پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# تۆخمەکانی پابەندبوون

## لە شەریعەتی ئیسلام و یاسای مەدەنی عەرەبیدا

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

وەرگێڕانی: عبدالكريم فتاح

# توخمەکانی پابەندبوون

## لە

## شەریعەتی ئیسلام و یاسای مەدەنی عەرەبیدا


نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی

عبدالکریم فتاح

سەرپەرشتیاری پڕۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# عناصر الالتزام

## في الشريعة الإسلامية والتشريعات المدنية العربية

# توخمەکانی پابەندبوون

## لە شەریعەتی ئیسلام و یاسای مەدەنی عەرەبیدا


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی

وەرگێڕانی : عبدالکریم فتاح

نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە



نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار


**پڕۆژەی وەرگێڕانی**
**کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا**


بەپێی گرێبەستی واژۆکراو لە بەرواری ٢٠١٤/٩/١٧ لەنێوان لایەنی یەکەم: بەڕێز دکتۆر مصطفی زەڵمی کە لەبری ئەو بەڕێز مسعود مصطفی زەڵمی واژۆی کردووە.
لایەنی دووەم: دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ڕۆژ هەلات کە بەڕێز حەسەنی دانیشفەڕ واژۆی کردووە.
مافی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمانە بۆ زمانی کوردی و چاپکردنیان بەپێی ئەو خالانەی لە گرێبەستەکەدا لەسەری ڕێککەوتوون، دراون بە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ڕۆژهەلات.



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا
وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ
نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾

سورة النساء/٥٨

**(أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ
كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ
النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ وَإِذَا حَدَّثَ
كَذَبَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ)**

بخاري ومسلم

# ناوەرۆك

# پێشەکی

ئەو هۆیانەی لە پشتی هەڵبژاردنی ئەم باس و لێکۆڵینەوەوەن زۆرن، گرنگترینیان:

١- هەڵەی باو لە هەموو یاساکاندا لەوەی کە توخمەکانی پابەندبوون سیانن.

٢- تەنها نەبوونەوەی کتێبێك، دەروازەیەك، یان بەشێك لە فیقهی ئیسلامی بە لێکۆڵینەوە و باسی پابەندبوون بەجۆرێك توخمەکانی و هۆیەکانی و جۆرەکانی و حوکمەکانی بگرێتەوە، نهێنی لەوەدا بریتییە لە بەرینی ئاسۆی پابەندبوون لەشەریعەتی ئیسلامدا، پابەندبوون تەنها پابەندبوونە داراییەکان ناگرێتەوە وەك لە یاسا دانراوەکاندا، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ پێیەوە پابەند دەبێت لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا لە بەرانبەر خۆی و پەروەردگاری وخێزان و کۆمەڵگە و هاوشێوەکانی لە مرۆڤ و تەواوی دروستکراوەکانی تر دەگرێتەوە, بابەتی پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا هەندێ جار مافی خودایە وەك لە عیبادەتەکاندا و هەندێ جاریش مافی بەندەیە جا مافی گشتی بێت یان مافی تاکەکەسی, مافەکە دارایی بێت یان نادارایی، پابەندبوون لە عیبادەتەکان و ئەرکەکانی کاروباری خێزاندا بوونی هەیە، هەروەها پابەندبوون لەمامەڵە داراییەکان و پابەندبوون لە تاوانەکان و سزاکان و رێکارە قەزاییەکان و داوا و رۆشنکردنەوەکاندا...

ئەم ئاسۆ بەرینە بۆ ناوەرۆکی پابەندبوون و مەیدانی پیادەکردنی وایکردووە بە شێوەیەکی سەربەخۆ باسی لەبارەوە نەکرێت، لەگەڵ ئەوەش فەقیهە موسڵمانەکان لە هەر بوارێك لەو بوارە ئاماژە بۆکراوانەدا بە شێوەیەکی تێروتەواو و لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆردا باسیان لەبارەوە کردووە، جارێك بەگوزارەی پابەندبوون وجارێکی تر بەگوزارە و دەربڕینی تر.

سەرباری ئەمە زانایانی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامی گوزارەی "داوالێکردن"یان بەکارهێناوە لە جێگەی "پابەندبوون"، هەروەها بەکارهێنانی "داوالێکراو" لە جێگەی "پابەندبوو"، "داواپێکراو" لە جێگەی "پێپابەندکراو" و "داواتیاکراو" لە جێگەی "تیاپابەندکراو"

٣- نەبوونی کتێبێك-ئەوەندەی من ئاگادارم-لە کتێبە نوێیەکان کە بابەتی بەراورد کردن لەنێوان شەریعەت ویاسادا لە بابەتی پابەندبووندا بگرێتە خۆ بە شێوەیەکی گشتگیر و بەربڵاو بۆ هەموو توخم و جۆر و شێوەکانی، هەر کەس لەم بەراوردکاریانەدا نووسیبێتی لەمەڕ نزیککردنەوەی فیقهی ئیسلامی لە یاسای دانراو وا گومان دەبات فیقهی خۆرئاوایی-یان یاسا- قووڵی زۆرتر وتێگەیشتنی بەرینتر و ئاسۆی فراوانترە لە هەر بابەتێك کە ئەو فیقهە یان ئەو یاسایە دەستی بۆ دەبات، وەك ئەوەی فیقهی خۆرئاوایی بنچینە و بنەڕەت بێت و فیقهی ئیسلامی شوێنکەوتە بێت.

٤- سڕینەوەی ئەو گومان وتەمومژەی کە هەندێ لەفەقیهانی یاسا تێیکەوتوون لەوەی پەیوەستە بە پابەندبوونەوە، وا گومانیان بردووە ئاسۆی پابەندبوون لە فیقهی ئیسلامیدا بەرتەسکترە لەوەی لە فیقهی خۆرئاواییدایە، بۆیە وتویانە: (پابەندبوون+ دەستەبەرکردن لە فیقهی ئیسلامیدا= پابەندبوون لە فیقهی خۆرئاواییدا) لەو سۆنگەیەوە بەکارهێنانی پابەندبوون لە فیقهی ئیسلامیدا -بە تێگەیشتنی خۆرئاواییانە- لەو فیقهەوە خوازراوە، لەوانە خوالێخۆش بوو

مامۆستای دکتۆر "عبدالرزاق السنهوري" لەکتێبەکەیدا "مصادر الحق" کە دەڵێت:

"مافی تاکەکەسی یان پابەندبوون دەربڕینێکە لە فیقهی خۆرئاوایی خواستوومانە، ئەگینا بە سروشت فیقهی ئیسلامی ئەم دەربڕینەی(ئەم گوزارەی) تێدا نییە، گەر بمانەوێت گوزارەیەکی فیقهی بەرانبەر بە وشەی "پابەندبوون" بهێنین بە مانا باوەکەی لە فیقهی خۆرئاواییدا پێویستە دوو دەربڕین هەیە بەکاریان بهێنین، ئەو دوانەش بریتین لە "پابەندبوون و دەستەبەرکردن" لە دوای ئەوەش هێشتا هەموو جۆرەکانی پابەندبوونمان دەرنەبڕیوە کە لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانیانەوە سەرهەڵدەدەن، بۆیە لەسەر وشەی پابەندبوون خۆمان کورتهەڵدەهێنین بە مانا باوەکەی لە فیقهی خۆرئاواییدا"

ئەم مامۆستا مەزنە سەرەڕای ئەوەی لە پێشەنگی ئەو یاساناسانەدایە کە لێکۆڵینەوەی بەراوردی فیقهی ئیسلامی و یاسا لە مامەڵە داراییەکاندا لەئەستۆ دەگرن کەوتۆتە ناو ئەو تەمومژ و لێڵییەوە، هەرچەند پاساو و بیانووی تایبەت بەخۆی هەیە، چونکە پێناسەی پابەندبوونی بە مانا بەرتەسکەکە لە هەندێ لە فەقیهە ئیسلامییەکان وەرگرتووە وەك "حطاب" لە فەقیهە مالیکییەکان کە "الشیخ محمد علیش"لە کتێبەکەیدا(فتح المالك في الفتوى على مذهب الإمام مالك) لەژێر ناونیشانی "مسائل الإلتزام"دا دەڵێت:

"ئیمام "حطاب" لە کتێبەکەیدا(تحریر الکلام في مسائل الإلتزام) لە دوای پێشەکییەکەی دەڵێت، کە ئەمە دەقی قسەکەیەتی: (پایەکەی لەسەر پێشەکییەکەی چوار دەروازە و کۆتاییەکەی وەستاوە، پێشەکەییەکە لە ڕۆشنکردنەوەی مانای پابەندبوون و پایەکانی و مەرجی هەر پایەیەك لە پایەکان، بۆیە دەڵێم(حطاب دەڵێت) ئاماژەی پابەندبوون لەڕووی زمانەوانییەوە بریتییە لە خۆپابەندکردنی کەسێك بە شتێك کە پێیەوە پابەند

نەبووە ئەوەش بەم مانا گشتگیرە لە فرۆشتن و ئیجارە و هاوسەرگیری و تەولوی گرێبەستەکانی تردا، لە عورفی فەقیهەکانیشدا بریتییە لە خۆپابەندکردنی کەسێك بە شتێکەوە بە چاکە(خۆبەخشی) بە شێوەیەکی رەها یان بە شێوەیەکی هەڵپەستێراو، ئەوەش بە مانای بەخشش، لە عورفدا بۆ تایبەتتر لەوە بەکاردەهێنرێت کە بریتییە لە پابەندبوونی چاکە(خۆبەخشی) بە وشەی پابەندبوون)[1]

ئاشکرایە پێناسەکەی "الحطاب" بۆ پابەندبوون بە مانایەکی گشتگیرتر و تایبەتتر لە عورفی فەقیهەکاندا لەسەر پابەندبوون بە ویستی یەکلایەنە کورتهەڵدێت و ئاسۆکەشی تەنها لەسەر "خۆبەشی" کورتهەڵهاتووە، ئەمەش نەنگیدارە و پێناسەی پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا نانوێنێت وەك "الحطاب" بانگەشەی بۆ دەکات.

وەك باسمان کرد فەقیهە موسڵمانەکان لە باسەکانیاندا هەموو جۆرەکانی پابەندبوونیان لە شەریعەتی ئیسلام و هەموو دەروازەکانی فیقهی ئیسلامیدا دەست بۆ بردووە، بەڵام زۆرجار ئەم گوزارەیان بەکارنەهێناوە، بەڵکو باسەکانیان لەژێر ناونیشانی تردا هاوواتا بە پابەندبوون هێناوە وەك گوزارەی "داوالێکردن یان

---

[1] پاشان "الحطاب"بەردەوام دەبێت لە قسەکەی و دەڵێت: "پایەکانی پابەندبوون چوارن: وەك پایەکانی پێدان، کەسی پابەندبوو و بۆپابەندبوو و پێپابەندبوو، و دارشتن، بۆیە بۆ هەریەکێك لەم پایانە ئەوەی بۆ پێدان بەمەرج دەگیرێت بۆ ئەویش بەمەرج دەگیرێت، وەك چۆن بابەتەکانیان ئاماژە بەوە دەکەن، پایەی یەکەم کە بریتییە لە پابەندبوو مەرجە کەسەکە لێوەشاوەیی بەخشینی تێدا بێت، ئەوەش ئەو کەسەیە کە داوالێکراوە کە دەستبەسەرداگرتنی لەسەر نییە و زۆرلێکراو نییە و پابەند نابێت وەك پابەندکردنی دەستبەسەرداگیراو وەك کەسی گێل، و مۆڵەتپێدراو لە بازرگانیدا و ئەو کەسەی قەرز ئابلۆقەیماڵەکەی داوە.."
بەم جۆرە هەر کەس درێژەپێدانی زیاتری دەوێت با تەماشای کتێبی ناوبراو یان سەرچاوە ئەسڵییەکەی "الحطاب" بکات
ئەوەی رۆشنە لەوەی گواستمانەوە "الحطاب" بەخشینەکانی لە مامەڵە دارایيەکاندا کورتکردۆتەوە، ئەو لەم ئاراستەیەدا تەنها نوێنەرایەتی خۆی دەکات و دەربڕی ئاراستەی بەرینی شەریعەتی ئیسلام ناکات لە پابەندبوونەکانی مرۆڤدا.

پێویستبوون یان شاندانەژێر، و هاوشێوەکانی ئەمانە، ئەوەی ڕۆشنە پەندوەرگرتن بە مانایە نەك بە وشە و گوزارە، بەکارنەهێنانی هەمان گوزارەی یاسایی مانای ئەوە نییە ئەو زاراوەیان بە ناوەڕۆك و حوکم لەژێر ناونیشانی تر و هاووتا بە گوزارە یاساییەکە بەکارنەهێناوە.

بۆ ڕەواندنەوەی تەمومژی ئاسۆی پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا لە زمانی عەرەبی و زانستی صەرف و مەنتق و زانستی فەلسەفە و زانستی ئوسولّ فیقهی ئیسلامیدا دەست بۆ پێناسەکەی دەبەین، پاشان لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەدا پێناسەی گشتگیر و بەرفراوان بۆ پابەندبوون لە قورئان سەرچاوەی یەکەم بۆ هەلگۆزینی هەموو حوکمە شەرعییە ڕاستەوخۆکان یان لە ڕێگەی سوننەتی پێغەمبەرەوە یان سەرچاوە پاشکۆکانی ئەو دوانە دەردەهێنین.

## پابەندبوون لە زمانی عەرەبیدا:

"الإلتزام–پابەندبوون" لە داتاشراوەکانی "اللزوم"ە کە چاوگی فرمانی "لزم، یلزم" لە دەروازەی "علم، یعلم"ە، فرمانی "لزم" بە تێپەڕ و تێنەپەڕ بۆ یەك بەرکار هاتووە، بۆیە "اللزوم" لە فرمانی تێنەپەڕەوە بە مانای "جێگیربوون و بەردەوامی و پێویستبوون" دێت، دەوترێت: "لزم الشيء" واتە جێگیر و بەردەوام بوو، هەروەها: "لزم الأمر" واتە پێویست بووە، "اللزوم" لە فرمانی تێپەڕدا بە مانای "وابەستەبوون بە شتێکەوە و جیانەبوونەوە لێی" دێت، دەوترێت: "لزم الدائن الغريم(المدين)" واتە شوێنی کەوت و لێی جیانەبوویەوە[1].

---

[1] لسان العرب لأبن منظور (جمال الدين محمد بن مكرم) الأنصاري (٦٣٠–٧١١هـ)، ١٤/١٦، مادة لزم.

## پابەندبوون لە زانستی صەرفدا:

"الإلتزام" چاوگی "ألتزم، يلتزم"ە لە دەروازەی "افتعل، يفتعل"ە، هەموو دارِشتەکانی ئەم دەروازەیە بۆ "مطاوعة-کەوتنەژێربار"ە، دەروازەی "إفتعل" بە زیادکردنی هەمزەی وەصلْ لە سەرەتایەوە و پیتی "تاء" لە نێوان "فاء و عين"دا بۆ "مطاوعة-کەوتنەژێربار"ی سێ دەروازە دێت:

١-بۆ "مطاوعة-کەوتنەژێربار"ی دەروازەی "فعل"، وەك "جمعته فاجتمع" هەروەها "غممته فاغتم" هەروەها "لزمته فالتزم"

٢-بۆ "مطاوعة-کەوتنەژێربار"ی دەروازەی "فعل"(بتشديد العين) وەك "قربته فاقترب" هەروەها "عدلته فاعتدل"

٣-بۆ "مطاوعة-کەوتنەژێربار"ی دەروازەی "أفعل" وەك "أنصفته فانتصف" هەروەها "أبعته فابتعد" هەروەها "ألزمته فالتزم"[1]

## پابەندبوون لە زانستی مەنتقدا:

بریتییە لە سیفەتی ئاماژەی گوزارەیی دانرلو لەسەر مانای دەرەکی لە بابەتی بۆدانراوی بۆپێویست بوو، چونکە ئاماژەی وشە لەسەر تەواوی ئەوەی بۆی دانرلوە پڕاوپڕە و لەسەر بەشێکی ئامێزگرییە، لەسەر دەرچوو لە مانای بۆدانراو پابەندبوونە، چونکە ئەو دەرچووە بۆ مانای بۆدانراو پێویستە.

بۆ نموونە ئاماژەی وشەی "گرێبەست" لەسەر کۆی ئەرێکردن و قبوولْ کردن پڕاوپڕییە، لەسەر یەکێکیان لە ئامێزی هەموودا ئامێزگرییە، لەسەر ئەو ئاسەوارە سەرهەڵدراوەی لێیەوە پەیدا دەبێت لە ماف و ئەرکەکان پابەندبوونە[2]

---

[1] ينظر كتاب دروس التصريف للعلامة محمد محي الدين عبدالحميد. ص٧٨.

[2] ينظر تهذيب المنطق للعلامة المعروف بالتفتازاني بشرح الخبيصي للعلامة عبيدالله بن الفضل الخبيصي، ص١٠.

## پابەندبوون لە زانستی فەلسەفەدا:

"الإلتزام"لە گۆکراوی "الإنفعال" کە بریتییە لە کاریگەربوون بە پابەندبوون وەرگیراوە، وەك "التسخن" کاریگەر بوو بە گەرم کردن، ئەوەش لە مانای "مطاوعة- کەوتنەژێربار"ی زانستی صەرفەوە نزیکە.

## پابەندبوون لە زانستی ئوسولی فیقهدا:

"الإلتزام" لە ئوسوڵی فیقهی ئیسلامیدا لە حوکمە تەکلیفییەکانە، هەموو "تکلیف"ێك پابەندکردنە و هەموو "تکلف"ێك پابەندبوونە، هەموو حوکمە شەرعییەکان و یاسا تەکلیفییەکان پابەندکردنە لە خاوەن شەرعەوە لە حوکمە شەرعییەکاندا، هەروەها لە یاسادانەرەوە لە جوکمە یاساییەکاندا، ئاسەوارەکەی بریتییە لە پابەندکردن و پابەندبوون، بۆیە زانایانی ئوسوڵ "الإلزام(التكليف)"یان پێناسە کردووە بەوەی: گوتاری خودایە پەیوەست بە کاروکردەوەی تەکلیفلێکراوان لەڕووی کردن و نەکردنەوە.

کردن و نەکردن(الإقتضاء) بریتییە لە داوای ئەنجامدانی کارێك یان ئەنجامنەدانی، داوای کارێك گەر ناچارکردنی تێدا بوو بریتییە لە پێویست و پابەند(إيجاب و إلزام)، ئاسەوارەکەشی بریتییە لە پێویستبوون و پابەندکردن(الوجوب واللزوم)، کاری داواکراویش بریتییە لە "واجب و لازم"، بکەرەکەی پاداشت دەدرێتەوە و رێزی لێ دەگیرێت و وازلێهێنەریشی سزا دەدرێت و لۆمە دەکرێت، چونکە وازلێهێنانی تاوانێکی نەرێیە، گەر لەڕووی لەپێشتر و باشترەوە بوو بریتییە لە پەسەندبوون، و ئەسەرەکەی بریتییە لە پەسەندی و کاری داواکراوی بریتییە لە پەسەندکراو و خۆشویستتراو بکەرەکەی پاداشت دەدرێتەوە و وازلێهێنەری سزا نادرێت.

داوای وازلێهێنان گەر بە شێوەی ناچارکردن بێت بریتییە لە حەرامکردن و پابەندکردن بە وازهێنان، ئاسەوارەکەی بریتییە لە حەرام و پابەندبوون بە وازهێنانەوە، کاری داواکراو بۆ وازهێنان بریتییە لە حەرامکراو و قەدەغەکراو، بۆیە

پێویستە وازی لێ بهێنرێت و بکەرەکەی سزا دەدرێت و لۆمە دەکرێت، و وازلێهێنەرەکەی پاداشت دەدرێتەوە و رێزی لێ دەگیرێت، کاری قەدەغەکراوی سزا لەسەردراو تاوانێکی ئەرێیە، گەر لەسەر شێوەی لەپێشتر و باشتر بوو بریتییە لە ناپەسەند، و ئاسەوارەکەی بریتییە لە ناپەسەندی، کاری داواکراو بۆ وازلێهێنان بریتییە لە پەسەندنەکراو، بۆیە بکەرەکەی سزا نادرێت لەسەری، بەلاّم لۆمە دەکرێت.

لەوەی باسمان کرد ئەنجامگیری دەکەین کە تەکلیف لای زانایانی ئوسولّ هاوواتایە لەگەلّ پابەندکردن، وەك چۆن تەکەلوف بریتییە لە پابەندبوون، داواتیاکراو بریتییە لە بابەتی پابەندبوون، داواپێکراویش(پێهەستان) بریتییە لە جێگەی پابەندبوون، پابەندکردن و پابەندبوون (پەیوەست نین بە شتە بەرجەستەکانەوە، بەلّکو پەیوەستبوونەکەیان بریتییە لە کاری مرۆڤ(پێهەستان) بە شێوەیەکی ئەرێیی وەك هەستان بە کارێك لە واجبەکاندا یان رێگرتنەوە لە کار وەك لە قەدەغەکراوەکاندا)[1]

## پابەندبوون لە قورئاندا:

خودا –سبحانە وتعالی– دەفەرموێت: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً﴾[2]

"كل إنسان–هەموو مرۆڤێك": لە شێوە دەربڕینە گشتییەکانە نێر و مێ و بچووك و گەورە دەگرێتەوە، لە کاملّ لێوەشاوەییەوە بۆ نەبوونی لێوەشاوەیی.

بەلاّم پابەندبوونە تاوانکارییەکان لەم گشتگیرییە هەلّوەردەکراوە بە تایبەتکردنەوەی بەم ئایەتە ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[3]، بەلاّم بەرپرسیارێتی مەدەنی ئاراستە دەکرێت، کەسێك کە لێوەشاوەیی نییە پێویستە بە مالّەکەی

---

[1] يُنظر أصول الفقه الإسلامي في نسيجه الجديد للمؤلف، ٨/٢ وما بعدها.

[2] الإسراء : ١٣

[3] البقرة : ٢٨٦

قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە بەرهەمی دەهێنێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك شایستەی پابەندبوونە لە کاتی لەدایکبوونەوە تا مردنی.

"ألزمناه" پابەندکردن یان بە کردار(داوای کردار) دەبێت وەك لە فەرمانەکاندا یان بە رێلێگرتن(داوای وازهێنان) دەبێت وەك لە نەهیلێکراوەکاندا، بۆیە مرۆڤ پابەندە بە کرداری هەموو پێویستێك(واجبێك) وەك هاوکاریکردن لەسەر چاکە و خۆپارێززی(البر والتقوى)، بەپێی داخوازی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1]. وەك چۆن پابەندە بە خۆگرتنەوە لە کاری قەدەغەکراو وەك خۆگرتنەوە لە کوشتن بە نموونە لەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾[2].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جێگەی پابەندبوون بریتییە لە کردار بە مانا گشتییە گشتگیرەکەی کار کردن، هەروەها خۆگرتنەوە لە کار کە هاوواتای پێهەستانە.

"طائره": "الطائر" بریتییە لە کار و کردەوەی چاکە و خراپە، گەر کار و کردەوەکانی چاك بوو پاداشتەکەی چاك دەبێت، گەر خراپیش بوو خراپ دەبێت.

کار بە "طائر" ناونراوە چونکە عەرەب کاتێ دەیانویست کارێك ئەنجام بدەن تەماشای باڵندەیان دەکرد، گەر بە لای راستدا بڕۆیشتبایە کارەکەیان ئەنجام دەدا و وا گومانیان دەبرد خێری بۆ ئەوان تێدایە، گەر بە لای چەپدا بڕۆیشتبایە وا گومانیان دەبرد ئەوە بۆ ئەوان خراپە و پشتیان لە کارەکە دەکرد، کاتێك ئەو کارە زۆر لە ئەوان دووبارە دەبوویەوە خودی خێر و شەڕیان ناونا"طائر"، ناونانی شت بە پێویستەکەی کە بانگەشەیان بۆ دەکرد تا وای لێ هات بوو بە راستەقینەیەکی باو، کاتێك قورئان ئەم عورفە عەرەبییە بەکاردەهێنێت مانای ئەوە نییە بیرۆکەکەیان بەڕاست دەزانێت، چونکە لە ئیسلامدا "طيرة" بوونی نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی وەك چۆن قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە هەر بەو جۆرە لە هەندێ ئایەتیدا بە عورفی

(1) المائدة : ٢

(2) الأنعام : ١٥١ ، الإسراء : ٣٣ .

ئەوان دابەزیوە، بۆ نموونە وشەی "ولد" لە زمانی عەرەبدا بۆ نێر و مێ بەکاردەهێنرا، بە هەمان مانا لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾[1] لە کاتێکدا لە ئایەتی تردا بە مانا عورفییەکەی هاتووە کە بریتییە لە تەنها نێر، وەك لە ئایەتی: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾[2]، جمهوری فەقیهان دەڵێن: مەبەست بە وشەی "ولد-کوڕ" لەم ئایەتەدا مانای عورفیە کە بریتییە لە "نێر"

"في عنقه": واتە لە گەردنیدا، گەردن یان شوێنی خشڵ و جوانکارییە وەك گەردانە و هاوشێوەکانی، یان شوێنی ناشیرینییە وەك کۆتوبەند و هاوشێوەکانی، گەر کارەکەی چاك بوو وەك گەردانە وایە لە گەردنیدا و جوانی دەکات، گەر کارەکەی شەڕ بوو وەك کۆتوبەند وایە لە گەردنی و ناشیرینی دەکات.

ئەم ئایەتە بە ڕۆشنی ئاماژە دەکات بەوەی ئەستۆگری کە ماف و پابەندبوونی خەڵکانی تری پێوە پەیوەستە بریتییە لە گەردنی کەسی پابەندبوو، ئەمەش مانای ئەوە نییە قەرزکەر زاڵ بکرێت بەسەر جەستەی قەرزداردا وەك چۆن پێشتر لە یاسا کۆنەکاندا باو بوو، لەوانە یاسای ڕۆمانەکان، بەڵکو دەستەبەرکردنی قەرزی قەرزدەر تەنها لە ماڵی کەسی قەرزداردایە، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[3] ناچارکردنی مادیانە بۆ جێبەجێکردنی زۆرنامێز(جەبری) لە ئیسلامدا تەنها بۆ ئەو دەوڵەمەندانەیە کە توانای جێبەجێ کردنی پابەندبوونەکان و گێڕانەوەی قەرزەکانیان هەیە، سەرەڕای ئەوەش خۆیان دوادەخەن و نایانەوێت وەفا بە پابەندبوونەکانیان بکەن، بۆیە دروستە سزا بدرێن بە سزایەکی نەرێیی بۆ ئازادی(بەندکردن) یان سزایەکی مەعنەوی(زەم کردنیان لەبەردەم خەڵکیدا) بە هۆی ئەو فەرموودەی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم): (دواخستنی دەوڵەمەند

---

[1] النساء : ١١

[2] النساء : ١٧٦

[3] البقرة : ٢٨٠.

ستەمە)[1]، واتە دواخستنی قەرزداری خاوەن توانا بۆ گێڕانەوەی قەرزەکە ستەمە، هەموو ستەمێکیش پێویستە بە سزایەك یان بە شتی تر لابدرێت، لە ریوایەتێکی تردا: (دواخستنی(لَي) کەسی هەبوو ستەمە، عیرز و سزادانی حەلاڵە)[2]، واتە دواخستنی قەرز لەلایەن کەسی دەوڵەمەندەوە ستەمە، ئەم ستەمەش عیرزی حەلاڵ دەکات، واتە ناوهێنانی بە خراپە حەلاڵ دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی لە مامەڵە کردنی دوور بخرێنەوە، چونکە "عِرض-بکسر العين" لەم فەرموودەیەدا بە مانای ئەوەیە کە کەسێکی پێ مەدح دەکرێت یان کەسێکی پێ زەم دەکرێت، ئەم سزا مادییە یان مەعنەوییە سزای ئەو کەسە نییە کە وەفای بە قەرزەکە نەکردووە، بەڵکو سزایە بۆ ستەمی قەرزدار و سەرپێچی لە گێڕانەوەی قەرزەکە.

هەڵبژاردنی گەردن وەك ئەستۆگری بۆ ماف و پابەندبوون بۆ گرنگی ئەو بەشە لە جەستەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە، چونکە ئامێری بیرکردنەوەی مرۆڤ(دەماغ) بە ئامێری کارکردنەوە(دەست و لاق) دەبەستێتەوە.

بینا لەسەر ئەم راستییە قورئانییە هیچ پاساوێك نییە بۆ هەندێ لە زانایانی ئوسول و فەقیهان لە پێناسەی "ئەستۆگری" بە پێناسەگەلێکی تەومژاوی ئیجتیهادی، لەگەڵ ئەوەی کە (لە میانەی دەقدا رێگە بە ئیجتیهاد نادرێت)، قورئان ئەستۆگری مرۆڤی دیاریکردووە لە چەندین ئایەتی تردا، لەوانە: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾[3]. هەروەها: ﴿وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً﴾[4].

ئامـاژە دەکـات بـەوەی کـە مـافی مـرۆڤ بـە کـۆن بـوون و درێژخایـەنی بەرنابێتەوە(کۆتایی پێ نایەت) و گەر لە بەردەم قـەزادا بـۆی سـاغ نەبوویـەوە ئـەوا

---

[1] سبل السلام شرح بلوغ المرام من جمع أدلة الأحكام، للحافظ ابن حجر العسقلاني، تـأليف الإمـام محمد بن اسماعيل الصنعاني، ٣/٧٢.

[2] المرجع السابق.

[3] النساء : ٩٢

[4] الإسراء : ١٣

لەلای خودا بەفیڕۆ ناچێت، بەڵکو کەسی قەرزدار پابەندبوونەکەی بە جێبەجێ کردنی ئەوەی پێویستە جێبەجێی بکات لە دونیادا دەمێنێتەوە، گەر لە لێرە و لەبەردەم قەزایەکی دونیاییدا وەفای پێ نەکرد، ئەوا لە بەردەم قەزای دواڕۆژدا لێی وەردەگیرێتەوە، چونکە لە نووسراوێکی والادا و لە زانستی خودادا جێگیر کراوە، بۆیە لە ڕووی ئایینەوە بەرپرسیارە با لە ڕووی قەزاییشەوە ڕووبەڕووی پرسیار نەکرێتەوە.

## پێناسەی پابەندبوون لەڕووی زاراوەییەوە:

لەو ئایەتە ئاماژەبۆکراوە﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾ و لە پێناسە باسکراوەکانەوە لە زانستی صەرف و مەنتق و فەلسەفە و ئوسوڵی فیقهـ دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پێناسەی دروستی کۆکەرەوەی ڕێگر(جامع مانع) بۆ پابەندبوون بریتییە لەم پێناسەیە:

پابەندبوون: شاندانەژێر ئەرکێکی پێویستە خۆبەخشانە یان بە شێوەی ناچارکردن، خەریککردنی ئەستۆگری بە ماڧ کەسانی تری لێوە سەرهەڵدەدات تا کۆتایی پێ دێت( الالتزام: تحمل أداء واجب طوعاً أو كرها، يترتب عليه انشغال الذمة بحق الغير حتى ينقضي)

**شیکردنەوەی پێناسەکە :**

"التحمل-شاندانەژێر": شاندانەژێر و دواڵێکردن و پابەندبوون (التحمل والتكلف والإلتزام) لە دەروازەی "الإنفعال"ن(کاریگەربوون و کەوتنەژێربار)، هەموو ئەوانە یەك مانایان هەیە، لەو شاندانەژێر بەرپرسیارییەدا جگە لە تاوان و عیبادەتەکان تەنها لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ بە مەرج دەگیرێت، ئەوەش بریتییە لە توانای کەسەکە بۆ ئەوەی ماڧ هەبێت و ئەرکی لەسەرشان بێت، لە حوکمە دانراوەکاندا کە دەگەڕێنەوە بۆ گوتاری دانان ئەو لێوەشاوەییە بەسە بۆ پابەندبوون، بەڵام لە حوکمە داواکراوەکانی گەڕاوە بۆ گوتاری داواکردن بوونی لێوەشاوەیی بەرپرسیارێتی تاوانکاری و پابەندبوونی تاوانکارانە بە مەرج دەگیرێن، ئەوەش ئەوەیە کەسی

پابەندبوو باڵغ و ئاقڵ بێت و توانای هەڵبژاردنی هەبێت و زانا بێت بەوەی دلوای لێکراوە و توانای بەسەریدا هەبێت، وەك چۆن لە جێگەی خۆیدا باسی لەبارەوە دەکەین.

"الأداء–پێهەستان": ئەوەش بریتییە لە هەستان بە کاری رادەست کردنی فرۆشرلو و پێدانی نرخ و گێڕانەوەی ئەمانەت لە مامەڵە دارلییەکاندا و هاوشێوەکانی ئەمانە، وەك هەستان بە نوێژ و پێدانی زەکات لە عیبادەتەکاندا و خەرجکردن بۆ ژن و منداڵ لە ئەرکە خێزانییەکاندا، و هاوشێوەکانی ئەمانە لە کارە رەواکان، یان خۆگرتنەوە(ئەنجام نەدان) لە کار وەك پابەندبوون بە زیان نەگەیاندن بە کەسانی تر لە ژیانی یان لە ماڵی یان لە ناموسی یان لە حورمەت و ناوبانگی و هاوشێوەکانی ئەمانە لە کاری ناڕەوا، پێهەستان لە واجبەکاندا و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان بریتییە لە کردار، لە حەرامکراوەکان و قەدەغەکراوەکان و نەهیلێکراوەکانی تردا خۆگرتنەوەیە لە کردار و دەستنەبردنە بۆی.

"طوعا–خۆبەخشانە": شاندانەژێر کارێك خۆبەخشانە دەبێت گەر هۆی پابەندبوون روویدابێت سەرباری ویستی کەسی پابەندبوو بەوەی لە بنەڕەتدا ویستی نەبووبێت، وەك هەڵسوکەوتی زیانبەخشانەی کەسێك کە لێوەشاوەیی نییە، ئەوە دەبێتە هۆی پابەندبوون بە پێدانی قەرەبووکردنەوە بۆ کەسی زیانپێگەیو، یان هۆیەکە رووداوێکی شەرعی مادی بێت (یان یاسایی بێت) وەك رووداوەکانی ئۆتۆمبێل، یان مەعنەوی بێت وەك خزمایەتی، ئەمەی دوایی هۆیەکی ناویستییە بۆ میراتگرتن و پێویستی خەرجی بۆ خزمی هەژار لەسەر خزمە دەوڵەمەندەکەی.

"کرها–ناچارکردن": مەبەست بە ناچارکردن بریتی نییە لە زۆرلێکردنی باو، چونکە ئەوە فشارێکی ناڕەوایە لەسەر کەسەکە بۆ ئەوەی هەڵبنرێت بۆ ئەنجامدانی کارێك کە پێی رازی نییە.

پوختەی قسان: هۆ گەر هەڵسوکەوتێکی بەویستی هۆشیارانە بوو ئەوا شاندلنەژێر بریتی دەبێت لە خۆبەخشانە، گەر رووداوێکی مادی یان مەعنەوی بوو شاندلنەژێر و پابەندبوون ناچاری دەبێت.

"الإنشغال-خەریککردن": لە زاراوەی یاساناساندا پێی دەوترێت قەرزداری و بەرپرسیارێتی، قەرزداری بریتییە لە خەریکبوونی ئەستۆگری بە ماف کەسانی ترەوە تا بۆیان دەگێڕێتەوە، بەرپرسیارێتیش: ئەوەیە کە مرۆڤ دلوای لێکراوە هەستێت بە گێڕانەوەی ماف کەسانی تر لەسەر خۆی بە ویستی خۆی، ئەگەر نە، ناچاردەکرێت.

هەموو ئەوەی کەسی پابەند(قەرزدار) هەیەتی لە مافە دیاریکراوەکان و مافە تاکەکەسییەکان دەستەبەرکردنێکی گشتییە بۆ مافی قەرزدەران، سەرباری دەستەبەرکردنی تایبەت گەر ببینرێتەوە، وەك بارمتە پێش خاڵیبوونەوەی ئەستۆگری لەو خەریکبوونە، گەر داوای قەرزدەر بەهۆی درێژخایەنییەوە بەریوویەوە(کۆتایی پێهات) یان بەهۆی نەبوونی بەڵگەی سەلماندن لەسەر داوالەسەرکراو، ئەوا لە بەردەم قەزادا بەرپرسیارێتی بەردەبێتەوە و قەرزداری بۆ بەردەم خودا دەمێنێتەوە و پابەندبوون وەك قەرزداری دەگۆڕێت بۆ پابەندبوونی سروشتی.

زۆرێك لە لێکدەرەوان(شرۆڤەکاران)ی یاسا[1] قەرزداری و بەرپرسیارێتی وەك توخمی پابەندبوون سەرژمێر دەکەن، ئەمەش هەڵەیەکی بەربڵاوە و لەسەر تێکەڵی

---

[1] لەوانە دکتور "عبدالحي الحجازي" لە کتێبەکەیدا"النظرية العامة للإلتزام وفقا للقانون الكويتي" ٩٣/١ و ئەوەی بەدوایدا دێت، لەوێ دەڵێت: پابەندبوون گەرچی لە رووالەتیدا وادەردەکەوێت بیرێکی یەکگرتوو بێت لە حەقیقەتیدا لە دوو توخم پێکدێت: توخمێکی تاکەکەسی و توخمێکی بەرچاو، توخمی تاکەکەسی ئەو ئەرکەیە کە داوا لە قەرزدار دەکات پێهەستانەکە بەوە جێبەجێ بکات، بۆ ئەو مەبەستە پێی دەوترێت توخمی قەرزداری، توخمی بەرچاویش ئەوەیە کە قەرزدەر بۆی هەیە هێرشبکاتە سەر ئەستۆگری قەرزدار لەکاتی جێبەجێ نەکردنی پابەندبوونەکەی، ئەوەش بە مەبەستی ئەوەی هەڵبنێت بۆ جێبەجێ کردن، بۆیە پێی دەوترێت توخمی بەرپرسیارێتی.

نێوان توخمەکانی شتێك لەگەڵ بەرهەڵستکارە تایبەتەکان لە دوای هەبوونیان بیناکراوە، قەرزداری و بەرپرسیارێتی لە بەرهەڵستکارە پێویستەکانن بۆ پابەندبوون لەدوای هەبوونیان، نەك لە توخمەکانی بن، وەك لەو دوو پێناسە ئاماژەبۆکراوانەوە– بۆ هەردووکیان– ڕۆشن دەبێتەوە، چونکە خەریکبوونی ئەستۆگری بە ماف کەسانی ترەوە و دلواکردن بۆ ئەو مافە لە دوای هەستان بە پابەندبوون و فەراهەمبوونی توخمەکانیان دەبێت.

"الذمة–ئەستۆگری": فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام پێناسەیان کردووە بە چەندین پێناسە، هەندێ لەو پێناسانە ناتەواون و هەندێکی تریان نارۆشنن، لەوانە پێناسەی ئەستۆگری بەوەی وەسفێکە بەهۆیەوە دلوالێکراو لێوەشاوە دەبێت بۆ پابەندکردن و پابەندبوون[1]، لەو پێناسانەش ئەوەیە کە دەڵێت: ئەستۆگری مانایەکی شەرعی دیاریکراوە لە داوالێکراودا شایەنی پابەندبوون و پابەندکردنە[2]، هەروەها لەو پێناسانە ئەوەیە کە ئەستۆگری وەسفێکە مرۆڤ بەهۆیەوە شایستە دەبێت بەوەی بۆ ئەوە و لەسەر ئەوە[3]، هەموو ئەم پێناسانە لە چەندین رووەوە عەیبدارن، لەوانە:

١. هەریەکەیان نارۆشنە، لە مەرجەکانی پێناسە ئەوەیە روون و ئاشکرا بێت.
٢. تێکەڵیان تێدایە لە نێوان ئەستۆگری دارایی و لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ.
٣. هەندێکیان کۆکەرەوە نین و ئەستۆگری ئەوانە ناگرێتەوە کە داوا لێنەکراون لەوانەی لێوەشاوەییان ناتەواوە یان لێوەشاوەییان نییە.

---

[1] كشاف القناع في الفقه الحنبلي ١١٧/٣.

[2] الفروق للقرافي (شهاب الدين أبي العباس أحمد بن ادريس بن عبدالرحمن الصنهاجي) المالكي ١٨٣/٣ و ٢٣١.

[3] التوضيح والتنقيح لصدر الشريعة (عبيدالله بن مسعود) مع التلويح ١٥٢/٣.

فەقیهانی یاسا پێناسەی ئەستۆگرییان کردووە بەوەی دەفرێکە بۆ ماف و ئەرکەکان یان بریتییە لە کۆی ئەوەی بۆ مرۆڤ هەیە لە مافەکان و ئەوەی لەسەریەتی لە ئەرکەکان[1]، هەردوو پێناسەکە لە چەندین رووەوە عەیبدارن، لەوانە:

١. دەستبەسەردا گرتنی دلواکراویان تێدایە بە دەربڕینی زاراوەی یاسایی، و نەشیاوی مەنتقییان تێدایە بە زاراوەی مەنتقیانە، چونکە ئەستۆگری داراییانە بوونی لەسەر فەراهەمبوونی دوو توخمی ماف و ئەرکەکان وەستاوە، ئەو دوانەش لەسەر بوونی ئەستۆگری داراییانە وەستاون، چونکە گەر ئەستۆگری داراییانە راوەستاو نەبێت ماف و ئەرکە داراییەکان بوونیان نابێت، وەستانی شتێك لەسەر ئەوەی کە لەسەر ئەو وەستاوە وەستانی شتەکە لەسەر خودی خۆی پێویست دەکات، لێرەوە پێشکەوتنی شتەکە لە خۆی پێویست دەکات، پێویستەکە پووچەڵە و پێویستکراویش بە هەمان شێوە.

٢. پێناسەکە تەنها لەسەر ئەستۆگری دارایی کورتهەڵهێنراوە، لە کاتێکدا ماف و ئەرکەکانی مرۆڤ وەك چۆن داراین زۆرجاریش نادارایین، وەك ماف و ئەرکە نادارایییەکانی هاوسەرداری.

٣. پێناسەکردنی بە "دەفر" نارِوونە، چونکە دەفر گریمانەیەکی یاساییە، لە کاتێکدا لە پێناسەدا بە مەرج دەگیرێت پێناسە لە پێناسەکراو رۆشنتر و ئاشکراتر بێت.

٤. لەو دوو پێناسە ئاماژەبۆکراوانەوە حاڵی دەبین ئەو کەسەی لەدایك دەبێت لە کاتی لەدایکبوونیدا یان دوای لەدایکبوونەکەی خاوەنی مافی دارایی نییە و پابەند نییە بە هیچ جۆرە پابەندبوونێکەوە، چونکە ئەو ئەستۆگری نییە،

---

[1] المدخل للقانون الخاص للدکتور عبدالمنعم البدراوي، ص٤٦٢ تیایدا هاتووە: (مەبەست بە ئەستۆگری داراییانە کۆی ئەوەیە بۆ کەسێك هەیە و ئەوەی لەسەریەتی لە مافەکان و ئەرکە داراییەکان، بۆیە ئەستۆگری لە دوو توخمی پێکدێت: ئەرێی "مافەکانی کەسێك" و نەرێی "پابەندبوونەکان")

ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ کۆدەنگی فەقیهەکانی شەریعەت و یاسا بەوەی مرۆڤ لەدایك دەبێت و ئەستۆگری دارایی لەگەڵ لەدایك دەبێت و تا مردن لەگەڵی بەردەوام دەبێت.

ئەو قسەی گوایە مەبەست پێی دەسەلاتەکانی کەسەکەیە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا مافی هەبێت و ئەرکی لەسەر شان بێت تێکەڵی لە نێوان ئەستۆگری دارایی و لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ دروست دەکات، پێویستەکە پووچەڵە و هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکەش.

لەڕاستیدا وەك باسمان کرد قورئان بە دەق ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەستۆگری مرۆڤ دارایی بێت یان نادارایی بریتییە لە مل و گەردنی، ئەم بەشەی مرۆڤ کارێکی بەرهەستە و بەردەستە و ئامێری بیرکردنەوەی مرۆڤ(دەماغ) دەبەستێتەوە بە ئامێری کاری مرۆڤەوە(دەست و لاق)

"الحق-ماف": بەپێی زانستی من تاکو ئێستا رایەکی یاسایی لەلای شرۆڤەکارانی یاسا جێگیر نەبووە لەسەر پێناسەیەکی وردی کۆکەرەوەی رێگری گشتگیر بۆ هەموو بەشەکانی مافی دارایی و نادارایی، وەك چۆن پێناسەکە لەلای فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام مانا زمانەوانییەکەی تێناپەڕێنێت، بۆیە پێشنیار دەکەم "ماف" پێناسە بکرێت بەوەی: ناوەندێکی[1] شەرعییە[2] لە باریدایە[3] هەموو کەسێك کە شایستەیەتی و کەسانی تریش سوود(قازانج)ی[4] لێ ببینن.

ئەم پێناسەیە هەموو بەشەکان و جۆرەکانی مافی دارایی و نادارایی گشتی و تایبەت دەگرێتەوە.

---

[1] یەکسانە ناوەندێکی مادی بێت یان مەعنەوی.

[2] شەرع یان یاسا دانییێدا بنێت و بڕیاری لێبدات و بیپارێزێت.

[3] واتە بەمەرج ناگیرێت سوودلێبینینەکە بەکردار راوەستاو بێت، گرنگ ئەوەی شیاوی سوودبینین بوونی هەبێت گەر بەکرداریش بەدەست نەهاتبێت.

[4] بە سنووردارییەك(یان شتێکی تر) مافەکانی خودا دەچنە ناو پێناسەکەوە، چونکە سوودمەند لەوە تەنها مرۆڤە.

## پێناسەی پابەندبوون لە یاسا و فیقهی ئیسلامیدا:

لەو پێناسە یاساییانەی لە مادەی (٦٩)ی یاسای مەدەنی عێراقی رلوەستاودا هاتووە، لەم دەقانەدا:

١. ماف تاکەکەسی بریتییە لە پەیوەستبوونێکی یاساییانەی نێوان دوو کەس(قەرزدەر و قەرزدار)، بەپێی ئەوە قەرزدەر داوا دەکات مافێکی دیاریکراوی بگوێزێتەوە یان هەستێت بە کارێك یان خۆبگرێتەوە لە کارێك.

٢. پابەندبوون بە گواستنەوەی مولکداری جێگەکەی هەرچییەك بێت کاژ بێت یان هاونموونە یان بەها بە مافێکی تاکەکەسی دادەنرێت، هەر بەو جۆرە پابەندبوون بە رادەست کردنی شتێکی دیاریکرلو بە مافێکی تاکەکەسی دادەنرێت.

٣. گوزارەی "پابەندبوون" بە دەربڕینی "قەرز" هەمان مانا دەگەیەنێت کە گوزارەی "ماف تاکەکەسی" دەیگەیەنێت.

لەسەر ئەم مادەیە کۆمەڵێك تێبینی هەیە:

١. ماف تاکەکەسی و پابەندبوون و قەرز بە کۆمەڵێك وشە دادەنرێن کە یەك مانا بۆ هەموویان هاوواتایە ئەوەش بریتییە لە پەیوەستبوونی یاسایی نێوان قەرزدەر و قەرزدار، بەپێی ئەو پەیوەستبوونە یەکەمیان(قەرزدەر) داوا لە دووەمیان دەکات هەستێك بە گواستنەوەی مافێکی دیاریکراو یان هەستان بە کارێك یان خۆگرتنەوە لە کارێك، ئەمەش مانای وایە ئەو پەیوەستبوونە یاساییە وەك یەك سکە وایە و دوو رووی هەیە: ماف تاکەکەسی تایبەت بە قەرزدەر لەگەڵ پابەندبوون تایبەت بە کەسی قەرزدار.

ئەم گریمانە یاساییە بە پێوەری مەنتقی لە چەند روویەکەوە هەڵەیە:

أ- "الإلتــزام-پابەنــدبوون" لــە گوتــەی "الإنفعــال"ە(کاریگــەربوون و کەوتنەژێربار) "پەیوەستبوونی یاسایی"ش لە گوتەی "دانەپاڵە" لـە دوو رێژە پێکدێت، یەکەمیان قەرزدەر و دووەمیان قەرزدار، ئەم دوو گوتەیەش

لەڕووی ناوەڕۆکەوە لەیەکتر جیاوازن، بۆیە لە ترازووی مەنتقدا یەکێکیان بەوی تریان ناناسرێتەوە.

ب- پابەندکردن سیفەتێکی یەکلایەنەی راوەستاوە بە کەسی قەرزدارەوە، پەیوەستبوونیش سیفەتێکی هاوبەشە لە نێوان قەرزدەر و قەرزداردا، بۆیە دروست نییە یەکێکیان بەویتریان شرۆڤە بکرێت لە زمان و مەنتقدا.

ت- دانانی قەرز(مافی تاکەکەسی) و پابەندبوون وەك دوو هاوواتا بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەو قسەی کە مافە تاکەکەسییەکان گەر زیاتر بوو لە ئەرکەکان ئەستۆگری قەرزدەرانە دەبێت، گەر کارەکەش بە پێچەوانەوەی ئەوەوە بوو ئەستۆگری قەرزدارانە دەبێت، چۆن ئەم گۆڕانە لە ئەستۆگریدا لەڕووی مەنتقییەوە وێنا دەکرێت، گەر قەرز و پابەندبوون دوو وشەی هاوواتا بن و یەك ناوەڕۆکیان هەبێت.

٢. هەروەها لەو تێبینیانەی لەسەر هەمان مادە بوونی هەیە: گواستنەوەی مولکییەتی ناوبراو واتە گواستنەوەی مولکییەت تەنها بە دامەزرانی گرێبەست بەدیدێت، جا گرێبەستێکی رازیبوونانە بێت یان گرێبەستێکی شێوەگری، پێش دامەزرانی گرێبەستەکە هیچ پابەندبوونێك بوونی نییە بە گواستنەوەی مولکییەت و دوای دامەزرانیش هیچ داخوازیەکی لەسەر نییە، ئەمەش تێکەڵییەکە لە نێوان ئاراستەی یاسای میسری کاریگەر بە یاسای فەرەنسی لە هەڵسوکەوتەکانی تایبەت بە خانووبەرە کە پابەندبوون سەرهەڵدەدات و مولکییەت ناگوێزرێتەوە پێش تۆمارکردنی لە ئاشکراکردنی خانووبەرەدا، لەگەڵ ئاراستەی یاسای مەدەنی کاریگەر بە فیقهی ئیسلامی لەلایەکەوە و لەبەرچاوگرتنی گرێبەستی شێوەگری بەوەی پووچەڵە بەر لە رێکارە رووالەتییەکان هیچ پابەندبوونێك لە لایەکی ترەوە لەسەری سەرهەڵنادات.

٣. ناوهێنانی پارە(سکە) لەگەڵ هاونموونەکان ناواخنە، چونکە پارە لە هاونموونەکانە.

پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی نوێ[1] (م١١٠) پێناسەی "پابەندبوون"ی بەوە کردووە کە: ئەرکێکی یاسایییە بە پێهەستان(جێبەجێ کردن)ی دیاریکراو، دەکەوێتە سەر کەسێکی دیاریکراو بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر، ئەمەش تێکەڵییە لە نێوان پابەندبوون و جێگەی پابەندبوون، جێگەکەی بریتییە لە پێهەستان بە ئەرکێکی پێویست، بۆیە پێویست سیفەتی پێهەستانە نەك پابەندبوون.

یاسای مەدەنی میسری کۆنی هەموارکراوی تێکەڵ (م٩٠/١٤٤)پابەندبوونی پێناسە کردووە بەوەی بریتییە لە پەیماندان، دواتر پەیماندانی پێناسە کردووە بەوەی پەیوەستبوونێکی یاسایییە مەبەست پێی بەدەستهێنانی سوود و قازانجە بۆ کەسێك بە پابەندبوونی پەیماندەر بە ئەنجامدانی شتێکی دیاریکراو یان خۆگرتنەوە لە ئەنجامدانی.

تێبینی دەکرێت پەیماندان سەرەڕای نزیکی لە شاندانەژێر، لەگەڵ ئەوەش پابەندبوون دەگرێتەوە کە هۆیەکەی ناویستییە.

## هەروەها لە پێناسە فیقهییەکانی پابەندبوون:

پێناسەکەی لە خوالێخۆش بوو مامۆستا "السنهوري"ەوە، کە دەڵێت[2]:

"ئەو پێناسەی ئێمە هەڵیدەبژێرین ئەوەیە کە پابەندبوون حاڵەتێکی یاسایییە بەپێی ئەوە کەسێکی دیاریکراو پەیوەست دەبێت بە گواستنەوەی مافێکی بەرچاو یان هەستان بە کارێك یاخود خۆگرتنەوە لە کارێك"

لەم پێناسەیەوە تێبینی ئەم خاڵانە دەکرێت:

١. پێناسەیەکی تەمومژاوییە، چونکە حاڵەتی یاسایی لە خودی خۆیدا ناڕۆشنە و دیاری نەکراوە، پێناسەش پێویستە روون و ئاشکرا بێت و لێڵی لەئامێز نەگرێت.

---

(١) تاکو ئێستا رۆشنایی نەبینیوە.

(٢) الوسيط ١/١٢٥.

٢. پێناسەکە توخمەکانی پابەندبوون لەخۆ ناگرێت، توخمی شتێك لە پێناسەکەیەوە وەردەگیرێت.

٣. حاڵەتی یاسایی لەگەڵ پەیوەستبوونی یاسایی لە ناوەرۆکدا جیاوازییان نییە، بەڵکو جیاوازی تەنها لە دەربڕیندایە.

بۆیە بەرپەرچی ئەم پێناسەیە دەدرێتەوە بەوەی لەسەر پێناسەی پابەندبوون هێنامان بە: گرێدانێکی یاساییە لە یاسای مەدەنی عێراقیدا.

هەروەها لەوانە ئەو پێناسەیەی[1] کە دەڵێت: "واجبێکی هاتوو بەسەر گەردنی قەرزداردا بۆ پێدانی شتێك یان هەستان بە کارێك یاخود خۆگرتنەوە لە کارێك"

بەرپەرچی ئەم پێناسەیە دەدرێتەوە بەوەی لەسەر پێناسەی پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی نوێ هێنامان، کە دەڵێت: تێکەڵییە لە نێوان پابەندبوون و جێگەی پابەندبووندا، بۆیە "واجب" بریتییە لە پێهەستان کە بریتییە لە جێگەی پابەندبوون نەك خودی پابەندبوونەکە.

پوختەی قسان: هەرکەس شوێنپێی یاسای دانراو و شرۆڤەکردنەکانی و بۆچوونی فەقیهەکان و لێکدەرەوانی یاسا هەڵبگرێت پێناسەکی دروستیان تێدا نابینێتەوە بۆ پابەندبوون بە ترازووی زانستی مەنتق و فەلسەفەی یاسا و داخوازی زمان.

## توخمەکانی پابەندبوون:

توخمەکانی شتێك بریتییە لەو شتەی لەسەری دەوەستێت لە هاتنەدی و بوون و وەسفیدا، توخمەکان پێش ئەو شتە دەکەون لە بوونی زەینی و دەرەکیدا، چونکە "لەسەروەستاو" لەڕووی مەنتقەوە وەك هۆ وایە بۆ وەستاوەکە، "هۆ"ش هەمیشە پێشی هۆئامێز دەکەوێت.

توخمەکان لەوانەیە مادی بن یان مەعنەوی، مادی بن واتە بەرهەست بە یەکێك لە پێنج هەستە ئاشکرا راستەوخۆکە، یان بەهۆی ئامێرەوە وەك بینینی تەنەکان لە

[1] د.عبدالناصر العطار، الأجل في الإلتزام ص٢٠.

ئاسماندا لە ڕێگەی هۆکارە فەلەکییە نوێیەکانەوە، توخمە مادییەکان وەك کەرەستەی سەرەتایی وان بۆ بیناکردن، هەروەها وەك بەشەکانی ئامێری لێکدراوی چەندین پارچە وان، بە سروشت بەشە مادییەکانی شتێك پێش شتەکە بوونیان هەیە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ وەك چۆن لەناو زەینی مرۆڤدا بوونیان هەیە لەڕووی وێنە و زانست بەو توخمانە، هەموو لێکدراوێك پێکهێنەرەکانی بریتین لە توخمەکانی.

توخمە مەعنەوییەکانیش هەمیشە زەینین وەك توخمی زاراوەکان و تیورە زانستییەکان، بە سروشت هەر تیورەیەك دابەش دەبێت بۆ توخم و حوکمەکانی بە پێچەوانەی توخمەوە، چونکە تایبەتمەندی شتێك و بەرهەڵستییە خودییەکانی پاشکۆن بۆی، لەدوای هاتنە بوونی شتەکە دێنە بوون، چونکە وەك سیفەتی خودی و سیفەتە لابەلاکان وان، ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە بوونی سیفەتی شتێك لە بوونی شتە وەسفکراوەکە دوادەکەوێت، جا دەواکەوتنەکە خودی بێت بەوەی کات نەکەوێتە نێوانیانەوە، وەك پێشکەوتنی هێز لە ڕوناکی لە گڵۆپی کارەباییدا، یان دواکەوتنەکە لەڕووی کاتەوە بێت بەوەی لابەلایەك سەرهەڵبدات بۆ ماوەیەك لە دوای بوونی خودە وەسفپێکراوەکە وەك شێتێتی کتوپڕی.

لێرەوە هەڵەی هەندێ لە ڕاڤەکەرانی یاسامان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە بە لەبەرچاوگرتنی قەرزداری و بەرپرسیارێتی وەك توخمەکانی پابەندبوون، چونکە قەرزداری بریتییە لە خەریککردنی ئەستۆگری بە مافی کەسانی ترەوە، خەریککردنیش لەسەر پابەندبوون سەرهەڵدەدات و لە بووندا بۆی پاشکۆیە، وەك لە پێناسەی پابەندبووندا باسمان لەبارەوە کرد، بەرپرسیارێتیش: قەرزدار دواڵێکراوبێت بە مافێك چونکە بە هەڵبژاردەی خۆی(بە ویستی خۆی) وەفادار نییە پێی و لەسەری ناچار دەکرێت، ئەم سیفەتەش دیسان لەڕووی بوونەوە لە پابەندبوون دواکەوتووە بە دواکەوتنێکی خودی.

بینا لەسەر ئەوە توخمەکانی هەموو شتێك بریتییە لە پایەکان و مەرجەکان و کەرەستە سەرەتاییەکانی، بە سروشت توخمەکانی هەر زاراوەیەکی زانستی لە پێناسە کۆکەرەوە رێگرەکەی وەردەگیرێت.

گەر بگەڕێینەوە بۆ پێناسەی پابەندبوونی دروست دەبینین لەسەر ئەم شەش توخمە رلوەستاوە:

١. سەرچاوەی پابەندکەر[1]: بریتییە لە شەرع لە پابەندبوونە شەرعییەکاندا، و یاسا لە پابەندبوونە یاساییەکاندا، و عورف لە پابەندبوونە باوەکاندا.

٢. پابەندبوو: بریتییە لە کەسێکی دلوالێکراو یان شانژێرخەر یان قەرزدار، لەوانەیە کەسایەتییەکی مەعنەوی بێت وەك پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان.

٣. بۆپابەندبوو: بریتییە لە بۆدلواکراو یان قەرزدەر یان خاوەن ماف.

٤. تیاپابەندبوو: ئەمەش بریتییە لە بابەتی پابەندبوون، دەبێتە جێگەی گرێبەست لە پابەندبوونە گرێبەستییەکاندا.

٥. پێپابەندبوو: بریتییە لە جێگەی پابەندبوون، واتە پێهەستانی ئەرێیی(کردار) لە واجبەکاندا و نەرێیی(خۆگرتنەوە) لە قەدەغەکراوەکاندا.

٦. هۆی پابەندبوون: ئەوەش بریتییە لە تاوتوێکردن(هەڵسوکەوت)ی شەرعی(یان یاسایی)، و رووداوی شەرعی(یان یاسایی)، ئەم هۆیەیە زانایانی یاسا بە سەرچاوەی پابەندبوون ناوی دەبەن، ئەم ناولێنانە بە ترازووی مەنتق و فەلسەفەی یاسا هەڵەیە، وەك چۆن لە کاتی خۆیدا باسی لەبارەوە دەکەین.

---

[1] گەر توخمی پابەندبوون لە پابەندبوون دابڕنرێت ئەوا پابەندبوون بەهای هونەری خۆی و ئامـاژەی یاسـایی خـۆی لەدەسـت دەدات ئـەوکات بـەکارهێنانی وشـەی پابەنـدبوون دەبێتـە هەڵەیـەکی ئاشکرا. مجلة القانون والاقتصاد ٣٤ و ٤ س ١٩٧١ جامعة القاهرة.

## سروشتی پابەندبوون لە یاسادا:

لە سروشتی پابەندبووندا دوو مەزهەب كێبەركێ دەكەن:

١- مەزهەبی تاكەكەسی كە پەیوەندی راوەستاو لە نێوان "دوو لای پابەندبوون"دا بەهەند وەردەگرێت، بەبێ پێدانی رۆڵ بە بابەتەكەی.

٢- مەزهەبی مادی كە لای "بابەتی پابەندبوون" زاڵ دەكات بەسەر لای تاكەكەسیدا.

بەری جیاوازی ئەوەیە مەزهەبی تاكەكەسی قەرزدەر سەرپشك دەكات بە دەسەلاتێك كە بەهۆیەوە مافێكی پێشینەی هەیە بۆ بە كۆیلەكردنی كەسی قەرزدار و فرۆشتنی كەسەكە بەرانبەر بە قەرزەكەی كە نەیتوانیوە بیگێرێتەوە، پاشان گۆڕا بۆ مافی بەندكردن، پاشان بۆ مافی جێبەجێ كردنی ناچاری لەسەر ماڵی كەسی قەرزدار گەر بە هەڵبژاردنی خۆی جێبەجێی نەكرد، لە كاتێكدا مەزهەبی مادی كەسی قەرزدەر بە دەسەلاتی جێبەجێ كردن لەسەر ماڵی قەرزدار سەرپشك دەكات و هەموو ماڵ و دارایی كەسی قەرزدار بە دەستەبەرێكی گشتی دادەنێت بۆ كەسی قەرزدەر.

سەرباری ئەوە كاركردن بەپێی مەزهەبی تاكەكەسی دڵوای بوونی بۆپابەندبوو دەكات لە كاتی سەرهەڵدانی پابەندبوونەكەدا، بە پێچەوانەی ئەوەوە لە مەزهەبی مادیدا.

## سروشتی پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا:

بریتییە لە خاوەن سیفەتێكی دوولایەنە، و سروشتێكی میانەگیری هەیە و میانەگیری دەكات لە نێوان دوو مەزهەبە ئاماژەبۆكراوەكەدا لە یاسای دانراودا، بۆیە پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا سیمایەكی تاكەكەسی هەیە لەڕووی سەرهەڵدانەوە و سیمایەكی مادی هەیە لەڕووی جێبەجێ كردنەوە، قورئان ئاماژەی

بە لای یەکەم کردووە لەم ئایەتەدا: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾[1]، هەروەها ئاماژەی بە لای دووەم کردووە لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[2].

لەسەر ئەم سروشتە دوولایەنییە هەندێ ئاسەوار سەرهەڵدەدەن:

١- دروستە بۆپابەندبوو نەبوو یان نادیار بێت لە کاتی سەرهەڵدانی پابەندبوونەکەدا سەرنج بە ئەنگێزە مادییەکەی.

٢- دروست نییە قەرزداری دەستەوسان بە گێڕانەوەی قەرزەکە بەند بکرێت، چونکە دەسەڵاتی قەرزدەر تەنها بەسەر ماڵی کەسەکەدایە کە دەبێتە دەستەبەرکەر بۆ قەرزەکەی نەك خودی کەسەکە.

٣- دروستە قەرزدار بەند بکرێت کاتێك نەیویست وەفا بە پابەندبوونی قەرزەکەی بکات سەرەڕای توانا و دەسەڵاتی بە گێڕانەوەی قەرزەکە و نەبوونی پاساوێکی شەرعی تاکو ئەو نەگێڕانەوەیە پاساو بدات.

**پلانی باسەکە:**

دوای ئەم پێشەکییە دابەش کردنی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە لەڕووی شێوەوە بۆ شەش بەش دابەش دەبێت، یەکەم سەرچاوەی پابەندکەر، دووەم پابەندبوو، سێیەم بۆپابەندبوو، چوارەم تیاپابەندبوو، پێنجەم پێ پابەندبوو، شەشەم هۆی پابەندبوون.

---

[1] الإسراء : ١٣

[2] البقرة : ٢٨٠

# بەشی یەکەم

## سەرچاوەی پابەندکەر

ئەم بەشە دوو بابەتی گرنگ لەخۆ دەگرێت، ئەو دوانەش:

یەکەم: پێشکەوتنی مێژوویی بۆ سەرچاوەکانی پابەندبوون.

دووەم: تێکەڵی لە نێوان هۆی پابەندبوون و سەرچاوەکەی.

بۆ لێکۆڵینەوەی هەر یەکێك لەو دوانە باسێکی سەربەخۆ تایبەت کراوە.

# باسی یەکەم:
# پێشکەوتنی مێژوویی
# بۆ سەرچاوەکانی پابەندبوون

## (التطور التاريخي لمصادر الالتزام)

لەڕووی زمانەوانییەوە وشەی "المصدر": مانای "چاوگە"ی هەیە، سەرچاوەی ئاو بریتییە لە چاوگەی ئاوەکە، بۆیە وشەی "المصدر"ناوی شوێنە.

"المصدر–چاوگ" لە زانستی صەرفدا ئەو وشەیە کە فرمانەکان و سیفەتەکانی لێوە دادەتاشرێت، وەك فرمانی رابردوو و رانەبردوو، و ناوی بکەر و ناوی بەرکار، و پلەی بەراورد و پلەی بالاّ، هەر هەموو ئەمانە لە وشەیەك دادەتاشرێن کە مادە و پیتە بنەڕەتییەکانیان لەو وشەیەوەیە پێی دەوترێت"چاوگ"، وشەی "العلم" بۆ نموونە، دەبێتە چاوگ بۆ ئەم داتاشراوانە لە وشەکە "عَلِم، يعلم، عالم، معلوم، عليم، علامة"، ئەمە و هاوشێوەکانی ئەمانە.

"المصدر" لە زاراوەی شەرعیدا بریتییە لە بەڵگەی شەرعی یان ئەوەی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت، بۆیە سەرچاوەکانی پابەندبوونە شەرعییەکان بریتییە لە شەرع، هەر بەو جۆرە سەرچاوەکانی پابەندبوونە یاساییەکان بریتییە لە یاسا.

"المصدر" لە شەریعەتی ئیسلامدا یان سەرپێهەڵدەر(دروستکەر)ی حوکمەکانە کە بریتییە لە قورئان، یان رۆشنکەرەوەی حوکمەکانە کە بریتییە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر، یان پەردەلادەرە لەسەریان کە "إجماع و قياس و عرف و مصلحة و إستحسان و سد الذرائع و إستصحاب" و سەرچاوە پاشکۆ دەرخەرەکانی تر دەگرێتەوە.

بەکارهێنانی "المصدر" لە یاسای دانراو و فیقهی یاساییدا بۆ گرێبەست و ویستی یەکلایەنە و کرداری زیانبەخش و کرداری بەسوود تەنها لە رێگەی مەجازەوە دروستە، پەیوەندی مەجازی ئەوەیە یاسا هێزێکی پابەندکەری بەو هۆیانە بەخشیوە، سەرەڕای ئەوە سەرچاوە نەرێتییەکان لە زۆربەی یاسا هاوچەرخەکاندا بریتین لە گرێبەست و ویستی یەکلایەنە و کاری زیانبەخش(یان کاری ناڕەوا) و بەدەستهێنان بەبێ هۆ(دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) و یاسا، بینا لەسەر ئەوە بە شێوەیەکی پوخت و کورت پێشکەوتنی مێژوویی ئەو سەرچاولنە دەخەمە ڕوو، پاشان ڕۆشنی دەکەمەوە ناونانیان بە "المصدر"–بەهەڵوارد‌ەی یاسا– لەڕووی زاراوەیی و زمانەوانی و یاسایی و فەلسەفییەوە نادروستە، مەگەر تەنها ناولێنانێکی مەجازی بێت.

سەرچاوەکانی پابەندبوون بەم پێشکەوتنانەدا تێپەڕیون:

**أ– لە یاسای رۆماندا ئەم پێشکەوتن و گۆڕانانە هاتنە ئاراوە:**

١–لە سەردەمی فێرگەییدا سەرچاوەکانی پابەندبوون تەنها لە گرێبەست (لە گرێبەستگەلێکی دیاریکراودا) و تاوان(تاوانگەلێکی دیاریکراو)دا کورت بووبوویەوە، سەرباری ئەوەی پێی دەوترا سەرچاوەکانی تر(یان سەرچاوەی جۆرلوجۆر).

٢–لەسەردەمی زانستیدا فەقیهی رۆمانی(گایس–Gaius) هەستا بە دیاریکردن و درێژەپێدان(ڕۆشنکردنەوە)ی ئەوەی لەسەردەمی فێرگەییدا پێی دەوترا"سەرچاوەکانی تر"(سەرچاوە جۆرلوجۆرەکان)، زانای ناوبرلو ئەو زاراوەی گۆڕی بۆ زاراوەی "کاروکردەوەی ناڕەوا" و خستییە پاڵ تاوان، هەروەها"کاروکردەوەی رەوا" و خستە پاڵ گرێبەست، نەك لەڕووی سەرچاوەییەوە، بەڵکو لەڕووی ئاسەوارەوە، ولتە هەستا بە دانانی پابەندبوونە سەرهەڵدراوەکان لە کاروکردەوە ناڕەواکانەوە لە پەنای پابەندبوونە لەدایکبووەکان لە تاوانەکانەوە، لە دیدگای ئەوەوە ئەوانە پابەندبوونێکن کە کەسی قەرزدار پێیانەوە پابەند دەبێت، وەك چۆن پابەند

دەبێت بە تاوانەکەیەوە، دەربارەی پەیوەندی نێوانیان وتی: کارە ناڕەواکان وەك تاوان وان لە نەبوونی رەوایەتیدا و لە سەرپێچەهڵدانی پابەندبوونەکاندا لەسەری لە پێویستبوونی قەرەبووکردنەوە لە زیان، ئەو دوانە(تاوان و کاری ناڕەوا) لە دوو شتدا تەبان: یەکەمیان ناڕەوایەتی، دووەمیان پێویستبوونی قەرەبووکردنەوە لە زیانی سەرهەڵدراو لە هەردووکیانەوە، بەڵام بە دوو جیاوازی لەیەکتر جیاوازن: یەکەمیان، نەبوونی مەرامی زیانی فەراهەمهاتوو بە کەسانی تر لە کاروکردەوە ناڕەواکاندا و بوونی ئەو مەرامە لە تاوانەکاندا، دووەم، تاوانەکان سەرچاوەی پابەندبوونی راستەقینەن بە پێچەوانەی کاروکردەوە ناڕەواکانەوە، چونکە لە واقیعدا تاوان نین بەهۆی دواکەوتنی توخمی مەرامی خراپ(مەرامی تاوانکارانە).

کاروکردەوە رەواکانیشی لەپاڵ گرێبەستەکاندا دانا، نەك لەڕووی سەرچاوەییەوە بەڵکو لەڕووی ئاسەوارەوە، هەروەها لەڕووی ئەوەی پابەندبوونە سەرهەڵدراوەکان لە هەردووکیانەوە بە مردن بەرنابنەوە(کۆتاییان پێ نایەت)، بەڵکو دەگوێزرێنەوە بۆ میراتگران یان لێجێماو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش وەك گرێبەستەکان نین لە سەرچاوە راستەقینەکان، بەهۆی نەبوونی ویستی ئاراستەکراو بۆ سەرپێچەهڵدانی ئاسەوار کە یاسا شانی لەسەر دابدات(بایەخی پێ بدات)، لە کاروکردەوە رەواکاندا بەیەکترگەیشتنی دوو ویست و تەباییان فەراهەم نابن وەك لە گرێبەستەکاندا بوونی هەیە، بەڵام قەرزدار لە کاروکردەوە رەواکاندا پابەندە وەك چۆن لە گرێبەستەکاندا پابەندە، بینا لەسەر ئەوە "گایس" سەرچاوەی نوێی نەهێنا، بەڵکو گوزارەی "هۆیە جۆرلوجۆرەکانی تر"ی گۆڕی بە "کاروکردەوەی رەوا و کاروکردەوەی ناڕەوا".

٣-سەردەمی خاوەن حاشییەکان(پەراوێزەکان): لەم سەردەمەدا دوو پێشکەوتن روویدا، یەکەمیان پێشکەوتنێکی گوزارەیی و دووەمیان

پێشكەوتنێكی راستەقینە، پێشكەوتنە گوزارەییەكە بریتی بوو لە بەكارهێنانی زاراوەی "پاشكۆی گرێبەست" لە جێگەی "كاروكردەوەی رەوا"، هەروەها بەكارهێنانی "پاشكۆی تاوان" لە جێگەی كاروكردەوەی ناڕەوا.

پێشكەوتنە راستەقینەكەش بریتی بوو لە خستنە سەری بەشێكی تایبەت كە پێشتر پێی دەوترا"هۆیە پەرشوبلاوەكانی تر" واتە گێڕانەوەی دۆخەكە بۆ ئەوەی پێشتر لەسەری بوو لە لێڵی و تەمومژ تایبەت بەو خستنە سەرە، ئەم پێشكەوتنە بەهۆی فێرگەی "بارتۆلی"ەوە روویدا كە گیانی شیكردنەوەی مەنتقیانەی هەڵگرتبوو، "بارتۆل" سەركردەی ئەم فێرگە بوو وای بۆ دەچوو "پاشكۆی گرێبەست" لەسەر ویستێكی رەها بینا نەكراوە(نە ویستی راستەقینە و نە ویستی گریمانەیی) بەڵكو لەسەر ویستێكی ئەندێشەیی بیناكراوە كە یاسا خولقاندوویەتی، لەدوای ئەم پێشكەوتنە هەنگاوێك نرا بەرەو نزیككردنەوەی "پاشكۆی گرێبەست" لە گرێبەست لەسەر ئەو بنچینەی كە "پاشكۆی گرێبەست" كارێكی رەوایە وەك گرێبەست، بۆیە لە دوو رووەوە لێی نزیك دەبێتەوە:

یەكەمیان: هەردووكیان كاری رەوان.

دووەمیان: هەردووكیان لەسەر ویست بیناكراون، بەڵام لە گرێبەستدا ویستی راستەقینەیە و لە پاشكۆكەیدا ویستی گریمانەییە.

ب– ئەو پێشكەوتنەی لە یاسای فەرەنسیدا روویدا:

لە یاسای فەرەنسی كۆندا رێكخستنەكەی "گایس" گوازرابوویەوە بۆ تۆماركراوەكەی "جستنیان" لەوێشەوە بۆ یاسای فەرەنسی كۆن، پاشان "بوتییە" هات و سەرچاوەكانی پابەندبوونی بە پێنج دانا: گرێبەست، نیمچە گرێبەست، تاوان، نیمچە تاوان، یاسا، ئەم رێكخستنە پێنجییە گوازرایەوە بۆ یاسای "ناپلیۆن"

پاشان "بلانیول" هات و رەخنەی لە رێکخستنە پێنجییەکەی "بوتییە" گرت کە یاسای ناپلیۆن وەریگرتبوو، بۆیە وتی: ئەو دابەشبوونە وردەکاری تێدا نییە و لە دوو رووەوە لە مەنتق دوورە:

یەکەمیان: دابەش کردنی "کاری ناڕەوا" لەو سۆنگەیەوە کە سەرچاوەی پابەندبوونە بۆ تاوان و نیمچە تاوان لەسەر بنچینەی فەراهەمبوونی نیێتی خراپ(مەرامی گەیاندنی زیان بە کەسانی تر) لە تاواندا و فەراهەم نەبوونی لە نیمچە تاواندا هیچ جۆرە گرنگییەکی نییە نە لەڕووی سەرهەڵدانی پابەندبوونەوە و نە لە ڕووی ئاسەوارەوە(قەرەبووکردنەوە)، چونکە هەردووکیان پابەندبوون دەخولقێنن لەسەر بکەری کارێکی ناڕەوا یان قەرەبووکردنەوە پێویست دەکەن بۆ کەسی زیانپێگەیو بەبێ هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا، بۆیە هیچ ڕوویەك بوونی نییە بیانکات بە دوو سەرچاوەی سەربەخۆ.

دووەمیان: گوزارەی "نیمچە گرێبەست" گوزارەیەکی سەرلێتێکدەرە، چونکە ئەو قسەی گوایە لە گرێبەستەوە نزیکە بەوەی هەردووکیان کارێکی بەویستن و دوورن لە تاوان و نیمچە تاوان، لەو رووەوە کە کارێکی رەوایە پێچەوانەی راستەقینە و واقیعە، بەڵکو واقیع پێچەوانەی ئەوەیە، چونکە نیمچە گرێبەست دوورە لە گرێبەست لەبەر ئەوەی بۆ قەرزداری پابەندبوو کارێکی نەویستە، و نزیکە لە تاوان و نیمچە تاوان، چونکە کارێکی ناڕەوایە لە قەرزدارەوە، ئەوەی کە کارێکی نەویستە لەبەر ئەوەیە سەرەڕای ویستی کەسی پابەندبوو سەرهەڵدەدات، بۆیە تیایدا لێوەشاوەیی دامەزرانی داواکراو لە سەرهەڵدانی گرێبەستدا بە مەرج ناگیرێت، لێوەشاوەیی لە گرێبەستدا بە مەرج دەگیرێت، چونکە پابەندبوون لە ویستی کەسی پابەندبووەوە سەرهەڵدەدات، بۆ نموونە، هەر کەس لەسەر زەوی کەسێکی تر یان لەسەر کێڵگەی کەسێکی تر بەبێ مۆڵەتی ئەو بینایەکی دروست کرد، لەسەر ئەو خاوەن زەوییە پێویستە —

کاتێك زەوییەکەی وەردەگرێتەوە– قەرەبووی ئەو شتانە بکاتەوە کە لە زەوییەکەدا سەریهەڵداوە لە بینا و کێڵگە و هاوشێوەکانیان، بینا لەسەر ئەوە سەرچاوەی پابەندبوون بریتییە لە دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ)، بۆیە سەرچاوەی پابەندبوون سیفەتێکی لکاوە بە قەرزدارەوە، چونکە کەسێك پابەند ناکرێت بەوەی کەسانی تر ئەنجامیانداوە.

ئەوەش کە کارێکی ناڕەوایە یان نزیکە لە تاوان یان لە نیمچە تاوان، چونکە کەسی فزولی سەرەڕای ئەوەی لە بنەڕەتەوە کارەکەی ڕەوایە، بەڵام لەڕووی سەرئەنجامەوە دەگۆڕێت بۆ کارێکی ناڕەوا، چونکە سەرچاوەی پابەندبوون کاری قەرزدەر نییە، بەڵکو دەوڵەمەندکردنی قەرزدارە بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ)، بۆ ڕۆشنکردنەوەی زیاتر، هەر کەس قەرزی کەسێکی تر بداتەوە بە کارێکی ڕەوا هەستاوە، بەڵام گەر کەسی قەرزدار نەیویست ئەوە بگێڕێتەوە کە کەسەکە(کەسە فزولییەکە) بۆ ئەوی داوە دوای گەڕانەوە بۆ سەری، ئەو خۆگرتنەوە و نەدانە بە کارێکی ناڕەوا سەرژمێر دەکرێت.

"بلانیۆل" لەسەر ئەم شیکردنەوە زانستی و مەنتقییە قسەکەی خۆی بینا کردووە کە دەڵێت: سەرچاوەی پابەندبوون تەنها دوانن، ئەو دوانەش بریتین لە گرێبەست و یاسا، چونکە ئەو پابەندبوونانەی لەسەر نیمچە گرێبەست و تاوان و نیمچە تاوان سەرهەڵدەدەن پابەندبوونی سزایین و لەسەر تێکدانی پابەندبوونە یاساییەکان ڕاستبوونەتەوە، بۆیە سەریکێشاوە بۆ پابەندبوونی مەدەنی سزایی و لەسەر بنچینەی تێکدانی پابەندبوونە یاساییەکان ڕاستبووەتەوە و سەریکێشاوە بۆ پابەندبوونی مەدەنی بە پێدانی قەرەبووکردنەوە بۆ کەسی زیانپێکەیو، سەرجەم پابەندبوونە ناگرێبەستییەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بۆ یاسا دەگەڕێنەوە، لە نیمچە گرێبەستدا کەسێك لەسەر گیرفانی کەسێکی تر دەوڵەمەند دەبێت، ئەوەش پابەندبوونی یاسایی تێکدەدات کە پێویستە

لەسەری بەبێ ماف لەسەر گیرفانی کەسێکی تر دەوڵەمەند نەبێت، لەم تێکچوونەوە(لەم کەمتەرخەمییەوە) پابەندبوونی سزایی سەرهەڵدەدات کە بریتییە لە گێڕانەوەی ئەوەی پێی دەوڵەمەند بووە یان هاوجێی ئەوە.

لە نیمچە تاواندا کەسێك بە ئەنقەست یان بە هەڵە زیان بە کەسێکی تر دەگەیەنێت و کەمتەرخەمی دەکات بەرانبەر پابەندبوونی یاسایی خۆی، پابەندبوونی یاسایی ئەوەیە نە بە ئەنقەست نە بە هەڵە زیان بە کەسانی تر نەگەیەنێت، لەم تێکدانەوە(لەم کەمتەرخەمییەوە) پابەندبوونی سزایی سەرهەڵدەدات کە بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی دروستی کردووە.

لە تاوانیشدا تاوانبار بە کارە تاوانکارییەکەی زیانێك دروست دەکات و پابەندبوونی یاسایی تێکدەدات، ئەوەش دەستدرێژی نەکردنە بۆ سەر مافی کەسانی تر، بۆیە پێویستە لەسەری قەرەبووی زیانە داراییەکە بکاتەوە سەرباری سزای تاوانەکە[1].

## سەرچاوەکانی پابەندبوون لە یاسا هاوچەرخەکاندا:

لە یاسا هاوچەرخەکاندا وەك یاسای وڵاتانی عەرەبی کاریگەر بوو بە یاسا لاتینییەکان، وەك یاسای سویسری و ئیتالی، سەرچاوەکانی پابەندبوون پێنجن: گرێبەست، ویستی یەکلایەنە، کاری ناڕەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ(دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) و یاسا.

لەو یاسانەی کە ئەم دابەشبوونە پێنجییەی وەرگرتووە یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاوە[2]، کاریگەریوو بە یاسای میسری، پرۆژە یاسای عێراقی دەروازەی تایبەت کردووە بەم سەرچاوانە و بۆ پێنج بەش دابەشی کردوون، بەشی یەکەمی تەنها کردۆتەوە بە رۆشنکردنەوەی حوکمەکانی گرێبەست(ئەو حوکمانەی کە

---

[1] يُنظر الوسيط للسنهوري ١/١٣١–١٣٧.

[2] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

سەرچاوەكانیان گرێبەستە) لە بەشی دووەمدا ویستی یەكلایەنە دەست بۆ دەبات، لە بەشی سێیەمدا حوكمەكانی پابەندبوون سەرهەڵدراو لە كاری ناڕەوا ڕۆشن دەكاتەوە، لە بەشی چوارەمدا باس لە بەدەستهێنان بەبێ هۆ دەكات لەڕووی سەرچاوەی پابەندبوونەوە، لە بەشی پێنجەم و كۆتاییدا باس لە یاسا دەكات.

**ڕاستكردنەوەی ئەم دابەشكردنە:**

ئەم تێبینییانە ئاراستەی ئەو دابەشكردنە دەكرێت:

یەكەم: دابەشكردنێكە لەسەر پێوەرێكی ورد بینا نەكراوە، چونكە هەر دابەشكردنێك یان ئەقڵییە یان خوێندنەوەیی و پشكنینی واقیعە.

دابەشكردنی ئەقڵی لە نێوان ئەرێ و ئەرێدا دەسوڕێتەوە، هەر دابەش كردنێك لەسەر ئەم بنچینەیە بێت دەبێت بە دابەشكردنێكی كۆكەرەوەی ڕێگر، بۆ نموونە دابەشكردنی "وشە" لەلایەن زانایانی نەحو(ڕێزمان)ەوە، كە دەڵێن: وشە یان سەربەخۆیە لە ئاماژەی بۆ سەر مانا یان سەربەخۆ نییە، دووەمیان بریتییە لە پیت(ئامراز)، یەكەمیان یان یەكێك لە سێ كاتە(ڕابردوو، ڕانەبردوو، داهاتوو) دەگرێتە خۆ، یان نایگرێتە خۆ، دووەمیان ناوە و یەكەمیان فرمانە.

دابەشكردنی خوێندنەوەیی و پشكنینی واقیع: بریتییە لە لێكۆڵینەوەیەكی مەیدانی بۆ بەشەكییەكان تاكو بگەین بە هەمووەكییەكان، ئەوەش یان تەواوە یان ناتەواو، "تەواو" بریتییە لە خوێندنەوە و پشكنینی هەموو بەشەكییەكان بۆ گەیشتن بە هەمووەكی كە ئەو بەشەكییانە لەژێریدا جێگەی دەبێتەوە، ئەوەش یەقین دەبەخشێت، وەك لە ئایەتی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾، ناتەواویش بریتییە لە خوێندنەوە و پشكنینی زۆربەی بەشەكییەكان بۆ گەیشتن بە هەمووەكی كە بەشەكییەكانی لەژێردا جێدەبێتەوە، ئەمەیان گومان دەبەخشێت، وەك: هۆی هەموو تاوانێك ئابوورییە.

دابەشکردنی پێنجینەی ئامازەبۆکراو لەسەر یەکێك لەو سێ پێوەرە ناوبراوانە ئەقڵ و پشکنینی تەواو و ناتەواو بینانەکراوە، بەڵکو تەنها دابەشکردنێکی نەریتییانەیە.

دووەم: زاراوەی دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆیەکی هاتوو لە دووتوێی ئەم سەرچاوانەدا لە هەندێ یاسادا وەك یاسای میسری(الفصل الرابع– إثراء بلا سبب (م/١٧٩) و(م/١٨٠) دەربڕینێکی ورد نییە، چونکە کاتێك دەبێتە سەرچاوە کە سێ پایەی بۆ فەراهەم هاتبێت:

١. دەوڵەمەندبوونی کەسێك کە قەرزدارە لەسەر گیرفانی کەسێکی تر.
٢. هەژاری کەسێکی تر کە قەرزبەخشە.
٣. نەبوونی هۆیەکی شەرعی بۆ هەریەکێك لە دەوڵەمەندبوون و هەژاربوون، بەوەی دەوڵەمەندبوون لەسەر هەژاری سەریهەڵدابێت بەبێ پاساوێك.

ئەم زاراوەیە گەر بە زمانی دایکی خۆی(زمانە بێگانەکە) ورد و لەجێ بێت ئەوا لە زمانی عەرەبیدا ورد و گونجاو نییە، چونکە هەر کەس ماڵێك بەدەست بهێنێت یان مافی کەسێکی تر بەدەست بهێنێت با بێبایەخیش بێت و بەها و هێزی کڕین و فرۆشتنی زۆر کەم بێت پێویستە لەسەری بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنە شەرعییەکەی با نەشبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی و هەژاربوونی خاوەن ماڵەکە یان خاوەن مافەکە، یاسادانەری عێراقی لەو زاراوە ئامازەبۆکراوەدا هەستی بەم نەنگییە کردووە، بۆیە پشتگوێی خستووە و گوزارەی "بەدەستهێنان بەبێ هۆ"ی بۆ بەکارهێناوە لە بەشی چوارەمی دەروازەی یەکەم لە یاسای مەدەنی جێبەجێکار بەوەش کارێکی پەسەندی ئەنجامداوە.

سێیەم: کاری ناڕەوا لە ڕێکخستنی نەریتی باسکراودا بە سەرچاوەی پابەندبوون دادەنرێت گەر سێ پایەی تێدا بەدیبێت، ئەو سیانەش: "هەڵە و زیان و پەیوەندی هۆگەرایی"ن، لەکاتێکدا کاری ناڕەوا ڕەگەزێکە لە ڕەگەزەکانی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی، هەڵەیەك نییە کە بریتییە لە کەمتەرخەمی

بەرانبەر ئەركێكی یاسایی لەگەڵ ئاگاهی كەسی كەمتەرخەم بە كەمتەرخەمییەكەی، بۆیە توخمەكانی بەرپرسیارێتی كەمتەرخەمی= (كاری ناڕەوا+ زیان+ پەیوەندی هۆكارایی)، كاری ناڕەوا هەندێ جار لەگەڵ هەڵە كردەبنەوە، لەولەنەش ناڕەوابێت بەبێ هەڵە، وەك تیابردن بەهۆی كەسێكەوە كە لێوەشاوەیی نییە، هەر بەو جۆرە كاری ناڕەوا لە سیفەتی ناڕەوابوون دانارێنرێت، بەهۆی ئەوەی كە بكەرەكەی شێت بێت یان منداڵ یان جیانەكرەوە یان كەسانێك لە حوكمی ئەوانەدا بن.

چوارەم: ئەم پێنج توخمە نەرێتییە بۆ سێ سەرچاوە دەگەڕێتەوە گەر بە سەرچاوەوەمان دانان لە زمانی یاسادا، ئەو سیانەش بریتین لە: هەڵسوكەوتی یاسایی و ڕوودلوی یاسایی و یاسا، چونكە هەر سەرچاوەیەك—جگە لە یاسا— یان هەڵسوكەوتی یاساییە یان ڕوودلوی یاسایی، ئەوەش لەبەرئەوەی گەر ویستی مرۆڤ ڕۆڵێكی هەبێت لە ڕوودانی بەوەی لەو ویستەوە سەریهەڵدابێت و ویستی بۆ ڕوودانی ئاراستەكردبێت بەجۆرێك یاسا ئەسەری لەسەر ڕێكدەخات ئەوە هەڵسوكەوتی یاساییە، گەر ویستی كەسەكە دەستێوەردانی نەبوو لە ڕوودانی ئەوەدا ئەوا ڕوودلوی یاساییە جا لە هەڵسوكەوتی مرۆڤەوە سەریهەڵدابێت وەك ڕوودلوەكانی ئۆتۆمبێل یان سروشتی بێت و سروشت سەرچاوەی ڕوودانەكەی بێت.

ئەم هەڵە باسكراوانە و هیتریش لەناو ئەو سەرچاوە نەرێتییانەدان، لەلایەن فەقیهان و شرۆڤەكارانی یاساوە هەوڵێكی هاوچەرخ دراوە بۆ ڕاستكردنەوەیان، هەیانە تەنها لە دوو سەرچاوەدا كورتی دەكاتەوە(هەڵسوكەوتی یاسایی و ڕوودلوی یاسایی)[1]، هەشیانە لە سێ سەرچاوەدا كورتی دەكاتەوە(یاسا، هەڵسوكەوتی یاسایی، و ڕوودلوی یاسایی).

---

[1] وەك مامۆستای بەڕێز دكتۆر حسن الذنون، النظرية العامة للالتزامات. ص٢٥.

خوالێخۆش بوو "السنهوري" سەرکردایەتی ئاراستەی یەکەم دەکات و لە کتێبەکەیدا(مصادر الحق في الفقه الإسلامي)[1] دەڵێت: هەڵسوکەوتی یاسایی ویستێکی رووتە ئاراستە دەبێت بۆ رووداني ئەسەرێکی یاسایی دیاریکراو کە یاسا رێکی دەخات، وەك فرۆشتن و بەخشین، رووداوی یاساییش کارێکی مادییە بە ویستی مرۆڤ یان بە ناویستی روودەدات و یاسا ئەسەرێکی یاسایی دیاریکراوی لەسەر رێکدەخات، بۆ نموونە رووداوێکی هەڵبژاردەیی(کاری ناڕەوا و لایەنگری) و نموونەی رووداوی ناهەڵبژاردەییش وەك لەدایکبوون و مردن.

پاشان دەڵێت[2]: ئەوەی لە کۆتاییدا دەیگەیەنێ لە کۆی ئەوەی پێشکەشکرا سەرچاوەکانی ماف لە فیقهی ئیسلامیدا هەروەك ئەوەی لە فیقهی خۆرئاواییدایە لە دوو سەرچاوە تێناپەڕێت: هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاسایی[3].

لەکاتێکدا لە کتێبەکەیدا بە ناوی "الوسيط" ئیجتیهادێکی تری خوالێخۆش بوو "السنهوري" دەبینین، لەوێ پێیوایە سەرچاوەکانی پابەندبوون بریتین لە رووداوەکان لە ئاشکرادا و یاسا و واقیع، بۆیە دەڵێ: "لەوەوە دەبینین رووداوەکان بریتین لە سەرچاوەی پەیوەندییە یاساییەکان، رووداوەکان یان سروشتین یان هەڵبژاردەیین: رووداوە هەڵبژاردەییەکان یان کاروکردەوەی مادین یان کاروکردەوەی یاسایین، کاروکردەوە یاساییەکان یان تەنها لە یەك لایەنەوە دەرچوون یان لە دوو لایەنەوە،

---

[1] ٦٦/١.

[2] المرجع السابق/ ٦٩/١.

[3] هەروەها دەڵێت: "ئەوەی جیاکاری دەکات لە نێوان هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاسایی بە جیارکردنەوەیەکی قبوڵکراو، لە فیقهی ئیسلامیدا فەقیهەکان لە زۆربەی بۆنەکاندا جیاکاری دەکەن لە نێوان هەڵسوکەوتی گوتاری(ئەمەیان بریتییە لە هەڵسوکەوتی یاسایی) و هەڵسوکەوتی کرداری(ئەمەیان بریتین لە رووداوە یاساییەکان)، بە هەمان شێوە جیاکاری دەکەن لە نێوان دەستەبەری گرێبەست(ئەمە بریتییە لە بەرپرسیارێتی گرێبەستی) لەگەڵ دەستەبەری کردار(ئەمەش بریتییە لە دەستەبەری ناگرێبەستی)"

یاسا لەپشتی هەموو ئەمانەوە ئابلۆقەدەرە، بۆیە یاسایە ئاسەواری یاسایی دیاری دەكات كە لەسەر هەموو رووداوەكان و كاروكردەوەكان سەرهەڵدەدەن"

هەڵسوكەوتی یاسایی بە هەردوو جۆرەكەیەوە(گرێبەست و ویستی یەكلایەنە)گێڕایەوە بۆ ئەوەی پێی دەوترێت كاروبارە یاساییەكان.

ئەم هەوڵە لە مامۆستا و زانای مەزنەوە "السنهوري" بە هەنگاوێكی بوێرانەی پێشكەوتووی زانستی ورد دادەنرێت، چونكە بە باوەڕی من یەكەمین كەسە لە جیهانی عەرەبیدا هەستی كردووە بە نەنگییەكانی سەرچاوە نەریتییە باوەكان لە یاساكانی جیهانی عەرەبیدا، بۆیە سەرۆكایەتی بیری گەشەپێدانی دەكات بەپێی ئەوەی ئێستا باسمان كرد، سەرباری ئەوەش ئەوەی پێگەیشتووە لە چەندین رووەوە لەم تێبینییانە خاڵی نییە:

١–ئەو كاریگەربووە بە فیقهی ئیسلامی، پێویست بوو ئەو كاریگەربوونە بە جۆرێك بوایە سەری بكێشابایە بۆ شوێنكەوتنی كاری فەقیهە موسڵمانەكان لەوەی پەیوەستە بە هەڵسوكەوتی یاساییەوە، ئەوان پێناسەی هەڵسوكەوتی یاساییان كردووە بەوەی بریتییە لە هەرشتێك لە مرۆڤ دەوەشێتەوە لە قسە و كردار بە ویستێكی ئازادانەی پەیبەر بە جۆرێك شەرع(یان یاسا) ئەسەری لەسەر رێكبخات.

لە كاتێكدا سەرەڕای كاریگەربوونی بەم فیقهە مەزنە نەیتوانیوە دەربچێت لە پێناسەی نەریتی هەڵە بۆ هەڵسوكەوتی یاسایی، بەوەی بریتییە لە ئاراستەبوونی ویست بەرەو دروستكردن و روودانی ئەسەرێك كە یاسا گرنگی پێدەدات، ئەوەی ئاشكرایە ئەوەیە ئەم پێناسەیە عەیبدارە بە پێوەری مەنتقی لەم بارانەی لای خوارەوە:

أ.هەڵسوكەوت بریتی نییە لە ئاراستەگری ویست، بەڵكو بریتییە لە بەر و ئەنجامی ئەو ئاراستەگرییە، هەر بەو جۆرە بریتی نییە لە ویستێكی رووت(پەتی) بەپێی گوزارەكەی ئەو، چونكە هەڵسوكەوتی یاسایی

ئەنجامی توانای مرۆڤە لەسەر هەستان یان هەڵنەستان بەوەی دەیەوێت، توانای مرۆڤ شوێنی ویستی مرۆڤ دەکەوێت، و ویستی مرۆڤیش شوێنی پەیبردنی مرۆڤ دەکەوێت، بینا لەسەر ئەوە هەڵسوکەوتی یاسایی بریتی نییە لە ویستێکی پەتی و ئاراستەگیری ئەو ویستە، بەڵکو بریتییە لە ئەنجام و ئەسەری ئاراستەگری ویستەکە.

ب-کارە بە ویستەکان کە لە کتێبی "الوسیط"دا ناوی ناون کارە مادییەکان جۆرێکن لە هەڵسوکەوتی شەرعی یان یاسایی، چونکە هەڵسوکەوت وەك چۆن فەقیهە موسڵمانەکان پێناسەیان کردووە، بریتییە لە هەر شتێك کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە لە قسە و کردار بە ویستێکی ئازادی پەیبەر و شەرع یان یاسا ئەسەرێکیان لەسەر رێکدەخات جا کارەکە رەوا بێت وەك لە کاری بەسوودا یان نارەوا بێت وەك لە کاری زیانبەخشدا، یەکسانە قەرەبووکردنەوە پێویست بکات وەك تیابردنەکان یان سزا پێویست بکات وەك تاوانەکان، دانانی ئەم کاروکردەوە بەویستانە لە ناو رووداوە یاساییەکاندا تێکەڵییەکە لەنێوان هەڵسوکەوتە کردارییەکاندا کە لە ویستی مرۆڤ دەوەشێنەوە لەگەڵ رووداوە کردارییەکان کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بەبێ ویستی خۆی.

٢-رووداوە یاساییەکان(یان شەرعییەکان) بریتین لەو رووداوانەی کە بەبێ ویستی مرۆڤ روودەدەن، جا سەرچاوەکەی کاری مرۆڤ بێت وەك هەڵسوکەوتە نەویستەکان لە مرۆڤێکی لێوەشاوە تەولوەوە یان مرۆڤێکی لێوەشاوە ناتەواو، یان لە کەسێکەوە هۆشیاری و پەیبردنی نییە، وەك هەڵەکار و لەبیرکەر و خەوتوو و بێئاگا و بوراوە و منداڵی بچووکی جیانەکەرەوە و شێت و زۆرلێکرلو و ناچار و هاوشێوەکانی ئەمانە.

یان سەرچاوەکەی مرۆڤ نەبێت لە سروشت، جا رووداوەکان مادی بن وەك رووداوەکانی هۆکارەکانی گواستنەوەی وشکانی و ئاسمانی و لافاو و بوومەلەرزە و

نەخۆشی و پەتا و هاوشێوەکانیان، یان مەعنەوی بن وەك نزیکی و خزمایەتی، ئەوە رووداوێکە دەبێتە هۆی میراتبردن، پابەندبوونی خزمی نزیکی دەوڵەمەند بە خەرجکردن لەسەر خزم و کەسوکاری هەژار، هەروەها وەك شێتێتی کە رێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانکارانە و رێگرە لە دروستی هەڵسوکەوتی کەسە شێتەکە.

لەو هەولانەی کە ویستویانە سەرچاوە نەرێتییە پێنجییەکان بگێڕنەوە بۆ دابەشبوونێکی سیانی کە لە یاسا و هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاساییدا خۆی دەنوێنێت ئەوەیە کە لیژنەی ئامادەکردنی دەستووری نوێی مەدەنی عێراقی رێزدار بۆ ساڵی ١٩٨٤—١٩٨٥ لە مادەکانی (٣٠١، ٣٠٢، ٣٠٣، ٣٠٤، ٣٠٥، ٣٠٦) پێیهەستاوە.

لە مادەی (٣٠١)دا بە دەق هاتووە: (سەرچاوەکانی پابەندبوون بریتین لە یاسا و هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاسایی)

مادەی (٣٠٢) یاسای پێناسە کردووە بەوەی: (کۆمەڵێك رێسای یاسایین کە لە دەستەیەکی پسپۆڕ و تایبەتەوە دەردەچێت بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان)

هەر بەو جۆرە مادەی (٣٠٥) هەڵسوکەوتی یاسایی پێناسە دەکات بەوەی(ئاراستەگیری ویست بۆ روودان(سەرپێهەڵدان)ی ئەسەرێك کە یاسا گرنگی پێ دەدات، هەڵسوکەوتی یاسایی گرێبەست و ویستی یەکلایەنە دەگرێتە خۆ.

مادەی (٣٠٦) پێناسەی گرێبەست بەم جۆرە دەکات: (رێکەوتنی دوو ویست یان زیاتر لەسەر سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا گرنگی(بایەخی) پێ دەدات)

ئەوەی خستمانەڕوو لەمەڕ ئەو ئەنجامەی زانای مەزن "السنهوري" پێیگەیشتبوو لە تێبینی باسکراو تایبەت لەمەڕ پێناسەی هەڵسوکەوتی یاسایی و تێکەڵی نێوان هەڵسوکەوتی کرداری بەویست و رووداوی یاسایی بە دانانی یەکەم لەناو دووەمدا لەم پرۆژەیەدا تێبینی دەکرێت.

# باسی دووەم:
# تێکەڵی نێوان
# هۆیەکانی پابەندبوون و سەرچاوەکانیان

ئەوەی یاسای دانراوی هاوچەرخ لەسەری دامەزراوە بە دانانی گرێبەست و ویستی یەکلایەنە و کاری زیانبەخش و کاری سوودبەخش وەك سەرچاوەکانی پابەندبوون جا بە ناوەکانی خۆیان ناونرابن یان هاتبنە ژێر هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاساییەوە یاخود نە، تێکەڵییەکە لە نێوان هۆ و سەرچاوەدا، ئەولنە هۆی پابەندبوونن نەك سەرچاوەی پابەندبوون بن، چونکە سەرچاوە لە پابەندبوونە یاساییەکاندا بریتییە لە یاسا، لە پابەندبوونە شەرعییەکانیشدا بریتییە لە شەرع، بەم بەڵگە رۆشنانە:

١–پابەندبوون حوکمێکی داخوازیکارە جێگەکەی بریتییە لە پێهەستان، پێهەستان کردارێکە لە هەر شتێك فەرمانی پێکرابێت لەڕووی شەرع و یاساوە، یان خۆگرتنەوە و نەکردن لە هەر شتێك لەڕووی شەرع و یاساوە نەهیلێکراوە، چونکە سەرجەم دەقە شەرعی و یاساییەکانی پەیوەست بە پابەندبوونەکانی مرۆڤ مەدەنی بن یان تاوانکاری فەرمان و نەهیکردنن و سەرچاوەکانیان بریتییە لە دەسەڵاتی یاسادانان، وەك چۆن رێسای گشتی لە یاسارێژییە سزاییەکاندا بریتییە لە: (تاوان و سزا تەنها بە دەقن)، هەر بەو جۆرە لە پابەندبوونە مەدەنییەکاندا، پابەندبوون بە تێگەیشتنە یاسایی و شەرعییەکەی بوونی نییە مەگەر پاڵپشت بە بوونی دەقێك بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بینا لەسەر ئەم بنچینەیە یاساناسان پێناسەی هەڵەیان کردووە بەوەی بریتییە لە

کەمتەرخەمی بەرانبەر ئەرکێکی یاسایی هاوتا بە پەیپێبردنی کەسی کەمتەرخەم و ئەو ئەرکانەی کە کەمتەرخەمی تیایاندا بە هەڵە دادەنرێت، جا یان یاسا بە رێگەیەکی راستەوخۆ دیاریدەکات بە کۆمەڵە دەقێکی تایبەت کە کۆمەڵێك شت پێویست دەکەن بە پێویستبوونێکی ورد وەك لە پابەندبوونە تاوانکارییەکاندا، یان بە رێگەیەکی ناڕاستەوخۆ[1] دیارییان دەکەن وەك لە پابەندبوونە مەدەنییەکاندا، ئاسەواری هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە ماف و ئەرکەکان لەسەریان بینادەکرێن بەپێی یاسا یان بەپێی شەرع، وەك چۆن پایەکان و مەرجەکانی ئەو هەڵسوکەوتانە یاسا یان شەرع دیارییان دەکات، دەستبردن بۆ هۆیەکان بە ویستی مرۆڤە، و سەرهەڵدانی ئاسەوار لەسەریان بە ویستی یاسادانەر یان خاوەن شەرعە.

بۆ نموونە هەر کەس خانوبەرەکەی فرۆشت و بە ناوی کڕیارەوە تۆماری کرد لە فەرمانگەی تۆمارکردنی خانووبەرە و هەموو پایەکان و مەرجەکانی تێدا هاتە دی و هەردوو کەسە گرێبەستکارەکە لە تۆماری تایبەتدا واژوویان کرد و فرۆشیار دانی نا بەوەی نرخەکەی وەرگرتووە یان کاتێکیان دیاریکردووە بۆ رادەستکردن و وەرگرتن، و کڕیار دانی بەوەدا نا فرۆشراوەکەی وەرگرتووە یان فرۆشیار توانیویەتی رادەستی بکات، ئایا دوای هەموو ئەوانە دروستە دوو کەسی گرێبەستکار بڵێن نامانەوێت ئاسەوار لەسەر ئەم گرێبەستە سەرهەڵبدات لە گواستنەوەی موڵکییەتی فرۆشراوەوە بۆ کەسی کڕیار و پابەندبوونی کڕیار بە رادەستکردنی نرخەکە بۆ کەسی فرۆشیار یان بۆ کەسێك کە لە جێگەی ئەو دانیشتووە؟ وەڵام نەخێر، چونکە ئەو ئاسەوارانە لەسەر گرێبەستەکە

---

[1] الدكتور سليمان مرقس (أصول الالتزامات/ ص٣٦٠):-ئەرکەکان لە هەڵەی تاوانکاریدا یاسای سزاکان دیارییان دەکەن، لە هەڵەی مەدەنیشدا یاسای مەدەنی و رێسای گشتی دیارییان دەکەن، بۆیە هەرکات هەڵەی تاوانکارانە هاتە دی هەڵەی مەدەنی دێتە دی، نەك بە پێچەوانەوە.

سەرهەڵدەدەن یان هەر هەڵسوکەوتێکی یەکلایەنە بەپێی یاسا یان بەپێی شەرع، بینا لەسەر ئەوە هۆی پابەندبوون لەم هەڵسوکەوتەدا بریتییە لە گرێبەست و سەرچاوەکەی بریتییە لە یاسا یان شەرع، چونکە لەم بابەتەدا جیاوازی نییە لە نێوان شەریعەتی ئیسلام و یاسادا.

٢-فەقیهانی یاسا کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی سەرچاوەی پابەندبوون لە رووداوە سروشتییەکاندا بریتییە لە یاسا، لەپێش هەموانەوە مامۆستا "السنهوري"، لە کتێبی "الوسیط"دا دەڵێت: (رووداوە سروشتییەکان وەك جیرانی و خزمایەتی یاسا پابەندبوونی دیاریکراویان لەسەر رێکدەخات بە هۆی کۆمەڵێك لەبەرچاوگرتنەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ دادپەروەری و هاریکاری کۆمەلآیەتی، بۆیە دروستە ئەو پابەندبوونانە راستەوخۆ بدرێنە پاڵ یاسا و یاسا ببێت بە سەرچاوەیان).

ئەمە راشکاوانە نیشانی دەدات کە رووداوی سروشتی هۆی پابەندبوونە و سەرچاوەش بریتییە لە یاسا، جیاوازییەك نابینینەوە لە نێوان رووداوی مادی هەڵبژاردەیی وەك کاری بەسوودی بەویست و کاری زیانبەخشی بەویست و رووداوی سروشتی کە هیچ دەستێوەردانێك بۆ ویستی مرۆڤ تیایاندا بوونی نییە مەگەر بە دەستێوەردان و دەستێوەرنەدانی ویست، ئەو قسەیەی کە رووداوی هەڵبژاردەیی سەرچاوەی پابەندبوونە و رووداوی سروشتی هۆی پابەندبوونە بڕیار و پارسەنگ کردنێکە هیچ پارسەنگدەرێکی بۆ نییە، هۆبۆهێنانەوە بە بوونی ویست لە هەڵسوکەوت و رووداوە هەڵبژاردەییەکاندا نەك لە رووداوە سروشتییەکاندا رەد دەکرێتەوە بەوەی ویستی هەر کەسێك کەسێکی تر پابەند ناکات، ئەمە بابەتێکە لە نێوان فەقیهانی یاسا و شەریعەتدا جیاوازی لەسەر نییە، بۆیە دەتوانین بڵێین هەر بەو جۆرە خودی خۆی پابەند ناکات گەر یاسا نەبولیە، بە بەڵگەی گۆڕانی پابەندبوونی مەدەنی بۆ پابەندبوونی سروشتی بە

نێرینبوون(بە درێژخایەنی)، سەرباری مانەوەی ئەوەی پێی دەوترێت سەرچاوەی پابەندبوون.

٣-جیاوازی نییە لەوەدا سەرچاوەی پابەندبوونە تاوانکارییەکان بریتییە لە یاسای تاوانکاری بەپێی بنەمای رەوایی: (تاوان و سزا تەنها بە دەقن)، هەر کەس کەمتەرخەمی بکات بە پابەندبوونەوە کە ئەم یاسایە دەیسەپێنێت بەپێی ئەوە سزایەکی دادپەروەرانە وەردەگرێت، هەر بەو جۆرە جیاوازی نییە لەوەی کەمتەرخەمی و تێکدان لە پابەندبوونە مەدەنییەکاندا گرێبەستی بن یان کەمتەرخەمی بەپێی یاسا سزای لەسەر رێکدەخرێت، بەڵام جیاوازی هەیە لە سروشتی سزای مەدەنی لەگەڵ سروشتی سزای تاوانکارانە، سزا لە کەمتەرخەمی پابەندبوونی مەدەنی بەزۆری داراییە وەك قەرەبووکردنەوە یان جێبەجێ کردن لەسەر گیرفانی قەرزدار و هاوشێوەکانی ئەمانە، بە پێچەوانەی سزای تاوانکارییەوە، ئەمەیان سزایەکە جیاوازە بەپێی جیاوازی سروشتی تاوانەکە، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی سزا لە کەمتەرخەمی پابەندبوونە سزایی و مەدەنییەکاندا بریتییە لە یاسا بۆیە پێویستە سەرچاوەی پابەندبوون لە هەردوو بارەکەدا نیسان بریتی بێت لە یاسا، چونکە گەر یاسا نەبێت لەسەر کەمتەرخەمی بە پابەندبوون هیچ سزایەك رێکناخرێت.

٤-فەقیهانی یاسا و فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی هۆیەکانی بەدەستهێنانی مافە دیاریکراوەکان حەوتن کە بریتین لە: دەستبەسەرداگرتن، و میرات، و وەسێت، و پەیوەستبوون(پێوەلکان) و گرێبەست و تکاکاری و لەخۆگرتن(بندەستخستن)، ئەم هۆیانە هەیانە هەڵسوکەوتی یاسایین و هەیانە رووداوی یاسایین، ئەوانەش بریتین لە هۆگەلێك بۆ مافە دیاریکراوەکان و سەرچاوەکانیان بریتییە لە یاسا، بینا لەسەر ئەمە ئەوانە بریتین لە هۆگەلێك بۆ پابەندبوون کە سەرچاوەکەی یاسایە، چونکە هەریەك لە مافەکان و ئەرکەکان ئاسەوارێکن لەسەر ئەو هەڵسوکەوت و رووداوانە

ڕێکدەخرێن، بە هۆ دانانیان بۆ جۆری ئەو ئاسارانە(مافانە) دەگەڕێتەوە و بە سەرچاوە دانانیان بۆ جۆرێکی تر لە ئاسار(ئەرکەکان) دەگەڕێتەوە ئەمەش بڕیاردان و پارسەنگکردنێکی بێ پارسەنگدەرە.

٥-گەر مرۆڤ لەگەڵ سروشتی خۆی وازلێبهێنرێت ڕێژەیەکی زۆری پابەندبووان کەمتەرخەمی دەکەن لە پابەندبوونەکانیان، بەڵگە لەسەر ئەوە کەسی قەرزدەر گەر قەواڵەیەکی یاسایی بۆ جێبەجێکردن لەلا نەبێت کەسی قەرزدەر بەزۆری خۆدەگرێتەوە لە وەفا بە پابەندبوونی گێڕانەوەی قەرزەکە، گەر سەرچاوەی پابەندبوونەکەی بریتی بێت لەو گرێبەستەی کە پێی هەستاون یان ویستی یەکلایەنەی یان کرداری زیانبەخشانەی یان سوودبەخشانەی ئەوا هەوڵیدەدا پابەندبوونەکەی جێبەجێ بکات سەرەڕای نەبوونی هیچ بەڵگەیەك دژ بە ئەو یان نەبوونی قەواڵەی جێبەجێکردن، چونکە هەریەك لە پابەندبوون و سەرچاوەکەی راوەستاون.

٦-گەر سەرچاوەی پابەندبوونی مەدەنی یاسا نەبوایە بە نێرینبوون(درێبوونەوەی کات) بەرنەدەبوویەوە(کۆتایی پێ نەدەهات)، چونکە ئەو هەڵسوکەوتەی پابەندبوونی دروست کردووە بە نێرینبوون بەرنابێتەوە، کاتێك سەرچاوە بەربوونەوە قبوڵ ناکات کەوابوو پێویستە ئەو پابەندبوونەی لەسەری سەرهەڵدەدات نیسان قبوڵی بەربوونەوە نەکات پاڵپشت بە ڕێسای مانەوەی هۆکار بە مانەوەی هۆیەکە و تیاچوونی بە تیاچوونییەوەیە.

٧-گەر سەرچاوەی پابەندبوون بریتی بێت لە گرێبەست ئەو کات پێویست نەدەبوو یاسادانەری عێراقی بڵێت بۆ نموونە لە مادەی(١٤٥) مەدەنیدا: (جێگەکە هەرچییەك بێت کە گرێبەستەکە بەسەریدا دێت کەسی گرێبەستکار ناچاردەکرێت لەسەر جێبەجێ کردنی پابەندبوونەکەی)، گەر سەرچاوەی پابەندبوون ویستی یەکلایەنە بوایە ئەو کات پێویست نەدەبوو یاسادانەری

عێراقی لە مادەی (١٨٤)ی مەدەنیدا بڵێت: ویستی یەکلایەنە هاوەڵەکەی پابەند ناکات مەگەر لەو بارانەدا کە یاسا بە دەق لەسەر ئەوە هاتبێت).

گەر سەرچاوەی پابەندبوون بەدەستهێنان بوایە بەبێ هۆ ئەو کات پێویست بە مادەی (٢٤٣)ی مەدەنی نەدەبوو کە دەڵێت: (هەر کەسێك -با جیاکەرەوەش نەبێت- بەبێ هۆیەکی ڕەوا شتێکی بەدەستهێنا لەسەر گیرفانی کەسێکی تر لە سنووری ئەوەی بەدەستی هێناوە پابەند دەبێت بە قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسەی زیانی پێگەیشتووە بەهۆی ئەو بەدەستهێنانەوە و پابەندبوون ڕاوەستاو دەبێت با بەدەستهێنانەکەش دواتر نەمابێت).

گەر سەرچاوەی پابەندبوون کرداری زیانبەخش بوایە ئەوا پێویست نەبوو یاسادانەری عێراقی لە مادەی (١٨٦)ی مەدەنیدا بڵێت: (گەر یەکێك ماڵی کەسێکی تری تیابرد یان ڕاستەوخۆ لە بەهای کەمکردەوە یاخود بووە هۆی کەمکردنەوەی بەهاکەی، ئەوا ئەو کەسە دەبێ بە دەستەبەرکەر گەر لە سەرهەڵدانی ئەو زیانەدا ئەنقەست یان دەستدرێژی بوونی هەبێت).

گەر سەرچاوەی پابەندبوون لە شەریعەتی ئیسلامدا بریتی بێت لە خودی گرێبەستەکە ئەوا پێویست نەدەبوو خودا بفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾[1]

٨-بەر لە سەرهەڵدانی یاسا سەرچاوەی پابەندبوون بریتی بوو لە عورفی باو لە هەموو کات و شوێنێکدا، کۆمەڵگەکان و گەلان بەر لە سەرهەڵدانی دەوڵەت و یاسا تاکەکانی خۆیان بۆ عورفی باو لە پرسە تاوانکاری و مەدەنییەکاندا گەردنکەچ دەکرد، دوای سەرهەڵدانی دەوڵەت و یاسا زۆربەی ڕێسا عورفییەکان گوازرانەوە بۆ ناو یاسا و یاسا جێگەی عورفی گرتەوە، ئەوەی ڕوونە ئەوەیە مەنتق بڕیار دەدات کە ئاڵوگۆڕکراو حوکمی ئاڵوگۆڕپێکراوی هەیە، وەك چۆن

[1] المائدة : ١

عورف سەرچاوەی پابەندبوونەکانی کۆمەڵگە و تاکەکانی بووە پێش یاسا، هەر بەو جۆرە تەنها یاسا سەرچاوەی پابەندبوونە تاوانکاری و مەدەنییەکانە بەبێ جیاوازی.

٩-"سەرچاوە" زاراوەیەکی داهێنراوی نوێیە جێگەی زاراوەی "بەڵگە" دەگرێتەوە، لە زاراوەی شەرعی و یاساییدا بەرانبەر ئەوە دانراوە، ئەوەی بەڵگە نەویستە ئەوەیە کە بەڵگەی پابەندبوونە شەرعییەکان بریتییە لە شەرع، و بەڵگەی پابەندبوونە یاساییەکان بریتییە لە یاسا، زانایانی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامی گوزارەیان داوە لە بەڵگە شەرعییەکان وەك(القرآن، والسنة، والإجماع، والقیاس) و بەڵگەکانی تر بە سەرچاوەکانی حوکمە شەرعییەکان لە مافەکان و ئەرکەکاندا.

١٠-یاسا و شرۆڤەکانی لە زۆرێك لە مەیدانەکاندا بە دەق هێناویانە کە یاسا ئەو دەسەڵاتەیە ئاسەوار رێکدەخات لەسەر هەڵسوکەوتە یاساییەکان و رووداوە یاساییەکان، لەو یاسایانە یاسای مەدەنی کوێتی کە لە مادەی (٣١)دا بە دەق دەڵێت: (گرێبەست بریتییە لە پەیوەندی ئەرێکردن بە قبووڵ کردنەوە لەسەر سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا رێکی دەخات)

ئەم بەڵگانە و جیا لەم بەڵگانەش بە کۆی هەموویان دەبنە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە لەسەر ئەوەی کە سەرچاوەی پابەندبوونە مەدەنییەکان بریتییە لە یاسا، هەروەك پابەندبوونە تاوانکارییەکان، پابەندبوونی مەدەنی وەك پابەندبوونی تاوانکاری وایە لە حوکمە داخوازییەکاندا، داخوازی تەنها لە یاسادانەر یان لە خاوەن شەرعەوەیە، نەرێکردنی ئەم راستیانە وەك نەرێکردنی بەڵگەنەویستەکان وایە و لەلای مرۆڤی خاوەن ژیری تەندروست-ئەو مرۆڤانەی کە بە پێوەرە مەنتقییەکان تەماشای کاروبارەکان دەکەن- بایەخیان پێ نادرێت.

توخمی دووەم لە توخمەکانی پابەندبوون بریتییە لە کەسی پابەندبوو، ئەوەش لە شەریعەتی ئیسلامدا بریتییە لە هەر کەسێکی سروشتی کە خاوەن شەرع پابەندی کردووە بە هەستان بەوەی لەسەری پێویستە لە ئەرکەکان و خۆگرتنەوە لەو شتە قەدەغەکراوانەی پێویستەکراوە لەسەری لێیان دووربکەوێتەوە.

لەم پێناسەیەوە دەگەینە ئەو سەرئەنجامەی کەسی پابەندبوو لە شەریعەتی ئیسلامدا تەنها بریتی نییە لە قەرزدار بە پابەندبوونە داراییەکانەوە بۆ خاوەن قەرزەکان و تەنها لەسەر ئەو ئاستە سنووردار و بازنە بەرتەسکەی ژیانی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانی تر کورت نابێتەوە، وەك چۆن فەقیهانی یاسا گومان دەبەن، بەڵکو بریتییە لە هەموو ئەوانەی کە خاوەن شەرع پابەندی کردووە بە وەفاکردن بە مافەکانی کەسانی تر جگە لە خۆی یان لە رێگەی ئەو کەسەی کە نوێنەرایەتی ئەو دەکات لەو شتانەی نوێنەرایەتی قبووڵ دەکات بەرانبەر بە کەسانی تر.

هەموو ژیانی مرۆڤ بە پێی ئەو پەیامەی دلوای لێکراوە پێی هەستێت بریتییە لە پابەندبوون بەرانبەر بە خۆی و خودا و خێزان و کۆمەڵگەکەی و خێزانی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی.

ئەم بەشە بە شێوەیەکی گشتی باس لە لێوەشاوەیی پابەندبوون دەکات و بە شێوەیەکی تایبەت لێوەشاوەیی تاوانکارانە، بۆ هەریەکێك لەمانە باسێکی تایبەت تەرخان کراوە.

# باسی یەکەم:
# لێوەشاوەیی پێویست بۆ پابەندبوون

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە مرۆڤ لە قۆناغەکانی ژیانیدا چوار جۆر لێوەشاوەیی بۆ جێگیر دەبێت، ئەوانەش:

### ١-لێوەشاوەیی پێویستی ناتەواو:

بریتییە لە شیاوی مرۆڤ بەوەی هەندێ مافی هەبێت کە داوای قبوولّ کردنیان ناکەن لە جێگیرکردن و خاوەندارێتیدا، بەلاّم هیچ پابەندبوونێکی لەسەر نییە، ئەم پابەندبوونە بۆ مرۆڤ جێگیر دەبێت لەو کاتەوەی بە رەحمی دایکەوە دەنوسێت تا کاتی لەدایکبوونی، ئەو لەو بارەدا کەسایەتییەکی ناتەولوی ناجێگیرە، لە کۆرپەلەییەوە بۆی جێگیر دەبێت و بە لەدایکبوونی بەزیندووی بۆی کامڵ دەبێت.

ئەوەی باوە لە یاسا دانرلوەکاندا[1] کەسایەتی مرۆڤ بە لەدایکبوونی تەواوی زیندوو دەست پێ دەکات و بە مردنی کۆتایی پێ دێت، ئەمەش قسەیەکی ورد نییە، بەلکو کەسایەتی مرۆڤ لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە لە قۆناغی دروستبوونی کۆرپەلەدایە، بەلاّم کەسایەتییەکی ناتەواوە و بە لەدایکبوونی بە زیندوویی تەواو دەبێت و تا مردنی بەردەوام دەبێت، بەو بەلگەیەی کە کۆرپەلە هەندێ مافی بۆ جێگیر دەکرێت، بەلاّم ئەو مافانە جێگیر ناکرێن تا بەزیندوویی لەدایك نەبێت، گەر پێش لەدایکبوونی هیچ جۆرە کەسایەتییەکی نەبوایە نە ناتەواو و نە تەولو–وەك یاساناسان دەیلێن– ئەوا نە وەسێت و نە بەخشش و نە میرات و نە وەقف و نە شتانی تر لە مافی

---

[1] ومنها القانون المدني العراقي رقم (٤٤) لسنة ١٩٥١ المادة (٣٤).

جۆرلوجۆر کە پێویستیان بە قبووڵ نییە بۆ دروست نەدەبوو، ئەو مافانەی کە پێش لەدایکبوونی بۆی دیاریدەکرێن بە دیاریکردنێکی ناجێگیر، گەر بە زیندوویی لەدایك بوو موڵکییەتی بۆ ئەو مافانە جێگیر دەبێت، گەر بە مردوویی لەدایك بوو وەسێت و بەخشش و وەقف و بەخشینەکانی پووچەڵ دەبنەوە و بەشەکەی لە میرات کە پارێزگاری لێکرابووە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرانی تر، هەریەکەیان بەپێی شایستەبوون و بڕی بەشەکەی خۆی، هەر بەو جۆرە گەر کەسایەتی یاسایی ناتەواوی نەبوایە ئەوا لێوەشاوەیی پێویستی ناتەواوی نەدەبوو، گەر لێوەشاوەیی نەبێت دەستدرێژی کردنە سەری پێش لەدایکبوون حەرام نەدەکرا.

### ٢-لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ:

ئەوەش بریتییە لە شایستەبوونی کەسێك بۆ ئەوەی مافی هەبێت و هەندێ ئەرکی لەسەر شان بێت، وەك پابەندبوون بە خەرجکردن لەسەر خزمی هەژار گەر لەڕووی داراییەوە دەوڵەمەند بوو، هەروەها خەرجکردن بۆ ژنەکەی -لەلای ئەوانەی تەنها بە گرێبەستی هاوسەرگیری لەسەری پێویست دەبێت- ئەوەی ڕۆشنە شەریعەتی ئیسلام دانی ناوە بە هاوسەرگیری کوڕ و کچی بچووکدا لە باری ڕاستبوونەوەی بەرژەوەندییەکی پێویست، سەرپەرشتیار ئەرێکردن و قبووڵ کردن یان هەردووکیان لە ئەستۆ دەگرێت، هەروەها پابەند دەبێت بە پێدانی زەکات لە ماڵ و دارایی خۆی کە زەکاتی تێدا پێویست بووە بە هەڵواردەی پارەی لۆککراو، ئەو جۆرە پارەیە بە بۆچوونی ئێمە زەکاتی ناکەوێت، چونکە گەر لەڕووی بازرگانییەوە بەرهەم نەهێنرێت بۆ قازانج هەنگاو بە هەنگاو زەکات کۆتایی پێ دەهێنێت، ئەمەش زیان بە کەسی ناکام دەگەیەنێت و زیانیش لە ئیسلامدا قبووڵ نەکراوە، پێغەمبەر-صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: ((نە زیان و نە زیانگەیاندن))، بەڵام گەر پارە لە کاری بازرگانیدا بەکارهێنرا و لە باریدا بوو قازانج بەدەست بهێنێت و گەشە بکات، ئەوا دیسان زەکاتی تێدا پێویستە، ئەوەش لەبەر ئەوەی زەکاتدان بەندایەتییەکی دارایی ڕووتە، لای

زەخیرە و خۆراك تیایدا لە لای عیبادەت زاڵترە، پاڵپشت بۆ ئەمە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾[1]، هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر-صلى الله عليه وسلم-: ((لە دەوڵەمەندەکان وەردەگیرێت و بۆ هەژارانیان دەگێڕرێتەوە))، هەندێ لە فەقیهان پێویستبوونی زەکات بە رەهایی لە ماڵ و دارایی کەسی ناکامیش بە پێویست دەبینن، ئەوانەش کە زەکات لە ماڵ و دارایی ناکامدا بە پێویست نابینن پێیان وایە رووی بەندایەتی لە زەکاتدا زاڵترە، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی لێوەشاوەییان نییە داوای عیبادەتیان لێ ناکرێت کەوابوو نابێت بە زەکات پابەند بکرێن، چونکە لە عیبادەتە داراییە رووتەکانە.

بەڵام-بە باوەڕی من- ئاراستەی یەکەم دروستە، چونکە حیکمەتی پێویستبوونی زەکات بریتییە لە پڕکردنەوەی پێویستی کەسی ئاتاج بەو برە داراییە بۆ کەسانێك توانای ئەو پڕکردنەوەیان هەیە لەڕووی داراییەوە، بە چاوپۆشی لە لێوەشاوەیی کەسەکەن بۆیە لە عیبادەتە داراییە رووتەکاندا سەرنجی بکەر نادرێت، بەڵکو تەنها کارەکە بە هەند وەردەگیرێت، بە پێچەوانەی عیبادەتە جەستەییە رووتەکانەوە وەك نوێژ و رۆژ، لەم عیبادەتانەدا سەرنجی کەسی بکەر دەدرێت بەبێ کردارەکە، بۆیە نوێنەرایەتی لە عیبادەتە داراییەکاندا دروستە، بەڵام لە عیبادەتە جەستەییەکاندا دروست نییە.

بەرپرس لە دانی دارایی زەکاتی کەسێك کە لێوەشاوەیی نییە بریتییە لە سەرپەرشتیارەکەی یان وەسێتدارەکەی یان ئەو کەسەی بەرپرسە لە سەرۆکاری ئەو.

کەسێك لێوەشاوەیی نەبێت پابەندە بە دەستەبەرکردن گەر ماڵی کەسانی تری تیابرد و زیانی پێگەیاند، ئەوەش لەبەر ئەوەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی لە

---

[1] المعارج : ٢٥

شەریعەتی ئیسلامدا داوای ویست و پەیبردن(الإرادة والإدراك) ناکات، چونکە لەم توخمانە پێکدێت:

کاری ناڕەوا+ زیان+ پەیوەندی هۆگەرایی نێوان ئەو دوانە.

پێچەوانەی ئاراستەی باو لە یاسا دانراوەکاندا کە توخمەکانی بریتین لە:

هەڵە+ زیان+ پەیوەندی هۆگەرایی نێوانیان.

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە هەڵە داوای پەیبردن و ویست دەکات، چونکە بریتییە لە کەمتەرخەمی بە ئەرکێکی یاسایی هاوتا بە پەیبردنی کەسی کەمتەرخەم پێی، ئەمەش لە کەسێکدا کە لێوەشاوەیی نییە بەدی نایەت، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە ئاراستەی شەرعی ئیسلامی لەم بابەتەدا لە دادپەروەرییەوە نزیکترە، بۆیە هەندێ لە یاسای هاوچەرخ بەرەو ئەم ئاراستە ئیسلامییە هەنگاویانا هەڵگرتووە، بە ئاڵوگۆڕ کردنی "هەڵە" بە "کاری ناڕەوا" لە بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمیدا.

لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ بۆ مرۆڤ جێگیر دەبێت بە لەدایکبوونی بەزیندوویی و بە درێژایی ژیانی بەردەوام دەبێت و کاریگەر نابێت بە هیچ بەرهەڵستکارێك لە بەرهەڵستکارەکانی لێوەشاوەیی، بۆیە مرۆڤ مافە دیاریکراوەکان و مافە کەسی و مادی و مەعنەوییەکانی لەدەست نادات بە هۆی بەرهەڵستکارێك لە بەرهەڵستکارەکانی لێوەشاوەییەوە، وەك شێتێتی و هاوشێوەکانی، هەر بەو جۆرە مافە نادارایییەکانی دەمێننەوە، هەر کەس دوای هاوسەرگیری شێت بوو، هاوسەرگیرییەکەی پووچەڵ نابێتەوە جا شێتێتییەکەی تا مردن بەردەوام بێت یان ناوبەناو بێت یان بەر لە مردن کۆتایی پێ بێت، بەڵام هاوسەرە تەندروستەکە بۆی هەیە داوای جیابوونەوەی قەزایی بکات بە هۆی شێتێتی هاوسەرەکەی ترەوە.

هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی لێوەشاوەییان هەیە بەڕەهایی پووچەڵە، سەرپەرشتیار مۆڵەتی دابێت یان نە، هەڵسوکەوتەکە دارایی بێت یان نادارایی، هەروەها یەکسانە هەڵسوکەوتە دارایییەکە قەرەبووکردنەوە بێت یان بەخشش.

### ٢-لێوەشاوەیی پێهەستانی ناتەواو(یان لێوەشاوەیی جیاکەرەوە):

ئەوەش بریتییە لە شیاوی هەستان بە هەندێ لە ماف، ئەو مافانە جێگیر دەبن بۆ مرۆڤ بە چوونە ناو تەمەنی جیاکردنەوە(التمیین) و بەردەوام دەبێت تا چوونە ناو تەمەنی روشد(تەمەنی کامڵ بوون)، لە فیقهی ئیسلامی و فیقهی یاسایی و یاسای دانراودا پێوەرێکی بابەتیانەی وردی کۆکەرەوەی رێگر بۆ "جیاکردنەوە" نابینینەوە لە نێوان دوو قۆناغی جیاکردنەوە و پێش جیاکردنەوە، بەڵام بۆچوونی باو لە شەریعەت و هەندێ یاسادا ئەوەیە کە هەر کەس حەوت ساڵ لە تەمەنی تەواو کردبێت و چووبێتە ناو تەمەنی هەشت ساڵەوە بە جیاکەرەوە دادەنرێت و لێوەشاوەیی پێهەستانی ناتەواو بەدەست دەهێنێت، ئەوەش بریتییە لە شیاوی بۆ جێبەجێ کردنی هەندێ ماف و هەستان بە هەندێ هەڵسوکەوت کە شەرع و یاسا بایەخیان پێ دەدەن.

لە هەندێ لە یاسا دانراوەکاندا چوونە ناو ساڵی هەشتەم لە تەمەن بۆ پابەندبوونی تاوانکارانە بەس نییە، بەڵکو پێویستە نۆ ساڵ لە تەمەنی تەواو کردبێت و پێی لە دە ساڵی تەمەن نابێت، یاسادانەری عێراقی لە یاسای چاودێری نەوجەوانان ژمارە(٧٦)ی ساڵی (١٩٨٣) مادەی (٤٧) کاری بەمە کردووە هەروەها لە یاسای سزا عومانییەکان(م/١٠٤) کار بەمە کراوە، لە هەندێ یاسادا مرۆڤ لێوەشاوەیی جیاکردنەوەی تاوانکارانە بەدەست ناهێنێت مەگەر تەمەنی سیازدە ساڵی تەواو کردبێت و پێی لە چواردە ساڵ نابێت، وەك یاسای سزاکانی لیبیا(م/٨٠) و جەزائیر(م/٤٩)، سەرەڕای هەموو ئەم پێوەرانە ناتوانرێت یەکێك لەوانە لە هەموو بار و دۆخەکاندا و تایبەت بە هەموو کەسێك دەستی بۆ ببرێت.

لەوانەیە مرۆڤ لێوەشاوەیی جیاکردنەوە بەدەست بهێنێت پێش ئەو ماوە دیاریکراوە بە شەرع یان بە یاسا، لەوانەیە کەسێکی تر ببینینەوە ئەو لێوەشاوەییە بەدەستنەهێنێت تا تێپەڕاندنی ئەو ماوەیە ئەوەش لەبەر کۆمەڵێ هۆی ناوەکی(خودی) و دەرەکی.

**حوکمی هەڵسوکەوتی کەسی لێوەشاوە ناتەواو:**

أ-هەڵسوکەوتی زیانبەخشانەی بە زیانبەخشینێکی پەتی بەرەهایی پووچەڵە، سەرپەرشتیار مۆڵەتی دابێت یان مۆڵەتی نەدابێت، بەخشینەکانی دروست نییە بە هەڵواردەی وەسێت، وەسێت لەبەر دوو هۆ دروستە:

یەکەمیان: کەسی وەسێتکەر موڵکی وەسێتپێکراو لەدەست نادات تا لە ژیاندا بێت، بۆیە ئەو موڵکییەتە ناگوێزرێتەوە بۆ کەسی وەسێتبۆکراو مەگەر لەدوای مردنی، بەوەش وەسێت زیانێکی دارایی پێ ناگەیەنێت تا لە ژیاندا بێت، بینا لەسەر ئەمە بە هەڵسوکەوتێکی زیانبەخش بە زیانبەخشینێکی پەتی نازمێررێت.

دووەم: کەسی وەسێتکەری ناتەولو لە لێوەشاوەییدا پێویستی بە پاداشتی دوارۆژە لەو بارەدا باری وەك کەسێك وایە کە لێوەشاوەیی تەولوی هەبێت.

مۆڵەتدان ئەم هەڵسوکەوتە زیانبەخشانە ناگرێتەوە لە دوای روودانیان، چونکە هەڵسوکەوتی پووچەڵن و پووچەڵیش وەك نەبوو وایە، ئەو و نەبوون یەکسانن، هیچ بوونێکی یاسایی یان شەرعییان نییە تاکو مۆڵەتدان بیانگرێتەوە.

ب-هەڵسوکەوتە سوودبەخشەکانی بەرەهایی دروستن، سەرپەرشتیار مۆڵەتی دابن یان مۆڵەتی نەدابن، وەك قبووڵ کردنی هەدیە و بەخشش و دەستگرتن بەسەر ماڵی موباحدا.

ج-هەڵسوکەوتەکانی کە لە نێوان سوود و زیاندا دەسورێنەوە(بریتیدانەکان) بە دروست دادەنرێن لەبەر ئەو ویستەی کە هەیەتی سەرەرای ناتەولوی تیایدا، سەرەرای ئەوەی لە هەڵسوکەوتەکاندا ئەو ویستە سوودی بۆ دەستەبەر ناکات بەهۆی بوونی ناتەولوییەوە، بۆیە رلوەستاوە لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسەی کە مافی مۆڵەتی هەیە وەك سەرپەرشتیار و وەسێتدار، گەر مۆڵەتی دا ئاسەوارەکەی لە ماف و ئەرکەکان سەرهەڵدەدات لە بەرواری سەرهەڵدانی ئەو هەڵسوکەوتانەوە، نەك لە بەرواری مۆڵەتدانەکەوە، ئەمەش بەپێی بۆچوونی

پارسەنگکراو لەلای فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام و یاسای دانراویش دەستی بۆ بردووە.

نهێنی پێویستی بە مۆڵەت ئەوەیە کە ویستی کەسی مۆڵەتدە، گەر بدرێتە پاڵ ویستی کەسی ناتەواو لە لێوەشاوەییدا بەرژەوەندی ئەو کەسە دەستەبەر دەکات لە هەڵسوکەوتی خولخولاردووی نێوان سوود و زیان.

## ٤-لێوەشاوەیی پێهەستانی کامڵ:

رای باو لە فیقهی ئیسلامیدا مرۆڤ لێوەشاوەیی کامڵ دەبێت، واتە کامڵ دەبێت بۆ داوالێکردن گەر پازدە ساڵ لە تەمەنی تەواو کرد، هەندێ لە فەقیهان وای بۆ دەچن بە کەسێکی کامڵ تەماشا دەکرێت گەر هەژدە ساڵ لە تەمەنی تەواو کرد، یاسا دانراوەکان کاریگەر بە فیقهی ئیسلامی ئەمەیان وەرگرتووە، لەوانە یاسای مەدەنی عێراقی(م/١٠٦)

لێوەشاوەیی پێهەستانی کامڵ بریتییە لە شایستەبوونی مرۆڤ بۆ هەستان بە تەواوی هەڵسوکەوتەکانی لە هەموو بوارە دارایی و نادارایییەکاندا، هەر بەو جۆرە شاندانە ژێر تەواوی بەرپرسیارێتە مەدەنی و تاوانکارییەکان گەر بەرهەڵستکارێك لە بەرهەڵستکارەکانی لێوەشاوەیی بەسەردا نەهاتبێت.

شایانی باسە پرۆژە یاسای عێراقی هەڵواردنی هەریەك لەوانەی پازدەی تەواوکردووە و بە مۆڵەتی دادگا هاوسەرگیری کردووە بە خاوەن لێوەشاوەیی تەواو داناوە، بەپێی برگەی(أ) لە مادەی (٣)ی یاسای چاودێری ناکامان[1] کە دەقەکەی دەڵێت: (منداڵ ئەو کەسەیە نەگەیشتۆتە ساڵی پێگەیین کە بریتییە لە تەواوی هەژدە ساڵ لە تەمەن، ئەو کەسەی پازدە ساڵ لە تەمەنی تەواو کردووە و بە مۆڵەتی دادگا هاوسەرگیری کردووە بە لێوەشاوەی کامڵ دادەنرێت)

---

[1] رقم ٧٨ لسنة ١٩٨٠.

بەڵام یاسادانەری عێراقی ڕۆشنی نەکردۆتەوە مانای بە مەبەستگیراو لە لێوەشاوەیی کامڵ چییە، ئایا بریتییە لە یەکسانی و هاوتابوونی لێوەشاوەیی کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنێت لە دوای تەواوکردنی هەژدە ساڵ، یان ناوەڕۆکێکی تایبەتی هەیە و بەرینی کەمترە لەو تێگەیشتنە بەربڵاوە؟

هەر بەو جۆرە سەرئەنجامی ئەم لێوەشاوەییەی بۆ ڕۆشن نەکردووینەتەوە گەر جیابوونەوە کەوتە نێوان ژن و مێردەوە بە مردن یان بە تەڵاق پێش گەیشتن بە تەمەنی روشد(کامڵبوون).

ئەمەش سەریکێشاوە بۆ جۆرێك لە لێڵی و تەمومژ لەو مادە باسکراوەدا، بە جۆرێك قەزا لە عێراقدا پێیوایە مەرامی یاسادانەر لە لێوەشاوەیی کامڵ بریتییە لە لێوەشاوەیی لە هەڵسوکەوتەکانی پەیوەست بە هاوسەرگیری لە ئەرکە داراییەکان و ناداراییەکان کە لەسەری پەیدا دەبن.

بە بۆچوونی ئێمە ئەم کۆتوبەندکردنە بەڵگەی بۆ راست نەبووەتەوە، چونکە تایبەت ڕۆشنکردنەوە تایبەت بەم مادەیە باس نەکراوە تاکو بەڵگە بێت بۆ ئەوەی قەزای عێراقی بۆی دەچێت، بە پێچەوانەی سنووردارکردنی بە لێوەشاوەیی مەدەنی نەك لێوەشاوەیی تاوانکاری، چونکە رێسا گشتییەکان ئاماژە دەکەن بەوەی مرۆڤی ملکەچ بۆ یاسا عێراقییەکان پرسیاری بەرپرسیارێتی تاوانکاری کامڵی لێ ناکرێت گەر تەمەنی هەژدە ساڵی تەولو نەکردبێت.

تایبەت بە خاڵی دووەم هەریەك لە دوو هاوسەرەکە ناگەڕێنەوە بۆ ناتەواوی لێوەشاوەیی گەر جیابوونەوە روویدا لە نێوانیان پێش تەولوکردنی هەژدە ساڵ، بەم هۆیانە:

أ–ئەوەی یاسادانەری عێراقی بۆی دەچێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا تەبایە، رای باو لە فیقهی ئیسلامیدا هەر کەس تەمەنی پازدەی تەواو کرد بە لێوەشاوەی تەولو دادەنرێت جا هاوسەرگیری کردبێت یان نەکردبێت.

ب- ئەو لێوەشاوە کامڵەی کە پیاوی لێوەشاوە ناتەواو لە هاوسەرگیریدا بەدەستی دەهێنێت بەو مەرجە باسکراوانەی لە برگەی(أ) مادەی (٣) مافێکی بەدەستهاتووە بە تیاچوونی هۆیەکەی تیاناچێت کە بریتییە لە هاوسەرگیری.

ج- لەم مافە بەدەستهاتووەدا هاندان هەیە بۆ هاوسەرگیری پێشوەخت، رۆڵی ئەو هاندانە کەم دەبێتەوە گەر ئەو لێوەشاوەییە بەهۆی جیابوونەوە بە تەلاق یان بە مردن تیابچێت پێش تەواوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەن.

د- دەقەکە بەرەهایی هاتووە، ئەوەش بە رەهایی خۆی دەمێنێتەوە تا بەڵگەیەك لەسەر کۆتوبەند کردنی(سنووردارکردنی) جێگیر دەبێت.

**بەرهەڵستییەکانی لێوەشاوەیی:**

هەندێ جار مرۆڤ دەگاتە تەمەنی روشد و کامڵ بوون پاشان تووشی بەرهەڵستییەك لە بەرهەڵستییەکانی لێوەشاوەیی دەبێت، ئەو بەرهەڵستییانە یەکسان نین لە کاریگەرییان لەسەر لێوەشاوەیی کامڵ یان ناتەواو، گەر بەر لە تەمەنی روشد(کامڵبوون) ئەو بەرهەڵستیانە روویاندا ئەوا لەرووی ئەم کاریگەریەوە جیاوازیان لە نێواندا هەیە بەم جۆرە:

أ.بەرهەڵستییەك کە لێوەشاوەیی پێهەستان بە هەردوو بەشەکەیەوە(تەولو و ناتەواو) ناهێڵێت، بەڵام هیچ جۆرە کاریگەرییەکی نییە لەسەر لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ، وەك شێتێتی و ئەوانەی لە حوکمی ئەو بەرهەڵستییەدان، هەر کەس تووشی ئافەتی ئەقڵی ببێت بە جۆرێك جیاکردنەوەی لە نێوان دروست و نادروست یان لە نێوان سوود و زیان لەدەست بدات، لە حوکمەکانیدا وەك منداڵێکی لێبێت کە شتی پێ جیاناکرێتەوە، پێشتر باسی لەبارەوە کرا، بەڵام بە شایستەبوون بە لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ دەمێنێتەوە، بۆیە ماف و پابەندبوونە داراییەکانی بەرنابنەوە(کۆتاییان پێ نایەت).

ب- بەرهەڵستییەك تەنها کاریگەری هەیە لەسەر لێوەشاوەیی پێهەستانی تەولو و ئەو کەسەی پێی تووش دەبێت لێوەشاوەیی ناتەواوە لە هەموو حوکمە

باسکراوەکانی، وەك گێلێتی[1] و ئەوەی لە حوکمی گێلێتیدایە، دوای دانانی دەستگرتنبەسەری کەسی گێلدا.

ج-بەرهەڵستییەك بەڕەهایی هیچ کاریگەرییەکی نییە لەسەر لێوەشاوەیی، بەڵکو هەڵسوکەوتی مرۆڤ سنووردار دەکات وەك نەخۆشی مردن و ئەوەی لە حوکمی ئەوەدایە، ئەو کەسەی حوکمی کوشتنی درلوە وەك نەخۆشی مردن وایە، بۆیە بەخشینەکانی نەخۆش بە نەخۆشی مردن حوکمی وەسێتی بەسەردا تێدەپەڕێنرێت، بەخشینەکەی بۆ زیاتر لە سێیەکی لێجێماو لەلای هەندێ لە فەقیهان دروست نییە، لەسەر مۆڵەتی میراتگران رادەگیرێت لەلای هەندێکی تر لە فەقیهان، گەر میراتگر لێوەشاوەیی مۆڵەتدانی هەبوو و زانا بوو بە بڕی زیاتر لە سێیەك و دوای مردنی میراتلێگیراو بێت.

---

[1] گێل بریتییە لە دەستبلاو یا دەستبلاوییەکەشی لەڕووی خێرەوە بێت.

# باسی دووەم:
# لێوەشاوەیی پابەندبوونی تاوانکارانە

بۆ دەستەبەرکردنی لێوەشاوەیی تاوانکاری ئەم شەش مەرجە بە مەرج دەگیرێن:

### ١- پێویستە کەسێکی سروشتی بێت (مرۆڤ بێت)

جگە لە مرۆڤ بوونەوەرە زیندووەکانی تر و بێگیانەکان و کەسایەتییە مەعنەوییەکان(میرییەکان) خاوەنی لێوەشاوەیی تاوانکاری نین بەپێچەوانەی ئەوەی یاسا تاوانکارییە دانراوە کۆنەکان لەسەری بوون، لە دانانان بە بەرپرسیارێتی تاوانکاری بۆ ئاژەڵان و بێگیانان، هەروەها پێچەوانەی یاسا هاوچەرخەکان بە پابەندبوونی کەسی مەعنەوی بۆ شاندانە ژێر بەرپرسیارێتی تاوانکاری، گەر نوێنەرانی بە ناوی ئەوەوە هەستان بە کاری قەدەغەکراو ئەوا سزا پێویست دەکات، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەیدا:

أ.لە شەریعەتە کۆنەکان[1] شەریعەتی عیبرانییەکانە کە دانی ناوە بە بەرپرسیارێتی تاوانکاری بۆ گا-بۆ نموونە- گەر شۆقیدا لە پیاوێك یان لە ژنێك و بەهۆی ئەو شۆقلێدانەوە مرد گایەکە ڕەجم دەکرێت و گۆشتەکەی حەرام دەکرێت، ئەمە ئەگەر ئالوودەی شۆقدان نەبووبێت، بەڵام گەر بوو بە خو و خدەی گایەکە و خاوەنەکەی خەڵکی لێ ئاگادار کردەوە و نەیبەستەوە و چاودێری نەخستە سەر گایەکە تا بوو بە هۆی تیاچوونی کەسێك ئەوا سزای گایەکە ڕەجم کردنە

---

[1] یُنظر موانع المسؤولية الجنائية للدكتور عبدالسلام التونجي ص١٢-١٨.

و سزای خاوەنەکەی کوشتنە، لەم یاسایە شۆقدان لە یارییە وەرزشییەکان هەڵواردە کراوە، بۆیە وەرزش هۆیەك بوو لە هۆیەکانی موباح بوون.

یاسا یۆنانییەکان لەم سنوورەدا رانەوەستاون بەڵکو سزای بێگیانەکانیشی بڕیارلێدلوە سەرباری سزای گیانداران، بۆ نموونە گەر بێگیانێك بەربوویەوە بەسەر مرۆڤدا و کوشتی ئەوا ئەو بێگیانە سزا دەدرێت بە فڕێدانی بۆ دەرەوەی ئاوەدانی، لەم یاسایە تەنە ئاسمانییەکان و نەیزەك هەڵواردە کرابوون کە بۆ سەر مرۆڤ بەردەبنەوە و دەیکوژن ئەولنە بەرپرسیارێتیان لەسەر نەبوو.

ب-یاسا هاوچەرخەکان پابەندبوونی مەدەنی دانپیادانلوە بۆ کەسێکی مەعنەوی لەسەر ئەو بنچینەی دروستکزاوێکە کەسی یاسادانەر وێنای دەکات بە حوکمی پێویستییەکی کرداری، ئەمەش وەك ئاسانکاری بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتی یان تایبەت، لەڕووگەی مەدەنییەوە دروستە شایستە ببێت بە مافەکان و ئەرکەکان، بۆیە دەتوانرێ داولکەر یان دلوالەسەرکرلو بێت، بەلاّم خۆی هەڵنەستاوە بە هەڵسوکەوتەکان، چونکە قەوارەیەکی بەرجەستەی لە واقیعدا نییە، بەڵکو کەسانێکی تر پێیهەستاون کە نوێنەرلیەتی ئەو دەکەن.

ئەمەش ئەوەیە فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام دانیان پێداناوە، بۆ نموونە مزگەوت کەسایەتییەکی مەعنەوی هەیە و خاوەن سوودێکی گشتییە، مافی بۆ هەیە و ئەرکی دارایيانەی لەسەر شانە، هەر بەو جۆرە هەموو دامەزراوەیەك کە وەك مزگەوت خاوەن سوودی گشتییە.

بیرۆکەی پابەندبوونە تاوانکارییەکانی کەسی مەعنەوی بەرەهایی لە شەریعەتی ئیسلامدا رەد دەکرێتەوە، چونکە بەرپرسیارێتی تاوانکاری تایبەتە بە بوونەوەرێکی زیندووی خاوەن ژیری، ئەمەش تەنها لە مرۆڤدا کورتدەبێتەوە.

بەڵام لە فیقهی یاسای تاوانکاری هاوچەرخدا دوو ئاراستە لەسەر بیرۆکەکە کێبەرکێیانە:

**یەکەمیان:** ئاراستەی رەفزکردن و دانپیادانەنان بۆ پابەندبوونی تاوانکاری کەسێکی مەعنەوی، بەم هۆیانە:

١-ویستی ئازادی پەیەر بنچینەی بەرپرسیارێتی تاوانکارییە، کەسی مەعنەوی تەنها ئەندێشەیە و لە واقیعدا راستەقینەی بۆ نییە تا خاوەنی ئەو ویستە بێت، گەر بنچینە نەریێ بکرێت ئەوەش کە لەسەری بینا دەکرێت نەریێ دەکرێت.

٢-بوونی گریمانەیی بۆ کەسی مەعنەوی دیاریکرلوە بە بازنەی کار کە لە پێناویدا و بۆ پێویستی و بە شێوەیەکی هەڵواردەیی گریمانەی بۆ کرلوە، پێویستییش بە بڕ و ئەندازەی خۆی دیاری دەکرێت، بۆیە ئەوەی پەیوەستە بە پابەندبوونی تاوانکاری و پرسە تاوانکارییەکانەوە لە دەرەوەی قەوارەی یاسایی گریمانەییەوەن.

٣-ناتوانرێت سزای بڕیارلەسەردرلو بەسەر کەسی مەعنەویدا پیادە بکرێت لە یاسای سزاکاندا، وەك کوشتن و سزای نەرێیی بۆ ئازادی(بەندکردن) و هاوشێوەکانیان.

٤-بۆچوونی پابەندبوونی کەسی مەعنەوی لەرووی تاوانکارییەوە و سەپاندنی سزا بەسەر دلرایی کەسەکەدا و سنووردانان بۆ چالاکی ئەو کەسە پێچەوانەی کەسایەتی تاوان و سزایە، چونکە ئەو سزلیانە لە واقیعدا روو لە تاکەکان دەکەن کە نوێنەرایەتی کەسی مەعنەوی دەکەن[1].

**ئاراستەی دووەم:** ئەمەش بۆچوونی ئاراستەکردنی بەرپرسیارێتی تاوانکارییە بۆ کەسێکی مەعنەوی و پابەندکردنی لەرووی تاوانکارییەوە بە سەئەنجامی تاوانەکان کە کەسانێك نوێنەرایەتی ئەو دەکەن و بە ناوی ئەوەوە پێیهەڵدەستن، بەڵگەم بۆ

---

[1] القللي (محمد مصطفى) في المسؤولية الجنائية، ص٧٧ وما بعدها.

سەرخەرانی ئەم بۆچوونە نەبینییەوە جگە لە رەدکردنەوەی ئەو بەلگانەی ئاراستەی یەکەم دەیکەن بە پالپشتی بۆچوونەکەیان، کە دەلێن:

أ.کەسی مەعنەوی تەنها ئەندێشە نییە، بەلکو راستەقینەیە و بوونی تایبەت بە خۆی هەیە و خاوەنی ئەستۆگری داراییانەیە، بۆیە مافی بۆ هەیە و ئەرکی لەسەر شانە، هەر بەو جۆرە خاوەنی ویستی تایبەتی سەربەخۆیە لە ویستی ئەندامەکانی، بۆیە ویستی ئەو کۆکەرەوەی ویستی ئەندامەکان یان بەشداربولنە تیایدا یان نوێنەرانی ئەوە، دەرکەوتەکانیشی بریتین لە فەرمانەکان و رێنماییەکان کە راپەرێنەران بۆ بەرێوەبردنی کارەکانی جێبەجێی دەکەن.

ب-بۆچوونی "تاوان لەو ئامانجە بەدەرە کەسی مەعنەوی بۆ تایبەتکراوە" رەد دەکرێتەوە بەوەی کەسی سروشتی هەر بەو جۆرە بۆ ئەوە دروستنەکراوە بە تاوان هەلبستێت، لەگەلَ ئەوەش لەرووی تاوانکارییەوە پرسیاری لێ دەکرێت و سزادەدرێت.

ج-بۆچوونی "نەبوونی توانا بۆ پیادەکردنی سزای تایبەت بە تاوانی کەسی سروشتی بەسەر کەسی مەعنەویدا" خۆمانی رادەست ناکەین، هەموو ئەوەی هەیە بریتییە لە جیاوازی لە سروشتی سزاکەدا، بۆیە کوشتنی کەسی مەعنەوی بریتییە لە هەلوەشاندنەوە و سرینەوە و دەستبەسەرداگرتن و لەکارخستنی کارەکەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و هاوشێوەکانی ئەمانە.

د-بۆچوونی "سزا تاکەکەسییە و پێویستە جگە لە کەسی تاوانکار کەسی تر ئازاری پێ نەخوات" رەد دەکرێتەوە بەوەی هەر سزایەك بەسەر کەسی سروشتیدا سەپێنرابێت لە پشتی ئەو سزایەوە کەسانی تر زیانۆمەندبوون وەك ژنەکەی یان مندالەکانی یان خزمەکانی یان کۆمەلگەکەی.

بە بۆچوونی ئێمە ئاراستەی یەکەم تێگەیشتووترە، بۆیە کەسی مەعنەوی دەتوانرێ پابەندبوونی مەدەنی بۆ بریار بدرێت، بەلام پابەندبوونی تاوانکاریانە-بۆ

کەسی مەعنەوی– مەنتق رەدی دەکاتەوە، چونکە ژیری سەرچاوەی هەموو دلوایەك و هەموو بەرپرسیارێتییەکی تاوانکاریانەیە و ئەمەش لە کەسی مەعنەویدا بوونی نییە.

## ٢-کەسی پابەندبوو بالغ بێت:

کەسێك نەتوانێت جیابکاتەوە ئەوا بەرەهایی لەرووی تاوانکارییەوە پرسیاری لێ ناکرێت، نە لەرووی سزاوە و نە لە رووی ئەدەبدادانەوە، بەڵکو لەسەر بەرپرسیار لەو کەسە پێویست دەکرێت چاودێری بکات و رێنمونی بکات و بە پەروەردەیەکی دروست پەروەردەی بکات، گەر ئەو کەسە بەرانبەر پابەندبوونەکانی(ئەرکەکانی) کەمتەرخەم بوو رووبەرووی بەرپرسیارێتی دەبێتەوە لە جێگەی ئەو کەسەی کە لێوەشاوەیی نییە و هەڵدەستێت بە کاری تاوانکارانە، خودا–سبحانە وتعالی– دەفەرموێت: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾[1]، بەلام لەرووی مەدەنییەوە پرسیاری لێ دەکرێت، گەر زیانی بە خەڵکان گەیاند لەسەر سەرپەرشتیارەکەی پێویستە قەرەبووی زیانلێکەوتوو بکاتەوە لەماڵی ئەو کەسەی زیانەکەی گەیاندووە یان لە ماڵی سەرپەرشتیارەکەی و دواتر بەروویدا بشکێنێتەوە.

بەلام منداڵی جیاکەرەوە بە سزای ئەدەبدادانی چاکسازی سووك سزا دەدرێت، سەرباری چاودێری کردنی و ئاراستەکردنی دروست، لە هیچ بارێکدا بە سزای کاملی تایبەت بە تاوان کە پێی هەڵدەستێت و لێوەشاوەیی کامڵ بووە سزا نادرێت.

## ٣-پێویستە کەسەکە ئاقڵ بێت:

شێتێتی رێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانکاریانە، یەکسانە بە تێگەیشتنی تایبەت وەربگیرێت کە بەرانبەرە لەگەڵ تەولوی نەخۆشییە ئەقڵییەکاندا یان بە تێگەیشتنی گشتی و گشتگیر وەربگیرێت بۆ هەموو نەخۆشییە ئەقڵییەکان کە بریتییە لە ناتەواوییەك تووشی رۆیشتنی سروشتی ئاسایی ئامێری جەستە یان هێزەکانی

---

[1] التحریم : ٦

جەستە دەبێت، ئەو هێزانەی کۆمەکی دەکەن بۆ دروستبوونی ویست و دیاریکردنی بەشی ویست لە جیاکردنەوە و ئازادی هەڵبژاردن، بۆیە گەر شێتێك یان کەسێکی تووشبوو بە نەخۆشی ئەقڵی بە جۆرێك ناتەواوی بخاتە ناو ویستی ئازادی پەیبەر تاوانێکی ئەنجامدا لەڕووی تاوانکارییەوە پرسیاری لێ ناکرێت و بە هیچ جۆرە پابەندبوونێکی تاوانکاریانە پابەند ناکرێت، گەر تاوانی کوشتنی ئەنجامدا پێویستە خزم و کەسوکاری خوێنەکەی بدەن.

چونکە کەسێك لێوەشاوەیی نەبێت کاری ئەنقەستی نییە، بۆیە هەڵسوکەوتە ناڕەواکانی بە هەڵە دادەنرێن، چونکە ئەنقەست پێویستی بە پەیبردن و ویستی ئازادە، گەر کەسێك بەر لە تووشبوونی بە شێتێتی تاوانێکی ئەنجامدا و پاشان شێتبوو، ئەوا رێکارە تاوانکارییەکان و جێبەجێکارییەکان دەرحەق ئەو کەسە رادەگیرێن تا کاتی چاکبوونەوەی، گەر ئەگەری چاکبوونەوەی هەبوو بەپێی بۆچوونی پارسەنگکراو لە شەریعەتی ئیسلام و یاسادا، بەڵام لەڕووی مەدەنییەوە پرسیاری لێ دەکرێت بە قەرەبووکردنەوەی زیانگەیاندنەکە کە رووبەڕووی کەسانی تری کردۆتەوە، بۆیە سەرپەرشتکارەکەی یان وەسێتدارەکەی یان ئەو کەسەی راوەستاوە بە کارەکانی ئەو هەڵدەستێت بە وەفا کردنی ئەو پابەندبوونە لە ماڵی شێتەکە گەر ماڵی هەبوو، گەر کەسی سەرپەرشتیار لە ماڵی خۆی قەربووکردنەوەکەی دا ئەوا مافی خۆیەتی بەڕووی شێتەکەدا بیشکێنێتەوە گەر لە داهاتوودا شێتەکە ماڵی بەدەستهێنا.

### ٤-پێویستە خاوەنی هەڵبژاردن بێت:

کەسی زۆرلێکراو و ناچار(المكره والمضطر) لەڕووی تاوانکارییەوە پابەند نابن لە تاوانی سنووربەزێنیدا، چونکە هەریەك لەو دوانە سەردەکێشێت بۆ سەرهەڵدانی شوبهە، سزای سنووربەزێنییەکانیش(الحدود) بە شوبهە پاڵپێوەدەنرێن، هەر بەو جۆرە لەڕووی تاوانکارییەوە پابەندنابێت لە تیابردنی یان تیاچوونی یان بەکاربردنی ماڵی کەسانی تر بینا لەسەر ئەو رێسا شەرعی و یاساییە کە دەڵێت: (پێویستییە

ناچارییەکان دروستی[1] بە قەدەغەکراوەکان دەدەن)، بەڵام لەڕووی مەدەنییەوە پابەند دەبێت بە قەرەبووکردنەوە، هەرکەس ماڵی کەسێکی تر بخوات بۆ رزگارکردنی ژیانی خۆی لە مردن بەهۆی برسێتییەوە، یان ماڵی کەسێکی تری تیابرد بەهۆی هێزێکی زاڵەوە کە ڕووبەڕووی بووەتەوە و ئەویش بە تیابردن ترسەکەی لە خۆی دوورخستۆتەوە، ئەوا ئەو کەسە لەڕووی سزاییەوە پابەند نابێت و پرسیاری لێ ناکرێت و سزا نادرێت، بەڵام لەڕووی مەدەنییەوە پابەند دەبێت بە پێدانی قەرەبوو بە کەسی زیانبەرکەوتوو، بینا لەسەر ئەو ڕێسا شەرعییە گشتییە کە دەڵێت: (ناچاری ماڤ کەسانی تر پووچەڵ ناکاتەوە)، ئەم ڕێسایە بەرهەڵستی ئەو ڕێسایە ناکات کە دەڵێت: (دروستیی شەرعی نەرێی دەستەبەرکردن دەکات)، چونکە مەبەست بە "دروستیی" لەم ڕێسایەدا بریتییە لە "دروستیی بنەڕەتی"، نەك "دروستیی هەڵواردەیی" کە لەسەر روخسەت بیناکراوە، ئەو دروستییە نەرێی دەستەبەرکردن ناکات لە هەر زیانێکدا کەسێك بە کەسێکی تری دەگەیەنێت، بەڵام پابەندبوونی تاوانکاریانەی کەسی زۆرلێکرلو لە تاوانەکانی تۆڵەسەندنەوە و پێدانی خوێندا فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام جیاوازیان لە نێواندا هەیە، بەم جۆرە:

أ.لە کەسی زۆرلێکەر و کەسی زۆرلێکرلو تۆڵە وەردەگیرێتەوە گەر کاری تاوانی بریتی بوو لە کوشتنی ئەنقەستی دوژمنکارانە، ئەمەش بریتییە لە مەزهەبی مالیکی[2] و حەنبەلییەکان[3] و پارسەنگرلو لە مەزهەبی شافیعیدا[4]، چونکە ئەو دوو کەسە لە هەستان بە تاوانەکە بەشدارن، ئەمەیان لەبەر بوون بە هۆی

---

[1] لە هەموو سەرچاوەکاندا(پێویستییەکان قەدەغەکراوەکان موباح دەکەن) بەڵام هەڵەیەکی باوە و پێویستە وشەی "موباح دەکات" بە وشەی"ڕێگەپێدەدات" ئاڵوگۆڕ بکرێت، چونکە پێویستی لە ڕێگرەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکاریانەیە، نەك لە هۆیەکانی موباح کردن.

[2] شرح الخرشي ٩/٨.

[3] المغني لأبن قدامة ٦٤٥/٧.

[4] تحفة المحتاج شرح المنهاج ٣٨٨/٨

کوشتنەکە و ئەوەشیان لەبەر هەستان بە کاری کوشتنەکە، حاڵەتی لەم جۆرە وەك حاڵەتی کوشتنی کەسێکە لەلایەن کۆمەڵێکەوە.

ب-لە هیچ کامیان تۆڵە وەرناگیرێتەوە، ئەوەش بۆچوونی "أبي يوسف"[1] و فەقیهە حەنەفییەکانە، بەڵام دانی خوێن بە پێویست دەزانێت لەسەر کەسی زۆرکەری فەرمانکەر بە کوشتنەکە، چونکە کەسی زۆرلێکەری سەبەبکار بکوژە لەڕووی حوکمەوە نەك لە راستەقینەدا، کەسی زۆرلێکراوی راستەوخۆش بکوژی راستەقینەیە نەك لەڕووی حوکمەوە، لێرەوە شوبهە سەر هەڵدەدات.

ج-تۆڵەسەندنەوە لەسەر کەسی زۆرلێکەری سەبەبکار پێویست دەبێت نەك لەسەر کەسی زۆرلێکراوی هەستاو بە کوشتنەکە، بەهۆی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ((لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و ئەوەی لەسەری ناچاردەکرێن هەڵگیراوە))، واتە سزادان و بەرپرسیارێتی تاوانکاری هەڵگیراوە، هەروەها لەبەر ئەوەی کەسی زۆرکەر بریتییە لە بکوژەکە لەڕووی ماناوە، بۆیە کەسی زۆرلێکرلو وەك ئامێرێك وایە لە جێبەجێ کردنی تاوانەکەدا بەکارهێنرلوە، ئەمەش بۆچوونی "أبي حنيفة و محمد الشيباني"[2] و شێعەی زەیدییەکان و رای پارسەنگنەدرلوە لای شافیعییەکان[3].

د-زۆرلێکردن ناکرێتە پاساوێکی رێگر لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری، نە بۆ کەسی زۆرکەر نە بۆ کەسی زۆرلێکرلو، بەڵام بەرپرسیارێتی زۆرلێکراوی راستەوخۆ بۆ کاری کوشتنەکە زۆرترە، بۆیە تۆڵەی لێ دەسەنرێتەوە و سزای کەسی زۆرکەریش دەدرێت کە نزیکە لە سزای تۆڵەسەندنەوەکە و بریتییە لە بەندکردن بە درێژایی تەمەنی، ئەم ئاراستەیە رای شێعە ئیمامییەکان[4] و

[1] بدائع الصنائع للكاساني ٤٤٨٧/٩.

[2] بدائع الصنائع للكاساني ٤٤٨٨/٩.

[3] المهذب ١٧٧/٢.

[4] كتاب الخلاف في الفقه للطوسي ٣٥١/٢.

"زفر" لە حەنەفییەکانە[1]، بەڵام "زفر" -بەپێی زانیاری من- باسی سزای زۆرکەری فەرمانکەری نەکردووە، بە پێچەوانەی شێعە ئیمامییەکان کە دەڵێن: سزای تەمێکردنی دەدرێت کە بریتییە لە بەندکردنی هەتاهەتایی.

### ٥-زانا بێت بەوەی کە پابەندکراوە بە تیاپابەندبوو یان لە توانایدا بێت ئەو شتە بزانێت:

تایبەت بە پابەندبوونە تاوانکارییەکان نەزانی لە شەریعەتی ئیسلامدا رێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری، چونکە بیانووە، بەپێی ئایەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[2]، هەروەها ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾[3]، بۆیە سزا کاتێکە بەو دەقانەی حوکمی داواکراو لەخۆدەگرن لە واجبەکان و حەرامکراوەکان ئاگادار کرابن، بەڵام نەزانی رێگر نییە لە پابەندبوونی مەدەنی، هەر کەس ماڵی کەسێکی تری تیابرد یان بەکاربرد بەهەڵە یان گومانی برد ماڵی خۆیەتی یان ماڵێکی موباحە، ئەوا دەستەبەرکردن لەسەری پێویست دەبێت، چونکە پەند لەو گومانەدا نییە هەڵەکەی رۆشن دەکاتەوە.

### ٦-پێویستە توانای هەبێت بەسەر هەستان لە تیاپابەندبوودا:

بەپێی ئایەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[4]، لە عیبادەتەکان و تاوانەکاندا بوونی تونای پێهەستان لە مرۆڤ بە مەرج دەگیرێت کە لە کردنی کرداردا لە عیبادەتەکان و خۆگرتنەوە و نەکردن لە تاوانەکاندا خۆیان دەبیننەوە.

---

[1] بدائع الصنائع ٤٤٨٨/٩ حاشية ابن عابدين ١٣٧/٦.

[2] البقرة : ٢٨٦

[3] القصص : ٥٩

[4] البقرة : ٢٨٦

تایبەت بە پابەندبوونە مەدەنییەکانیش بە مەرج نەگیراوە کەسی پابەندبوو لە خۆیدا توانای هەستان بە پابەندبوونەکەی هەبێت، بەڵکو سەرپەرشتیارەکەی یان وەسێتدارەکەی یان بریکارەکەی بۆ جێبەجێ کردنی پابەندبوونەکانی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت.

ئەوەی ڕۆشنە هەموو کردارێك خاڵی نییە لە بوونی گرانی و دژواری تیایدا، بەڵام گەر ئەو گرانی و دژوارییە لەسەرو توانای کەسی داوالێکرلوەوە بوو ئەوا ئەو داوایە بە تەولوی لەسەر کەسەکە لادەدرێت، گەر داوایەکە لە سنووری تواناکانی ئەودا بوو، بەڵام تەندروستی و سەلامەتی کەسەکەی دەخستە بەر ترس و هەڕەشە ئەوا حوکمی داواکراو لە گرانی و دژوارییەوە بۆ ئاسانی و سانایی دەگۆڕرێت، بەپێی ئایەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1]، هەروەها ئایەتی: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2]، ئەم گۆڕانە لە دژواری و سەختییەوە بۆ ئاسانی و سانایی پێی دەوترێت روخسەت.

بەڵام گەر گرانییەکە ئاسایی بوو ئەوا حوکمەکە لەباری خۆیدا دەمێنێتەوە و کەسی داوالێکراوی پێ پابەند دەکرێت گەر ڕێگرێکی تر بوونی نەبێت.

---

[1] الحج : ٧٨

[2] البقرة : ١٨٥

توخمی سێیەم لە توخمەکانی پابەندبوون بریتییە لە بۆپابەندبوو، ئەوەش بریتییە لە خاوەن ماف، جا مافەکە دارایی بێت یان نادارایی، مادی بێت یان مەعنەوی، هەروەها یەکسانە مافەکە مافێکی بەرچاو بێت یان تاکەکەسی، گشتی بێت یان تایبەت.

ئەو مەرجانەی لە کەسی "پابەندبوو"دا پێویستە بوونیان هەبێت لە "بۆپابەندبوو" بە مەرج ناگیرێن، وەك لەم دۆخانەدا:

**لەڕووی کەسایەتییەوە:** دروستە(گونجاوە) کەسی پابەند کەسێکی سروشتی هەبێت، وەك کەسی زەید لە خەڵکی، یان کەسێکی مەعنەوی هەبێت وەك دامەزراوەیەك کە خاوەنی سوودێکی گشتییە و یاسا دانی بە کەسایەتییەکەیدا ناوە، هەر بەو جۆرە دروستە(گونجاوە) یەکێك لەو دوانە نە سروشتی بێت نە مەعنەوی، وەك لە مافەکانی خودادا، لە هەموو مافەکانی خودادا لە بیروباوەڕ و عیبادەتەکان و سزای تاوانەکان بۆپابەندبوو بریتییە لە خودا-سبحانه وتعالى- بەڵام سوود و قازانجی هەستان بەو مافانە بۆ مرۆڤی داوالێکراو و کۆمەڵگە دەگەڕێتەوە، کە دواتر لە بابەتی "تیاپابەندبوو" باسی لەبارەوە دەکەین.

**لەڕووی بوونەوە:** دروستە بۆپابەندبوو هەبوو هەبێت وەك چۆن دەگونجێ نەبوو بێت لە کاتی سەرهەڵدانی پابەندبوونەکەدا، وەك ئەو کەسەی کە وەسێت دەکات بە هەندێ لە ماڵەکەی بۆ یەکەمین منداڵی ژنی سکپڕ لە یەکێك لە کوڕەکانی کە هێشتا ژنی نەهێناوە، وەك چۆن دەگونجێ لە دوو هەبوو و دوو نەبوو سەریهەڵدا بێت، وەك وەقف لەسەر هەژارانی ناوچەیەکی تایبەت یان قوتابخانەیەك یان هاوشێوەکانی ئەمانە، هەروەها وەك وەقف لەسەر منداڵ و منداڵی منداڵ و بەو جۆرە تا خوارەوە.

**لەڕووی دیاریکردنەوە**: وەك چۆن دروستە بۆپابەندبوو ئاشکرابێت هەر بەو جۆرە دروستە نەناسراو و نادیار بێت لە کاتی سەرهەڵدانی پابەندبوون وەك لە پاداشتدا.

**لەڕووی لێوەشاوەییەوە**: دروستە کەسی بۆپابەندبوو لێوەشاوەیی کامڵ یان ناتەولو یان لەدەستچووی هەبێت.

**لەڕووی توانناوە**: لەسەر سوودبینین لە تیاپابەندبوو بە مەرج ناگیرێت کەسی بۆپابەندبوو خۆی توانای بەرهەمهێنانی تیاپابەندبووی هەبێت و سوود و قازانجی لێ ببینێت، بەهۆی شیاوی ئەوەی کەسێك لە جێگەی ئەو دابنیشێت بۆ بەرهەمهێنانەکە و سوود لێ بینینی وەك سەرپەرشتیاری یان وەسێتداری یان بریکاری.

**لەڕووی زانستەوە**: بە مەرج ناگیرێت بۆپابەندبوو بە پابەندبوونەکە بزانێت لە کاتی سەرهەڵدانی، لەوەی گەر لە تیاپابەندبوودا بەرژەوەندییەك بوونی هەبێت بۆ ئەو بگەڕێتەوە.

**لەڕووی هەڵبژاردنەوە**: لە هەموو شتێکدا رازیبوونی بۆپابەندبوو بە مەرج ناگیرێت، چونکە دەسەڵات دەتوانێت کەسێك بە قبووڵ کردنی خەڵاتێك یان مووچەیەکی مانگانە ناچار بکات بەرانبەر ئەو قازانجە گشتییەی بە کۆمەڵگە پێشکەشی دەکات.

**لەڕووی جۆرەوە**: بە مەرج ناگیرێت بۆپابەندبوو مرۆڤ بێت یان کەسێکی مەعنەوی، بەڵکو دەگونجێ گیاندارێك بێت، وەك چۆن بۆ مرۆڤ ماف هەیە هەر بەو جۆرە ئیسلام دانی بە ماف هەندێ لە گیاندارندا ناوە، بۆ نموونە هەر کەس گیاندارێك بەند بکات لە باخچەی ئاژەڵان یان لە ماڵی خۆیدا پێویست دەبێت لەسەری ئەو شتانەی بۆ دابین بکات کە بەردەوامی بە ژیانی دەبەخشێت لە خواردن و خواردنەوە و شتانی تر.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە سزا درا دەرگای لێ داخست تا مرد بۆیە ئافرەتەکە چووە ناو ئاگرەوە، چونکە نە خواردنی پێدا نە خواردنەوە کاتێك بەندی کرد بوو، وازیشی لێ نەهێنا لە خاشاکی زەوی بخوات))[1]

---

[1] صحيح مسلم باب تحريم تعذيب الهرة ونحوها من الحيوان الذي لا يؤذي ١٧٦٠/٤.

ئـامرازی "بـەهۆی" لـە فـەرمووده شـیرینەکەدا واتـە هـۆی سـزای ئافرەتەکـە بەنـدکردنی پشـیلەکە بـوو هـەروەها ڕێ لێگـرتنی لـە خواردنـەوە و خواردنـەوە و سەرئەنجام بەو هۆیە چووە ناو ئاگرەوە.

هەر بەو جۆرە پێویستە مرۆڤ هێرش و پەلاماری گیاندارێك نەدات نە سوودی هەیە نە قازانج، پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێت: ((پێغەمبـەرێك لـە پێغەمبـەران چـووە ژێـر دارێك، مێرووولەیەك گـازی لێگـرت، فـەرمانی كـرد بـە دەرهێنـانی خۆراكـەكانی بۆیـە هێنرانە دەرەوە بۆ ژێر درەختەكە، پاشان فەرمانی پێكرد و سوتێنرا، خودا وەحی بۆ نارد نەدەكرا تەنها یەك مێرووولە بوایە))[1]، واتە بۆچی تەنها یەك مێرووولەت سزا نەدا، ئەویش ئەو مێرووولەیە كە گازی لێگرتی، چـونكە زیانبـەخش بـوو، بـەڵام ئـەوانی تـر ئازاریان نەدایت.

پێویستە لەسەر خاوەن گیانداران كە لە كاردا بەكاریان دەهێنن جـا لـە سـەفەردا بێت یان لە ماڵەوە ڕەچاوی ئەو گیاندارانە بكات بە پێدانی پشووی تەواوی پێویسـت تاكو ژیانی گیاندارەكە ڕووبەڕووی ئازار نەبێتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((گەر بە لەوەڕگادا[2] (الخصب) سەفەرتان كرد مافی ئەو ئەسپ و حوشترانە بدەن بۆ بەشی خۆیان لەو لەوەڕگایە))[3]

---

[1] صحیح مسلم ٤/١٧٥٩.

[2] "الخصب"بریتییـە لـە زۆری گـژوگیا و لـەوەڕگا، دژی وشـەی"الجـوب"بێفـەڕ و بـێ لـەوەڕگا و گژوگیا.

[3] مختصر صحیح مسلم ١٤٩/٢٢٤١.

تیاپابەندبوو و تیاداوالێکراو و بابەتی پابەندبوون و مافی بۆپابەندبوو کۆمەڵێك وشەی هاوواتان و یەك ناوەڕۆکیان هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە لەسەر کەسی "پابەندبوو" پێویست دەبێت بە پێهەستان بۆ "بۆپابەندبوو"، هەندێ لە یاسادانەران و شرۆڤەکارانی یاسا بابەتی پابەندبوون و خودی پابەندبوونیان لا تێکەڵ بووە، لەو یاسایانەی کەوتۆتە ناو ئەم تێکەڵییەوە یاسای مەدەنی عێراقییە[1] کە لە بڕگەی سێیەم مادەی (٦٩) دەقەکەی هاتووە: (گوزارەی "پابەندبوون" بە وشەی"قەرز" هەمان مانا دەدات کە گوزارەی "مافی تاکەکەسی" دەیگەیەنێت) لە کاتێکدا مافی تاکەکەسی بریتییە لە بابەتی پابەندبوون.

هەر بەو جۆرە تێکەڵییەکیان لە نێوان بابەتی پابەندبوون و جێگەی پابەندبووندا لا دروستبووە کە بریتییە لە پێهەستان، لە بابەتی "پێپابەندبوو" باسی لەبارەوە دەکەین، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە ئەم کاروبارانە لە ڕێژەی مەنتقی نێوانیان جیاوازن، چونکە هەریەك لە بابەتی پابەندبوون و جێگەی پابەندبوون هاوبەشی یەکترن، هاوبەشی شتێك لەو شتە جیابووەتەوە، وەك چۆن هەردووکیان لە توخمەکانی پابەندبوونن، توخمی شتێك جیایە لە شتەکە، چونکە "هەموو" و "بەش" لە چییەتی و حەقیقەتدا لەیەکتر جیاوازن.

شایانی باسە گەلەوشە(مفردات)ی بابەتی پابەندبوونی کەسی پابەندبوو(یان مافی بۆپابەندبوو) زۆرن بە جۆرێك نایەنە هەژمارکردن و ئامارکردن، بەڵام خودا–سبحانه وتعالى– لە قورئاندا لەژێر یەك ناودا کۆی کردوونەتەوە و ناوی لێناوە ئەمانەت، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾[2]، مەبەست لە "عرض" لەم

---

[1] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

[2] الأحزاب : ٧٢

ئایەتە پیرۆزەدا بریتی نییە لە "عرض"ی راستەقینە، بەڵکو خودا-سبحانه وتعالی- بەو کەلامە دەیەوێت ترسناکی ئەو ئەمانەتە لەڕووی وەفاداری پێیەوە بە شێوەیەکی دروست بخاتە روو، هەروەها دەیەوێت ترسناکی ئەوەی لەسەر ناپاکی لە ئەمانەت و کەمتەرخەمی لە پابەندبوون بە وەفاداری پێیەوە رۆشن بکاتەوە، خودا دەیەوێت بە مرۆڤ بفەرموێت: گەر بڕیاربوایە تەنەکانی ئاسمان و زەوی پەیبردن و ئەقڵ و ویستیان هەبوایە ئەوا نەیاندەویست شان بدەنە ژێر کۆڵی ئەمانەت، نەویستنی یاخیبوون نە، بەڵکو نەویستنی پاساوهێنانەوە بۆ شاندانە ژێری، مرۆڤ شانیدایە ژێر کۆڵی ئەمانەت لەدوای ئەوەی پێی پابەندکرا، ئەمەش بەرانبەر کۆمەڵێك ماف کە پێی تەنهابووەتەوە لە نێوان دروستکراوە زیندووەکاندا، لەو مافانە ئەوەیە بە ئەقڵ تەنهای کردۆتەوە کە مەزنترین نیعمەتی خودایە و مرۆڤ بەدەستی هێناوە، سەرباری کۆمەڵێك مافی تر، لەوانە رێزلێنانی و رامهێنانی هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدان و فەراهەمهێنانی خواردن و خواردنەوە و سەرخستنی شکۆی مرۆڤ بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانیدا، هەموو ئەوەی لە بەرژەوەندی مرۆڤە لەسەر زەوی دروستی کردووە، ئەمەناش هەموو لەپێناوی مرۆڤدایە، خودا-سبحانه وتعالی- دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾[1]، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2]، هەروەها: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾[3]

لە داواکارییەکانی رۆحی شەریعەتی ئیسلام و یاسادانراوەکان و دادپەروەری ئەوەیە بەرانبەر هەر مافێك ئەرکێك بوونی هەبێت، لەبەر ئەوەی مرۆڤ تەنهاکراوەتەوە و جیاکراوەتەوە لە دروستکراوەکانی تر بەو هەموو نیعمەت و مافە، کەوابوو پێویستە

---

[1] الإسراء : ٧٠

[2] الجاثية :"١٣

[3] البقرة : ٢٩

لەسەری تەنها ببێتەوە بە شاندانە ژێر کۆڵی بەرپرسیارێتی جێنشینی لە زەویدا بۆ هەستان بە پەیامەکەی کە بریتییە لە هەستان بەو ئەمانەتە خودا فەرمانی بە پێهەستانی کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾[1]

بەلاّم بۆچی خودا لە ئایەتەکەدا مرۆڤی بە "ظلوم و جهول–زۆر ستەمکار و زۆر نەزان" وەسف کردووە لە شاندانە ژێر ئەم ئەمانەتە و هەردوو وشەکەش بە شێوەی "صیغة المبالغة"( ظلوم و جهول) و نەیفەرموو مرۆڤ "ظالم و جاهل"ە؟

وەلاّمەکە رۆشنە، چونکە مرۆڤ بە زۆر ستەمکار لە نەفسی خۆی و کۆمەلگەکەی و ئوممەتەکەی دەردەچێت گەر کەمتەرخەمی کرد لە ئەرك و پابەندبوونەکانی لە هەستان بەم ئەمانەتە کە پەیامێکە و مرۆڤ لەپێناو پێهەستانیدا دروستکراوە، لەبەر ئەو گشتە زیانە گەورەیەی لەم کەمتەرخەمییەوە سەرهەڵدەدات و لە هەمان کاتدا رووبەرووی کەسی کەمتەرخەم و خەڵکانی تر دەبێتەوە، وەك چۆن زۆر نەزانە بەهۆی نەزانینەکەیەوە بە سەرئەنجامی خراپ و ترسناکی کە لەسەر کەمتەرخەمییەکەی بەرانبەر بە ئەمانەت سەرهەڵدەدات، هەموو ئەو سەرئەنجامانە بەرووی کەسی کەمتەرخەم و کۆمەلگەکەیدا بە شێوەیەکی خراپ و نەرێنی دەشکێتەوە و ئەنجامێکی ترسناکی لێوە سەرهەڵدەدات، ئەمە ئەوەیە کە ئەزموونی ژیانی مرۆڤ لە هەموو چاخ و سەردەمەکانیدا سەلماندوویەتی، کارەساتەکانی جەنگ و تراژیدیاکانی کۆمەلگە و دواکەوتنی گەلانی جۆراوجۆر لە کاروانی شارستانی، هەموو ئەوانە بۆ کەمتەرخەمی مرۆڤ دەگەرێتەوە بەرانبەر پابەندبوونەکانی لە هەستان بە وەفاداری جێبەجێ کردنی ئەمانەت لەرووی شەرع و یاسا و عورف و گیانی مرۆییەوە.

---

[1] النساء : ٥٨

## بەشەکانی ئەمانەت(مافەکان):

ماف بریتییە لە بابەتی پابەندبوون، "پابەندبوو"ش هەمیشە مرۆڤە، مافەکانیش لەڕووی گرنگی و سروشتی "بۆپابەندوو" لە شەریعەتی ئیسلامدا دابەش دەبێت بۆ دوو بەشی سەرەکی، ئەو دوانەش: مافەکانی خودا، و مافەکانی مرۆڤن، لێکۆڵینەوەی هەر بەشێك بۆ باسێکی تایبەت دابەش دەبێت.

# باسی یەکەم:
# مافەکانی خودا

بەڵگەنەویستە خودا بەرەهایی لە هەموو جیهانەکان بێنیازە، گەر خێزانی مرۆڤایەتی خۆیان بۆ عیبادەتکردنی خودا یەکلابکەنەوە بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە مەزنی خودا زیاد ناکات، گەر ژیانی مرۆیی بگۆڕێت بۆ ژیانی ئاژەڵی بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە مەزنی خودا کەم ناکات، بینا لەسەر ئەمە نهێنی لە داوا لێکردنی مرۆڤ بۆ وەفاکردن بە مافەکانی خودا بریتییە لە سەرهەڵدانی توانا و وزەیەك پاڵیبنێت بۆ وەفاداری بە پابەندبوونەکانی بەرانبەر برا مرۆڤەکەی، چونکە هەتا بەڕاستی لە خودا نزیك ببێتەوە ئەمانەتداری مرۆڤ زیاد دەکات، بە هەمان شێوە هەتا لە خودا دووریکەوێتەوە ناپاکی زۆرتر و زیاتر ئەنجام دەدات، مافەکانی خودا بۆ سێ بەش[1] دابەش دەبن، ئەو سیانەش بریتین لە: بیروباوەڕەکان و عیبادەتەکان و سزاکان.

---

[1] زانیانی ئوسوڵ مافەکانی خودلیان بۆ هەشت بەش دابەش کردووە، کە ئەمانەن:

١-تەنها عیبادەت وەك باوەڕ بە خودا و پەلوپۆکانی.

٢-تەنها سزا وەك سزای تاوانەکان و سنووریەزێنییەکان.

٣-سزای کەمتەرخەمیانە وەك بێبەش کردنی میراتگری بکوژ بۆ میراتلێگیراوی کوژراو.

٤-مافێك کە لە نێوان عیبادەت و سزادایە وەك کەفارەتی سوێندنی درۆ.

٥-عیبادەتێك کۆمەکی خۆراکی تێدایە وەك زەکاتی سەرفیترە.

٦-کۆمەکی خۆراك و دارایی کە مانای عیبادەتی تێدایە وەك زەکاتی ساڵانەی ماڵ و سامان.

٧-کۆمەکی خۆراك کە مانای سزای تێدایە وەك زەریبەی خەراج.

٨-مافێك بە خۆیەوە راوەستاوە و پەیوەست نییە بە ئەستۆگری هیچ کەسێکەوە وەك مافی دەوڵەت لە بەرهەمهێنانی کانزای هەبوو لە زەوی هەرێمەکانیدا، بەڵام ئەم هەشت بەشە دەگەڕێنەوە بۆ سێ بەشەکە کە باسمان کردن.

**أ-بیروباوەڕەکان:**

ئەمەش بریتییە لە پەنهانەکان کە دلوای لە مرۆڤ پێکرلوە، لە پێشەنگی ئەو بیروباوەڕانەوە باوەڕ بە خودایە، ئەمەش لە دوو توخم پێکدێت:

مەعنەوی: کە بریتییە لە باوەڕێکی تەواوی جێگیری هەماهەنگ بە واقیع بە بوونی خودا-سبحانە وتعالی- و ئەوەی لەو باوەڕەوە جیادەبێتەوە.

مادی: ئەمەش بریتییە لە کاروکردەوەی چاك و پاك و بەسوود بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی.

ئەم دوانەش هاوشانی یەکن، هەریەکەیان ئەویتریان تەواو دەکات، و بۆ یەکتر پێویستن و هیچ کامیان لەوی تریان تەنها نابێتەوە.

باوەڕ بە خودا پێویستییەکی ئەقڵییە بەر لەوەی پێویستییەکی شەرعی بێت، ئەو باوەڕە بۆ مرۆڤی ژیر بە بەڵگەی بۆچەیی[1] یەکلا دەبێتەوە، ئەمەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار لەسەر بوونی خاوەن ئاسەوار، لەڕووی بنەماوە بە بەڵگە شەرعیەکان ناسەلمێت، چونکە باوەڕ بەو بەڵگانە لەسەر باوەڕ بە خودا رادەوەستێت، گەر باوەڕ بە خودا لەسەریان رابوەستایە ئەو کات نەشیاوی مەنتقی سەریهەڵدەدا، ڕۆشنکردنەوەی ئەمە:

گەر (أ) لەسەر (ب) راوەستابێت و (ب)ش لەسەر (أ) راوەستابێت ئەوا رلوەستانی (أ) لەسەر (أ) پێویست دەبێت، دوای سڕینەوەی ناوەندەکە(واتە سڕینەوەی "ب")، لەوێوە وەستانی (أ) لەسەر خۆی پێویست دەبوو، چونکە وەستانی شتێك لەسەر شتێك کە لەسەر ئەو دەوەستێت، وەستانی شتەکە لەسەر خۆی پێویست دەکات،

---

[1] بەرانبەر بە بەڵگەی "بۆچەیی" بەڵگەی "چۆنچۆنی"هەیە، ئەوەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە کارتێکەر لەسەر بوونی کارتێکرلو وەك بەڵگەهێنانەوە بە بەکتریا لە خوێندا لەسەر بوونی نەخۆشی.

وەستانی شتێك لەسەر خۆ واتە شتەکە پێش خۆی کەوتووە، پێویست(اللازم) پووچەڵ و هەریەوجۆرە پێویستکراو(الملزوم).

باوەڕ بریتییە لە دەرچەی یەکەم بۆ مرۆڤ بەرەو گەشە و پێشکەوتن و گۆڕانکاری لە هەردوو بواری رۆحی و مادیدا، بۆیە جەستە بەبێ باوەڕ وەك پەیکەرێکی بێ رۆحە، هەر کەس باوەڕی نەبێت پابەندبوونی نییە، هەر کەسیش پابەندبوونی نەبێت ئەمانەتداری بۆ نییە، ئەو کەسەش کە ئەمانەتداری نییە شایستەی ئەوە نییە ئەندامی کۆمەڵگەیەك بێت، و شایستە نییە شان بداتە ژێر هیچ جۆرە بەرپرسیارێتییەك، باوەڕی دروست وزەیەکی رۆحییە چاودێری کرێکار دەکات لە کارگەکەیدا و جوتیار لە کێڵگەکەیدا، و فەرمانبەر لە فەرمانگەکەیدا و مامۆستا لە قوتابخانەکەیدا و سەرباز لە مەیدانی جەنگدا و دایك لە ماڵەکەیدا و دەسەڵات کاتی جێبەجێ کردنی بەرپرسیارێتییەکانی، بەهۆی ئەم چاودێرییەوە هەموو کەسێکی پابەندبوو وەك پێویست بە پابەندبوونی خۆی هەڵدەستێت.

## ب- عیبادەتەکان:

ئەمەش یان عیبادەتی جەستەییە وەك نوێژ و رۆژوو، یان داراییە وەك زەکات، یان دارایی جەستەییە وەك حەج.

### گرنگی نوێژ لە وەفاداربوون بە مافەکانی مرۆڤەوە:

نوێژ قوتابخانەیەکە بۆ رێکخستنی کات: گرنگترین شتێك مرۆڤ خاوەنییەتی – لەدوای ژیان– بریتییە لە کات، رێکخستنی کات و ئاگاداربوون لە رۆژ و بەروار و کاتژمێر و دابەشکردنی ئەو کاتانە و بەفیڕۆنەدانیان لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی تاك و کۆمەڵگەیە لە هەموو چاخ و سەردەمێکدا، هۆی پێشکەوتنی ژیاریی هەندێ لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو بۆ رێکخستنی کات دەگەڕێتەوە، نوێژ قوتابخانەیەکە مرۆڤ رادەهێنێت لەسەر رێکخستنی کات و دابینکردنی هەر بەشێك لەو

کاتە بۆ کارێکی دیاریکراو کە پابەند دەبێت بە هەستان پێی بەرانبەر بە خۆی و کەسانی تر.

نوێژ کارگەیەکە بۆ سەرهەڵدانی وزەی رۆحی: نوێژ بەهێزترین هۆکارێکە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و پەروەردگاری، و گرنگترین هۆکارە بۆ سەرهەڵدان و بەهێزکردنی وزەی رۆحی، مرۆڤ لە رۆژێکدا پێنج جار پەیمانی خۆی نوێ دەکاتەوە بەوەی گەردنکەچ بێت بۆ دەستووری خودا و جێبەجێکار بێت بۆ فەرمانەکانی کە بۆ خێری هەموو مرۆڤایەتی هاتوون و دووربکەوێتەوە لە نەهیلێکراوەکان و یاخیبوونەکان کە زیان بە تاك و بە کۆمەڵگە دەگەیەنێت.

پوختەی قسان نوێژ پارێزەرێکە مرۆڤ لە ئاکاری تاوانکارانە دەپارێزێت، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ﴾[1]

نوێژ لە گرنگترین رێگەکانی خۆپارێزییە لە ئاکار و رەفتاری تاوانکارانە گەر بە رۆح و جەوهەر و ناوەرۆك و خوشوعی خۆی جێبەجێ بکرێت، لەگەڵ چوونە ژوورەوەی نوێژکەر بۆ کرۆکی ئەوەی لە هەموو رکاتێکدا بە پەروەردگاری خۆی دەڵێت: ﴿ اهدِنَــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ﴾[2]

بەڵام لە واقیعی کرداریدا زۆرێك لە نوێژخوێنان لەم سەردەمەدا راهاتوون لەسەر هەستان بەم ئەمانەتە وەك چاولێکەرییەك بۆ باب و باپیران، وەك راهاتن لەسەر جگەرەکێشان، بە رووالەت و توێکڵ و خاڵی لە کرۆك نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن، جووڵەکانیان لە نوێژدا خاڵییە لە مەرام و ناوەرۆك، بۆیە نابینین نوێژ رۆڵێکی کاریگەری لەسەر نوێژخوێنان هەبێت بۆ رێگرییان لە غەش و ناپاکی و درۆ و بەدەستهێنانی قازانجی ناڕەوا لەسەر گیرفانی کەسانی تر و هاوشێوەکانی ئەمانە لە کاری خراپ و ناپەسەند.

---

[1] العنكبوت : ٤٥

[2] الفاتحة : ٦– ٧

### گرنگی ڕۆژوو لە وەفاکردن بە مافەکانی مرۆڤ:

ڕۆژوو خولێکی ساڵانەیە ماوەکەی مانگێکە، لەسەر هەر مرۆڤێکی باڵغی ئاقڵی بەتوانا پێویستە لە هەموو ساڵێکدا بەشداری ئەم خولە بکات، بۆ شەحنکردنەوەی وزە ڕۆحییەکەی و ڕاهێنان لەسەر چۆنێتی و چەندێتی ئەوەی لەسەری پێویستە لە هەستان بە ئەمانەتەکەی بۆ خۆی و خێزان و کۆمەڵگە و هەموو مرۆڤایەتی.

ڕۆژوو تەنها خۆگرتنەوە نییە لە خواردن و خواردنەوە هاوسەریکردن وەك باوە و بەربڵاوە لەلای زۆریەی ڕۆژووگران، بەڵکو هەموو ئەندامێك ڕۆژووی تایبەت بە خۆی هەیە و هەموو غەریزەیەکی ناوەکی ڕۆژووی خۆی هەیە.

ڕۆژووی زمان بریتییە لە گرتنەوەی لە هەر قسەیەك کەسی بەرانبەر ئازار بدات، ڕۆژووی دەست دەستدرێژنەکردنە بۆ ماف کەسانی تر، ڕۆژووی لاقەکان نەڕۆیشتنە بۆ کاری حەرام و قەدەغەکراو، ڕۆژووی چاو پاراستنییەتی لە نامووسی خەڵکی، ڕۆژووی غەریزە ناوەکییەکان گرتنەوەی لە سیفەتە خراپەکان لە خۆپەرستی و لوتبەرزی و حەسوودی و ڕق و کینە و جیاخوازی و هاوشێوەکانیان لە سیفەتی ناپەسەند و خراپ، ئەم خۆگرتنەوە و ڕێگرییانە لەخۆ لەم ئایەتە پیرۆزەدا داوای پێکراوە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1]، واتە ڕۆژووی لەسەر فەرز کراوون وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێشوو فەرزی کرد لەپێناو ئەوەی توانا و وزەی ڕۆحی بەدەست بهێنن کە دەتنانبزوێنێت بەرەو پابەندبوون و ئەرکەکانتان بەرانبەر کەسانی تر.

### گرنگی زەکات لە وەفاکردن بە پابەندبوونەکان:

زەکات ڕێژەیەکی سەنیە لە ماڵ و دارایی کە تیادا پێویست دەبێت، ساڵانە لەسەر دەوڵەمەندان فەرزکراوە بە مەبەستی پڕکردنەوەی پێویستی هەژاران و گەدایان، بۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە دەوڵەمەندان لەسەر پێدانی زەکات ناچار بکات گەر بە

---

[1] البقرة : ١٨٣

هەڵبژاردەی خۆیان بەو کارە هەڵنەستان، وەك چۆن خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق(ﷺ) هێزی بەکارهێنا دژ بە رێگرانی زەکات و لەگەڵیان جەنگا و بە پاشگەز بوو لە ئیسلام سەرژمێری کردن، چونکە دەسەڵات بەرپرسە لە کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنەوەی بە رێگەیەك ئامانجەکانی خۆی بهێنێتە دی، بۆیە پێویستە لە هەر دەوڵەتێکی ئیسلامیدا وەزارەتێك بۆ زەکات بوونی هەبێت، چونکە لەم رووانەوە لە وەزارەتی ئەوقاف گرنگترە:

یەکەم: هەژاری و تاوانە ئابوورییەکان کۆتا پێدەهێنێت، یان کەمیان دەکاتەوە لە رێگەی دابینکردنی برێکی شیاو لە پارە بۆ هەر هەژارێك کە دەتوانرێت بەرهەم بهێنرێت وەك سەرمایەیەك بۆ ژیان و گوزەران و خەرجی خێزانەکەی، بە مەرجێك ئەو بەرهەمهێنانە لەژێر چاودێری دەوڵەتدا بێت، گەر ئازادی وازلێبهێنرێت بۆ ویستی دەوڵەمەند لە دابەش کردنی زەکاتی ماڵیاندا ئەوا زەکات ئەو ئامانجە دەستەبەر ناکات، چونکە دابەش کردنەکە بە چەندێتییەکی کەم دەبێت و هەژاری کەسەکە پڕ ناکاتەوە، هەندێ جاریش دەوڵەمەندەکە لە دابەش کردن و پێداندا جێی متمانە نییە.

دووەم: گەر بە شێوەیەکی دروست زەکات بدرێت ئەوا پلە بە پلە سیستمی چینایەتی بێزراو لە کۆمەڵگەدا کۆتا پێ دەهێنێت، بە کەمکردنەوەی ئاستی جیاوازی زیادەڕەو لە نێوان گوزەرانی دەوڵەمەندان و هەژاراندا.

سێیەم: کاتێك هەژار هەست دەکات بەشێکی لە ماڵی دەوڵەمەند هەیە و پێویستە لەسەری لە ماڵەکەی دەریبکات نەك وەك خێرکردن و چاکە بەڵکو بە پێویستبوون و پابەندبوون، لەو بارەدا کەسە هەژارەکە خۆی بە هاوکاری دەوڵەمەندەکە دەبینێت و ئاوات دەخوازێت ماڵ و سامانەکەی زیاد بکات لە جێی ئەوەی ئاواتی تیاچوونی بخوازێت، خۆشەویستی لە ناخیدا بەرانبەر دەوڵەمەندەکە حەشار دەدات لە جێگەی ئەوەی حەسودی پێ ببات و کینەی لێ بکێشێت، لەگەڵی هاریکار دەبێت لە جێگەی ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر ژیان و ماڵی، بڵاوبوونەوەی هەژاری و پەرشبوونەوەی

تاوان لە هەر كۆمەڵگەیەكدا لە دیاردەكانی دواكەوتن و وەفانەكردنە بە پابەندبوون و ئەركەكان.

**گرنگی حەج لە وەفاكردن بە مافەكانی مرۆڤ:**

حەج چەكی لێخۆشبوون و بلیتی چوونە ناو بەهەشت نییە، وەك هەندێ لایان وایە، بەڵكو كۆنگرەیەكی جیهانی ساڵانەیە كە نوێنەرانی گەلانی ئیسلامی لە هەموو سوچێكی جیهانەوە تیایدا بەشدارن، بە مەبەستی خستنەرووی گرفتە ناوخۆییەكان و هاوبەشەكانیان لە بواری بەرگری و ئابووری و سیاسی و بەڕێوەبردن و رۆشنبیری و تەندروستی و ئاسایش، و شتانی تر لە پێویستییەكانی ژیانێكی ئاسوودە.

هەروەها گفتوگۆكردن لەسەر هەموو گرفتەكان كە بۆ گفتوگۆ دەخرێنە روو لە وەرزی حەجكردندا، هەموو بە یەك دڵەوە بە وزەیەكی رۆحییەوە بەگەڕ دەكەون و پاشان چارەسەری گونجاویان بۆ دەبیننەوە و بڕیاری بە كۆمەڵ دەردەكەن لەمەڕ بەشداری هەمووان لە چارەسەری گرفتەكاندا هەر كەس بەپێی توانا و وەفاداری خۆی بە پابەندبوونەكانی بەرانبەر تاك و كۆمەڵگە، و خاڵیكردنەوەی ئەستۆگری لە مافی كەسانی تر و بەرپرسیارێتی بەرانبەری، هەر بەو جۆرە سەرئەنجامی ئەرێیی دەستەبەر دەبێت بۆ كۆمەڵگەی ئیسلامی بە شێوەیەكی تایبەت و خێزانی مرۆڤایەتی بە شێوەیەكی گشتی.

**ئەنجامگیری:**

لەم پوختەیەوە دەربارەی وزەی رۆحی بەدەستهاتوو لە بیر و باوەڕەكان و عیبادەتەكانەوە دەگەینە ئەم ئامانجانە گەر بە شێوەیەكی دروست جێبەجێ بكرێن:

١- خۆڕازلندنەوە بەوەی پێویستە مرۆڤی لەسەر بێت لە كار و سیفەتی چاك و پاك و خاڵیبوونەوە لەو شتانەی پێویستە لێی دووربكەوێتەوە لە كار و سیفەتی خراپ و ناپەسەند، بەو جۆرە كۆمەڵگەیەكی باڵا سەرهەڵدەدات كە هاریكاری و دەستەبەركردن و سۆز و خۆشەویستی و یەكگرتوویی و وەفاداری بە مافەكان و ئەركەكان دەبێت بە كاڵای باڵای.

٢-گەرنکەچبوون بۆ یاسا و پابەندبوون بە دلواکارییەکانییەوە وەك رێزگرتن بۆ سیستمی کۆمەڵگە نەك ترسان لە سزا، بەو جۆرە دیاردەی دەستدرێژکردن بۆ سەر رۆح و ماڵ و نامووسی بێگوناهان لە نهێنی و ئاشکرادا کۆتایی پێ دێت، ئەو دەستدرێژیکاریانەی کە بە دیارترین دیاردەی دواکەوتن و وەفا نەکردن بە ئەرکەکانەوە دادەنرێن.

٣-توندکردنەوەی پەیوەندی نێوان گوفتار و کردار، هەر قسەیەك کە لە خاوەنانی وزەی رۆحییەوە دەردەچێت و کردار و وەفاکردن بە پابەندبوونەکان تەصدیقی دەکەن.

٤-یەکبوونی کەسایەتی مرۆڤ، پەیوەستبوونی دەرەوەی بە ناوەوەی، و پاکبوونەوەی پەنهانی و رزگاربوون لە سیفەتی خراپی دووفلیقانەیی کە پێی دەوترێت دووڕوویی(نیفاق)، بۆیە دووفلیقانەیی تاك لە کۆمەڵگەدا ترسناکترە لە دوژمنی ئەو کومەلگەیە، هۆی شکستی غەزوەی "أحد" لە سەردەمی ریسالەتدا بوونی هەندێ لە دووڕووان بوو لە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەردا(ﷺ)

٥-جێگیربوون و دامەزران و راسترەوی لەسەر بنەماکان کە خزمەت بە کۆمەڵگەی ژیاریی دەکەن و بەشداری دەکەن لە بینای شارستانی و وەفا بە پابەندبوونەکان، لە گرنگترین سیفەتەکانی پیاوەتی و جوامێری راستوەستان و راسترەویە، بۆیە کەسی دواکەوتووی خۆگرەوە لە وەفا بە پابەندبوونەکانی وەك پەرێك وایە لەبەردەم بادا و بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیدا عەودالە بەبێ ئەوەی بەها و بەرژەوەندی کومەڵگەکەی و پابەندبوونەکانی بەرانبەر کەسانی تر بخوێنێتەوە.

٦-سەروەری یاسا و رەچاوکردنی دادپەروەری و یەکسانی لە کومەڵگەی پابەندبوودا لەگەڵ یەکسانی هەلی کار هەر کەس لە مەیدانی پسپۆڕی خۆیدا، بە وزە رۆحییەکان یاسا سەروەر دەبێت و وەفا بە ئەرك و پابەندبوونەکانەوە دەکرێت و رەچاوی دادپەروەری دەکرێت کە بریتییە لە پێدانی ماف بە هەموو

خاوەن مافێك، و یەكسانی دەستەبەر دەبێت كە بریتییە لە هاوسەنگی نێـوان مافەكان و ئەركەكان بۆ تاكەكانی كۆمەڵگە.

٧-یەكێتی ئامانج و سەرهەڵدانی رۆحی هاوكاری و یەكتر تەواوكردن و یەككگرتووی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگەی ژیاریی پابەندبوو بە ئەركـەكانی و دوورخـەرەوەی تۆوی ناكۆكی و دیۆزمـەی هەڵوەشـانی كۆمـەڵ و رزگـاربوو لـە لەمپـەرەكانی جوداخوازی و توانەوەی دەمارگیری بۆ رەگەز و رەنگ و مەزهەب و تایەفە لە بۆتەی وزەی رۆحیدا.

٨-هاریكاری نێوان وزەی رۆحی و مادی بۆ بیناكردنی ژیاری مرۆیی كە خزمەت بە مرۆڤایـەتی دەكـات و بەختـەوەری و ئاسـوودەیی بـۆ تـاك دابـین دەكـات و یەككگرتووی بۆ كۆمەڵگە دەستەبەر دەكات و مرۆڤ هاندەدات بۆ وەفاكردن بـە پابەندبوونەكانی.

٩-وزەی رۆحی خاوەنەكەی دەگۆڕێت بۆ مۆمێك لەپێناو رۆشنكردنەوەی رێگەی ژیاریی و بەختەوەری مرۆیی لەبەردەم خەڵكانی تردا دەسوتێت.

## ج-سزاكان:

كەسی پابەندبوو گەر وزەی رۆحی نەیبزوێنێت بۆ وەفاكردن بـە پابەندبوونـەكانی بەرەو كەسی بۆپابەندبوو، ئەوا لەسەر ئەو كارە ناچار دەكرێت لە رێگەی سزاكانەوە و بەتایبەت پابەندبوونە تاوانكارییەكان، فەقیهانی شەریعەتی ئیسـلام تاوانـەكان كـە سزا پێویست دەكەن بەپێی سروشتی تاوانەكە بۆ سێ بەش دابەش دەكەن:

بەشی یەكەم: تاوانی سنووربەزێنییەكان كە سزاكانیان و بەتاوانـدانانیان بـە دەق دیـاریكراوە، ئـەوەش بریتییـە لـە دەسـتدرێژی بـۆ سـەر مافـەكانی خودا(مافـە گشتییەكان)، یان مافە هاوبەشەكان لە نێـوان خـودا و مرۆڤـدا، و رووی مـاف گشـتی تیایدا زاڵە بەسەر رووی ماف تایبەتدا، لە گرنگترین ئەو تاوانانە تاوانی دزی و رێگری و زینا و تۆمەت و پاشگەزبوونەوە و خواردنی مادە سەرخۆشكەر و هۆشبەرەكانە.

سزای دزی دەستبڕینە بە مەرجی فەراهەمهاتنی پایەکانی و مەرجەکانی و هەلگرتن و نەمانی ڕێگرەکانی، لە مەرجەکانی پیادەکردنی ئەم ،سزایە ئەوەیە کە دزییەکە لەژێر کاریگەری پێویستی و هەژاریدا نەبێت.

سزای کەسی چەتە و ڕێگر کوشتنە یان دەستبڕینە، گەر پایەکان و مەرجەکانی تێدا هاتە دی و ڕێگرەکان هەلگیرابن، ئەمەش بە دوورودرێژی لە کتێبە فیقهییەکاندا خراوەتە ڕوو.

سزای زینا و بوختان بۆ دروست کردن بریتییە لە جەڵدکردن[1]، ئەوەی بەلگەنەویستە ئەوەیە زینا لە شەریعەتی ئیسلامدا سزای سنووربەزێنی بەسەردا پیادە ناکرێت گەر بە چوار شایەت نەسەلمێت، یان بە چوار جار داننانی خودی تاوانکەرەکە بە تاوانەکەیدا لەگەڵ بوونی هەڵبژاردن و پەیبردن و ئاگاهی.

سزای ئەوانەی مادە مەستکەرەکان(سەرخۆشکەرەکان) دەخۆنەوە هەشتا جەلد(دار)ە، چل داریان سنووربەزێنییە و چل داریشیان تەمبێ کردنە.

سزای پاشگەز بوو لە ئایینی ئیسلام بریتییە لە کوشتن کە بە سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و کۆدەنگی هاوەڵان جێگیر بووە، گەر کەسی پاشگەز بوو تێکدەر(مفسد) بوو، ئەم سزایە بە دوو مەرج پیادە دەکرێت:

یەکەمیان: داوای تەوبە لێکردنی و پێدانی ماوەیەك بە کەسی پاشگەز بوو بۆ گەڕانەوە لە پاشگەزبوونەکەی.

دووەم: ئەو پاشگەزبوونەی زیان بە کۆمەلگەی ئیسلامی و ئیسلام بگەیەنێت، بەوەی دژ بە ئیسلام بوەستێ بە کردار و قەڵەم و زمان.

بەشی دووەم: تاوانەکانی تۆڵەسەندنەوە و خوێندان، ئەمانەش بریتین لە تاوانەکانی دەستدرێژکاری لەسەر نەفس و ئەو شتانەی لەخوار نەفسەوەن لە

---

[1] سزای زیناکەری ژن و پیاو سەد بەلدە لە هەموو بارەکاندا، وەك خودا دەفەرموێت: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ..الآية)، رەجم لە ئیسلامدا نییە وەك لە کتێبی "لا رجم في القرآن"دا بە بەلگەی ئەقلی و نەقلی سەلماندوومانە.

سەلامەتی ئەندامەكانی مرۆڤ، سزای تۆڵەسەندنەوە كاتێك دەبێت پایەكان و مەرجەكانی فەراهەم هاتبن لە پێش هەمووانەوە مەرامی تاوانكارانە و نەبوونی رێگرەكان، وەك لە فیقهی ئیسلامیدا رۆشن كراوەتەوە، سزای خوێنوەرگرتن لە كاتی دواكەوتن(نەبوون)ی مەرامی تاوانكارانەدایە، خوێنوەرگرتن لە یەك كاتدا سزا و قەرەبووكردنەوەیە.

بەشی سێیەم: تاوانەكانی تەمبێ كردن بریتین لەو تاوانانەی كە دیاریكردنی رادەكەیان بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی سەردەم بەجێهێڵراوە، سزای تەمبێ كردن بۆ ئەم جۆرە سزایانە بەكارهێنراوە، ئەم جۆرە تاوانانە بۆ سێ جۆر دابەش دەبن:

جۆری یەكەم: هەر تاوانێكی سنووربەزێنی شوبهەیەك تیایدا سەریهەڵدا سزا سنووربەزێنییەكەی بەردەبێتەوە(نامێنێت) و لە جێگەی ئەوە سزای تەمبێكردن جێگەی دەگرێتەوە كە وەلی ئەمر(سەرۆكی دەوڵەت بە هاوكاری ئەهلی شورا و ئەهلی دامەزران و هەڵوەشاندنەوە) دیاریدەكات.

جۆری دووەم: تاوانگەلێك كە بە دەقی شەرعی تاوانكارییەكانیان دیاریكراوە لە قورئان و فەرموودەدا، وەك تاوانی جاسوسیكردن و بەرتیل و داگیركردن و ناپاكی لە ئەمانەت، و شتانی تریش لەو تاوانانەی كە لە دەقە شەرعییەكاندا ناویان هێنراوە بەبێ دیاریكردنی سزاكانیان، و لەسەر وەلی ئەمر بە هاوكاری ئەهلی شورا پێویستە سزاكانیان دیاری بكەن بینا لەسەر بنەمای شەرعی: (تاوان و سزا تەنها بە دەقن)، شایانی باسە ئەم بنەمایە شەریعەتی ئیسلام دانی پیادا ناوە پێش یاسا بە سەدان ساڵ لە زۆرێك لە ئایەتەكانی قورئاندا، لەو ئایەتانە: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾[1]

جۆری سێیەم: بۆ وەلی ئەمر هەیە بە هاوكاری ئەهلی شورا تاوان و سزا دابهێنێت لە رێگەی دانانی هەر كردارێك بە تاوان گەر زیان بە كۆمەڵگە و بەرژەوەندی گشتی

---

[1] الإسراء : ١٥

بگەیەنێت و دیاریکردنی سزا بۆ ئەو تاوانە بەجۆرێك لەگەڵ ترسناکی رادەی تاوانەکە گونجاو بێت.

**تایبەتمەندییەکانی مافی گشتی:**

مافە گشتییەکان کۆمەڵێك تایبەتمەندییان هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- سوڵحکردن و بواردن و گۆڕین و ئاڵوگۆڕ قبووڵ ناکەن.

بۆ میراتگران ناگوێزرێنەوە بینا لەسەر ئەم ئایەتە: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[1]

٣- بە مردن و لە دەستدانی لێوەشاوەیی بەرنابنەوە بەهۆی تووشبوونی کەسی تاوانکار بە نەخۆشییەکی ئەقڵی وەك شێتبوون.

٤- گەر کۆبوونەوە و کۆمابوون دەچنە ناو یەکەوە، هەر کەس چەندین جار تاوانی زینای ئەنجامدا بەر لەوەی سزا بدرێت، ئەوا تەنها لەسەر جاری کۆتایی سزا دەدرێت.

تایبەتمەندی یەکەم و دوایین تەنها جیاکەرەوەی تاوانە سنووریەزێنییەکانە.

---

[1] الإسراء : ١٥

# باسی دووەم:
# مافەكانی خەڵكی

فەقیهانی یاسا بە چەندین پێناسە "ماف"یان پێناسە كردووە، هەموویان جێگەی تێـڕوانین و رەخنــەن، لەوانــە پێناســەكەی "ســافینی" بــەوەی دەســەڵاتێكی ویستخوازانەیە بۆ تاك، هەروەها پێناسەكەی "دابـان" بـەوەی دانـەپاڵی شـتێكە بـۆ كەسێك كـە یاسـا دەیپارێزێـت[1]، ئەمانـە و كۆمـەڵێك پێناسـەی تـر لێـرەدا بـواری خستنەڕوو و قسـەكردن نییـە لەسـەریان، لـە پێشـەكی ئـەم باسـەماندا "ماف"مـان پێناسە كرد بەوەی بریتییـە لـە ناوەنـدێكی شـەرعی(یان یاسـایی) لـە باریدایـە ئـەو كەسەی شایستەیەتی و كەسانی تریش سوود(قازانج)ی لێ ببینن.

هەر بەو جـۆرە "مافـەكان"یان دابـەش كـردووە بـۆ چـەندین بـەش لـە شـێوازی جۆراوجۆر، هــەموو لەســەر پێــوەرێكی مــەنتقی ئــەقڵی بینانــ،كراون، و هەنـدێك لـەو پێناسانەش دەچنە ناو یەكترەوە، لەو دابەش كردنانە دابەش كردنی دووانییـە[2] بـۆ مافە مادی و مەعنەوییەكان، بۆیە مافە مادییەكان بریتین لەو مافانەی كە پەیوەستن بە پێویستییە مادییەكانـەوە وەك ئـازادی موڵكـداری و كـار و نیشـتەجێبوون، مافـە مەعنەوییەكان پەیوەستن بە بیری مرۆییەوە وەك ئازادی بیروڕا و بۆچوون، هەشیانە دابەشكردنی سیانییە[3] بۆ مافی تاكەكەسی و مافی فیكری(هزری) و مافی ئابووری، مافی تاكەكەسی وەك ئازادی گواستنەوە و نیشتەجێبوون، مافی فیكری(هزری) وەك ئازادی

[1] المدخل إلى علم القانون للدكتور عباس الصراف والدكتور جورج حزبون، ص١٢١–١٢٢.

[2] الدكتور عثمان خليل عثمان، الإتجاهات الدستورية الحديثة، ص١١١ وما بعدها.

[3] الدكتور ثروت بدوي (النظم السياسية) ص٤٠١.

بۆچوون و بیروباوەڕ و فێربوون، مافی ئابووری وەك مـافی خاوەنـدارێتی و بازرگـانی و پیشەسازی، هەشیانە دابەشکردنی چوارییە[1] بۆ مافی سیاسی و مەدەنی و ئابووری و رۆشـنبیری، هەشـیانە دابـەش کردنـی پێنجییـە[2] بـۆ ئـازادی تاکەکەسـی وەك مـافی ئاسایشداری لە بەندایەتی و ژێردەستەیی، و مافی ئاسایشداری و ئازادی تاك و ئازادی ژیانی تایبەت، و هەروەها بۆ جەستەیی و دەستەبەرکردنی پارێزگـاری لـە سـزادان و لاقەکردن و هاوشێوەکانیان، لە ئازادی رۆشنبیری و مەعنەوی.

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە ئەم دابەشکردنانە زۆربەی بەشەکانیان دەچـنە نـاو یـەکتر هەرچـەند هاوبەشـی شـتێك دەبێـت لـە شـتەکە جیابووبێتـەوە، جیابوونەوەشـی بەرهەڵستی چوونە ناویەکتر دەکات، سەرباری ئەوەی ئەو پێناسانە لەسەر پێـوەری ئەقڵی و مەنتقی جێگیر بینـا نـەکراون، بـەڵکو دابەشـکردنێکن لەسـەر خوێندنـەوەی ناتەواوی واقیع بیناکراون، ئەمەش لەڕووی مەنتقییەوە وەرناگیرێت.

بینا لەسەر ئەمە دابەشـکردنێکی نـوێم هەڵبـژارد کـە لەسـەر پێـوەری زانسـتی و بابەتی و مەنتقی بیناکراوە، ئەوەش مافەکانی مرۆڤ لەڕووی پابەندبوونەوە بـۆ چـوار بەش دابەش دەبێت، چونکە هەریـەك لـە پابەنـدبوو و بۆپابەنـدبوو یـان دوو کەسـی سروشتین، وەك مافی تاك لەسەر تاك، یان دوو کەسی مەعنەوین وەك مـافی کۆمەڵگـە کە لە دەوڵەتدا خۆی دەنوێنێت لەسەر کۆمەڵگە، یان بۆپابەندبوو کەسێکی سروشتی بێت و پابەندبوو کەسێکی مەعنەوی بێـت وەك مـافی تـاك لەسـەر کۆمەڵگـە، یـان بـە پێچەوانەوە بێت وەك مافی کۆمەڵگە لەسەر تاك.

نموونە بۆ هەر یەکێك لەم بەشانە دەخەینە روو، چونکە دانەکانی هەر بەشێك لەم مافانە نایەنە ژماردن و ئامارکردن.

---

[1] الدكتور سعيد محمد أحمد (الإعلان العالمي لحقوق الإنسان) ص٥.

[2] الدكتور أحمد حافظ نجم (حقوق الإنسان بين القرآن والإعلان) ص٣٣٠.

## بەشی یەکەم/ مافی تاک لەسەر کۆمەڵگە:

بەهۆی زۆری ئەم مافانەوە تەنها گرنگترینیان ئاماژە پێ دەدەین و بە مافە پێویستەکان دەست پێ دەکەین کە لە ئوسوڵی فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێت بەرژەوەندییە پێویستەکان یان مەرامە پێویستەکانی شەریعەتی ئیسلام کە بریتین لە: پارێزگاری ئایین(بیروباوەڕ) و ژیان و نامووس و ماڵ و ئەقڵ.

**١-پارێزگاری لە ئایین(بیروباوەڕ یان ئازادی بیروباوەڕ):**

هەموو مرۆڤێك بیروباوەڕێکی هەیە پێیەوە پابەند دەبێت، ئازادی بیروباوەڕ مافی تاکە لە هەر قبوولکردنی ئاینێك کە دەیەوێت و مافی خۆی لە جێبەجێ کردنی دروشمە ئاینییەکانی لە سنووری سیستمی گشتی و ئادابی گشتیدا، لەسەر کۆمەڵگە –کە لە دەوڵەتدا نوێنەرایەتی دەکرێت– پێویست دەبێت ئەم مافە پارێزگاری لێبکات، سەرچاوەکەی بریتییە لە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا، لەوانە: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾[1]، هەروەها ئەو ئایەتەی قسەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەی پێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾[2]، هەروەها ئەو ئایەتەی کە سەرزەنشتی پێغەمبەری پێ دەکات لە زۆرلێکردن لە هەندێ خەڵکی بۆ وەرگرتنی ئیسلام: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾[3]، لە جێگەی زۆرلێکردن و ناچارکردن خودا فەرمانی کردووە موسڵمانان خەڵکانی ناموسڵمان بانگ بکەن بۆ وەرگرتنی ئیسلام بە ئەقڵ و بەڵگەهێنانەوە و مەنتق و حیکمەت و ئامۆژگاری جوان و باش، دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾[4]، نهێنی لە ناچارنەکردنی خەڵك بۆ وەرگرتنی

---

[1] البقرة : ٢٥٦

[2] الغاشية : ٢١–٢٢

[3] يونس : ٩٩

[4] النحل : ١٢٥

بیروباوەڕی ئیسلام کە بە دڵ قەناعەتی پێی نییە ئەوەیە کە ئەو زۆرلێکردنە سەردەکێشێت بۆ دروستبوونی کەسایەتییەکی دوو فلیقانە(دووڕوو)، کەسێك کە رووالەتی پێچەوانەی ناوەوەیە، شاراوە نییە ترسناکی ئەو جۆرە کەسایەتییە لەسەر کۆمەڵگە و تاك زۆر زیاترە لە ترسناکی دوژمنێکی ئاشکرا.

**٢- پارێزگاری لە ژیان:**

پارێزگاری لە ژیان لە پێویستییەکان ئاستی دووەم داگیردەکات دوای پارێزگاری لە ئاین و ئازادی بیروباوەڕ، پارێزگاری نەفس و ئەوەی لە خوار نەفسەوەیە بۆ تاکەکان ئەرکێکی سەر شانی کۆمەڵگەیە، بۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە کە نوێنەرایەتی کۆمەڵگە دەکات تەولوی پێویستییەکانی ئەو پارێزگارییە فەراهەم بکات، سەرچاوەی ئەم مافەش بریتییە لە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا، لەوانە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ﴾[1]، هەروەها ﴿مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً﴾[2]، هەروەها﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[3]، هەروەها ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ﴾[4]، ئەمانە و چەندین ئایەتی تر کە دەست بۆ ئەو پارێزگاریکردنە دەبەن.

**٣- پارێزگاری لە نامووس:**

شەریعەتی ئیسلام گرنگیداوە بە پارێزگاری ماف نامووس و رەچەڵەك بەهۆی گرنگی و ترسناکییەوە، چونکە پەیوەستە بە شەرەفی مرۆڤ و ناوبانگی خێزانەوە، بۆ پارێزگاری لەو مافە ئیسلام بۆ سەلماندنی تاوانی زینا چوار شایەتی بە مەرج گرتووە، سەرچاوەی ئەم مافە بریتییە لە قورئان، وەك لە ئایەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ

---

[1] الإسراء : ٣٣

[2] المائدة : ٣٢

[3] البقرة : ١٩٤

[4] المائدة : ٤٥

فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾[١]، هەروەها لە ئایەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾[٢]، هەروەها ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[٣]

**٤- پارێزگاری لە ماڵ و مافی موڵکداری:**

ئەم مافەش ئیسلام بە بەرژەوەندییە پێویستەکانی دادەنێت و کۆمەڵگە پابەند دەکات دەستدرێژی نەکاتە سەری، پێویستە دەوڵەت پارێزگاری بۆ فەراهەم بکات، سەرچاوەکەی قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾[٤]

**٥- مافی یەکسانی لەبەردەم شەرع و یاسادا:**

مەبەست بە یەکسانی مانای لەبەرچاونەگرتنی پێکهاتەکان و لێوەشاوەیی خوبییەکان و شارەزاییە تاکەکەسییەکان و ئەوەی هەر تاکێك پێشکەشی دەکات لە سوود و قازانج و خزمەت بە کۆمەڵگەکەی ناگەیەنێت، بەڵکو مەبەست پێی یەکسانییە لە مافەکان و ئەرکەکاندا، واتە هاوسەنگی نێوانیان بەجۆرێك مافەکان زیاتر نەبن لە ئەرکەکان و ئەرکەکانیش زۆرتر نەبن لە مافەکان، بۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە ئەم پارێزگارییە بۆ یەك بەیەکی تاکەکان فەراهەم بهێنێت، سەرچاوەی ئەمەش قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[٥]

---

[١] الإسراء : ٣٢
[٢] النور : ٢
[٣] النور : ٤
[٤] النساء : ٢٩
[٥] الحجرات : ١٣

**٦-مافی ئازادی بیروڕا:**

لەسەر دەوڵەت پێویستە پارێزگاری لەم مافە بکات گەر دوو مەرجی تێدا بوو: یەکەمیان ئەوەیە کە بیروبۆچوونەکە بەرهەڵستکاری نەکات لەگەڵ سیستمی گشتیدا، مەبەست پێی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکی گشتی بێت، سەرچاوەی ئەمەش قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾[1]

ئەم ئایەتە دەربارەی ئافرەتێك دابەزی (خولة بنت حكيم) و قسەکردنەکانی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەمەڕ کێشەی جیابوونەوەی لە هاوسەرەکەی (أوس بن الصامت) بوو لەمەڕ زیهارکردنی پیاوەکە لە ژنەکەی، زیهار ئەوەیە ژنەکەی بە یەکێك لە مەحرەمەکانی خۆی بشوبهێنێت، لەپێش ئیسلام زیهار وەك تەڵاق وابوو، ئافرەتەکە دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا، هاوسەرکەم ئەوس، ماڵەکەی خواردم و گەنجێتی تیابردم، و سکی هەڵگوشیم تا تەمەنم بەساڵاچوو و لە منداڵبوون برامەوە پشتی تێکردم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەڵامیدایەوە: (وادەبینم تۆ لەسەر ئەو حەرامکراوی)، خەولە جارێکی تر کەوتەوە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بە ئەوپەڕی ئازادییەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد و پێی دەوت: من منداڵم لەو هەیە گەر بیاندەمە دەستی ئەو تیادەچن، گەر بیانگرمە خۆم برسی دەبن، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەمان شتی پێشووی پێ دەفەرموو، ئافرەتەکەش بە هەموو ئازادییەکەوە پێداگری دەکرد و قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکرد، ئافرەکە پێی وابوو ئەو حوکمە حوکمێکی نادادپەروەرانەیە، بۆیە ئایەت بۆ سەرخستنی ئەو ئافرەتە و تەواوی ئافرەتانی تر دابەزی.

زیهار لە سەردەمی نەفامیدا تەڵاق بوو، پێغەمبەر ئیجتیهادی کرد و بەو عورفە کاری کرد، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي...الخ﴾

---

[1] المجادلة : ١

**٧-مافی ئازادی گواستنەوە:**

دروست نییە دەوڵەت ئازادی گواستنەوەی تاك كۆتوبەند بكات، مەگەر لە سنووری بەرژەوەندی گشتیدا، سەرچاوەی ئەم مافە قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾[1]

بەم برە لە مافەكانی تاك لەسەر كۆمەڵگە دەوەستین، لەبەر ئەوەی لەم جۆرە باسانەدا ناتوانرێت هەژمار بكرێن.

## بەشی دووەم: مافەکانی کۆمەڵگە لەسەر تاک:

لە ئیسلامدا وەك چۆن تاك مافی لەسەر كۆمەڵگە هەیە كە لە دەوڵەتدا خۆیدەبینێتەوە، هەر بەو جۆرە كۆمەڵگەش لەسەر تاكەكان مافی هەیە، هەموو مافێك –جۆرەكەی و سروشتەكەی هەرچییەك بێت– بە كۆتوبەند و چەندین مەرج سنووردار كراوە، قورئان پێیان دەڵێت سنوورەكانی خودا: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[2]، هەموو ئەم كۆتوبەندانە بۆ رەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی(بەرژەوەندی كۆمەڵگە) دانراون.

خودا–سبحانە وتعالی– مەرج و كۆتوبەندی لەسەر خاوەن موڵك داناوە و پێویستە لە كاتی بەرهەمهێنانی موڵكەكەیدا رەچاوی بەرژەوەندی كۆمەڵ بكات، هەندێ لەو كۆتوبەندانە ئەرێیین واتە كردارگەلێكن پێویستە خاوەن موڵك پێیان هەڵبستێت، هەشیانە نەرێیین و لەسەر خاوەن موڵك پێویستە لێیان دووربكەوێتەوە و خۆی لێیان بگرێتەوە، وەك لە خوارەوە هاتوون:

---

[1] الملك : ١٥

[2] البقرة : ٢٢٩

**لە کۆتوبەندە ئەرێنییەکان:**

١- لەسەر خاوەن موڵك پێویستە توخمەکانی بەرهەمهێنان لە زەوی و پارە و تێکۆشان بە مەبەستی پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگەدا بەرهەم بهێنێت، بۆیە حەرام دەکرێت لەسەری پارە خەزن بکات و زەوی کشتوکاڵی پەکبخات و بەرهەمیان نەهێنێت، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە قورئانە لە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[١]، هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ((لەدوای سێ ساڵ کەسی دەستگریەسەردا مافی نامێنێت))[٢]، دەستگرتنبەسەردا بریتییە لە دەستگرتنبەسەری زەوی مردوو بە مەبەستی هەوڵی زیندووکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی.

٢- پابەندبوونی خاوەن موڵك بە پێدانی زەکات لە ماڵەکەی گەر لەو ماڵانە بوو زەکاتی تێدا پێویست دەبێت لە کشتوکاڵ و ئاژەڵ و خانووبەرە و پارە گەر مەرجەکانی زەکاتی تێدا هاتنە دی، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە بریتییە لە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا، لەوانە: ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ﴾[٣]

٣- پابەندکردنی بە خەرجکردنی زیادە لە پێویستییەکانی خۆی و خێزانەکەی لەپێناو بەرژەوەندییەکی گشتیدا و بۆ پڕکردنەوەی پێویستی هەژاران و گەدایان لە کۆمەڵگەدا، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە بریتییە لە قورئان لە چەندین

---

[١] التوبة : ٣٤

[٢] قال الألباني في " السلسلة الضعيفة والموضوعة " ( ٢ / ٢٩): رواه يحيى بن آدم ( ص ٩٠ ) و أبو عبيد القاسم بن سلام ( ص ٢٩٠ ) عن سالم بن عبد الله عن أبيه قال : كان الناس يحتجرون على عهد عمر رضي الله عنه فقال : من أحيا أرضا فهي له . قال يحيى : كأنه لم يجعلها له بالتحجير حتى يحييها. وهذا سند صحيح إلى عمر, و لكن ليس فيه " وليس لمحتجر..". لكن يظهر أن هذه الجملة ثابتة عن عمر, فقد رواها أبو يوسف عنه من طريق ثانية , و يحيى من طريق ثالثة , وهي وإن كانت لا تخلو من ضعف فبعضها يقوي بعضا .

[٣] البقرة : ٤٣

ئایەتدا، لەوانە: ﴿وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾[1]، هەروەها ئایەتی: ﴿وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[2]

**لە كۆتوبەندە نەرێنییەكان:**

١- رێلێگرتن لە پەرەپێدانی سەروەتی دارایی بە غەش و قۆرخكردن و چاوچنۆكی، سەرچاوەی ئەم پابەندكردنە قورئانە لە زۆرێك لە ئایەتەكانیدا، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾[3]، هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): ((كەسی قۆرخكار نەفرەتلێكراوە))[4]، هەروەها: ((تەنها كەسی هەڵەكار قۆرخ دەكات))[5]، هەروەها: ((هەر كەس غەشمان لێ بكات لە ئێمە نییە))[6]

٢- خۆگرتنەوە لە پەرەپێدانی ماڵ و دارایی بە سودی سووخۆرانە، سەرچاوەی ئەمەش قورئانە لە چەند ئایەتێكدا، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافاً مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[7]. ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[8]

---

[1] المنافقون : ١٠

[2] الحديد : ٧

[3] النساء : ٢٩

[4] السيوطي، الجامع الصغير (٩١٧٦).

[5] صحيح مسلم ١٦٠٥، صحيح الترغيب للألباني/ ١٧٨١

[6] إسناده جيد، الترغيب والترهيب للمنذري ٣/٣٣

[7] آل عمران : ١٣٠

[8] البقرة : ٢٧٥

٣- خۆگرتنــەوە لــە زیــادەڕەویی و دەســتبلاَوی و چــرووکی و دەســتنوقاویی، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَّحْسُوراً﴾[1]

٤- ڕێگری لە خاوەن موڵك بۆ تاوتوێكردن و مامەڵەكردن بە ماڵ و دارلییەكەی بە جۆرێك بەرهەڵستی بكـات لەگـەڵ بەرژەوەنـدی خێزانەكـەی و كۆمەڵگەكـەی، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە قورئانە لە چـەند ئایەتێكدا، لەولـە: ﴿وَلاَ تُؤْتُـواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ قِيَاماً﴾[2].

لە مافەكانی كۆمەڵگە لەسەر تاك ئەوەیە هەر پیشەیەك دەیزانێت جێبەجێی بكات و پێیهەڵبستێت، هەروەها هەر پسپۆڕییەكی هەیە لە خزمەتی كۆمەڵگەكەیدا بـەكاری بهێنێت، سەرچاوەی ئەمەش بریتییە لە قورئان لـە زۆرێـك لـە ئایەتەكانیـدا، لەوانـە: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[3]

هەروەها لەو مافانە فەرمان بە چاكە و ڕێگری لە خراپەیە وەك خزمەتی كۆمەڵگە و بەرژەوەندی كۆمەڵگە، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە، ئەم ئایەتەیە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[4]، هـەروەها ئـەو فەرموودەی پێغەمبەر(صـلی الله علیـه وسـلم): ((هـەمووتان شوان(چـاودێریكەر)ن و هەمووتان بەرپرسیارن لەوانەی چاودێرییان دەكەن))[5]

مـافی كۆمەڵگـە لەسـەر تـاك نایەتــە هــەژماردن و ئامـار ناكرێـت، بۆیـە بـەم بـڕە دەوەستین.

---

[1] الإسراء : ٢٩

[2] النساء : ٥

[3] المائدة : ٢

[4] آل عمران : ١٠٤

[5] مختصر صحيح مسلم (٢٠/١٨٢٩)

## بەشی سێیەم/ مافی تاک لەسەر تاک (مافە تاکییەکان)؛

مافەکان تاکەکەسین ئەگەر هەریەك لـە کەسـی پابەنـدبوو و بۆپابەنـدبوو کەسـی سروشتی بن، لەم بەشەدا چەندین لق لە ماف جیادەبنەوە، هەیانە مادی و هەشـیانە مەعنەوی.

### یەکەم/ مافە مادییەکان؛

بەرچاو و تاکەکەسین و هەریەك لەو دوانەش بنەڕەتی و پاشکۆیین:

**١- مادی بەرچاو:** بریتییـە لـە دەسـەڵاتی کەسـێکی دیـاریکراو لەسـەر شـتێکی دیـاریکراو کـە سەرپشـکی دەکـات لـە مامەڵـەپێکردن و بـەکارهێنان و بـەرخۆری و بندەستخستن، گەر رێگرێك بوونی نەبوو نەهێڵێ ئەو کـارە بکـات، هەنـدێ وا گومـان دەبەن[1] ئەم دەسەڵاتانە لەدوای جێگیربوونی مولکدارییەوە جـێگیر دەبـن، ئەمـەش هەڵەیە، چونکە توخمەکانی شتێك لە بووندا پێش شتەکە دەکەون، لـە کاتێکدا ئـەم دەسەڵاتانە تەنها دوای جێگیربوونی مولکداری جێگیر دەبن.

مادی بەرچاوی بنەڕەتی و پاشکۆیی: بنەڕەتییەکە بە خودی خۆیەوە وەستاوە و شـوێنکەوتەی مـافێکی تـر نییـە، وەك مـافی مولکـدار لـە مولکەکانیـدا، پاشکۆشـش شوێنکەوتەی مافی ترە بە تیاچوونی ئەو تیادەچێت، وەك مافی قەرزدەری رەهنگر لە شتە بەرەهنگیراوەکەدا وەك دەستەبەری بۆ قەرزەکەی.

**٢- مادی تاکەکەسی:** ئەمەش مافی پەیوەستە بە ئەستۆگری کەسێکی ترەوە یان پەیوەست بـە مـاڵ و داراییەکـەی، مـافێکی بنەڕەتییـە وەك قـەرزی پەیوەسـت بـە ئەستۆگری قەرزدارەوە، هەروەها مافی بەندکردنی فرۆشراو لە لایەن فرۆشـیارەوە تـا نرخەکەی وەردەگرێت، هەر بەو جۆرە هەندێ جار بۆی هەیە مافی پاشکۆیی بێت وەك

[1] کالعلامة السنهوري، مصادر الحق في الفقه الإسلامي، ٣١/١.
وفي شرح قانون التسجيل العقاري، ١٠٧/١ للأستاذ مصطفى مجيد (من المقرر في القـانون المـدني أن عناصر الملكية ثلاثة، هي: الاستعمال والاستغلال والتصرف).

مـــافی دەســــتیاری بۆکراو(کەفالـــەتبۆکراو) لـــە دەســــتیاری(کەفالەت)دا، ئەمـــەش شوێنکەوتەی مافێکی تاکەکەسی بنەڕەتی راوەستاوە بە ئەستۆگری دەستیارلێکراو کە بریتییە لە قەرزەکە، بۆیە بە کۆتایی ئەوە کۆتایی پێ دێت.

هۆیەکانی ئـەم مافـە مادیانـە بـە هـەردوو بەشەکانیانەوە(بەرچاو و تاکەکەسی) هەمان هۆی بەدەستهێنانی مولکداریە بە شێوەیەکی رەها، سەرچاوەکەی بریتییە لە شەرع و یاسا، مافی هەر لایەك بابەتە بۆ پابەندبوونی لایەکەی تر.

**دووەم / مافە مەعنەوییەکان:**

ئەمانەش هەمیشە تاکەکەسین و دەشبێت خێزانی و مرۆیی بن.

١-مافە خێزانییەکان: ئەمانە هۆیەکانیان بریتین لە پەیوەندییە خێزانییەکان، وەك رەچەڵەك و تەلاق و هاوشێوەکانیان، لە نموونەی ئەم مافانە ئەمانەیە:

أ.مافـە هاوسـەریەکان: ئەمانـەش ئـەو مافانـەن کـە هۆیەکـەیان بریتییـە لـە هاوسەرگیری دروست، ماف بۆ هەریەك لە دوو هاوسەرەکە لەسەر ئەویتریان بوونی هەیە، وەك چۆن هەریەکـەیان ئـەرك لەسـەر شـانییەتی بەرانبـەر بـە ئەویتریان، هۆی ئەم مافە بریتییە لە هاوسەرگیری دروست، سەرچاوەی ئەم مافە قورئانە لە زۆرێك لـە ئایەتەکانیدا، لەوانـە: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1]

هەروەها﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾[2]

هـەروەها ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ﴾[3]

---

[1] البقرة : ٢٢٨

[2] البقرة : ٢٣١

[3] البقرة : ٢٣٦

هەروەها ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾[1]

هەروەها ﴿وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ﴾[2]

ئەمانە و زۆرێك لە ئایەتی تر کە بەڵگەن لەسەر مافە هاوسەرداریيە مادی و مەعنەوییەکان.

مادییەکان لەژێر مافە داراییەکاندا دادەنرێن کە پێشتر باسکراون، ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە مافە مەعنەوییەکانە، ئەوەش بریتییە لە چێژوەرگرتن(خۆشیوەرگرتن)ی هەر هاوسەرێك لەویتریان و مامەڵەی جوان لەگەڵ یەکتر و رێزگرتنی ئاڵوگۆڕ و نرخاندنی بەرانبەر و ئازارنەدانی یەکتر لەڕووی مادی و مەعنەوییە.

ئەوەی رۆشنە ئەوەی مافەکانی هەر لایەك لە دوو هاوسەرەکە بریتین لە بابەتی لایەکەی تر.

ب- مافە رەچەڵەکییەکان وەك مافی بنجەکان(الأصول) لەسەر لقەکان(الفروع) و مافی لقەکان لەسەر بنجەکان، بە هەمان شێوە مافی هەموو خزمان و نزیکانی تر هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان، هەروەها هۆیەکانی ئەم مافانە بریتین لە خزمایەتی و رەچەڵەك، سەرچاوەی ئەم مافانە بریتییە لە قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا، لە مافی بنجەکان لەسەر لقەکان: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾[3]

---

[1] النساء : ١٩

[2] النساء : ٢٥.. والأجر هو الصداق.

[3] الإسراء : ٢٣-٢٤

هەروەها ئایەتی ﴿ووَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾[1]

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە هەموو مافە مادی ومەعنەوییەکان کە رۆڵەکان بەرانبەر باوکان و دایکان پێیانەوە پابەند دەبن هەیانە مادییە و هەشیانە مەعنەویین، مادییەکان پێشتر باسمان کردوون، مەعنەوییەکانیش بریتیین لە رێزی دایك و باوك و نرخاندنیان و شاندانە ژێر ئەو شتەی لە داواکارییەکانی بەردەوامی ژیانی ئەو دوانەیە بە ئاسوودەیی و بەختەوەری لە بوارە مەعنەوییەکاندا، وەك چۆن لەسەری پێویستن لە بواری مادی و بۆخەرجکردندا، مافەکانی باوك و دایك لەسەر رۆڵەکانیان برتییە لە بابەتی پابەندی رۆڵەکان.

لە سەرچاوەکانی مافی لقەکان لەسەر بنجەکان: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً﴾[2]

داواکاری و پێویستییە پەروەردەیی و فێرخوازی و رێنموونیکەری و سەغڵەمی، و هاوشێوەکانی ئەمانە لەژێر تێگەیشتنی ئەم ئایەتە جێیان دەبێتەوە کە پەیوەستن بە سەرهەڵدانی کەسایەتی رۆڵەکانەوە.

هەروەها ئایەتی ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم﴾[3]

هەروەها ئایەتی ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[4]

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە رۆزی و پۆشاکی فەرمانپێکراو لەم ئایەتەدا لەپێناو منداڵدایە کە ئافرەت سەرپەرشتیاری شیردان و بەخێوکردنی دەگرێتە دەست.

---

[1] لقمان : ١٤

[2] التحريم : ٦

[3] الإسراء : ٣١

[4] البقرة : ٢٣٣

لــە مافــە مەعنەوییــە خێزانییــەكان مــاف سەرپەرشــتیاری و وەســێتداری و شیرپێدان و بەخێوكردنە، ئەو مافانە لـە راسـتەقینەیاندا بـریتین لـە كۆمـەڵێك ئەرك لەسەر پێهەستاوان زیاتر لەوەی ماف ئەوان بێت.

بۆیە دروست نییـە بـۆ لێبەرپرسـان لێیـان دابـەزن بـۆ كەسـانی تـر و مامەڵـە تیاكردنیان بە قەرەبوویەك یان بە شتێك لەخوار ئەوەوە.

لە مافە خێزانییەكان لە نێوان خزماندا سیلەی رەحم و كۆمەكی كردنی مادی و مەعنەوی لە كاتی پێویستدا، سەرچاوەی سیلەی رەحم بریتییە لە سـوننەتی پێغەمبەر.[1]

٢- مافە مرۆییەكان(كۆمەڵایەتییەكان): ئەمانەش بریتین لە مـاف مـرۆڤ لەسـەر بـرا مرۆڤەكەی سەرەرای نەبوونی هۆیەك وەك هاوسەرگیری و خزمایەتی، هۆی ئەم مافانە برایەتی مرۆیین وەك خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾[2]، مەبەسـت بـە "التعارف" لەم ئایەتەدا بریتییە لە كۆمەكی و هاریكاری ئابووری و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سەغڵەمی و كارگێڕی و سیاسی، و شتانی تریش لە پەیوەندییـە مرۆییە نامادییەكان، هەروەها ئایەتی﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[3]، ئـەوەی لـە قورئانـدا هـاتووە لـە مـاف و ئەركـەكان لەسـەر بنچینەی برایـەتی مرۆیـی پێغەمبـەری مـەزن(صـلی الله علیـه وسـلم) دووپـاتی كردۆتەوە بە كردارەكان و گوفتارەكـانی، لـەو فەرموودانـە: ((یـەكێك لـە ئێـوە باوەڕی تەواو نییە تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ براكەی -یـان فـەرمووی بـۆ

---

[1] هناك أحاديث نبوية كثيرة بصدد وجوب صلة الرحم والتزام القريب تجاه قريبه، منها كما جاء في صحيح مسلم ١٩٨١/٤: ((عن عائشة قالت: قال رسول اللهﷺ: الرحم معلق بالعرش، تقول من وصلني وصله الله ومن قطعني قطعه الله)).

[2] الحجرات : ١٣

[3] المائدة : ٢

جیرانەکەی- پێیخۆش نەبێت))، هەروەها فەرموودەی: ((ئەو کەسە باوەڕدار نییە تێردەبێت و جیرانەکەی تەنیشتی برسییەتی))[1],[2]

قورئان بە دەق بەتایبەت دەربارەی مافی جیران لەسەر جیران پێداگری کردووە و لەریزی عیبادەت کردنی خودا و چاکە لەگەڵ دایک و باوک دایناوە، و دەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ[3] وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ﴾[4]، پێغەمبەری مەزن(صلى الله عليه وسلم) بە گوفتار و بە کردار دووپاتی ئەم

---

[1] قال الألباني في "السلسلة الصحيحة" ٢٢٩/١: رواه البخاري في "الأدب المفرد" (١١٢) والطبراني في "الكبير" (١/١٧٥/٣) والحاكم (١٦٧/٤) وكذا ابن أبي شيبة في "كتاب الإيمان" (٢/١٨٩)

[2] وقد تناول الغزالي رحمه الله بالبحث واجبات الإنسان على أخيه الإنسان، منها:

١- أن لا يؤذي أحدا بفعل أو قول.

٢- أن لا يزيد في الهجر لمن يعرفه على ثلاثة أيام، مهما غضب عليه.

٣- أن يتواضع لكل شخص ولا يتكبر عليه.

٤- أن يحسن إلى كل من قدر على الإحسان إليه بلا تمييز.

٥- أن لا يدخل على أحد في بيته ومسكنه إلا بإذنه.

٦- أن يخالق الجميع بخلق حسن ويعامل كل إمرء بحسب طريقته.

٧- أن يوقر المشايخ ويرحم الصبيان.

٨- ان لا يعد أحداً بوعد غلا ويفي به.

٩- أن ينصف الناس من نفسه فلا يعاملهم إلا كما يجب أن يعامل.

١٠- أن يزيد في توقير من تدل هيئته على علو منزلته.

١١- أن يصلح ذات البين مهما وجد إلى ذلك سبيلا.

١٢- أن يستر عورات الناس كلهم.

١٣- أن يصون عرض أخيه ونفسه وماله من ظلم غيره مهما قدر ويرد عنه.

١٤- أن يجامل اخاه ويواسيه إذا بلي بشرّ.

يُنظر الأخلاق عن العزالي، للأستاذ زكي مبارك، ص٢٦٦. وما بعدها.

[3] أي الجار البعيد في الجوار أو في النسب.

[4] النساء : ٣٦

مافەی کردۆتەوە کە لە ئایەتەکەدا هاتووە و دەفەرموێت: ((هەر کەس باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با چاکە لەگەڵ دراوسێکەی بکات))[1]

## بەشی چوارەم/ مافی کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵگە:

بەرهەمی گەشە و گۆڕان لە ژیاندا کۆمەڵگەکان و گەلان گۆڕان بۆ کۆمەڵێك دەوڵەت و سیستمی سیاسی کە ماف و ئەرك لە نێوانیاندا هەیە و پەیماننامەی وڵاتە یەکگرتووەکان بەڕێوەیان دەبات و یاسای نێودەوڵەتی گشتی ڕێکیان دەخات، بنچینەی ئەم ماف و ئەرکانە لە یاسای نێودەوڵەتیدا بریتییە لە بەرژەوەندی هاوبەش و رووبەڕووبوونەوەی هاوشێوە و عورفە نێودەوڵەتییەکان و ڕێکەوتنەکان، ئەم بنچینانە جیاوازن لە بنچینەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پەیوەندی نێوان گەلان و نەتەوەکان لە ئیسلامدا، بنچینەکانی ماف و ئەرکە نێودەوڵەتییەکان لە ترازووی شەریعەتی ئیسلامدا بەم جۆرەن:

١- برایەتی مرۆیی: وەك پێشتر باسمان کرد، هەموو گەلان و نەتەوەکان لە جیهاندا برا و خوشکن لە یەك باوك و دایك و لە یەك کانزاوە هاتوون کە خاك و خۆڵە, خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾[2]

ڕەوشتی برایەتی بریتییە لە هاریکاری و خۆشەویستی و تەواوکاری یەکتر و دەست لەناو دەستی، وەك خودا-سبحانە وتعالی- هۆی دروستکردنی مرۆڤی لە یەك دایك و باوك بەستۆتەوە بە﴿لِتَعَارَفُوا﴾ واتە بۆ ئەوەی کۆمەك و هاریکاری و دەست لەناو دەستی و یارمەتی یەکتری ئەنجام بدەن و دوور بن لە دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانی یەکتر و کەمتەرخەمی لە ئەرکەکانتان.

---

[1] صحيح مسلم (٧٧/٤٨).

[2] الحجرات : ١٣

٢-مولكییەتی زەوی و ئەوەی تێیدایە بۆ خودایە-سبحانە وتعالی-: مولكداری رووالەتی تەنها وەك بریكار و جێنشین وایە، بۆیە لەسەر بریكار پێویستە پابەندبێت بە مەرجەكانی بریكارگرەوە، لە گرنگترین ئەو مەرجانە كۆمەكی و هاریكاری لەسەر چاكە و تەقوایە، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[1]

٣-رەگەزنامەی موسڵمان بریتییە لە ئیسلام، و ئەوەی لەسەر زەوی دروستكراوە مولكێكی هاوبەشە لە نێوان تاكەكانی خێزانی مرۆڤایەتیدا لە هەر شوێنێ كۆچبكەن و نیشتەجێ بن، سەرەڕای ئەوەش لە ئیسلامدا شتێك نابینیتەوە رێگری بكات لە گەلان بۆ رێكخستنی ژیانی سەربەخۆی خۆیان بۆ دوورخستنەوەی زیادەڕەوی و دەستدرێژكارییەكانی گەلانی تر.

خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾[2]

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ﴾[3].

هەروەها: ﴿قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا﴾[4]

ئەمانە و دەیان ئایەتی تر ئاماژە دەكەن: ئەو شتانەی لەسەر زەوی و دەرەوەی زەوی و ناوەوەی زەوی دانراون بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستكراون، ئەوانە ماڵێكی هاوبەشن لەسەر رێگەی موباحبوونی بنەڕەتی، بۆ هەر تاكێك هەیە سوود و قازانجیان لێ ببینێت لە سنووری دیاریكراودا بەجۆرێك تێنەپەڕێت بۆ سەر مافی خەڵكانی تر.

**ئەنجامگیرییەكانی ئەو بنچینە باسكراوانە:**

لەسەر ئەو بنچینە ئاماژەبۆكراوانەی مافەكانی مرۆڤ و ئەركەكانی سەرشانی لە ئیسلامدا ئەم ئەنجامانە سەرهەڵدەدەن:

---

[1] المائدة : ٢

[2] البقرة : ٢٩

[3] الملك : ١٥

[4] النساء : ٩٧

**یەکەم- بنەڕەت لە ئیسلامدا لە پەیوەندییەکانی نێوان گەلان و نەتەوەکان و دەوڵەتاندا بریتییە لە ئاشتی و جەنگ هەڵاوردەیە**، ئەمە ئەوەیە قورئـان بـە دەق ئاماژەی پێ دەکات لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا، لەوانە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾[1].

هەروەها ئایەتی: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ﴾[2]

ئەمانە و دەیان ئایەتی تر کە فەرمان بە شێوێنکەوتنی ڕێگـەی ئاشـتی دەدەن و پەنابردن بـۆ بـەکارهێنانی هێـز لـە چارەسـەری کێشـە و ململانێکانـدا شـوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتانە کە دوژمنی مرۆڤـە، سـەرباری ئەمـە، ئـەوەی ئامـاژە دەکـات بنەڕەت لە ئیسلامدا بریتییە لە "ئاشـتی" وشـەی "سـلام" و داتاشـراوەکانیەتی لـە قورئاندا (١٣٣) جار هاتوون، لەوانە: ﴿وَاللّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلاَمِ﴾[3].

پاشان ئیسلام فەرمانی کردووە بەوەی سڵاوکردنی ئاڵوگۆڕکراوی نێـوان خـەڵکی بەیانیان و ئێواران بریتی بێت: "السلام علـيكم" و "علـيكم السـلام" کەسـی نوێژکـەر دەبـێ بڵێـت: "السـلام علـيكم ورحمـة الله وبركاتـه، السـلام علينـا وعلـى عبـاد الله الصالحين" خودی ئیسلام لە وشەی "سلام" داتاشراوە.

**دووەم-جەنگە ڕەواکان: لە ئیسلامدا جەنگی ڕەوا بوونی نییـە**، جگـە لـە دوو حاڵەت:

حاڵەتی یەکەم: بریتییە لـە حاڵـەتی بـەرگری شـەرعی، خـودا-سـبحانه وتعـالى- دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[4].

---

[1] البقرة : ٢٠٨

[2] الأنفال : ٦١

[3] يونس : ٢٥

[4] البقرة : ١٩٤

حاڵەتی دووەم: بۆ پاڵپێوەنان و لادان و هەڵگرتنی فیتنەیە، دەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ﴾[1]

**بنەما و وەسیەتەکانی جەنگە رەواکان:**

گەر جەنگ لە ئیسلامدا هەڵواردە بێت: ئەوا لەم حاڵەتە هەڵواردەییەدا بەرەهایی وازی لێنەهێناوە، بەڵکو بە کۆمەڵێك وەسێت و بنەما کۆتوبەندی کردووە، لەوانە:

أ- لە وەسێتەکانی قورئان ئەوەیە پێویستە بەرگری بە ئەندازەی دەستدرێژکارییەکە بێت، گەر لەو رادەیە تێپەڕی بەرگری دەگۆڕێت بۆ دەستدرێژی، قورئان بە دەق ئاماژەی بەمە کردووە: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[2]

ب- لە وەسێتەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): ((غەدر مەکەن, زیادەڕەوی مەکەن، منداڵ مەکوژن))[3]، ((کۆمەڵێك پیاو دەبینن لە خەڵوەتگاکانیاندا کەناریان گرتووە لە خەڵکی، هێرش و پەلاماری هیچ کام لەوانە مەدەن، مەگەر بە خێر و چاکە، هەندێکی تر دەبینن بۆ شەیتانەکانن...... ئەوانە بە شمشێر سەریان لە جەستەیان جیابکەنەوە، کەسی بە تەمەن و ئەفتادە و بچووك و شیرەخۆرە مەکوژن، ژن مەکوژن و دارخورما مەبڕنەوە))[4].

ج- لە وەسێتەکانی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق(ﷺ): (ناپاکی مەکەن و زیادەڕەوی مەکەن، غەدر مەکەن و مردوو مەشێوێنن، منداڵی بچووك مەکوژن، پیاوی پیر و ئافرەتی پیر مەکوژن، دارخورما مەبڕنەوە ومەیسوتێنن، داری

---

[1] البقرة : ١٩٣د-

[2] البقرة : ١٩٤

[3] صححه الألباني في صحيح ابن ماجه (٢٣٢٤).

[4] أورده ابن عساكر في تأريخ دمشق ٢/١٠: إسناده مرسل والمحفوظ أن هذه وصية أبي بكر.

بەردار مەبڕنەوە، ئاژەڵی سپی و رەش و مانگا و گا و وشتر سەرمەبڕن)[1]

د- لە وەسێتەکانی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) کە قسە بۆ یەکێك لە سەرکردەکانی سوپای ئیسلام دەکات و دەفەرموێت: من فەرمان دەکەم بە تۆ و ئەوانەی لەگەڵ تۆن لە سەربازان بە تەقوای خودا لە هەموو بارێکدا، تەقوا باشترین چەك و پارێزەرە لە دوژمن، و بەهێزترین پیلانی جەنگە، هەروەها فەرمان دەکەم بەتۆ و ئەوانەی لەگەڵ تۆن زیاتر خۆتان لە گوناه و یاخیبوون بپارێزن وەك لە دوژمنەکەتان، چونکە گوناه و تاوانی سوپا ترسناکترە لەسەر ئێوە لە دوژمنەکەتان، موسڵمانان بە گوناه و یاخیبوونی دوژمنەکەیان لە خودا سەردەکەون، گەر ئەوە نەبوایە هێزی ئێمە زاڵ نەدەبوو بەسەر ئەواندا، چونکە ژمارەی ئێمە وەك ژمارەی ئەوان نییە، گەر لە یاخیبووندا یەکسان بین ئەوا ئەوان بە هێزی خۆیان زاڵ دەبن بە سەرماندا.

هـ- لە وەسێتەکانی خەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبی تالب(ﷺ): (ئاگادارت دەکەمەوە لە خوێن و رشتنی خوێن بەبێ حەلاڵبوونی، هیچ شتێك نییە بە ئەندازەی ئەوە تەنگەژە وناڕەحەتی بۆ مرۆڤ دروست بکات و هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە خراپەی بەدوادا نایەت و هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە نیعمەتەکان تیانابات و کۆمەکی نابڕێت, لە خوێنڕشتن بەبێ مافی خۆی، دەسەڵاتی خۆت بەهێز مەکە بە رشتنی خوێنی حەرام، چونکە ئەوە دەسەڵاتەکەت بێهێز و لاواز دەکات، بەڵکو تیایدەبات و دەیگوێزێتەوە).

**سێیەم: کانزاکانی ناوسکی زەوی و ڕووی زەوی لە کانزا و ناکانزا خودا بۆ هەموو نەوە یەك لەدوای یەکەکان دروستی کردوون**، بۆیە دروست نییە بۆ هیچ نەوەیەك زیاد لە پێویستی خۆی دەربهێنێت، مەگەر بە ئەندازەی پێویستی خۆی، هەر زیادەڕەوییەك لە دەرهێنان و بەکاربردنیدا دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافی نەوەکانی

[1] تاريخ الرسل والملوك للإمام محمد بن جرير الطبري ج٣ ص٢٢٦ ، ط دار المعارف – مصر، ت: محمد أبو الفضل إبراهيم.

داهاتوو و پێچەوانەی ئەو گوتارە ئاراستەکراوەیە کە روو بە هەموو نەوەکانە، لە ئایەتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾[1]

**چوارەم: رووبارەکان و دەریاکان هەر هەموو لە نێوان دەوڵەتاندا هاوبەشن کە** پیایدا گوزەر دەکەن، بۆیە دروست نییە هیچ دەوڵەتێك بە جۆرێك دەستێوەردان بۆ ئەو ئاوانانە بکات زیان بە دەوڵەتانی تر بگەیەنێت کە لەو ئاوانەدا لەگەڵی هاوبەشن.

**پێنجەم: زیادە لەلای هەر گەلێك پێویستە بۆ گەلانی تری هەژار بەکاربهێنرێت،** ئەمەش وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[2]، بنچینەی ئەم حوکمە داوا دەکات ئەوەی لە زەویدایە لە خێر و بێر بۆ هەموو ئەوانە دروستکراوە نیشتەجێی ئەم زەویەن لە مرۆڤ لە هەموو کات و شوێنێکدا، بۆیە دروست نییە ئەو زیادەیە بەکاربهێنرێت بۆ کڕینی چەك و تەقەمەنی کە مرۆڤ دژ بە برا مرۆڤەکەی بەکاری دەهێنێت.

**ئەنجامگیری:**

لەوەی خستمانە روو بە شێوەیەکی کورت و پوخت، ئەوەی پەیوەستە بە تیاپابەندبوو(بابەتی پابەندبوون) دەگەینە ئەم ئەنجامە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- بوارەکانی پابەندبوونی مرۆڤ لە شەریعەتی ئیسلامدا زۆر فروانترە لە بوارەکانی پابەندبوونە یاساییەکان، لەوەوە هەڵەی ئەوانە رۆشن دەبێتەوە کە پێیان وایە پابەندبوون لەپاڵ دەستەبەرکردندا لە فیقهی ئیسلامیدا یەکسانە بە پابەندبوون لە فیقهی خۆرئاواییدا، لە پێشەکی ئەم کتێبەدا قسەمان لەم بابەتە کردووە.

٢- هەر مافێك لە مافە مادی و مەعنەوییەکان هۆیەکەی و سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت پابەندبوون بەرانبەرییەتی، بۆیە ماف "بۆپابەندبوو" پابەندبوونی کەسی "پابەندبوو" بەرانبەرییەتی، ئەمەش ئاماژە دەکات بەوەی مانای

---

[1] البقرة : ٢٩

[2] المائدة : ٢

دادپەروەری و یەکسانی بریتییە لە هاوسەنگی نێوان مافەکان و ئەرکەکان، هەر کەس مافی زیاتر لە ئەرکەکان وەربگرێت ستەمی لە کەسانی تر کردووە، بە تایبەت کۆمەڵگەکەی، بە پێچەوانەی ئەوەوە هەر کەس بەبێ رەزامەندی خۆی زیاد لەو مافانەی وەریدەگرێت ئەرکی دلوا لێکرا ئەوا کۆمەڵگە ستەمی لێکردووە، بۆیە دادپەروەری خودایی و برایەتی مرۆیی دلوای هاوسەنگی کامڵ دەکەن لە نێوان مافەکان و ئەرکەکاندا، هەر تاکێك لە خێزانی مرۆڤایەتی بەدەر لە رەگەز و رەنگ و ئایین و مەزهەبی، چونکە خودا–سبحانە وتعالی– کاتێك فەرمانی بەم یەکسانیە کردووە لە بڕیارەکەیدا رووی گوتاری لە هەموو خێزانی مرۆڤایەتی بووە، دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[1]

٣– هەر مافێك بۆ "بۆپابەندبوو" بریتییە لە بابەتی پابەندبوونی "کەسی پابەندبوو"، ئەو دوانەش دوو هاوبەشی بەشەکانی توخمەکانی پابەندبوونن، هاوبەشی شت لە شتەکە جیادەبێتەوە، بۆیە دروست نییە "قەرز" و "مافی تاکەکەسی" و "پابەندبوون" وشەی هاوواتا بن، وەك هەندێ وا گومان دەبەن و پێشتر لە پێشەکییەکەدا باسمان کردووە.

٤– هەڵەیە مافەکانی خودا پشتگوێ بخرێن و لێپێچانەوە لە کەسی کەمتەرخەم لە پابەندبوونەکانی نەکرێت، بە وەفا کردن بەو مافانە لە یاسادا، بە تایبەت یاساکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، چونکە وەفاکردن بە جێبەجێ کردنی مافەکانی خودا دەستەبەری مافەکانی خەڵکە، هەتا مرۆڤ لەگەڵ پەروەردگاری راستگۆ بێت لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆی راستگۆ دەبێت، پێچەوانەکەشی پێچەوانە دەبێت.

---

[1] الحجرات : ١٣

٥- لە مافەکانی کۆمەڵگە لەسەر تاك، دەسەڵاتی کاتی مافی ئەوەی هەیە تاك ناچار بکات بە هەستان بەو مافانە گەر خۆی بە مافەکان هەڵنەستا، حاڵی ئەو کەسە وەك حاڵی قەرزداری دەوڵەمەندی خۆگرەوە وایە لە گێڕانەوەی قەرزەکەیدا بە هەڵبژاردەی خۆی، بینا لەسەر ئەوە بۆ دەسەڵات هەیە پزیشك و ئەندازیار و مامۆستا و قازی و هەموو خاوەن پیشەیەك ناچار بکات بە هەستان بە کارەکانیان هەر یەکەیان لە زەمینەی پسپۆڕی خۆیدا، گەر کۆمەڵگە پێویستی پێی بوو.

٦- بۆ دەسەڵات هەیە موڵکداری زەوی کشتوکاڵی لە دەستی خاوەنەکانیان وەربگرێتەوە گەر بەرهەمیان نەهێنا یان بە باشی بەرهەمی نەدەهێنا بەجۆرێك خزمەت بە بەرژەوەندی خۆیان و بەرژەوەندی کۆمەڵگەکەیان بکات، چونکە ئەو زەویانە موڵکی خودان و مرۆڤیش جێنشین و بریکاری خودایە، گەر کەسی بریکار کەمتەرخەمی کرد بە مەرجەکانی بریکارییەکەی ئەوا لەو کارە کەنارگیر دەکرێت.

٧- سوودمەند لە مافەکانی خودا خودی مرۆڤ خۆیەتی، چونکە خودا بەرەهایی لە هەموو جیهانان بێنیازە، بۆیە بۆ پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی لەسەر مرۆڤ پێویستە پارێزگاری لە مافەکانی خودا بکات، هەرموو حوکمە شەرعییە داواکراوەکان لە بەرژەوەندی مرۆڤن، خودا-سبحانه وتعالى- روو لە پێغەمبەرەکەی دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[1]، رەحمەت بریتییە لە بەرژەوەندی، بەرژەوەندیش بریتییە لە قازانجێکی هێنراو و زیانێکی لادراو.

٨- مافە مەعنەوییە خێزانییەکان و ناخێزانییەکان ناگوێزرێنەوە بۆ میراتگران، هەر بەو جۆرە هەر مافێك کە تیایدا لایەنی تاکەکەسی بەسەر لایەنی داراییدا زاڵ

[1] الأنبياء : ١٠٧

بێت، وەك مافەکانی خانەنشینی، کاتێك کەسەکە دەمرێت مووچەی خانەنشینی ناگوێزرێتەوە بۆ میراتگران وەك ئەوەی لێجێماو بێت، بەڵکو گواستنەوەی لە رێگەی یاساوە دەبێت لەسەر بنچینەی هەژاری میراتگر و پێویستییەکانی، گەر لێجێماو بوایە ئەوا جیاوازییەك بوونی نەدەبوو لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند لە میراتگران، پاشان کەسی خانەنشین نابێت بە خاوەنی مووچەکەی تا لە دەوڵەت وەرینەگرێت.

٩- مافە خێزانییەکان کە سروشتێکی دوو لایەنەیان هەیە، لە یەك کاتدا مافن و پابەندبوونیشن، بۆیە دروست نییە بەبێ بیانوو لێیان دابەزێت، هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی شایستەیەتی مافی ئەوەی نییە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی بەریان بداتەوە(ئەنجامیان نەدات)، چونکە بۆ بەرژەوەندی کەسانی تر دانیان پیادا نراوە، نەك بۆ بەرژەوەندی ئەو بەتەنها، خۆشی وەرگرتنی پیاو لە ژنەکەی زیاتر پابەندبوونە وەك لەوەی ماف بێت، بۆیە گەر هاوسەریکردن لەگەڵ ژنەکەی بۆ ماوەی چوار مانگ وازلێهێنا -بەبێ بوونی بیانوویەك- ئەوا لە نێوانیان جیابوونەوە سەرهەڵدەدات بەپێی بۆچوونی هەندێ لە فەقیهان[1]، تەنها بە کۆتاهاتنی ماوەکە قازی لەیەکتریان جیادەکاتەوە بە داوای ژنەکە لەلای هەندێکی تر لە فەقیهان[2]، هاوسەرە پیاوەکە بەند دەکرێت تا هاوسەری لەگەڵ ژنەکەی بکات یان تەڵاقی بدات یان-بەپێی بۆچوونی هەندێ لە فەقیهانی تر-

(1) كالحنفية (شرح فتح القدير) ٣/١٨٣ وما بعدها.
(تحفة الفقهاء ٢/٣٠٨.
(بدائع الصنائع) ٤/١٩٦٢.

(2) كالمالكية (شرح الخرشي) ٤/٩١ وما بعدها.
والشافعية (الأنوار) ٢/٢٩٣.
والحنابلة (الأنصاف) للمرداوي ٩/١٨٣ وما بعدها.
(منتهى الإرادات) ٢/٣٢١.

لە بەندیخانەدا تا مردن بمێنێتەوە[1].

هەر بەو جۆرە سەرپەرشتیاری و وەسێتداری و بەخێوکردن و شیرپێدان مافن بۆ ئەو کەسانەی دەیگرنە دەست، بەڵام لە هەمان کاتدا پابەندبوونن، چونکە بۆ بەرژەوەندی ناکامان بڕیاریان لەسەر دراوە، بۆیە مامەڵەپێکردنیان و دابەزین لێیان بەبێ بیانوویەك دروست نییە، وەك چۆن ناگوێزرێنەوە بۆ کەسانی تر لەسەر بنچینەی ئەوەی لێجێماو بن.

١٠-ئاشتی لە ئیسلامدا بنەڕەتە، و جەنگ هەڵواردەیە، بۆیە دروست نییە پەنابرێت بۆ بەکارهێنانی هێز مەگەر لەباری پێویستدا، وەك بەرگری شەرعی، پێویستییەکانیش بە ئەندازە و رادەی پێویستییەکە دیاری دەکرێت، خۆی رووبەڕووی هەڵەیەکی گەورە کردۆتەوە هەموو ئەوانەی کە دەڵێن: ئایەتەکانی ئاشتی و لێبووردن و ئارامگرتن و هاوشێوەکانی بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەنەتەوە[2].

---

[1] كالإمامية (شرائع الإسلام) ٨٤/٢.

[2] يقول هبة الله بن سلامة بن نصر بن علي البغدادي (ت-٤١٠ هـ) في كتابه (الناسخ والمنسوخ) تحقيق الدكتور موسى بناي علوان العليلي، نشر الدار العربية للموسوعات، ص١٢٨ "إنها-أي آية السيف- نسخت من القرآن الكريم مائة آية وأربعاً وعشرين آية، ثم صار آخرها ناسخاً لأولها".

وآية السيف كما هو معروف لدى عشاق النسخ قوله تعالى ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(التوبة : ٥).

في حين أن هذه الآية خاصة بالمشركين الذين نقضوا عهدهم مع الرسول(ﷺ) واعتدوا على المسلمين، وإن الأمر بقتال المشركين في هذا الظرف خاص بحالة الدفاع الشرعي وهذا الحق أقرته جميع الشرائع السماوية والقوانين الوضعية، ولا يوجد تعارض بين آيات السلم والتسامح وبين هذه الآية الخاصة بظرف معين، حتى يُرفع التعارض بالقول بنسخها لتلك الآيات.

ويقول أيضاً، ص٢٠٢ في هذا المرجع "واعلم أن كل ما في القرآن مثل أعرض وتول عنهم وذرهم وما أشبه ذلك، فناسخه آية السيف".

فهذا القول من أبن سلامة خلط بين النسخ والتخصيص، فآية السيف خاصةٌ بحالة الدفاع الشرعي ومخصصة لعموم الآيات التي زعم أنها منسوخة بها، ووقع في نفس الخلط ابن حزم الأندلسي في ←

کتابه الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم، تحقيق الدكتور عبدالغفار سليمان البندلوي، طبعة بيروت، ص١٢ وما بعدها.

وحذا حذوهما بعض المفسرين وغيرهم ممن كتبوا في موضوع النسخ في القرآن، فلا مجال لاستعراض تلك الآراء غير العلمية وغير المنطقية ومناقشتها في مثل هذا البحث الخاص بالالتزامات، فمن يروم التفصيل فليراجع مؤلفنا (التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن).

توخمی پێنجەم لە توخمەکانی پابەندبوون بریتییە لە "پێپابەندبوو"، ئەوەش ئەوەیە کە پابەندبوونی لەسەر راستدەبێتەوە و داوا لە کەسی پابەندبوو دەکرێت پێیەوە پابەند بێت، بە زارەوەی فیقهی و یاسایی پێی دەوترێت گوزارەی "پێهەستان"ی بۆ بەکاردەهێنرێت، پێهەستان یان ئەرێنییە یان نەرێنی، ئەرێنییە و بریتییە لە کردار بە تێگەیشتنە گشتگیرەکە بۆ وتن لە هەموو ئەرکەکاندا، نەرێنییە و بریتییە لە خۆگرتنەوە و دەستگرتنەوە لە کردار لە هەموو حەرامکراوەکاندا.

پوختەی قسان جێبەجێ کردنی فەرمانپێکراو لە فەرمانەکانی شەرع و یاسادا بە کردار دەبێت و نەهێلێکراوەکان لە نەهییەکانی شەرع و یاسادا بە خۆگرتنەوە لە نەهیلێکراوەکان دەبێت. بۆ نموونە "پێپابەندبوو" لە ئایەتی: ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ﴾[1] بریتییە لە هەستان بە نوێژ و دانی زەکات ئەو دوانەش لە کردارەکانن، هەروەها ئایەتی: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾[2] دەستگرتنەوە و خۆگرتنەوە لە کوشتنی نەفس بەبێ ماف و پاساو، هەموو فەرمان و نەهییەك لە شەریعەت و یاسادا بەشێوازی ناچارکردن پابەندبوون و داوایە، و تەنها پەیوەستە بە کاروکردەوەی داوالێکرلوانەوە، گەر پەیوەست بوو بە شتە بەرچاوەکانەوە پێویستە فەرمانەکە بخەملێنین، وەك لە ئایەتی: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ...الآية﴾[3]

واتە هاوسەریکردن یان چێژوەرگرتنی رەگەزی لە یەکێك لەو حەرامکرلوانەی هاتوو لە ئایەتە ئاماژەبۆکراوەکەدا، هەر بەو جۆرە لە ئایەتی ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ

---

[1] البقرة : ١١٠

[2] الأنعام : ١٥١

[3] النساء : ٢٣

ولَحْمُ الْخنْزِيرِ...الآية﴾[1]، دەبێ فەرمانەکە بخەملێنین بۆ کردارێك حەرامبوونی پێوە پەیوەست بێت ئەوەش بریتییە لە خواردنی مردارەوەبوو و گۆشتی بەراز و خواردنەوەی خوێن، ئەمە ئەوەیە زانایانی موسڵمان لە ئوسولییەکان و فەقیهان و شرۆڤەکارانی قورئان کۆدەنگیان هەیە لەسەری.

زۆرێك لە یاساناسان لە یاسادانەران و فەقیهانی یاسا و شرۆڤەکارانی تێکەڵییان لا دروستبووە جارێك لە نێوان "جێگەی پابەندبون" و "بابەتی پابەندبوون"، جارێکی تر لە نێوان "جێگەی پابەندبوون" و "جێگەی گرێبەست"، لەو دەقە یاسایانەی ئەم تێکەڵییەیان تێدا دروست بووە ئەمانەن:

أ.مادەی(١٢٩-١) لە یاسای مەدەنی عێراقی: (دروستە جێگەی پابەندبوون نەبوو بێت لەکاتی گرێدانی گرێبەستەکەدا گەر بەدەستهێنانی شیاو بوو لە داهاتوودا و دیاریکراوبێت بە دیاریکردنێك نەرێی نەزانی و فریو بکات)

تێکەڵ کردن لە نێوان "جێگەی پابەندبوون" و "جێگەی گرێبەست" لەم مادەیەدا رۆشنە، چونکە ئەو پێەهستانەی جێگەی پابەندبوونە بە وەسفی هاتوو تیایدا وەسف ناکرێت، ئەوەی نەبووە لە کاتی سەرهەڵدانی گرێبەست یان پابەندبووندا بریتییە لە جێگەی گرێبەست نەك جێگەی پابەندبوون کە بریتییە لە جێگەی پێەهستان، بۆیە دروستە بوترێت: (گەر جێگەی گرێبەستەکە لە کاتی گرێدانی گرێبەستەکەدا نەبوو بێت، هتد..)

ب-مادەی(١٣١) لە یاسای مەدەنی میسری راوەستاو: (دروستە جێگەی پابەندبوون شتێك بێت لە داهاتوودا) هەروەها مادەی (١٣٢) لە هەمان یاسا: (گەر جێگەی پابەندبوون لە خودی خۆیدا نەشیاوبوو، ئەوا گرێبەستەکە پووچەڵە) دروست لەم مادانەدا ئەوەیە بوترێت: "جێگەی گرێبەست" لە جێگەی ئەوەی بوترێت "جێگەی پابەندبوون".

---

[1] المائدة : ٣

ئەم تێکەڵییە لە فیقھ و یاسای فەرەنسیدا روویداوە، وەك مامۆستای دکتۆر "جميل الشرقاوي"[1] دەڵێت: "بەردەوام هەریەك لە "جێگە" و "هۆ" گرفتن لە فیقهدا لە نێوان گرێبەست و پابەندبووندا، چارەسەرێکیان بۆ نابینرێتەوە سەرەڕای ئەو هەوڵەی هەندێ لە فەقیهان لەم پێناوەدا بەخشیویانە"

"بودان" دەڵێت: لە گرێبەستە پێویستکراوەکاندا بۆ یەکێك لە لایەنەکان تەنها پابەندبوون دەبینرێتەوە، بۆیە جێگەی گرێبەست بە جێگەی پابەندبوون کە لێیەوە سەرهەڵدەدات تێکەڵ دەکرێت، بەڵام لەو گرێبەستانەی بۆ هەردوو لایەنەکە پێویستکراون بەجۆرێك پابەندبوونەکان فرەن هەموو جێگەکانیان دەبنە جێگەیەکی لێکدراو بۆ رێکەوتن.. "بودان" قسەکەی خۆی بە نموونەیەك لە گرێبەستەکانی فرۆشتن رۆشن دەکاتەوە و دەڵێت: جێگەی پابەندبوونی فرۆشیار بریتییە لە شتە فرۆشراوەکە و جێگەی پابەندبوونی کڕیار بریتییە لە نرخەکە کە وەفا لەسەری پێویست دەکات، بۆیە شتی فرۆشراو لەگەڵ ئەو نرخەی پێویست پێیهەڵبستێت هەردووکیان پێکەوە دەبنە جێگەی پێویست بۆ گرێبەستەکە.

پاشان "الشرقاوي" لە قسەکەی بەردەوام دەبێت بە وتنی: "بودان تێبینی ئەوەی کردووە رێکخستنی یاسای مەدەنی فەرەنسی کە جێگە و زنجیرەکەی دەگرێتە خۆ ئاماژە دەکەن بەوەی جێگەی پابەندبوون و جێگەی گرێبەست یەك شتن، واتە ئەوەی بە جێگەی گرێبەست دادەنرێت بریتییە لە جێگەی پابەندبوون بەبێ هیچ جیاوازییەك، ئەمەش تێکەڵییەکە لە نێوان دوو شتی جیابوەوە لەیەکتر"

پاشان"الشرقاوي" رەخنە لە "بودان" دەگرێت و دەڵێت: "بەڵام لە واقیعدا جێگەی پابەندبوونی سەرهەڵدراو لە گرێبەستەکە بریتییە لە خودی جێگەی

[1] طبيعة التصرف القانوني، محاضرات دراسات عليا (ماجستير في جامعة القاهرة) للدكتور جميل الشرقاوي، ١٩٧٢، مطبوعة على الرونيو، ص١١-١٢. وقد كنت أحد تلاميذ الشرقاوي في هذه المحاضرات.

گرێبەست، گەر چەندین پابەندبوون بوونیان هەبێت ئەوا هەموو جێگەکانیان جێگەی گرێبەستن"

لە خستنەڕووی ئەم پوختەیەوە دەبینین ئاراستەی دوایی مامۆستا"بودان" لە ڕەخنەگرتنە ئاراستەکراوەکەی بۆ یاسای فەرەنسی و جیاکردنەوەی نێوان جێگەی گرێبەست و جێگەی پابەندبوون ئارلستەیەکی دروستە، و مامۆستا"الشرقاوي" ورد نەبووە کاتێك قسەی لەسەر قسەکەی "بودان" کردووە، بۆیە کەوتۆتە ناو هەمان تێکەڵییەوە لە نێوان جێگەی گرێبەست و جێگەی پابەندبوون.

شایانی باسە ئاراستەی هەندێ لە فەقیهان لە میسردا لەوانە مامۆستای دکتۆر"سلیمان مرقس" بریتییە لە وەرگرتنی ئەوەی "بودان" بۆی چووە، لە جیاوازی نێوان جێگەی گرێبەست و هۆی هەریەك لە گرێبەست و پابەندبوون لە لایەکەوە و نێوان جێگەی پابەندبوون و جێگەی گرێبەست لە لایەکی ترەوە، کاتێك بۆچوونەکانیان جێگیربووە لەسەر ئەوەی جێگەی پابەندبوون بریتییە لە پێهەستان کە پێویستە لەسەر کەسی قەرزدار پێی هەڵبستێت بۆ بەرژەوەندی قەرزدەر، لەوانەیە ئەو پێهەستانە گواستنەوەی خودی شتەکە یان کارێك یان خۆگرتنەوە لە کارێك بێت، بەڵام هەندێکی تر لە فەقیهانی یاسای میسری جێگەی پابەندبوونیان جارێك کردووە بە شتێکی بەرچاو و جارێکی تر بە کردار، لەوانە خوالێخۆش بوو مامۆستا"السنهوري"[1] کاتێك دەڵێت: پابەندبوون چەندین پەیوەندی دەگرێتە خۆ گرنگترینیان چوار دانەیە: پابەندبوون بە قەرزەوە، پابەندبوون بە خودی شتەکەوە، پابەندبوون بە کردارەوە، پابەندبوون بە متمانەگریی:

١-پابەندبوون بە قەرزەوە جێگەکەی بریتییە لە برێك لە پارە یان هەندێ لە شتی بەرچاو.

[1] مصادر الحق في الفقه الإسلامي ١/١٥.

٢-پابەندبوون بە خودی شتەکەوە بریتییە لەو پابەندبوونەی جێگەکەی شتێکی دیاریکراو(بەرچاو)ە بۆ بەموڵککردنی خودی شتەکە یان بۆ بەموڵککردنی سوودەکەی جا یان رادەستکردنی یان پارێزگاری لێکردنی.

٣-پابەندبوون بە کارێکەوە بریتییە لە پابەندبوونی جێگەی شتێکی دیاریکراو بە گرێبەستی داوای بۆدروستکردن یان هەستان بە خزمەتێك.

٤-پابەندبوون بە متمانەگیری جێگەکەی بریتییە لە کەفالەتی پابەندبوون و سەرچاوەکەی کەفالەتە.

لەم چوار برگەیەدا مامۆستا "السنهوري" لە یەکەم و دووەمدا بابەتی پابەندبوونی کردووە بە جێگەی پابەندبوون، لە کاتێکدا بابەت لە شتە بەرچاوەکانە و جێگە لە کاروکردەوەکانە، بە پێچەوانەی برگەی سێیەم و چوارەمەوە کە جێگەی پابەندبوونی لەو دوانەدا کردووە بە کردار.

دکتۆر "عبد الحي الحجازي" کەوتۆتە ناو هەمان شێواز و تێکەڵکردنەوە دوای ئەوەی دان بەوەدا دەنێت کە جێگەی پابەندبوون بریتییە لە پێهەستان، دەڵێت: "جێگەی پابەندبوون بریتییە لە پێهەستانەکان کە بەپێی فیقهی نەریتی سەرهەڵدەدەن لە پێدان یان کردار یان خۆگرتنەوە لە کردار، بۆیە جێگەی پابەندبوون شت نییە، بەڵکو پێهەستانە"

پاشان دوای یەك لاپەڕە لەم قسەیەی رەخنە لە مادەی (١٠٤) لە یاسای مەدەنی کوێتی دەگرێت: (دروستە گرێبەست بەسەر شتە بەرچاوەکاندا بێت، هەروەها بەسەر سوودەکان(قازانجەکان)دا و بەسەر کرداری هەر شتێکی تردا کە پێوە پابەندبوونیبە یاسا قەدەغە نەکرابێت و پێچەوانەی سیستمی گشتی نەبێت)

لێرەدا سەرنجێکی مادەی (١٠٤) دەدەین کە دەربارەی جێگەی گرێبەست قسە دەکات وەك رۆیشتن لەگەڵ زاراوەی باو، باشتر بوو بڵێت "جێگەی پابەندبوون"، پێویستە لە جێگەی پابەندبووندا چەند مەرجێکی دیاریکراو فەراهەم هاتبن کە بە جیاوازی جۆری پابەندبوون جیاوازن لەیەکتر، گەر جێگەی پابەندبوون چەند

پێهەستانێك بوو مەبەست تێیاندا سەرهەڵدانی مافێك بێت بۆ كەسی قەرزدەر، ئەوا بۆ "جێگە" چەند مەرجێك بە مەرج دەگیرێت لەوانە:

١-دەبێ ئەو شتەی جێگەی پابەندبوونە بوونی هەبێت.

٢-لەناو بازنەی مامەڵەكردندا بێت.

٣-دیاریكرلو بێت و جێگەی دیاریكردن بێت[1].

لە كاتێكدا ئەم مەرجانە بۆ بابەتی پابەندبوونن كـە جێگـەی گرێبەسـتە، نـەك بـۆ جێگەی پابەندبوون كە بریتییە لە پێهەستان، وەك چۆن مامۆسـتا"الحجـازي" دانـی پیادا دەنێت، ئـەم دژبەیەكییـە لـە دوو لاپـەڕەی هـاتوو بـەدوای یـەكتردا لـەپێناوی چیدایە؟

خوالێخۆش بوو دكتۆر"عبدالمجيد الحكيم"-رەحمەتی خودای لێ بێت- كەوتۆتە ناو هـەمان تەومـژ و تێكەڵییـەوە چـاولێكەری بـۆ ئـەوەی یاسـادانەری عێراقـی لـە مادەی(م٢٣٦) و (م٢٣٧) تێیكەوتووە لە تێكەڵی نێوان جێگەی پابەندبوون و بابـەتی پابەندبوون كاتێك باس دەكات لە پابەندبوونی شایستەنەبوو بە دابەشكردن.[2]

---

[1] النظرية العامة للالتزام وفقاً للقانون الكويتي، دراسة مقارنة، للدكتور عبـدالحي حجـازي، مطبوعـات جامعة الكويت ١/٣٢٠-٣٢٢.

[2] شرح القانون المدني العراقي، أحكام الإلتزام، ٢/٢٩٢ وما بعدها.

## پێشەکی:

بەڵگەنەویستە هۆی پابەندبوون بریتییە لە توخمی شەشەم لە توخمەکانی پابەندبوون، هەر پابەندبوونێك بەبێ هۆ بە پووچەڵ دادەنرێت[1]، یان ئەو شتە بە کردار بوونی نییە یان بوونی هەیە بەڵام بە بوونێکی نادروست، یان دروستە بەڵام لەدوای بوونی و پێش بوونی تیادەچێت، وەك لە دوو حاڵەتی پووچەڵبوونەوەدا، یان بوونی هەیە بە بوونێکی ناڕەوا.

لێکۆڵینەوەی بابەتەکە بەپێی سروشتی دابەش دەبێت بۆ پێنج باس:

یەکەم: بۆ پێناسە بە هۆ

دووەم: بۆ پێناسە بە گرێبەست

سێیەم: بۆ ویستی یەکلایەنە

چوارەم: بۆ ڕووداوە شەرعی و یاساییەکان

پێنجەم و کۆتایی: ئەنجامەکان

---

[1] كما في المادة ١٣٢ من المدني العراقي النافذ "يكون العقد باطلاً اذا التزم المتعاقدون دون سبب أو لسبب ممنوع قانوناً أو مخالف للنظام العام أو للآداب".

# باسی یەکەم:
# پێناسەی هۆ

هـۆی پابەندبوونـە شـەرعییەکان(یان یاسـاییەکان) لـە دوو بەشـی سـەرەکیدا کورتدەبێتەوە، ئەو دووانەش:

هەڵسـوکەوتە شـەرعییەکان(یان هەڵسـوکەوتە یاسـاییەکان) و رووداوە شەرعییەکان(یان رووداوە یاساییەکان).

رووی کورتکردنەوە ئەوەیە هۆی هەر پابەندبوونێك –جا پابەندبوونەکە مەدەنی بێت یان تاوانکاری، ئایینی بێت یان دونیایی– یان لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بە ویستی ئازادی پەیبردووی خۆی یاخود نە(یان لە مرۆڤ ناوەشێتەوە)، یەکەمیان بریتییە لە هەڵسوکەوتی شەرعی(یان یاسایی)، دووەمیان رووداوێکی شەرعییە(یان یاساییە) جا سەرچاوەی رووداوەکە مرۆڤ بێت یان گیانداران یاخود سروشت، هەموو ئەوەی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بە گوفتار و کردار بەبێ ویستێکی ئازادی پەیبردوو بریتییە لە رووداو، یەکسانە کەسەکە ویستی لەدەست دابێت وەك شێت و منداڵی جیانەکەرەوە، یان خاوەنی ویست بێت، بەڵام بێئاگابێت لە بەکارهێنانی لە کاتی رووودانی کردارەکە لە ئەو، وەك ئەو قسە و کار و کردەوانەی لە باری خەوتن و لەبیرچوون و هەڵە و بێئاگایی و بووراوەیی لە مرۆڤ دەوەشێنەوە، یان قسە و کردارێکی لێدەوەشێتەوە و لێیان بەئاگایە، بەڵام ویستی پەککەوتووە لەژێر فشاری زۆرلێکردن و ناچارکردندا، یاخود لەباری زۆر پێویستدا.

بینا لەسەر ئەم پێوەرانە بۆ جیاکردنەوەی نێوان هەڵسوکەوت و رووداو، پێناسەی دروست بۆ هەڵسوکەوت بریتییە لە: هەموو ئەوەی لە مرۆڤی باڵغی ژیر دەوەشێتەوە

لە گوفتار و کردار بە ویستێکی ئازادی رۆشنبین، بەجۆرێك شەرع(یان یاسا) ئەسەری لەسەر رێکبخات(بایەخی پێ بدات)، بینا لەسەر ئەمە هاتنەدی هەڵسوکەوتی شەرعی(یان یاسایی) لەسەر ئەم شەش توخمە راوەستاوە:

١-دەبێ لە مرۆڤ وەشابێتەوە(مرۆڤ ئەنجامیدابێت)، هەموو ئەوەی سەرچاوەکەی شتێکی ترە بەدەر لە مرۆڤ لە گیانداران یان سروشت بریتییە لە رووداو.

٢-دەبێ لە مرۆڤێکی باڵغ وەشابێتەوە، هەموو ئەوەی لە مرۆڤێکی نەگەیشتوو بە تەمەنی جیاکردنەوە(سن التمییز) وەشابێتەوە بریتییە لە رووداو، چونکە ویستی تێدا نییە.

٣-دەبێ لە کەسێکی عاقڵ وەشابێتەوە، بۆیە هەموو ئەوەی لە شێت دەوەشێتەوە بریتییە لە رووداو.

٤-دەبێ بە ویستێکی ئازادەوە ئەنجامدرابێت، بۆیە ئەوەی لە زۆرلێکراو و ناچار دەوەشێتەوە بریتییە لە رووداو.

٥-دەبێ لە مرۆڤێکی بەهۆش وەشابێتەوە، بۆیە ئەوەی لە کەسی لەبیرچوو و بێئاگا و بووراوە دەوەشێتەوە بریتییە لە رووداو.

٦-دەبێ ئەنجامدانەکە بە جۆرێك بێت ئەسەری لەسەر پەیدا ببێت و شەرع یان یاسا بە هەندی وەربگرێت، بۆیە موجامەلە و قسەی ئاسایی رووداوە.

لەم خستنەرووە کورتەوە ئەنجامگیری دەکەین: پێناسەی هەڵسوکەوت لای زانایانی یاسا بەوەی بریتی بێت لە: "ئاراستەی ویست بۆ سەرهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا بایەخی پێ دەدات" یان هاوواتای ئەم مانایە، پێناسەیەکە وردەکاری زانستی و مەنتقی کەمی تێدایە، لە چەندین رووەوە:

١-هەڵسوکەوت شوێنی توانین(قدرة)ی مرۆڤ دەکەوێت و بەو توانینە روودەدات، توانین شوێنی ویست(إرادة) دەکەوێت، و ویستیش شوێنی پەیبردن(إدراك) دەکەوێت، هەموو ئەوەی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بە ویستێکی ئازادی پەیبردوو لە قسە و کردار یەکەمجار پەیبردنی کەسەکە پێیەوە پەیوەست دەبێت،

دووەمجار ویستی پێیەوە پەیوەست دەبێت، سێیەمجار توانینی پێوە پەیوەست دەبێت، پاشان سەرئەنجامێك دەستەبەر دەبێت گەر رێگر بوونی نەبێت، کەوابوو هەڵسوکەوت بریتییە لەو سەرئەنجامە کە بریتییە لە ئەسەری توانین شوێنکەوتوو بۆ ویست شوێنکەوتوو بۆ پەیبردن، پاشان شەرع یان یاسا لەسەر ئەو سەرئەنجامەی پێی دەوترێت هەڵسوکەوت ئەسەر رێکدەخات، جا ئەوەی لێیوەشاوەتەوە پێی رازی بێت–وەك لە گرێبەستەکاندا– یان پێی رازی نەبێت وەك لە تاوانە نامەرامییەکان و تیابردنە نەخوازراوەکاندا.

٢–ویستی مرۆڤ هەرچەندە ئازاد و پەیبردوو بێت روو لە سەرهەڵدانی ئەسەر ناکات، بەڵکو روو لە سەرهەڵدانی هۆی ئەو ئەسەرە دەکات، چونکە ئەسەر روودەدات و لەسەر هۆیەکەی بە شەرع یان بە یاسا رێکدەخرێت، رۆڵی مرۆڤ لە کامڵبوونی هۆ و دەستەبەربوونی داواکارییەکانی هۆکار کۆتایی پێ دێت، بەڵام هۆکار(سەبەبکار) ناچێتە ژێر ویستی ئەو کەسەوە کە دەستی بۆ هۆیەکە بردووە، جا یەکسانە ماف بێت یان پابەندبوون.

ئاراستەبوونی ویست واتە پەیوەستبوونی، هەڵسوکەوت بریتییە لە پەیوەستکراو، نەك خودی پەیوەستکەر.

٤–هەڵسوکەوت بە مانای یاسایی لە بازنەیەکی بەرتەسکدا کورتدەبێتەوە، بە جۆرێك دابەشیان کردووە بۆ گرێبەست و ویستی یەکلایەنە، لە کاتێکدا بە مانای دروستی لە زمانی عەرەب و شەرع و مەنتقی یاساییدا هەموو هەڵسوکەوتە گوفتارییە رەواکان و نارەواکان و لێکدراوەکان و تاکەکەسییەکان دەگرێتەوە، سەرپێهەڵدەری ماف و پابەندبوونەکان بێت یان لابەری ماف و پابەندبوونە راوەستاوەکان بێت، هەر بەو جۆرە هەموو هەڵسوکەوتە کردارییە رەواکان و نارەواکان دەگرێتەوە، یەکسانە سەریکێشێت بۆ بەرپرسیارێتی مەدەنی بە هەردوو بەشەکەیەوە(گرێبەستی و کەمتەرخەمی) یان سەریکێشێت بۆ بەرپرسیارێتی تاوانکارانە.

دانە پاڵی ڕوودلو یان هەڵسوکەوت بۆ لای شەرع مانای ئەوە نییە هەڵسوکەوتەکە ڕەوایە یان ڕووداوەکە ڕەوایە، بەڵکو مەبەست بەو دانەپاڵە هاتنەژێرباریەتی بۆ ڕێکخستن و حوکمەکانی شەرع یان یاسا، بینا لەسەر ئەمە هەردووکیان وەك چۆن ڕەوان بۆ نموونە گرێبەستەکان و هەڵسوکەوتە بەسوودەکان، هەر بەو جۆرە دەگونجێ ناڕەوابن وەك هەڵسوکەوتە زیانبەخشەکان.

بۆیە پێویستە ئەم بازنە بەرتەسکەی ئێستای پابەندبوون لە یاساکاندا تێپەڕێنێت بۆ ئەوەی پابەندبوونە مەدەنی و تاوانکارییەکان و ئایینی بێت یان دونیایی بگرێتەوە، وەك چۆن شەریعەتی ئیسلام دانی پیادا ناوە، مرۆڤ لە تەواوی بوونەوەرە زیندووەکانی تر بە ئەقڵ جیادەبێتەوە، بۆیە خودا -سبحانە وتعالى- داوای ئەمانەتی لێکردووە کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾[1]، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەموو ژیانی مرۆڤ پابەندبوونە بەرانبەر بە پەروەردگار و بەرانبەر بە خۆی و خێزان و کۆمەڵگە و ئومەتەکەی، بەڵکو بەرانبەر هەموو بوونەوەرە زیندووەکان لە گیاندارە بێزیانەکان و ڕووەکە بەرییەکان، بۆیە لەسەر خاوەن گیانداران پێویستە نەرمونیان بن لەگەڵیان و ژیان و گوزەرانیان بۆ دابین بکەن و بیانپارێزن، بە هەمان شێوە لەسەر خاوەن درەخت پێویستە ئاوی درەختەکانی بدات، هەر بەو جۆرە دروست نییە بەبێ پاساوی شەرعی هیچ گیاندارێك بکوژرێت.

هۆ بۆ دوو بەش دابەش دەبێت، بۆ لێکۆڵینەوە لە هەر یەکێکیان مەبەستێك تەرخان دەکرێت.

---

[1] الأحزاب : ٧٢

# مەبەستی یەکەم:
# هۆ لە فیقهی ئیسلامیدا

"هۆ" لەڕووی زمانەوانییەوە بە چەندین مانا هاتووە، لەوانە: پەت، هۆکار، ئەو شتەی پێیدەگەیە مەرام، ڕێگە، هاوشێوەکانی ئەمانە[1].

بەو مانا زمانەوانییانە لە چەندین ئایەتی قورئاندا بەکارهێنراوە، لەوانە: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَباً فَأَتْبَعَ سَبَباً﴾[2].

لە زاراوەی شەرعیدا "هۆی شەرعی" ئەوەیە کە خاوەن شەرع کردوویەتی بە نیشانە لەسەر بوونی حوکم، بەجۆرێك لە بوونیەوە بوونی حوکمەکە پێویست بکات، گەر ڕێگرێك بوونی نەبێت، هەر بەو جۆرە لە نەبوونی هۆ نەبوونی حوکم پێویست بکات، هۆ بەم مانایە بە مەبەستگیراوە لە زاراوەی"هۆی پابەندبوون"، ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی حوکمی دانراو، وەك چۆن پابەندکردن و پابەندبوون لە حوکمە داواکراوەکانن، دکتور جمال الدین هەڵەی کردووە کاتێك دەڵێ: "جێگەی مشتومڕ نییە لە لامان هۆ لەلای زانایانی ئوسوڵ جیاوازە لەو هۆیەی کە ئێمە باسی لەبارەوە دەکەین ئەوەش بریتییە لە هۆی پابەندبوون"[3]

زانایانی موسڵمان پێناسەی هۆیان کردووە بە هەر سێ جۆرەکەیەوە کە لە بیردۆزەی فەرەنسیدا بوونیان هەیە، یان ئەوەی پێی دەوترێت بیردۆزەی نەرێتی، ئەوەش بریتییە لە هۆی سەرچاوەگر(یان هۆی داڕشتنی) و هۆی مەرامی(یان مەرامی ڕاستەوخۆ) و هۆی هاندەر(یان هاندەری پاڵنەر)، وەك لەم ڕوونکردنەوەیەدا:

---

[1] لسان العرب، فصل السين، حرف الباء، ١/٤٣٨.

[2] الكهف : ٨٥

[3] سبب الإلتزام وشرعيته في الفقه الإسلامي، دراسة مقارنة، ص١٢١.

## یەکەم: هۆی سەرپێهەڵدەر:

زانایانی ئوسولٚ ئەم جۆرەیان لە هـۆ بـە دووروودرێـژی لـە حـوکمی دانـراودا بـاس کردووە، حوکمی دانراو بریتییە لـە گوتـاری خـاوەن شـەرع بـە دەقـی شـەرعی یـان گوتاری یاسادانەر بـە دەقـی یاسـایی پەیوەسـت بـە هەڵسـوکەوتی مـرۆڤ و رووداوە شـەرعییەکان(یان یاسـاییەکان) بـە جۆرێـك بیانکـات بـە هـۆ بـۆ شـتێکی تـر، وەك خزمایەتی کە کراوە بە هۆ بۆ پابەندبوون بە خەرجکردنەوە، یان کراوە بە مەرج بۆی، یان وەك ئەقلٚ کە کراوە بە مـەرج بـۆ دروسـتی هەڵسوکەوتی مـرۆڤ و لێوەشـاوەیی داوالێکردن، یان رێگر بێت لێی، وەك شێتێتی کـە بـووە بـە رێگـر لـە بەرپرسـیارێتی تاوانکـاری و پابەندبوونـەکانی، یـان هەڵسـوکەوت وا لـیٚ دەکـات دروسـت بێـت یـان پووچەلٚ بێت لەبەر رۆشنایی فەراهەمهاتن و دواکەوتنی پایەکان و مەرجەکانیدا، یـان حوکم دەکات بە سووربوون و لێبڕان(عزیمة) لە باری ئاساییدا و بە روخسەت لە باری هەڵواردەییدا[1].

ئەم جۆرە لە هۆ ئەوەیە کە زانایانی یاسا بە "هۆی سەرپێهەڵدەر" و سەرچاوە بۆ پابەندبوون ناوی دەبەن، وەك گرێبەست و ویسـتی یەکلایەنـە و بەدەسـتهێنانی بـیٚ هۆ(دەوڵەمەندبوونی بیٚ هۆ) و کاری ناڕەوا.

سەرباری ئەوە فەقیهانی موسڵمان پێناسەی "هۆ"یان کـردووە بـەم مانایـە و لـە بابـەتی "هۆیـە رەواکانـدا بـۆ بەدەسـتهێنانی مولکـداری" بـە دووروودرێـژی باسـیان لەبارەوە کردووە، هەر بەو جۆرە لە هەڵسوکەوتە نادارابیەکاندا دەستیان بۆ بردووە، بۆیە دەڵێن: هاوسەرگیری هۆیە بۆ سەرهەڵدانی مافەکان و ئەرکەکانی هاوسـەرداری، تـەلاقی خولع(تـەلاقی بریتیـدان) هۆیـە بـۆ کۆتاهـاتنی پەیوەنـدی هاوسـەرداری لـە لایەکەوە، و هۆیە بۆ پابەندکردنی ژنەکە بە پێدانی ئـەوەی بـۆ مێردەکـەی پێیـەوە پابەندبووە بە رێکـەوتن لەسـەر تـەلاق بەرانبـەر بریتییـەك، لـە رووداوە مادییەکاندا

---

[1] هنا عند من عدّ الصحة والبطلان والعزيمة والرخصة ضمن الأحكام الوضعية.

دەڵێن: کارە ناڕەواکان کە زیانیان لێوە سەرهەڵدەدات هۆن بۆ پابەندبوون بە پێدانی قەرەبووکردنەوە بۆ کەسی زیانپێگەیشتوو، لە رووداوە مەعنەوییەکاندا خزمایەتی هۆیە بۆ پابەندکردنی خزمی دەوڵەمەند بە خەرجکردن لەسەر خزمە هەژارە دەستەوسانەکە لە بەدەستهێنانی کاری رەوا و دابینکردنی ژیان و خەرجی بۆ ئەوانەی خەرجیان لەسەر ئەوە، دزی هۆیە بۆ بڕینی دەست، زینا هۆیە بۆ جەلدکردن و هاوشێوەکانی ئەمانە، زۆرجار وشەی "عیللەت" بۆ "هۆ" بەکاردەهێنن بە سەرنجدان بە رۆڵی کاریگەری لە سەرهەڵدانی حوکمدا، سەرەڕای ئەوەی سەرچاوەی حوکم بریتییە لە شەرع نەك خودی هۆیەکە.

### دووەم: هۆی مەرامی:

ئەمە ئەوەیە زانایانی یاسا پێی دەڵێن مەرامی راستەوخۆ بۆ کەسی گرێبەستکار، فەقیهانی موسڵمان ئەم جۆرە لە مامەڵەی داراییان تاوتوێ کردووە لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆردا لەوانە: سوود، بەمەرامگیراو، هۆی پابەندبوون، بریتی، هاوشێوەکانی ئەمانە.

لە "مرشد الحيران"دا (م٢١١) هاتووە: "پێویستە لە گرێبەستدا سوود بۆ دوو کەسی گرێبەستکار بوونی هەبێت و لەڕووی شەرعەوە بەمەرامگیراو بێت، هەر گرێبەستێك سوودی تێدا نەبێت بۆ دوو گرێبەستکارەکە بریتییە لە گرێبەستی تێکچوو، بە هەمان شێوە ئەو گرێبەستەی مەرامی نارەوای تێدا بە مەرامگیرابێت".

لە "تبين الحقائق"دا[1] هاتووە:"گەر ژنەکە بە شتێك بۆ مێردەکەی پابەندبوو، بۆ نموونە گەر مۆڵەتی حەجی نەدا بە ژنەکەی ئەوە پابەندبوونێکی پووچەڵە، چونکە هەستان بە فەرزی حەج لەسەری پێویستە، بۆیە لەسەر مێردەکە پێویستە رێگری لێ نەکات بەبێ بیانوو، گەر رێگری لێ کرد بۆ ئەوەی پابەند بێت بە شتێکەوە بۆی ئەوا پابەندبوونەکەی پووچەڵە، هەروەها وەك ئەو کەسەی پابەند دەبێت بۆ شاهیدەکان

---

[1] للزيعلي

بەوەی بڕێك پارەیان پێ بدات تاکو شایەتییەکەیان بدەن، چونکە ئـەو هـیچ شـتێکی لەسەر نییە، گەر کاریان بەجێهێلا لەپێناو هەستان بـە شـایەتیدان پاداشـتیان لـەلای خودا هەیە"

ئەم قسەیە ئاماژە دەکات بەوەی هۆی پووچەڵبوونەوەی پابەندبوون لـە هـەردوو حاڵەتە ئاماژەبۆکراوەکەدا بریتییە لە نەبوونی هـۆی مـەرامی ڕەوا بـۆ یـەکێك لـە دوو گرێبەستکارەکە، لە "جامع الفصولين"[1]دا هاتووە: "گەر ژنەکەی بە کرێ بگرێت بۆ ئەوەی نانی خواردنی بۆ دروست بکات دروست نییە، چونکە لەڕووی ئایینەوە لەسەر ژنەکە پێویستە، بەڵام بـۆ فرۆشـتن دروسـتە"، ئەمـەش بـۆ نـەبوونی هـۆی مـەرامی ڕەوا(یان مەرامی ڕاستەوخۆ) تایبەت بە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە دەگەڕێتەوە.

لە "تحرير الكلام في المسـائل الإلتـزام"ی "حطـاب"دا هـاتووە[2]: "گـەر وشـترە وێڵەکەم بۆ بهێنیتەوە یان گەر شتە ونبووەکەم بۆ بدۆزیتەوە ئەوا ئەوەت پێ دەدەم، گەر وشترەکە و شتەکان لای ئەو بوون، یان شوێنەکەی دەزانی، ئەوە پێویست نییە لەسەر کەسی پابەندبوو، بەوەش حوکم نادرێت بەسەریدا، چونکە گێڕانەوەی ئەوانـە لەسەری پێویستە، هەر بەو جۆرە ئاگادارکردنەوەی کەسەکە بە شوێنی ونبووەکانی، چونکە لە مەرجەکانی بەخشین ئەوەیە لەوانە نەبێت بەخششەکە لەسەری پێویسـت دەکــات"، ڕۆشـــنە پووچـــەڵبوونەوەی پابەنـــدبوون بـــەهۆی نـــەبوونی "هـــۆی مەرامی"یەوەیە بەرانبەر قەرەبوو کە لایەنەکەی تر بەڵێنی پێداوە.

---

[1] لابن قاضي سماونة ٢٤٨/١.
[2] للحطاب ص٤٥.

## سێیەم: هۆى پاڵنەر(یان هاندەرى پاڵنەر):

زانایانى موسڵمان چارەسەرى ئەمـەیان لـەژێر ناونیشـانى جۆراوجـۆردا كـردووە، لەوانە:

أ. زانایـانى ئوسـوڵى فیقـه لـەژێر ناونیشـانى "هۆكارەكـان دەرگـا لێداخسـتن و كردنـەوەیان" باسـیان لـەبارەوە كـردووە، بۆیـە دەڵـێن: ئـەو هۆكارانـەى كـە ئامانجیـان رەوابێـت لەبـەردەم خەڵكیـدا دەرگاكانیـان دەكرێنـەوە، بـەڵام ئـەو هۆكارانەى كە سەردەكێشن بۆ ئامانجى ناڕەوا دەرگایان لێ دادەخرێت، لەسەر ئەم بنچینەیە هۆكارەكانیان بۆ چوار بەش دابەش كردووە:

بەشى یەكەم: ئەوەیە هەریەك لە هۆكار و ئامانج رەوا بن، وەك هـاوەردەكردنى دەرمـانى پێویسـت لـە وڵاتێـك بـە مەبەسـتى قەلاچـۆكردنى نەخۆشـى و چارەسەرى نەخۆش، بۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە دەرگاى هاوەردەكردنى بۆ بكاتەوە بە رێگەیەكى راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

بەشى دووەم: ئەوەیە هەریەك لە هۆكار و ئامانج ناڕەوا بن، وەك دروسـتكردنى چـەكى ئـەتۆمى بـە مەبەسـتى وێرانكـارى ئـاوەدانى و كۆتاپێهێنـانى ژیـانى مرۆڤایەتى، پێویستە لەسەر دەوڵەتانى جیهان هاریكار و هاوكارى یەكتر بـن لــە داخسـتنى دەرگـاى دروسـتكردنى ئـەو چـەكە وەحشـییە ژیارییــە و قەدەغەكردنى بە یاساى پابەندكەر لەگەڵ سزاى توندوتیژ.

بەشى سێیەم: ئەوەیە كە هۆكارەكە ناڕەوا بێت و ئامانجەكە رەوا بێت، زۆربەى كاروبارەكانى ژیان لە خودى خۆیاندا ناشیرینن، چـونكە زیانبەخشـن، بۆیـە پێویستە حەرامكراو و ناڕەوا بن، بـەڵام بـۆ جگـە لـە خۆیـان چـاك و پـاكن، بــەهۆى ئــەو ســوود و قازانجــە پارســەنگكراوەى لەســەر ئــەو زیانانــە سەرهەڵدەدات، بۆ نموونە: سزا بە هەموو جۆر و رەنگەكانییەوە جەسـتەیى یان نەفسى یان دارایى لە خودى خۆیاندا ناشیرینن، چونكە زیانى تێدایە بـۆ حوكم بەسەرداراو و خانەوادەكـەى و هـەموو ئەوانـەى پەیوەنـدییان هەیـە

پێیەوە و بۆ کۆمەڵگەش، بەڵام سەرجەم شەریعەتە ئاسمانییەکان و یاسا دانراوەکان دانیان بە رەوایەتی پیادەکردنیدا ناوە بەسەر تاوانکاراندا، ئەمەش بەهۆی رەوایەتی لە ئامانج و پاڵنەریاندا لە پارێزگاری گیانی بێگوناهان و ماڵ و دارایییان و نامووس و ئاسایش و جێگیربوونیان.

بەشی چوارەم: ئەوەیە کە هۆکارەکە رەوا بێت، بەڵام ئامانجەکە نارەوا بێت، ئەم بەشەی دوایی تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لەژێر ناونیشانی هاندەری پاڵنەر(یان مەرامی ناڕاستەوخۆ یان مەرامی دوور یان هۆی بەرژەوەندییانە).

ب-فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەسەری ئەم جۆرە لە هۆ-گەر نارەوا بێت- لەمەڕ هەڵسوکەوتی مرۆڤ دابەش بوون بۆ سێ ئاراستە:

**ئاراستەی یەکەم**: کە "الشافعي"-رەحمەتی خودای لێ بێت- سەرۆکایەتی دەکات ئەوەیە: هاندەری پاڵنەری نارەوا لەڕووی ئامانجەوە بایەخی پێ نادرێت و ئەسەری لەسەر دروستیی هەڵسوکەوت نییە گەر بە دەق لەسەری نەهاتبێت لە ناوەرۆکی گرێبەستەکەدا، لە کتێبی "الأم"دا دەفەرموێت: "ئەسڵی ئەوەی بۆی دەچم هەموو گرێبەستێك لە رووالەتدا دروستە گەر بە تۆمەتێك یان بە عادەتێك لە نێوان دوو کەسی فرۆشیار و کڕیاردا پووچەڵی نەکەمەوە، بە دروستی رووالەت دروست دەیبینم، نیێت بۆ هەردووکیان بە ناپەسەند دەزانم گەر نیێتێك سەریهەڵدا فرۆشتنەکە تێکبچێت، هەر بەو جۆرە بە ناپەسەندی دەبینم لە پیاوێك شمشێرێك بکڕێت لەسەر ئەوەی مرۆڤی پێ بکوژێت، بۆیە لەسەر فرۆشیارەکە حەرام نابێت بیفرۆشێت بەو کەسەی کە پێیوایە بە ستەم کەسێکی پێ دەکوژێت، چونکە لەوانەیە پێی نەکوژێت و ئەو فرۆشتنەی لێ تێکنادەم، هەر بەو جۆرە بە ناپەسەندی دەبینم لە پیاوێك ترێ بفرۆشێت بە کەسێك پێیوایە ئارەقی لێ دروست دەکات، فرۆشتنەکە تێکنادەم گەر بە حەڵاڵی فرۆشتی، چونکە لەوانەیە کەسەکە هەرگیز ئارەقی لێ دروست نەکات، خاوەن شمشێرەکە لەوانەیە هەرگیز کەسێکی پێ نەکوژێت، هەر بەو جۆرە نیکاحی موتعە بە تێکچوو دەزانم گەر پیاوێك ژنێکی بە گرێبەستی دروست

مارە کرد و نیێتی وابوو تەنها یەك ڕۆژ لەلای بێت یان کەمتر لە ڕۆژێك یان زۆرتر لە ڕۆژێك نیکاحەکە بە تێکچوو نابینم، بەڵکو هەردەم بە گرێبەستێکی تێکچوو بە تێکچووی دادەنێم"[1]

ئەوەی یاسا جەرمانییەکان و یاسا کاریگەرەکان بەوانە بۆی دەچن لەگەڵ ئەم ئاراستەیەدا یەکدەگرنەوە، لە بایەخدان بە ویستی رووالەتی لەباری جیاوازییەکەیدا لەگەڵ ویستی ناوەکی گەر بەڵگەی پێچەوانە لەسەر ئەوە راست نەبوویەوە.

**ئاراستەی دووەم**: بریتییە لە بۆچوونی فەقیهانی مالیکی و حەنبەلی، ئەوەش ئەوەیە کە بۆ هاندەری پاڵنەری ناڕەوا ئەسەرێك بوونی هەیە لە دروستیی هەڵسوکەوتی مرۆڤدا با لە گوزارەکەشدا "ویستی رووالەتی" باس نەکرابێت، لە "الفروق"ی[2] "القرافي" مالیکیدا[3]هاتووە: "داخستنی دەرگای هۆکارەکان ماناکەی یەکلاکردنەوەی مادەی هۆکاری تێکدان وەك پالپێوەنانی، بۆیە هەر کات کرداری بێکێشە لە تێکچوون بوو بە هۆکار بۆ تێکچوون ئەوا "مالیك" رێگری لەو کارە کردووە لە زۆرێك لە شێوازەکانیدا، داخستنی دەرگای هۆکار لە تایبەتمەندی مەزهەبی مالیکی نییە وەك چۆن زۆرێك لە مالیکییەکان وا ئەندێشەی دەکەن، بەڵکو هۆکارەکان سێ بەشن، بەشێکیان ئوممەت کۆدەنگیان هەیە لەسەر داخستنی دەرگاکانیان بە رێگری لێیان و یەکلاکردنەوەیان وەك هەڵکەندنی بیر لەسەر رێگەی موسڵمانان، چونکە ئەوە هۆکارە بۆ تیاچوونیان... بەشێکیان زانایان جیاوازییان هەیە لەسەریان ئایا دەرگایان بە رووودا دابخرێت یان نە، وەك فرۆشتنەکانی بەماوە(بیوع الآجار) لەلای ئێمە، وەك ئەو کەسەی شتێك دەفرۆشێت بە دە درهەم بۆ ماوەی مانگێك پاشان دەیکڕێتەوە بە پێنج درهەم پێش ئەو مانگە، "مالیك" دەڵێ ئەو لە ئێستادا پێنج درهەمی لەدەستچووە و "دە"ی تری مانگێکی تر وەرگرتووە، ئەمە هۆکارێکە بۆ دواخستنی

---

[1] كتاب الأم ٨٨٣/٣

[2] ٣٢/٢.

[3] للإمام شهاب الدين أبي العباس أحمد بن ادريس بن عبدالرحمن الصنهاجي.

پێنج بە دە درهەم بۆ ماوەیەك، وەك كردن بە هۆكارێك بە دەرخستنی شێوەی فرۆشتن بۆ ئەو مەرامە، شافیعی دەڵێت: تەماشای شێوەی فرۆشتنەكە دەكرێت و كارەكە هەڵدەدرێتە سەر رووالەتی، بۆیە ئەوە دروستە".

"مالیك" تەماشای ئەوە دەكات ئەو كارە گرێبەستی قەرزی بەسوودی سووخۆرییە لەژێر پەردەی فرۆشتندا، شافیعی پێیوایە ئەوە گرێبەستی فرۆشتنە و پایەكان و مەرجە دروستەكانی فەراهەم هاتوون.

لە "أعلام الموقعين"ی "إبن القيم الحنبلي"دا[1] هاتووە: گەر مەبەستی پێیان– واتە بە هۆكارەكان وەك گرێبەستەكان– شتێك بێت كە مەبەستگرتنی دروست نەبێت وەك وتنی "مارەم كردی" و "تۆم كرد بە هاوسەرم" بە مەبەستی حەلاڵ كردن[2]، هەروەها "فرۆشتم" و "كڕیم" بە مەبەستی سووخۆری، یان "تەلاق كەوتبێت" بە مەبەستی فێڵ لەسەر كرداری سوێن لەسەرخورلو[3]، یان بە "بووم بە خاوەنی" بە مەبەستی فێڵ لەسەر بەربوونەوەی زەكات یان شفاعەت كردن، و هاوشێوەكانی ئەمانە، ئەمانە مەبەستەكەیان لێوە بەدەست نایەت كە بە مەبەستی گرتووە، رووالەتی وشەكە و كردارەكەی كردووە بە هۆكارێك بۆ لای، چونكە لە بەدەستهێنانی مەبەستەكەیدا جێبەجێ كردنی حەرامكراوێكە و بەردانەوەی پێویستێك و كۆمەك

---

[1] ١٢١/٣.

[2] گەر بۆ جاری سێیەم تەلاق بكەوێت ئەوا بۆ دوو هاوسەرەكە دروست نییە ژیانی هاوسەری تێهەڵكەنەوە بە گرێبەستێكی نوێ تا ژنەكە شوو بە مێردێكی تر دەكات و دەچێتە لای و دواتر لەیەكتر جیادەبنەوە و عیدەی تەواو دەبێت، لە عورفە نابووت و تێكدەرەكان ئەوەیە ژنەكە بۆ ئەو مەبەستە بۆ رۆژێك یان زیاتر مێرد دەكات، ئەمە پێی دەوترێت "تحليل–مارە بە جاش" ئەمەش لای هەندێ لە فەقیهان پووچەڵە و لای هەندێكی تر دروستە.

[3] هەر كەس سێ بە سێ تەلاقی ژنەكەی هەڵپەسارد لەسەر كارێك و پاشان پەشیمانبوویەوە و یەك تەلاقی جیابوونەوەی دا پاشان ئەوەی تەلاقەكەی پێوە پەیوەست بووە لە كاتی داڕانیان ئەنجامیدلیەوە وەك فێڵێك، پاشان هاوسەری لەگەڵ كردەوە.

کردنە لەسەر یاخیبوون لە خودا و هەڵوەشاندنەوەی ئایینەکەی و شەرعەکەی، بۆیە پارمەتیدانی لەسەر ئەوە یارمەتیدانە لەسەر خراپە و دەستدرێژکاریی".

هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا[1]: "مەرام رۆحی گرێبەست و بەدروستدانەر و پووچەڵکەرییەتی"

لە "المغني"دا[2] هاتووە: "فرۆشتنی دۆشاو بەوانەی دەیکەن بە ئارەق پووچەڵە، پوختەی ئەوە: فرۆشتنی دۆشاو بە کەسێك باوەڕوایە دەیکات بە ئارەق حەرامە و لەلای شافیعی ناپەسەند(مکروه)ە" لە هەمان سەرچاوەدا[3]: "فرۆشتن حەرام دەکرێت و پووچەڵ دەبێتەوە گەر کەسی فرۆشیار مەرامی کڕیارەکەی دەزانی، ئەوەش یان بە قسەیدا یان بە نیمچە بەڵگە تایبەت بێت پێی و ئاماژە بۆ ئەوە بکات، بەڵام گەر کارەکە ئەگەر بوو وەك ئەوەی کەسێك بیکڕێت حاڵی نەزانراو بێت یان کەسێك بێت سرکە و ئارەقیش پێکەوە دروست بکات و قسەیەکی لەدەم دەرنەچوویێت ئاماژە بێت بۆ ویستی ئارەق، ئەوا فرۆشتنەکە دروستە، گەر حەرامبوون جێگیر بوو ئەوا فرۆشتنەکە پووچەڵە و ئەگەری هەیە دروستیش بێت ئەوەش مەزهەبی شافیعییە، چونکە حەرامکراو لەوەدا باوەڕیەتی بە گرێبەستەکە نەك شتانی تر، بۆیە رێگری لە دروستیی گرێبەستەکە ناکات ئەگەر نەنگی و فریودانێکی تیادا شارابێتەوە، لەلای ئێمە گرێبەستە وەك ئەوەی دەبینرێت دروست نییە بەهۆی ئەو سەرپێچییەی کە تێیدایە لە خودا، وەك بە کرێگرتنی کەنیزەك بۆ زینا، شاردنەوەی نەنگی و فریودانیش حەرامکراوە نەك گرێبەستەکە، لەبەر ئەوەی حەرامکردنەکە لێرەدا لە مافی خودایە بۆیە گرێبەستەکە تێکدەدات وەك فرۆشتنی درهەمێك بە دوو درهەم و لە فریودانیش جیادەبێتەوە، ئەوە مافی ئادەمییە... هەر

---

[1] إعلام الموقعين ٨٢/٣.

[2] لابن قدامة أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة (ت ٦٣٠ هـ) على مختصر أبي القاسم عمر بن حسين عبدالله بن أحمد الخرقي ٢٤٥/٤.

[3] ٢٤٦/٤.

بەو جۆرە حوکم لە هەموو ئەوەی مەرامی پێیەتی حەرامە، وەك فرۆشتنی چەك بـە ئـەهلی جـەنگ یـان بـە کەسـانی چـەتە و ڕێگـر یـان بـۆ فیتنـە... یـان بەکرێـدانی خانووەکەی بۆ فرۆشتنی ئارەق تیایدا"

لەگەڵ ئاراستەی مالیکی و حەنبـەلی یاسـا لاتینییـەکان و ئـەو یاسـایانەی پێیـان کاریگەرن لەڕووی بایەخدان بە ویستی ناوەکی هـاوڕان گـەر بەڵگەیـەك لەسـەر ئـەوە ڕاست نەبێتەوە.

**ئاراستەی سێیەم:** لە نێوان دوو ئاراستەکەی تردایە، حەنەفییەکان ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر، ئەوەش ئەوەیە لە هاندەری پاڵنەری ناڕەوادا –لەڕووی کاریگەرییەکـەی لە پووچەڵکردنەوەی هەڵسوکەوت– بە مەرج دەگیرێت لە گرێبەستەکەدا راشـکاوانە باس بکرێت یان لە سروشتی جێی گرێبەستەکە ئەنجامگیری بکرێت.

لە **شێوازی حاڵەتی یەکەم** ئەوەیە کە لـە "البـداع"دا هـاتووە بـەوەی[1]: "گـەر بەرانێکی کڕی لەسەر ئەوەی شۆقوەشێنە یان کەڵەشێرێکی کڕی لەسەر ئـەوەی کـە شەڕکەرە ئەوا فرۆشتنەکە تێکچووە لەلای "أبي حنيفة"–ڕەحمەتی خوای لێ بێت– ئەوەش یەکێکە لە دوو ریوایەتەکە لە لای محمەد–ڕەحمەتی خودای لێ بێت– لەبەر ئەوەی ئەم سیفەتانە خەڵکی بە نەرێتی خۆیان لەهوی پیێ دروست دەکەن و لەهویش قەدەغـەکراوە، بۆیـە ئـەوە مـەرجێکی قەدەغـەکرلوە و دەبێتـە هـۆی تێکچـوونی فرۆشتنەکە"

لە "الفتاوى الخانية"دا[2] هاتووە: "گەر پیاوێکی بە کرێ گرت بۆ ئەوەی بتێکی بۆ بتاشێت یان ماڵێکی بە پەیکەر بـۆ برازێنێتـەوە ئـەوا کەسـەکە کرێـی نییـە، چـونکە هەروەك ئەوە وایە مردوولاوێنێك یان گۆرانیبێژێکی بەکرێ گرتبێت"

لە **شێوازی حاڵی دووەم** لە "البدائع"دا هاتووە: "فرۆشتنی ئامێری لەهوکـەر لـە بەربووت و تەپڵ و جووزەلە و دەف و هاوشێوەکانیان لەلای "أبي حنيفـة"دروسـتە،

---

[1] ٥/١٦٩.

[2] ٢/٣٢٢.

بـەلأم لای "أبـي يوسـف و محمـد" کەراهـەتیان هەیـە و فرۆشـتنی ئـەو ئامێرانـە گرێبەستیان دانامـەزرێت، چـونکە ئامێرگـەلێکن بـۆ لـەهو ئامـادەکراون و بـۆ لادان و تێکچوون داهێنراون، بۆیە ماڵ و سامان نین و فرۆشتنیان دروست نییە، لەلای "أبـي حنيفة" دەگونجێ لەڕوویەکی ترەوە بەپێی شەرع سوودیان لێ ببینرێت"

لەم دەقە فیقهییانەی خاوەن سێ ئاراسـتە باسـکراوەکان ئـەنجامگیری دەکـەین بەوەی فـەقیهانی شـەریعەتی ئیسـلام کۆدەنگییـان هەیـە لەسـەر ئـەوەی هاندەری پاڵنەری نارەوا بەتەنها بەس نییە بـۆ حـوکمی پووچـەڵبوونەوەی گرێبەسـت، بـەڵکو هەردەبێ زانینی کەسە گرێبەستکارەکەی تری پێوە پەیوەست بێت، بەلأم دەربارەی سروشتی ئەو زانینە جیاوازییان بەم جۆرە لە نێواندایە:

١-هەیانە لەم زانینەدا توندڕەوی کردووە، بۆیـە بـە مـەرجیگرتووە هانـدەر لـە کرۆکی گرێبەستەکەدا ناوبرابێت، ئەمە بریتییـە لـە رای شـافیعی و ئەوانـەی لەگەڵی هاوڕان لە فەقیهان.

٢-هەیانە ئاسانکاری کردووە لـەم زانینـەدا بۆیـە باسـی هانـدەری پاڵنـەری لـە گرێبەستدا نەکردووە، بەڵکو تەنها بە زانینی کەسەکەی تر راوەستاوە یان لە توانایدا هەبێت ئـەوە بزانێـت سەرچـاوەکەی لـە هـەرکوێوە بێـت, ئەمـەش ئەوەیە مالیکییەکان و حەنبەلییەکان بۆی دەچن.

٣-هەیانە میانـەگیری کـردووە لـە نێـوان ئـەو دوو ئاراسـتە باسـکراوەدا، بۆیـە دەڵێت: بەسە نیمچە بەڵگەیەك بە حاڵ یان بـە قسـە بـوونی هـەبێت ئامـاژە بکاتە سەر هاندەری پاڵنەری نـاڕەوا، بـۆ نموونـە، گـەر سروشـتی جێگـەی هەڵسوکەوت لەو جۆرانە بوو کە لێیەوە ئەنجامگیری دەکرا هاندەری پاڵنـەر ناڕەوایە پێویستە حوکم بە پووچەڵبوونەوەی هەڵسوکەوتەکە بکرێت یان بە سەرهەڵنەدانی ئاساری شەرعی بنەڕەتی سەرەڕای باس نەکردنی هاندەر لە کرۆکی گرێبەستەکەدا، وەك لە بۆچوونی هەندێ لە فەقیهە حەنەفییەکاندایە.

ج- فەیلەسـوفە موسـڵمانەکان بابـەتی مەرامـەکان و هانـدەرەکانیان لـەژێر

ناونیشانی(هۆی ئامانجگەرایی)دا باسکردووە، کاتێك هۆیەکان دابەش دەکەن لە هەڵسوکەوتە کرداری و گوتارییەکانی مرۆڤ بۆ چوار بەش[1] کە ئەمانەن:

١-هۆی بکەریی کە بکەری پێ دەبێت بە بکەر و بنەمای جووڵە، بە دەربڕینێکی ڕۆشنتر هۆی بکەریی بریتییە لەو کەسە بکەرەی کە هەڵسوکەوتی کرداری و گوتاری بە ویستی ئازاد و پەیڕەوو لێدەوەشێتەوە بۆ دەستەبەرکردنی مەرامێکی تایبەت بۆ گرێبەستکار لە گرێبەستەکەیدا، لەو ڕێگەیەوەی کە ئەرێکردن و قبووڵ کردنی لێدەوەشێتەوە هۆیەکی بکەرییە بۆ گرێبەستەکە، وەك چۆن دارتاش لەڕووی کارەکەیەوە لە دروستکردنی کورسیدا هۆی بکەرییە.

٢-هۆی مادی، ئەوەش بریتییە لەو مادەی بکەر بەکاریدەهێنێت لەو شتانەی دەیەوێت بەکاریبهێنێت، وەك گوزارەی "ئەرێکردن و قبووڵ کردن" لە گرێبەستدا یان تەختە لە دروستکردنی کورسیدا.

٣-هۆی وێنەیی(شێوەیی) ئەمەش بریتییە لەو شێوەیەی کە بۆ شتێك بەدەستدێت دوای تەواوکردنی دروستکردن و سەرهەڵدانی، جا شێوەکە بەرهەست بێت وەك وێنەی کورسی و دارشتنی گرێبەست یاخود زەینی بێت وەك پەیوەندی شەرعی یان یاسایی لەنێوان دوو کەسی گرێبەستکاردا لەدوای دامەزرانی گرێبەستەکە.

٤-هۆی ئامانجگەرایی بریتییە لە هاندەری پاڵنەر بۆ چوونە پێش لە هەڵسوکەوتێکی کرداری یان گوتاری، بۆیە هۆی ئامانجگەرایی لە دروستکردنی کورسی بریتییە لە دانیشتن لەسەری، لە گرێبەستەکانیشدا بریتییە لە سوودی مادی یان مەعنەوی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کەسی گرێبەستکار بەدەستی دەهێنێت لەڕێگەی گرێبەستەکەیەوە.

---

[1] النجاة لإبن سينا ص٨٣.

پوختەی قسان هەر ئامانجێك مرۆڤی باڵغی عاقڵ دەیەوێت دەستەبەری بکات لە هەڵسوکەوتی کرداری یان گوتاری خۆیدا لەو رووەوە کە وێناکراوە بەر لە چوونە پێش لە هەڵسوکەوتەکە بریتییە لە هاندەری پاڵنەر بۆ ئەو هەڵسوکەوتە و پێی دەوترێت مەرام، لەرووی بوون و دەستەبەرکردنییەوە لەدوای ئەنجامدانی هەڵسوکەوتەکە پێی دەوترێت ئامانج یان هۆی ئامانجگەرایی.

زانایانی ئوسوڵی دین لە زانستی کەلام(زانستی بیروباوەڕ) جیاوازییان کەوتۆتە نێوانەوە لەوەی ئایا حوکمەکانی خودا هۆدار کراون بە مەرام یان نە؟

هەندێکیان پێیان وایە حوکمەکانی خودا-سبحانە وتعالی- ناکرێت بەوە وەسف بکرێن کە هۆدارن بە مەرامەکان، چونکە مەرام لە هەرشتێك ئەوەیە کە بکەری شتەکە پێویستییەتی، پێویستی لە خەسڵەتی ناتەواوی بکەرە، خودا-سبحانە وتعالی- لەو سیفەتە پاك و بێگەردە، و ئەو-سبحانە وتعالی- بەرەهایی دەوڵەمەندیکی بێنیازە، بۆیە دروست نییە بوترێت حوکمە شەرعییەکانی کە داوای لە مرۆڤ پێکردوون هۆدارن بە مەرامەکان، چونکە مەرام بریتییە لە پڕکردنەوەی ناتەواوی یان تێرکردنی پێویستی.

هەندێکیان پێچەوانەی ئەم ئاراستەیە بۆی دەچن، بۆیە دەڵێن: هەر حوکمێك لە حوکمەکانی خودا هۆدارە بە مەرام و حیکمەت، چونکە بەو حوکمانە ویستوویەتی دەستەبەری بەرژەوەندی مرۆڤ بکات کە مەرام و هۆی ئامانجگەراییە، وەك بە دەق لەگەڵ پێغەمبەرەکەی محەمەد(ﷺ) دەدوێ و دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[1]، رەحمەت بریتییە لە بەرژەوەندی مادی و مەعنەوی، و دونیایی و دوارۆژیی ئەرێیی(سوودی راکێشراو) و نەرێیی(خراپەیەك یان زیانێکی لادراو)، بەڵام لەوانەیە مرۆڤ بە ژیرییەکەی ئەو ئامانجە یان ئەو حیکمەتە لە دەقەکان و حوکمەکانیاندا پەی پێ ببات، ئەوکات دەوترێت ئەو حوکمانە مانایان ماقووڵە، واتە

[1] الأنبياء: ١٠٧

حیکمەت و هۆی ئامانجگەراییان هەیە کە ژیری پەییان پـێ دەبـات، لەبەرانبـەر ئـەو حوکمانەدا کۆمەڵێك حوکمی شەرعی تر هەن ژیری ناتوانێن نهێنی و حیکمەت و هۆی ئامانجگەراییان پەی پێ ببات، وەك دیاریکردنی عیدەی ئافرەتی مێردمردوو بە چوار مانگ و دە ڕۆژ، یان دیـاریکردنی مـانگی رەمـەزان بـۆ ڕۆژووگـرتن، و هاوشـێوەکانی ئەمانە، نموونەی ئەم حوکمانە پێیان دەوترێت حوکمـەکانی بەندایـەتی کـردن، واتـە لەسەر مرۆڤ پێویستە بۆیان گەردنکەچ ببێت و جێبەجێیان بکات بەبێ گەڕان بەدوای حیکمەت و ئامانجیاندا، چـونکە ژیـری مـرۆڤ کەموکورتـە و ئابلۆقـەی هـەموو شـتێك نادات.

بە بۆچوونی ئێمە جیاوازییەکە گوزارەییە، چـونکە گـەر بـە سـەرنجدان لـە مـرۆڤ هاندەر و مەرام بۆ حوکمەکانی خودا وەربگرین ناتوانرێت نەرێ بکرێن، چونکە هەموو مرۆڤێکی ژیرمەند پەی بەوە دەبات بەبێ بوونی هۆ و مەرام و سوودێك بەو حوکمانـە مرۆڤ داوای لێ نەکراوە، زانایانی موسـڵمانی کـۆن و نـوێ کۆدەنگیـان هەیـە لەسـەر ئەوەی هەموو ئەو بیروباوەڕ و عیبادەت و مامەڵە و داوایانەی خودا لە مرۆڤی دەکات بۆ مەرامی بەرژەوەندی مرۆڤە.

بەڵام گەر ئەو مەرامانە تایبەت بە خودا وەربگرین، بەو تێڕوانینەی گوایە سوودی حوکمەکان بۆ خودا دەگەڕێنەوە و پێویستی و ناتەواوییەکانی ئەو تەواو دەکەن، ئەوا بێباوەڕییە و هیچ کەس ناوێرێت بە زمانیدا بێت، چونکە خودا دەوڵەمەندی رەهایە و بێنیازە لە هەموو جیهانان، گەر خێزانی مرۆڤایەتی شەو و ڕۆژ لە سوژدەبردندا نغـرۆ بن گەردیلەیەك لە مەزنی خودا زیاد ناکەن، گەر لە ئیلحاد و زەندەقـە و یاخیبوونـدا نغرۆ بن لە مەزنی خودا گەردیلەیەك کەم ناکات، بۆیە مەبەسـتەکان لـە حوکمـەکانی خودادا کۆمەڵێك مەرامن تایبەت بە خودا–سبحانه وتعالی– و کۆمەڵێك بەرژەوەنـدین تایبەت بە مرۆڤ.

# مەبەستی دووەم:
# هۆ لە یاسادا

چەندین بیردۆزەی لەیەکتر جیاواز لە دیاریکردنی هۆ لە پابەندبووندا یان لە گرێبەستدا بوونیان هەیە، گرنگترینیان:

**أ-بیردۆزەی فەرەنسی:**

(ناسراوە بە بیردۆزەی نەریتی) کە بەشێوەیەکی گشتی هۆ دابەش دەکات بۆ سێ جۆر، ئەوانەش هەمان ئەو بەشانەن زانایانی موسڵمان لە ئوسولییەکان و فەقیهەکان و فەیلەسوفەکان و زانایانی زانستی کەلام دەستیان بۆ بردوون و باسیان لەبارەیانەوە کردووە، لە کاتێکدا یاسا لەم بارەی ئێستایدا هۆی نەناسی بوو، بەڵکو بە کۆمەڵێك گۆڕانکاریدا گوزەری کردووە و تاکو ئێستا لە دیاریکردنی مانای وردی ئەم زاراوەیەدا جێگیر و دامەزراو نەبووە، "السنهوري"[1] دەڵێت: (بیرۆکەی هۆ بە شێوەیەکی ترسناك گۆڕان و پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە، وای لێهاتووە هۆ بووە بە هاندەری پاڵنەر لە گرێبەستگیریدا.

**جۆرەکانی هۆ لە یاسادا سیانن:**

**جۆری یەکەم: هۆی سەرپێهەڵدەر(یان هۆی داڕێژەریی)**، ئەمە ئەوەیە زانایانی یاسا پێی دەڵێن "سەرچاوەی پابەندبوون"، وەك گرێبەست و ویستی یەکلایەنە و کرداری زیانبەخش و دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ(یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ)، زانایانی

[1] الوسيط ٤٦٦/١. ويقول في كتابه مصادر الحق ١٢/٤ (بیرۆکەی "هۆ" بەبەردەوامی و بەدرێژایی ئەو حەوت سەدەیە لە سەدەی دوازدەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم لە گەشە و گۆڕاندا بووە)

یاسا ئەم جۆرە لە هۆیان لەژێر ناونیشانی هـۆی سـەرپێهەڵدەر چارەسـەر نـەکردووە گوایە سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی پابەندبوون.

"السـنهوري"[1] دەڵێـت: هـۆی داڕێـژەریی بریتییـە لـە سەرچـاوەی پابەنـدبوون، ئـەوەمان زانـی سەرچـاوەکانی پابەنـدبوون بـریتین لـە گرێبەسـت و کـاری نـاڕەوا و دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ و یاسا، هۆ بەم مانایە لێرەدا مەبەستی ئێمە نییە و پێویستە دووری بخەینەوە".

مامۆستا مەرقەس دەڵێـت[2]: "بـیردۆزەی نـەریتی لـە نێـوان سـێ مانـادا بـۆ هـۆ جیادەبێتەوە:

**جۆری یەکەم: هۆی سەرپێهەڵدەر:** ئەمەش بریتییە لە هـۆی پابەنـدبوون، واتـە رووداوی یاسـایی کـە پابەنـدبوونی دروسـتکردووە، وەك کـاری زیانبەخشـانە و گرێبەست، ئەم مانایە وەك ئێمە دەیبینین پەیوەندی نییە بە پایـەکانی گرێبەسـت و پابەندبوونەوە".

ناونانی ئەم جۆرەیان بە سەرچاوەی پابەندبوون هەڵەیەکی رۆشنە، چۆن ئەو دوو زانا گەورەیە و هاوشێوەکانیان تێیکەوتوون؟!.

**جۆری دووەم: هۆی مەرامی(یان مەرامی ناڕاستەوخۆ)** یان وەك هەنـدێك نـاوی لێدەنێن بە "هۆی هونەری"[3]، ئەوەش بریتییـە لـە مـەرامی راسـتەوخۆ کـە کەسـی پابەندبوو مەبەستییەتی لـە پشـتی پابەندبوونەکەیـەوە پێـی بگـات، لـە گرێبەسـتی بریتیکاریـدا هـەر بریتییـەك یـەکێك لـە دوو گرێبەسـتکارەکە وەریـدەگرێت هۆیـە بـۆ پابەندبوونی کەسی بەرانبەر بەوەی بە گرێبەستکارەکەی تر دەدرێت.

---

[1] الوسيط ٤٧٨/١.

[2] الدكتور سليمان مرقس، أصول الالتزامات (ص ١٤٦) قارن أستاذنا الدكتور عبدالمجيد الحكيم شرح القانون المدني العراقي ٢١٦/١.

[3] د. وحيد الدين سوار، التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي ص٤٧٤.

بە بۆچوونی ئێمە هۆ بەم مانایە لە بەخششەکاندا نابینرێتەوە، بەڵکو هۆ تیایدا بە هەمیشەیی بریتییە لە هاندەری پاڵنەر، ئەوەی هەندێ لە پیاوانی یاسا بۆی دەچن گوایە هۆ لە بەخششەکاندا بریتییە لە نییەتی بەخشین هەڵەیەکی باوە، چونکە نییەت سیفەتێکی راوەستاوە بە کەسی بەخشەرەوە، لە کاتێکدا هۆی بەخشین کە دەیەوێت دەستەبەری بکات بریتییە لە کاروبارێکی دەرەکی، وەك سیلەی رەحم یان نزیکبوونەوە لە خودا یان گێرانەوەی چاکە و هاوشێوەکانی ئەمانە لە پێدان و بەخشش.

**جۆری سێیەم–هۆی پاڵنەر(یان مەرامی دوور یان ناڕاستەوخۆ یان وەك ئەوەی هەندێك پێی دەڵێن: هۆی بەرژەوەندییانە)**[1]، بۆ نموونە هاندەری پاڵنەر بۆ کەسێك ئۆتۆمبێلەکەی دەفرۆشێت لەوانەیە بە پارەکەی بینایەك تەواو بکات یان ژن بهێنێت یان دوکانێك دابنێت یان ئۆتۆمبێلێکی نوێ بکڕێت یان شتانی تر لە هاندەر کە بە جیاوازی دوو گرێبەستکارەکە و گرێبەستەکان جیاوازی دەکەوێتە ناویانەوە، بینا لەسەر ئەوە هۆی پاڵنەر لە هۆی مەرامیی بە چەندین جیاکەرەوە و تایبەتمەندی جیادەبێتەوە، لەوانە:

أ.هۆی پاڵنەر شتێکە لە دەرەوەی گرێبەستەوە، لە رێککەوتنی دوو گرێبەستکارەکەدا باس ناکرێت، بە پێچەوانەی هۆی مەرامییەوە کە لەناو گرێبەستەکەدایە، چونکە بەشێکە لە گرێبەست لەسەرکراو کە بریتییە لە هەریەك لە دوو بریتییەکە.

ب–هۆی پاڵنەر شتێکی خودییە بۆ کەسی پابەندبوو کاتێك پێداچوونەوە دەکات بۆ نییەتەکانی و ئەوەی پێی کاریگەر دەبێت لە پاڵنەرەکان، بە پێچەوانەی هۆی سەرپێهەڵدەر و هۆی مەرامییەوە، هەریەك لەو دوانە بابەتین بە جیاوازی مەرامەکان جیاواز دەبن.

---

[1] د. وحيد الدين سوار المرجع السابق ص٥١٣.

ج-شتێکە دەگوێزێت نەك تەنها لە هەموو جۆرەکانی گرێبەستدا بەڵکو لە یەکبەیەکی گرێبەستەکاندا هەریەکەیان بۆخۆی، ئەمەش بەپێی جیاوازی دوو کەسی گرێبەستکار بەڵکو تایبەت بە یەکێك لە گرێبەستکارەکان لە دوو دۆخی جیاوازدا.

**رەخنە لە بیردۆزەکە:** بیردۆزەی فەرەنسی(نەریتی) رووبەرووی چەندین رەخنە بووەتەوە کە پێویست بە باسکردنیان ناکات، تەنها بەوەندە رادەوەستم کە فەقیهی فەرەنسی "بلانیۆل" دەیکاتە بەڵگەی نادروستی ئەم بیردۆزەیە بەوەی نەشیاویی مەنتقی پێویست دەکات، پێویست پووچەڵە هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

رۆشنکردنەوەی قسەکەی "بلانیۆل"، ئەو لەوەی بۆیچووە لە نەشیاویی مەنتقی دەڵێت: پابەندبوونی فرۆشیار لە گرێبەستی فرۆشتنەکەدا-بۆ نموونە- هۆیەکە بۆ پابەندبوونی کڕیار، و پابەندبوونی کڕیاریش هۆیەکە بۆ پابەندبوونی فرۆشیار، بۆیە بوونی هەریەکەیان لەسەر ئەویتریان رادەوەستێت، سەرئەنجام هیچ کامیان دەستەبەر نابن، بە خستنەبری بەڵگەهێنانەوەکە بەم جۆرەیە:

(أ) لەسەر (ب) رادەوەستێت، و (ب)ش لەسەر (أ) رادەوەستێت ئەنجام لەدوای لابردنی ناوەندەکە بریتییە لەوەی کە (أ) لەسەر (أ) رادەوەستێت، چونکە وەستانی شتێك لەسەر ئەوەی کە لەسەری وەستاوە وەستانی شتەکە لەسەر خۆی پێویست دەکات، ئەمەش پێشکەوتنی شتێك لە خۆی پێویست دەکات، پێویست پووچەڵە هەر بەو جۆرە پێویستکراو[1]

بە بۆچوونی ئێمە ئەم بەڵگەهێنانەوەیە ئاتاج بە وردەکاری و زانیاری مەنتقە، چونکە نەشیاویی مەنتقی تەنها بەسەر کاروبارە واقیعییە هەبووەکانی دەرەوەی زەینی مرۆڤدا تێدەپەڕێت، وەستانی پابەندبوونی هەر یەکێك لە گرێبەستکارەکان لە گرێبەستی پابەندکەردا بۆ هەردوو لا لەسەر پابەندبوونی گرێبەستکارەکەی تر لە

[1] الموجز بشرح القانون المدني العراقي، مصادر الإلتزام، للدكتور عبدالمجيد الحكيم ٢٢٤/٢.

کاروبارە زەینییە یاساییە لەبەرچاوگیراوەکانە، بۆیە لە کاروبارە لەبەرچاوگیراوەکاندا نەشیاویی مەنقی بوونی نییە.

گەر –تەنها بۆ گفتوگۆ– خۆمان رادەستی بوونی نەشیاویی مەنتقی بکەین لە کاروبارە لەبەرچاوگیراوەکاندا، ئەوا دیسان راوەستاوە لەوەی فەقیهی فەرەنسی(کابیتان) وەك بەرگری لە بیردۆزەکە دەیڵێت: هۆی پابەندبوونی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە بریتی نییە لە پابەندبوونی ئەویتر بەڵکو بریتییە لە جێبەجێ کردنی پابەندبوونەکە.

## ب-بیردۆزەی ئیتالی لە هۆدا:

پوختەکەی هۆ بریتییە لە فەرمانی هەڵسوکەوتی یاسایی، و هۆ لە تێگەیشتنی ئەم بیردۆزە نوێیەوە بەوە جیادەبێتەوە بەوەی دابڕاوە لە ویستی تایبەت و پەیوەستە بە ویستی یاساوە، هەموو هەڵسوکەوتێك لە خودی خۆیدا بە سەرنجی مادی سەرنج دەدرێت، مەرامێکی ئابووری هەیە پاساو بە بوونی دەدات، بۆیە هۆ بریتییە لە مەرامی ئابووری یاسایی و یاسا دانی پیادا دەنێت و دەیپارێزێت، بۆ نموونە، هۆ لە فرۆشتندا بریتییە لە ئاڵوگۆڕکردنی شتێك بە نرخێك، واتە ئاڵوگۆڕی دوو کەسی گرێبەستکار بە قازانج و سوودی ئابووری یاسایی بەرانبەر بوو بە یەکتر[1].

ئەم بیردۆزەیە رەخنەی لێدەگیرێت بەوەی بەرهەڵستکاری دەکات لەگەڵ رێکخستنە یاساییەکاندا بۆ گرێبەستەکان و پابەندبوونەکان کە قسە لە هۆیەك دەکەن ویستی تایبەتی تاکەکەسی پاڵپێوە بنێت بۆ گرێبەستکاری بەبێ ئەو هۆیەی ویستی یاسا پاساو دەدات، پاشان ئاڵوگۆڕ بریتییە لە خودی گرێبەست و هەڵسوکەوتی یاسایی.

---

[1] التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي، المرجع السابق ص٤٧٧.

**بیردۆزە هاوچەرخییەکان بۆ هۆ:**

پوختەکەی ئەوەیە هۆ هاندەری پاڵنەرە بۆ گرێبەستکردن یان هاندەری پاڵنـەرە بۆ کەسی پابەندبوو تا پابەند ببێت، لەبەر ئەوەی ویست ئـازاد بـوو، لـەوەی چۆنی بوێت پابەندبوون سەرپێهەڵبدات، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی هـەر دەبێـت هانـدەرێکی هەبێت پاڵی بنێت، بۆیە کەمترین شت ئەوەیە یاسا بە مەرجی بگرێـت ئـەو هانـدەرە رەوا بێت، ئەو مەرامەی ویست دەیەوێت دەستەبەری کرد مەرامێك بێت یاسا حەرامی نەکردبێت و لەگەڵ سیستمی گشتیدا بەرهەڵستی نەکات و بە ئاداب و نەرێت نەرێکار نەبێت، هاندەرەکانی ویست زۆر و جۆراوجۆرن، هەیانە پاڵنەرە و هەیانە پاڵنەر نییە، هەیانە سەرەکییە و هەیانە سەرەکی نییە، بۆیە هاندەری پاڵنەری سەرەکی ئەوەیـە کە بایەخی پێ دەدرێت، ، و هەرکات توانرا پەردەی لەسەر لابدرێت پێویستە لـەپای بوەستی، چونکە ئەوە بریتییە لە هۆ[1]

**ئەسەری هاندەری پاڵنەری ناڕەوا لە هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە یاسادا:**

دوو ئاراستەی پێچەوانە بەیەکتر هەن:

ئاراستەی جەرمانی: بایەخ بە ویستی ئاشکرا دەدات و ئاراستەی لاتینی: بایەخ بە ویستی ناوەکی دەدات.

ئاراستەی جەرمانی[2]: لە یاسای مەدەنی ئەڵمانیدلیە کە ئەنگێزەیەکی بابەتیانەی هەیە، بایەخ بە پاڵنەرە ناوەکییەکان نادات، چونکە بوونیان لە گوزارشت لـە ویسـتدا ساغ نەبووەتەوە و بەشێك نییە لەوە، بۆیە گەر تەنها هانـدەرێکی نـاوەکی بـوو ئـەوا یاسا بایەخی پێ نادات، بەڵام گەر گوزارشتەکە لەئامێزی گرت و ڕەوا بوو ئەوا قـازی بایەخی پێ دەدات، بۆیە گرێبەستەکە دروست و بەرهەمهێن دەبێت بۆ ئاسەوارەکەی،

---

[1] مصادر الحق في الفقه الإسلامي دراسة مقارنة بالفقه الغربي، للدكتور عبدالرزاق السنهوري، الطبعة الثالثة (١٩٦٧) ٢٥/٤.

[2] التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي، المرجع السابق ص٤٨٢.

بەلاّم گەر پێچەوانەی ئادابی لەسەر دانراوبوو ئەوا گرێبەستەکە دەڕمێت و ئاسارەکانی لەبەریەکتر هەڵدەوەشێن و قەزای ئەڵمانی بایەخی پیّ نادات و لەم بارەدا هەروەك فیقهی شافیعی وایە.

ئاراستەی لاتینی(فەرەنسی): ئەوەی ئاشکرایە بیرۆزەی هاوچەرخ لە هۆدا لەسەر هاندەری پاڵنەر جێگیر بووە، و فیقه و قەزای فەرەنسی کاری پێکردووە، بەلاّم بایەخ بە هاندەری پاڵنەری ناڕەوا نادات یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکەی پاڵنابێت بۆ گرێبەستکردن گەر ئەو پاڵنەرە نائیار بوو لە گرێبەستکارەکەی ترەوە، بەڵکو پێویستە ئەو گرێبەستکارە زانستی پێی هەبێت، بەلاّم ئاستی ئەو زانینە چەندە؟

بۆ نموونە، گەر (أ) لە (ب) بڕێك پارەی قەرز کرد بۆ ئەوەی قوماری پیّ بکات، ئایا ئاستی زانینی پێویست چەندە بۆ قەرزدەر(ب) تاکو حوکم بکات بە نادروستی ئەو قەرزە بەهۆی نادروستی هاندەری پاڵنەرەوە:

لە فەرەنسا بیروڕاکان لەسەر ئەمە لەیەکتر جیاوازن، بەم شێوەیە:

١-فەقیهی فەرەنسی(کابیتان) دەڵێت: پێویستە بگەنە ئاستی ڕێکەوتن بۆیە بایەخ بە هاندەر نادرێت مەگەر لە نێوان دوو کەسە گرێبەستکارەکەدا ڕێکەوتنی لەسەر کرابێت.

٢-قەزای فەرەنسی بە ئاستی زانست بە هاندەر کۆڵدەدات و بایەخ بە هاندەر دەدات کە گرێبەستکارەکەی پاڵناوە بۆ گرێبەستکردن گەر گرێبەستکارەکەی تر بزانێت یان بتوانێت بەو هاندەرە بزانێت وەك لە باری هەڵەدا، ئەمە ئەوەیە فیقهی مالیکی و حەنبەلی بۆی دەچن وەك باسمان کرد.

٣-فیقهی فەرەنسی جیاکاری دەکات لە نێوان بریتیدان و بەخشینەکان، لە بریتیداندا ئاستێکی بالاّتر لە زانین داوا دەکات وەك باسمان کرد، بەلاّم فەقیهەکان لە دیاریکردنی ئەم ئاستە جیاوازیان لەنێواندایە، بەم شێوەیە:

أ.فەقیهی فەرەنسی(جوسران) پێیوایە ئەوەندە بەسە لە بریتیدانەکاندا لەلای گرێبەستکارەکەی تر هاندەر ئاشکرا بێت تا لەوەدا خۆپارێزی لە هەڵوەشان

بۆ مامەڵەکردن بوونی هەبێت، بە پێچەوانەی بەخشینەکانەوە، ئەو ویستەی لە پای دەوەستێت تەنها بریتییە لە ویستی کەسی بەخشەر کە زاڵە بەسەر هەڵسوکەوتدا جا بەخشینەکە بە بەیەکترگەیشتنی دوو ویستەکە تەواو بووبێت وەك لە گرێبەستی پێدان(بەخشش) یان بە یەك ویست وەك لە وەسێتدا، ئەو لەوەدا بایەخ بە هاندەری پاڵنەری نارەوا دەدات جا ئاشکرا بێت لای لایەکەی تر یان لێی شارلوە و نادیار بێت.

ب-"بواجیزان" گەیشتن بە ئاستی بەشداریکردن لە بریتیدانەکاندا و رازیبوون بە ئاستی زانین لە بەخشینەکاندا بە پێویست دەبینێت، ، چونکە لە یەکەمدا هەر یەك لە دوو کەسە گرێبەستکارەکە شتێکی لەلای خۆیەوە تیایدا بەخشیوە، ویستی هەریەکەیان هەڵدەستێت بە رۆڵێکی بنەرەتی لە دروستکردنی گرێبەستەکەدا، بۆیە بەشداربوونی هەردووکیان پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی مەرامی نارەوا، بەلام لە بەخشینەکاندا ویستی کەسی بەخشەر بنچینەیە بۆیە کورتبوونەوە لەسەر ئاستی زانین دروستە.

"السنهوري" پارسەنگی ئاراستەی قەزای فەرەنسی دلوە لە بەسبوونی ئاستی زانین بەرەهایی، جا هەڵسوکەوتەکە بەخشین بێت یان بریتیدان[1] ئەوەش کارێکی باش بووە، چونکە لەگەڵ فیقهی ئیسلامی و مەنتقی یاسایی پێکدێتەوە.

---

[1] مصادر الحق في الفقه الإسلامي (دراسة مقارنة بالفقه الغربي للسنهوري) ٢٨/٤.

# باسی دووەم:
# پێناسەی گرێبەست

لێکۆڵینەوەی گرێبەست بەدوورودرێژی باس لێوە دەکەم، چونکە لە گرنگترین هۆیەکانی پابەندبوونە لە هەردوو جیهانی شەریعەت و یاسادا.

**گرێبەست:** لە زاراوەی شەرعی(یان یاسایی)دا بە چەندین پێناسە پێناسەکراوە، دەتوانرێ هەر هەموویان لە پێناسەیەکی کورتی پوختی رۆشنی کۆکەرەوەی رێکردا کۆبکەینەوە، ئەوەش: گرێبەست بریتییە لە پەیوەندی ئەرێکردن و قبوولکردن لە روویەکەوە ئەسەرەکەی جێگیر بکات لە گرێبەستکار و گرێبەست لەسەرکراودا. ئەسەرەکەی لە گرێبەستکاردا بریتییە لە پابەندبوونی بەوەی پێویستە لەسەری پێی هەڵبستێت بەرانبەر گرێبەستکارەکەی تر بەپێی گرێبەستەکە کە لە سەرپێهەڵدانیدا بە ویستی ئازاد و رۆشنبینی خۆی بەشداری کردووە، ئەسەرەکەی لەسەر گرێبەست لەسەرکراو بریتییە لە ئاڵوگۆڕکردنی حاڵەتە شەرعییە(یان یاساییە) راوەستاوەکە پێش گرێبەستەکە بۆ هەر یەکێك لە دوو بریتیدانەکە، بە گواستنەوەی موڵکدارییەکەی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی لە بەکارهێنان و بندەستخستن و هەڵسوکەوت و ئامێزگری شەرعی و بەرهەڵستە دەرەکییەکانی لە دابینکردن و پێدانەکان و مافەکان کە جێگەی گرێبەستیان لە گرێبەستکارێکەوە بۆ گرێبەستکارێکی تر پێ قورس دەبێت[1]

---

[1] (مادەی م٧٣ لە یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکار پێناسەی کردووە بەوەی: "پەیوەست بوونی ئەرێکردنی دەرچوو لە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکەوە بە قبوولکردنی ئەویتریان بەجۆرێك ئەسەرەکەی لە گرێبەست لەسەرکراودا جێگیر ببێت" ئەمە پێناسەیەکە لە "مرشد الحیران"ی محمد قدری باشا(مادەی ١٦٨)وەرگیراوە)

←

بـە گرێبەسـتی فرۆشـتن–بـۆ نموونـە– موڵکـداری فرۆشـراو لـە فرۆشـیارەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کڕیار، و پێدانی نرخەکەی لە کڕیارەوە بۆ فرۆشیار، گەر فرۆشـراو رەهنکراو بوو یان بەکرێدراو بوو ئەوا پابەندبوونەکانی فرۆشیاری قەرزداری رەهنـدەر یان بەکرێگر بەرانبەر بە قەرزدەری رەهنگر یان بەکرێدەر دەگوێزرێتەوە بۆ کڕیارەکە لە یاسادا.

## رۆڵی گرێبەست لە سەرهەڵدانی پابەندبووندا:

یاساکان و فەقیهانی یاسا لەسـەر ئـەوە هـاودەنگن پابەنـدبوون لـە ئەسـەرەکانی گرێبەستە، گەر بە دروستی دامەزرا ئەوا مافەکان و ئەرکەکان لەسەری سەرهەڵدەدەن گەر رێگرێك بوونی نەبێت ببێتە هۆی لادانی لەو کارە.

بینا لەسەر ئەمە پێویست بوو ئەوان رێبکەون لەسەر ئەوەی گرێبەست هۆیەکە لە هۆیەکانی پابەندبوون، سەرەڕای ئەوەش کەوتوونەتە ناو ئەم هەڵانەوە:

١–دەڵێن: گرێبەست هۆیـەکی سـەرپێهەڵدەرە لـە پابەندبوونـدا، بـەڵام پێویسـتە باسی لێبکرێت و چارەسەر بکرێت نەك لەو رووەوە کە هۆیەکە بۆ پابەندبوون، بەڵکو لەو رووەوە کـە سەرچـاوەیەکە بـۆی، ئەمـەش مـەنتقی یاسـایی رەدی دەکاتەوە بەهۆی جیاوازی چییەتی هەریەك لە هۆ و سەرچاوە.

هۆ وەسفێکی دەرەکی و ئاشکرا و رێکخراوە، هەر کـات بـە شـێوەیەکی دروسـت دەستەبەر بوو و رێگری نەما ئەوا ئەنجامەکە(ئەسەرەکە) لەسەری سەرهەڵدەدات، جا حوکمێك بێت یان هەر ئەسەرێکی تر، ئەم وەسفپێدانە لە دانانی خـاوەن شـەرع یـان یاسـادانەرە، چـونکە هـۆ حـوکمێکی دانـراوە وەك چـۆن پابەنـدبوون حـوکمێکی

---

تێبینی دەکرێت لەسەری بەوەی پێناسەیەکی کۆکەرەوە نییە، چونکە ئاسار لە پابەندبوونەکان ناگرێتە خۆ، بینا لەسەر ئەوە پێشنیار دەکـەین وشـەی گرێبەسـتکار بخرێتـە سـەر گرێبەست لەسەرکراو تاکو پابەندبوونەکانیش بگرێتەوە، چونکە ئاسـاری گرێبەسـت مافەکانـە تایبـەت بـە گرێبەست لەسەرکراو و ئەرکەکان تایبەت بە گرێبەستکار.

دلواكاریانەیە، لە كاتێكدا سەرچاوە بریتییە لە بەڵگەی شەرعی كە ئەنجام لەسەر هۆیەكە رێكدەخات و هێزی پابەندكردنی پێ دەدات و كەسی پابەندبوو بەپێی ئەوە بە كار پابەند دەكات، پێشتر ئەم بابەتە بەدرێژی باسكراوە.

بینا لەسەر ئەمە، گرێبەست هۆیە بۆ سەرهەڵدانی پابەندبوون، بەڵگەی ئەوەی خاوەن شەرع كردوویەتی بە هۆ بۆ پابەندبوونە شەرعییەكان بە دەقی شەرعی ئەم ئایەتەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[1]، واتە وەفاداری بكەن بەو پابەندبوونانەی لەسەر گرێبەستی دروست سەرهەڵدەدەن، بە دەقی یاسا وەك لە مادەی (٨٢٦)ی مەدەنی عێراقی رلوەستاو تایبەت بە پابەندبوونی سەرهەڵدەر لە گرێبەستی چاندنەوە كە دەقەكەی دەڵێت: (خاوەن زەوی پابەند دەبێت بە رادەست كردنی زەویەكە بۆ كەسی چێنەر و دەبێت زەویەكە خاڵی بێت لە خەرۆكەر(خەریككەر)).

چاندن گرێبەستێكە كەسێك هەڵدەستێت بە پێدانی زەوییەكەی بە كەسێكی تر بۆ ئەوەی درەختی دیاریكراوی تیادا بنێژێت و هەستێت بە پەروەردەكردنیان بۆ ماوەیەكی دیاریكراو لەسەر ئەوەی درەختەكان و زەوییەكە یان تەنها درەختەكان لە نێوانیاندا هاوبەش بن بە رێژەیەكی دیاریكراو دوای تەواوبوونی ماوەكە.

ئاشكرایە دروست نییە "سەرچاوە" بۆ "هۆ" بەكاربهێنرێت، چونكە دوو ناوەكە پێویستە هاوواتا بن لەڕووی خود و پێكهێنەرەكانییەوە، نموونەی پێناسەكەر و پێناسەكراو لەگەڵ ئەوەی لەیەكتر جیاوازن لەڕووی چییەتییەوە وەك باسمان كرد.

٢-لە نێوان هۆی پابەندبوون و فەلسەفەی پابەندبووندا تێكەڵییان بۆ دروستبووە، ئەوەی لە فەلسەفەی پابەندبوون و هۆی ئامانجگەرایی و مەرامی نزیك یان دووریەتی بە "هۆ"یان داناوە بۆی، ئەمەش دیسان مەنتقی یاسایی رەدی دەكاتەوە، چونكە فەلسەفەی هەر شتێك بریتییە لە مەرامی نزیك یان دوور و

[1] سورة المائدة/ ١.

هـــۆی ئامانجگـــەرایی و بەرژەوەندییـــە بەمەبەســـتگیراوەکەی و ئەنجامـــە داواکراوەکەی و دەرئەنجامە بەمەرامگیراوەکەی، فەلسەفە بەم مانایانە لەڕووی دەستەبەریوونەوە دواخراوە، لە کاتێکدا هۆ پێشخراوە لەڕووی بوونەوە، ئـەو دوانەش واتە مەرامی فەلسەفی و هۆ لـەڕووی چییەتییەوە لەیـەکتر جیـاوازن، بۆیـە چـییەتی مـەرام(وەك یـەکێك لـە دوو بریتیدانەکـە لـە گرێبەسـتەکانی بریتیداندا) بریتییە لە فەلسەفە و چییەتی هۆ پێشتر لە برگەی یەکەم باسمان لەبارەوە کردووە.

٣-وەك باسمان کرد زیاتر لە هۆیەکیان بۆ پابەندبوون دانپیاداناوە، بۆیە دەڵێن:

أ.گرێبەست هۆیەکی سەرپێهەڵدەرە بۆ پابەندبوون.

ب-وەك دەڵێن هەریەك لە بریتیدانەکە هۆیە بۆ پابەندبوون، بۆیە هۆی مەبەسـتی یان مەرامی راستەوخۆ یان وەك ئەوانەی[1] ناوی "هۆی هونـەری" لـێ دەنـێن واتـــە مـــەرامی راســـتەوخۆ کـــە کەســـی پابەنـــدبوو دەیـــەوێت لـــەویو پابەندبوونەکەیەوە پێیبگات.

بۆیـە دەڵـێن: لـە گرێبەسـتەکانی بریتیدانـدا هـەر بریتیـدانێك یـەکێك لـە دوو گرێبەسـتکارەکە وەریـدەگرێت دەبێتـە هـۆ بـۆ پابەنـدکردنی ئـەو کەسـە بـۆ گرێبەستکارەکەی تر بەوەی پێی دەدرێت لە بەرانبەرەوە. بەڵگەنەویستە ئەو مەرامـە راسـتەوخۆیە بریتییـە لـە فەلسـەفەی پابەنـدبوونی "گرێبەسـت لەسەرکراو" نەك هۆیەك بێت بۆی.

ج-هـۆی پاڵنەر(مـەرامی دوور) یـان ناڕاسـتەوخۆ یـان هـۆی بەرژەوەنـدی بـۆ پابەندبوون[2]، لەگەڵ ئەوەی ئەم هاندەرە پاڵنەرە-کە پێـی دەوترێـت هـۆی پاڵنەر- بریتییە لە فەلسەفەی لێ چوونەپێش بۆ گرێدانی گرێبەستەکە، بەڵام بە جیاوازی کەسەکان جیاواز دەبێت تەنانەت لە یەك گرێبەستدا، بۆ نموونـە،

---

[1] لەوانە: د. وحيد الدين سوار- التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي، ص٤٧٤.

[2] المرجع السابق، ص٥١٣.

هاندەری پاڵنەر(فەلسەفەی پاڵنەری دوور) بۆ كەسێك كە ئۆتۆمبێلەكەی دەفرۆشێت لەوانەیە تەواوكردنی بینایەك بێت بە نرخەكەی، یان هاوسەرگیری یان چارەسەری نەخۆش یان كردنەوەی دوكانێك یان كڕینی ئۆتۆمبێلێكی نوێ بێت، یاخودی شتانی تر.

بە پێچەوانەی فەلسەفەی نزیكەوە(مەرامی راستەوخۆ) ئەمەیان بەشێكە لە گرێبەستەكە و پشكنینی لە ناوەوە بۆ دەكرێت، لە كاتێكدا فەلسەفەی پاڵنەر(فەلسەفەی دووری پاڵنەر) لە خودی گرێبەستكاردا پشكنینی بۆ دەكرێت، چونكە لە پێكهاتەكان و ویستە ناوەكییەكانی ئەوە و لەژێر تێگەیشتنی ئەرێكردن و قبوولكردندا جێگەی نابێتەوە لە كاتی گوزارشت لە ویستی ناوەكی بە ویستی دەرەكی.

د-دەڵێن: پابەندبوونی هەریەك لە دوو گرێبەستكارەكە لە گرێبەستی بریتیداندا هۆی پابەندبوونی ئەویتریانە، واتە پابەندبوونی فرۆشیار-بۆ نموونە- بە رادەستكردنی فرۆشراوەكە هۆیەكە بۆ پابەندبوونی كڕیار بە رادەستكردنی نرخەكەی، بۆ قسەكردن لەسەر ئەمە "بلانیۆل" لە رەخنەگرتنی بۆ بیردۆزەی هۆگەرایی[1] دەڵێت:

"لە بیردۆزەی نەریتیدا كە هۆ دابەش دەكات بۆ سێ جۆر(سەرپێهەڵدەر، مەرامی راستەوخۆ، هاندەری پاڵنەر یان مەرامی دوور) هۆی پابەندبوون لە گرێبەستی پابەندكەر بۆ هەردوو لایان بریتییە لە پابەندبوونی بەرانبەر... لەمەشدا نەشیاوی مەنتقی بوونی هەیە، چونكە هەردوو پابەندبوونەكە لە یەك كاتدا سەرهەڵدەدەن، بۆیە یەكێكیان نابێتە هۆ بۆ ئەویتریان، ئەسەر و خاوەن ئەسەر و هۆ و ئەنجام ناكرێت هەردووكیان هاودەم(هاوكات) بن".[2]

---

[1] ئەو لە مەقیهە مەزنە یاساییەكانی فەرەنسایە.

[2] نقلا عن الأستاذ عبدالمجيد الحكيم – الموجز في شرح القانون المدني العراقي ٢٤٤/١.

**ڕۆشنکردنەوەی قسەکەی بلانیۆل:**

ئەو لە ڕەخنەکەیدا لە ڕوویەکەوە پێکاویەتی و لە ڕوویەکی ترەوە بەهەڵەداچووە:

ڕووی پێکانەکەی لە ڕەخنەکەدا ئەوەیە گەر وامان دانا یەکێك لە دوو پابەندبوونەکە(أ) بێت و ئەویتریان(ب) بێت، گەر (أ) لەسەر (ب) ڕابوەستێت و (ب)ش لەسەر (أ) ڕابوەستێت ئەوا پێویست دەکات (أ) لەسەر (أ) ڕابوەستێت لەدوای سڕینەوەی دووبارەکە لە ناوەند، ئەوکات پێویست دەکات شتێك لەسەر خۆی وەستا بێت، ئەمەش پێویستی دەکات شتێك پێش خۆی کەوتبێت، پێویستەکە نەشیاوە و پێویستکراوەکەش هەربەو جۆرە.

ئەو لەو قسەیەدا پێکاویەتی دەڵێت دوو پابەندبوونەکە لە گرێبەستەکاندا کە بۆ دوو لایەنەکە پابەندکەرە هاوکاتن، بەڵام لە بەڵگەهێنانەوەی مەنتقی باسکراودا بەهەڵەداچووە، چونکە وەستانی ئەوەی ئەو باسی دەکات لە کاروبارە ئەقڵییەکان و لەبەرچاوگرتنە وێنەییەکانە، لە کاروبارە وێنەییە لەبەرچاوگیراوەکاندا–وەك باسمان کرد– نەشیاوی مەنتقیانە بوونی نییە، بۆ نموونە هەندێ جار مرۆڤ کۆبوونەوەی دوو دژ وێنا دەکات یان وێناکردنی هەڵگرتنیان پێکەوە، لە کاتێکدا ئەو دوانە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ و لە واقیعدا هەرگیز بەدینایەن، چونکە نەشیاوی مەنقی لە کاروبارە هەبووەکاندایە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤەوە.

ڕەخنەیەك دەخەینە سەر ڕەخنەکەی "بلانیۆل" ئەوەش ئەوەیە پابەندبوونی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە لە ئەسەرەکانی گرێبەستن، بۆیە لەو ڕووەوە یەکسانن، ئیتر چۆن دەبێت یەکێك لە دوو ئەسەرەکە ببێتە هۆ بۆ ئەسەرەکەی تر لە یەك کاتدا.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەڕووەوە ئەنجامگیری ئەمانە دەکەین:

یەکەم– فەقیهەکانی یاسا بەپێی ئەوەی باسمان کرد چوار هۆیان بڕیاردلوە بۆ یەك ئەنجام کە بریتییە لە پابەندبوونی گرێبەستکارانە، ئەمەش ئەوەیە ژێری

تەندروست و مەنتقی یاسایی رەدی دەكەنەوە، چونكە هەر هۆیەك گەر تەولوبوو بەسە بۆ دەستەبەركردنی ئەنجامەكەی، وەك چۆن ئاشكرایە تەنها زانراویك دروست نییە زیاتر لە هۆیەكی تەواوی هەبێت، هەر بەو جۆرە ئەنجامیش دروست نییە زیاتر لە یەك هۆ رووی لێ بكات، چونكە لە دەروازەی دووبارەكردنەوەی یەك شتە بە وشەی جیاواز، دووبارەكردنەوەی یەك شت بە وشەی جیاواز بە كۆدەنگی ژیرمەندان و فەیلەسوفان نەشیاوە.

دووەم–هەڵەی بیردۆزە یاساییەكان لە تێكەڵ كردنی نێوان هۆی پابەندبوون و فەلسەفەی پابەندبوون[1]

## دابەشكردنەكانی گرێبەست:

گرێبەستی فرۆشتن لە فیقهی ئیسلامیدا بە دایكی هەموو گرێبەستە بریتیدانە رەواكان دادەنرێت، كۆمەڵێك توخم و حوكمیان تێدا پێویست دەبن كە بەزۆری لە فرۆشتندا پێویست دەبن، لەگەڵ خستنە سەری توخمەكانی و حوكمە تایبەتەكان پێیان، هەریەك بەپێی سروشتی خۆی، بۆیە فەقیهە موسڵمانەكان دەڵێن:

- گەر نرخ لە گرێبەستدا كاژ بوو پێی دەوترێت فرۆشتن بە مانای تایبەت و ناسراوی.
- گەر نرخەكە كاژ نەبوو پێی دەوترێت بریتیدان و سەودا و ئاڵوگۆڕ و گواستنەوە.
- گەر هەردووكیان كاژ بوون پێیان دەوترێت ئاڵوێر.
- گەر نرخەكە ماوە بۆ دیاریكراو بوو پێی دەوترێت دواخراو.
- گەر فرۆشراوەكە ماوە بۆ دیاریكراو بوو پێی دەوترێت سەلەم.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو بیردۆز و یاسایانە تەماشای دانراومان (نظرية الالتزام برد غير المستحق – دراسة مقارنة)، ص٤٤ ئەوەی بە دوایدا دێت بكە.

- گەر جێگەکە سوود و قازانج بوو، ئەوا لەگەڵ بریتیدان دەبێتە ئیجارە و بەبێ بریتیدان دەبێتە خواستن.
- گەر هەریەك لەو دوانە(فرۆشراو و نرخ) قەرز بوو پێی دەوترێت حەواڵە.
- گەر فرۆشراو قەرز بوو و نرخیش شتێکی بەرجەستە و بەرچاو بوو لەو کەسەی کە لەسەریەتی پێی دەوترێت گۆڕینەوە.
- گەر نرخی یەکەم بۆ فرۆشیاری یەکەم بە هاونموونە بوو پێی دەوترێت هەڵوەشانەوە.
- گەر بە ئەندازەی نرخی یەکەم بۆ کەسانێك جگە لە فرۆشیاری یەکەم پێی دەوترێت بەسەرپەرشتیار دانان لەگەڵ زیادە پێی دەوترێت قازانجکردن، لەگەڵ کەمکردن پێی دەوترێت ئابلۆقەدراو و زیانکاری و گەر بە بەشێك لە نرخەکەی چووە ناو هەندێ لە فرۆشراوەکەوە پێی دەوترێت بەشداری پێکردن.

ئەم چوار حاڵەتەی دوایی پێیان دەوترێت فرۆشتنەکانی ئەمانەت، چونکە بنەماکەی بریتییە لە ئەمانەت، کەسی کڕیار فرۆشیار دەکات بە ئەمانەتدار لەوەی دەیڵێت تایبەت بە نرخی یەکەم(نرخی کڕینی) و ئەوەی خراوەتە سەری لە خەرجی، بۆیە پێویستە لەسەری خۆی لە ناپاکی بەدوور بگرێت و لە درۆ دووربکەوێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوە قسەکەی دەبێتە فریودانی گوتاری.

گەر ستەمی گەورەی لەسەر پەیدا بوو ئەوا هەڵبژاردن بۆ کەسی کڕیار هەیە واژووی گرێبەستەکە بکات یان هەڵیبوەشێنێتەوە، یاسادانەری عێراقی لە مادەی(م١٢١) وای بۆ دەچێت کە گرێبەستەکە راگیراوە، گەر ستەمەکە گەورە بوو و کەسی ستەملێکراو ناکام بوو یان ئەوماڵەی ستەمی تێدا کرابوو ماڵی دەوڵەت بوو یان وەقف بوو، ئەوا گرێبەستەکە پووچەڵ دەبێت(م١٢٤)، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە ناپاکی لە ئەمانەت لە فرۆشتنە باسکراوەکاندا بە فریودانی گوتاری دادەنرێن.

پاشان گرێبەستەکان هەیانە بەسەر شتەکەدا دێت وەك گرێبەستی فرۆشتن، وگرێبەستی ئاڵوگۆڕ، و گرێبەستی رادەستکردن، و گرێبەستی پێکهاتن، و گرێبەستی قەرزپێدان، و گرێبەستی بەخشین، و هاوشێوەکانیان..

هەیانە بەسەر قازانجدا دێت وەك گرێبەستی ئیجارە و گرێبەستی میوانخانەیی، و گرێبەستی خواستن و گرێبەستی بەخشینی سوودئامێز یان وەسێت بەو گرێبەستە.

هەیانە بەسەر کرداردا دێت، وەك گرێبەستی بەڵێندەرێتی و گرێبەستی بلاوکردنەوە و گرێبەستی بریکاری و گرێبەستی ئەمانەت و گرێبەستی گواستنەوە.

هەیانە گرێبەستی دەستەبەرییە یان گرێبەستی دڵنیاکەرەوەیە وەك گرێبەستی رەهن و گرێبەستی کەفالەت(دەستیاری)

بەشەکانی گرێبەست ئەمانەن، لەڕووی وەسفە شەرعییەکانیانەوە(یان یاساییەکانیانەوە) و لەڕووی سەرهەڵدانیانەوە و لەڕووی بریتیدانیانەوە و مۆڵەت و دیاریکردنیانەوە، بۆیە لێکۆڵینەوەی ئەم بەشانە بۆ شەش مەبەست دابەش دەکەین، بۆ هەر بەشێك مەبەستێك تایبەت دەکەین.

# مەبەستی یەکەم:
# لەرووی سەرهەڵدانی ئەسەرەکانەوە

ئەم بەشە لەڕووی ڕێکارەکانی دروستبوون لە کاتی سەرهەڵدانیاندا دابەش دەبێت بۆ گرێبەستی رازیبوونی و بەرچاو و رووالەتی و لێکۆڵینەوەکەی بۆ سێ لق دابەش دەکەم.

## لقی یەکەم:
## گرێبەستی رازیبوونی

گرێبەستی رازیبوونی ئەو گرێبەستەی تەنها پەیوەندی نێوان ئەرێکردن و قبووڵ کردن بە شێوەیەکی رەوا بەسە بۆ دامەزرانی، ئەرێکردن و قبووڵ کردن بەلگەیە لەسەر رازیبوونی دوو گرێبەستکارەکە لە دەستپێکردن و حەزی سەرئەنجامەکەی، بنچینە لە هەر گرێبەستێکدا ئەوەیە لەسەر رازیبوون وەستا بێت، گەر توخمی رازیبوونی تێدا فەراهەم هات ئەسەرە شەرعییەکانی لەسەر پەیدا دەبن، قورئان بە دەق ئاماژەی بە پێویستبوونی توخمی رازیبوون لە هەموو گرێبەستەکانی بریتیداندا کردووە، دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾[1]، هەڵواردەی هاتوو لە ئایەتەکەدا هەڵوەرادەی دابڕاوە(إستثناء المنقطع)، واتە هەڵواردە لە رەگەزی لێهەڵواردراو نییە، چونکە بازرگانی لە رازیبوونەوە لە خواردنی ماڵ بە ناڕەوا نییە، بۆیە مەبەست تیایدا: مەگەر ماڵەکە ماڵی بازرگانی بێت، لە ئایەتەکەدا پاڵدراو(مضاف) لادراوە و بۆپاڵدراو(مضاف

---

[1] النساء : ٢٩

إليه) لە جێگەی راستبووەتەوە[1]، شەریعەتی ئیسلام فەرمانی کردووە بە زەرورەتی فەراهەمبوونی توخمی رازیبوون لە گرێبەستەکانی بریتیداندا، وەك لە ئایەتە ئاماژەبۆکراوەکەدا، هەروەها توخمی رازیبوونی ناخی مرۆڤ لە بەخشینەکاندا، خودا دەربارەی مارەیی ئافرەت دەفەرموێت: ﴿وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَّرِيئاً﴾[2]، بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەوەی مرۆڤ بەدەستی دەهێنێت بەهۆی گرێبەستەکانی بریتیدان یان بەخشینەکانەوە بە خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا دادەنرێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەم حوکمە هاتووەی قورئان دووپاتدەکاتەوە و دەفەرموێت: ((ماڵی هیچ کەس حەڵاڵ نییە مەگەر بە رازیبوونی نەفسی لێی))[3].

لە شەریعەتی ئیسلامدا دەربڕینێکی دیاریکراو و زمانێکی تایبەت دیارینەکراوە بۆ ئاماژە لەسەر ئەو رازیبوونە یان ئەو دڵاوایییە لە گرێبەستەکەدا، بەڵکو هەر گوزارە و رەوشێك بەڵگە بێت لەسەری ئیسلام بایەخی پێدەدات، بە قسە بێت یان بە هەر رێگەیەکی تر، گرێبەستەکە دارایی بێت یان نادارایی وەك هاوسەرگیری، بەمەرجگرتنی شێوازێکی تایبەت لە هاوسەرگیریدا و شێوازێك لە تەڵاقدانیدا لە لایەن هەندێ لە فەقیهەکانەوە وەك شافیعییەکان[4] و زاهیرییەکان لەسەر ئیجتیهادی تایبەت بەخۆیان بیناکراوە، چونکە کۆتوبەندکردنی ویستی مرۆڤ بە شێوازێك لە دەربڕین و داڕشتنەوە یان بە زمانێکی تایبەتەوە تەنگاتاوکردنی تێدایە، تەنگەتاوکردنیش لە شەریعەتی ئیسلامدا قبووڵکراو نییە، خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي

---

[1] مجمع البيان في تفسير القرآن للطبرسي (الشيخ أبي علي الفضل بن حسين) ٣٦/٣. الكشاف للزمخشري (أبي القاسم جار الله محمود بن عمر) الزمخشري الخوارزمي ٥٢٢/١.

[2] النساء : ٤

[3] مسند أحمد بن حنبل رقم (٢٠٧١٤) صحيح لغيره ٧٢/٥. وفي الرواية المشهورة (لا يحل مال إمرئ مسلم...)، والصحيح (لا يحل ما إمرئ...)، وحتى إذا وجد لفظ (مسلم) في الرواية المشهورة ليس له المفهوم المخالف، لأن عدم الحل في الإسلام عام شامل لمسلم وغير مسلم.

[4] في الأنوار في الفقه الشافعي ٦٨/٢: "لا ينعقد النكاح بغير التزويج والإنكاح".

الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1]، گرنگ لە گرێبەستەکانی رازیبووندا بریتییە لە فەراهەمهاتنی رازیبوون لە گرێبەستەکانی پابەندکەر بۆ هەردوو لا و دڵاوایش لە گرێبەستەکانی پابەندکەر بۆ یەکێك لە لایەنەکان.

لە گرێبەستەکانی رازیبوون ئەو مامەڵە دارایيە رۆژانەیە لە بازاڕەکان و شوێنانی تر گوزەر دەکەن، ئەوانەی شێوەیەکی دیاریکراویان تێدا بەمەرج ناگیرێت، موڵکداری گرێبەست لەسەرکراو لە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ گرێبەستکارەکەی تر تەنها بە رازیبوون و دڵاوایی، گەر جێگەی گرێبەستەکە ماڵێکی هاوشێوەی دیاریکراو نەبێت بە جۆر یان بە پۆل(بنوعه أو صنفه) ئەوا لەو بارەدا موڵکییەتی جێگەی گرێبەست ناگوێزرێتەوە تا جیانەکرێتەوە، بەڵام بە جیاکردنەوە پابەندبوون سەرهەڵدەدات.

رازیبوون لە گرێبەستدا ناچێتە ژێر رێکخستنێکی تایبەتەوە، دروستە گرێبەستی رازیبوون بکرێت بە گرێبەستێکی شێوەگری بە رێکەوتنی هەردوو گرێبەستکارەکە، ئەو کات تەنها بە فەراهەمهاتنی ئەو رووالەتکارییە(کاری شێوەگرییەکە) تەواو دەبێت، بە پێچەوانەی پێچەوانەکەوە، بۆیە دوو گرێبەستکارەکە مافی ئەوەیان نییە گرێبەستی شێوەگری بکەن بە گرێبەستی رازیبوون، چونکە شێوەگری بەهەندگیراو لە شەریعەت یان لە یاسادا دەچێتە ژێر رێکخستنی گشتییەوە، بۆیە سەرپێچی کردن بە رێکەوتن دروست نییە بۆ وەرنەگرتنی شێوەگرییەك شەریعەت یان یاسا بیسەپێنێت.

**بەری دابەشکردن:**

١- تەنها رازیبوون بەسە لە گرێبەستی رازیبووندا، بە پێچەوانەی گرێبەستی شێوەگری و گرێبەستی بەرچاو.

٢-گرێبەستی شێوەگری پووچەڵە گەر رووالەتە یاساییەکەی تێر و تەواو نەبێت.

---

[1] الحج : ٧٨

٣-گرێبەستی بەرچاو چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی ناوەندە لە نێوان گرێبەستی رازیبوون و گرێبەستی شێوەگریدا، لەڕووی سەرهەڵدانی پابەندبوونەوە تەنها بە ئەرێکردن و قبوولّ کردن وەك گرێبەستی رازیبوون وایە، لەڕووی سەرهەڵنەدانی مافەکانەوە لەدوای دەستبەسەرداگرتن نەبێت وەك گرێبەستی شێوەگری وایە.

## لقی دووەم:
## گرێبەستە بەرچاوەکان

گرێبەستی بەرچاو ئەو گرێبەستەیە لەڕووی ئەسەرەکانەوە تەنها بە ئەرێکردن و قبوولّ کردن تەواو نابێت، بەڵکو پێویستە رادەستکردنی شتەکە کە بریتییە لە بابەتی پابەندبوون و جێگەی گرێبەست بخرێتە پاڵ ئەرێکردن و قبوولّ کردن، ئەمەش لە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکەوە بۆ ئەویتریان راستەوخۆ و بنەڕەتیانە یان بە نوێنەرایەتی، بۆیە ئەم جۆرە گرێبەستانە درلونەتە پاڵ شتە بەرچاوەکە، چونکە ئەو شتە بەرچاوەی دەبێتە جێگەی گرێبەست بە هەند وەردەگیرێت لەو رووەوە کە جێگەیە و هەروەها لەڕووی رادەستکردنییەوە، ئەم دانە پاڵە لە جۆری دانەپاڵی هەمووە بۆ بەشێك.

لە دەقە فیقهی و یاساییەکاندا ئەم گوزارەیە باوە: (لە گرێبەستە بەرچاوەکاندا تەنها بە دەستبەرداگرتن تەواو دەبێت)، مەبەست بە "تەولو" چییە لەم گرێبەستانەدا و سروشتی ئەم گرێبەستانە چۆنە؟

ئەوەی زانراوە لەناو خەڵکیدا ئەو گرێبەستانەی کە لەڕووی ئاسارەوە تەولونابن مەگەر بە دەستبەسەرداگرتن بریتین لە گرێبەستی بارمتە و گرێبەستی بەخشین و گرێبەستی خواستن و گرێبەستی قەرز و گرێبەستی ئەمانەت، بۆ زانینی ئاست و رۆڵی دەستبەسەرداگرتن لە تەواوکردنی ئەم گرێبەستانەدا لە فیقهی ئیسلامیدا داوادەکات

هەریەکەیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بەرلوردکاریانە و پوخت لێکۆڵینەوەیەکی بۆ بکرێت، تاکو خوێنەری بەرێز-کە ئەم بابەتەی لا گرنگە- لەسەر بەڵگەیەکی رۆشن بێت لە مانای بەمەبەستگیرلو لە گوزارەی "لا یتم-تەولو نابێت" کە لە سەرچاوە فیقهییەکان و دەقە یاساییەکاندا هاتووە و بە شرۆڤەیەکی هەڵە لێکدانەوەی بۆ کراوە لەلایەن هەندێ لە شرۆڤەکارانی یاساوە.

زانایانی یاسا تێکەڵییەکیان بۆ دروست بووە لە نێوان "تەولوی ئاسار" و "تەولوی توخمەکان"، "دەستبەسەرداگرتن"یان بە "توخمەکانی دامەزرانی گرێبەستە بەرچاوەکان" دانـاوە، وەك قەرز و خواستن و ئەمانەت و بەخشینی گوازراوە و بارمتەی بندەستخستن، ئەمەش لەسەر شرۆڤەکردنی "تەولو نابێت" بە "گرێبەستەکە دانامەزرێت".

لێکۆڵینەوەی ئەم گرێبەستانە بە شێوەیەکی کورت دابەش دەکەین بۆ پێنج بەش:

## یەکەم: گرێبەستی بارمتە

وشەی بارمتە(الرهن) لە زمانی عەرەبیدا بە چەندین مانا هاتووە، نزیکترینیان لە مانا شەرعییەکەوە بریتییە لە بەندکردن(الحبس) بەم مانایە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾[1].

لە فیقهی ئیسلامیدا بە چەندین پێناسە پێناسەکراوە، ئەمەش بەهۆی جۆراوجۆری بەکارهێنانی بە مانا ناویەکەی(ماڵی بارمتەکراو)، و مانای چاوگی(هەڵسوکەوتی شەرعی).

لە پێناسەکانی کە لەسەر مانای یەکەمە: پێناسەی "ابن عرفة" لە مالیکییەکان[2]بەوەی بارمەتە ماڵێکە دڵنیایی پێ بەدەست دەهێنرێت لە قەرزدا، لای

[1] المدثر : ٣٨

[2] شرح الخرشي ٢٣٥/٥، تحفة الحكام ١٠٦/١.

حەنبەلییەکان[1] ئەوماڵەیە متمانە بە قەرز پەیدا دەکات، لە نرخی ماڵەکە وەردەگیرێتەوە گەر کەسەکە نەیتوانی قەرزەکە بگێڕێتەوە، لای ئیمامییەکان[2] دڵنیاییەکە بۆ قەرز.

لە پێناسەکانی لەسەر مانای دووەم: پێناسەی حەنەفییەکان[3] بریتییە لە بەندکردنی شتێکی ماڵی بەجۆرێك بتوانرێت قەرزەکەی لێوە دەستەبەر بکرێت هەمووی یان بەشێکی، لای شافیعییەکان[4] بریتییە لە کردنی شتێکی بەرچاو لە ماڵ بە متمانە کە قەرزەکەی لێوە بەدەست دەخرێتەوە گەر بە مردنی قەرزکەر نەیتوانی بیگێڕێتەوە، لای زەیدییەکان[5]بریتییە لە کردنی ماڵ بە متمانەگری بەهۆی قەرزەوە، لێیەوە وەردەگیرێتەوە گەر ئەو کەسەی لەسەریەتی نەیتوانی بیگێڕێتەوە، لای ئیبازییەکان بریتییە لە بەخشینی ماف فرۆشتن لە کەسێکەوە کە فرۆشتنی شتەکەی بۆ هەیە بەهۆی مافێکەوە پێیەوە پەیوەستکراوە[6]، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە "والێکردن و دڵنیاکردنەوە و بەندکردن" لە هەڵسوکەوتی دوو کەسی گرێبەستکارن.

گرێبەست بریتییە لە هەڵسوکەوتی شەرعی پێکهاتوو لە بەیەکترگەیشتنی دوو ویست لەڕوویەکەوە ئەسەرەکەی لە "گرێبەست لەسەرکراودا" جێگیر بکات.

لەم پێناسانەوە ئەنجامگیری دەکەین پێناسەی هەڵبژێرراو ئەوەیە: بارمتە گرێبەستێکە بەپێی ئەو گرێبەستە ماڵێکی شایەن بە فرۆشتن دەکاتە دەستەبەرکەری تایبەت بۆ قەرزێك کە لە نرخەکەی وەردەگیرێتەوە کاتێك ماوەکەی هاتە پێشەوە و نەیتوانی بە ڕێگەیەکی تر بیگێڕێتەوە.

---

[1] المغني لابن قدامة ٣٦١/٤.

[2] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٣٤٨/١.

[3] فتح القدير ١٨٩/٨ تنوير الأبصار وشروحه بحاشية ابن عابدين ٤٧٨/٦.

[4] مغني المحتاج ١٢١/٢.

[5] الروض النضير ١٨/٤.

[6] كتاب النيل وشفاء العليل ٧/١٨

**بەڵگەی ڕەوایەتی بارمتە**

بارمتــە گرێبەســتێکە قورئــان و ســوننەت و ئیجمــاع و ژنــەوراو بەڵگــەن لەســەر ڕەوایەتییەکەی.

أ–خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾[1]، مەرجی هاتوو لەم ئایەتەدا تێگەیشتنی پێچەوانەی نییە، بەڵکو بارمتــە لــە ســەفەر و لــە نیشتەجێبووندا دروســتە بــە بەڵگــەی بەڵــەی دووەم(مەبەستی بەڵگەی "ب"یە، واتــە ســوننەتی پێغەمبــەر(صلى الله عليــه وسلم)

ب–سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لــە عائشــەوە دایکــی بــاوەڕداران– خودا لێی ڕازی بێت– پێغەمبەر خۆراکی لە یەهودییەك کڕی بە فرۆشتنی ماوە بۆ دیاریکراو[2]، بۆیە درعەکەی خۆی وەك بارمتە پێدا[3].

ج–ئیجماع: زانایانی موسڵمان لە سەرەتای ئیسلامەوە کۆدەنگیــان هەیــە لەســەر دروستی دڵنیایی وەرگرتنی قەرز بە بارمتە گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون و ڕێگرەکان بوونیان نەبوو[4].

د–ژنەوراو(ماقوول): ژیری تەندروست لەسەر دروستی دڵنیاییکردنــەوەی قــەرزی ماوە بۆ دیاریکراو بە وەرگرتنی بارمتە بڕیار دەدات، ئەمەش وەك پارێزگــاری بۆ مافەکانی قەرزدەران و دوورخستنەوەی ناکۆکی و دوژمنایەتی.

**پایەکانی بارمتە(أركان الرهن)**

بۆ وشەی "ركن–پایە" لە فیقهی ئیسـلامیدا دوو مانــا هەیــە: مانــای تایبــەت کــە بریتییە لەو نوخمەی هەڵسوکەوتی شەرعی لەسەر دەوەستێت و دەبێتە بەشێك لێی،

---

[1] سورة البقرة / ٢٨٣ .

[2] بيع النسيئة هو البيع بثمن مؤجل.

[3] صحيح مسلم ٣/ ١٢٢٦ تحت عنوان باب الرهن وجوازه في الحضر والسفر.

[4] المغني لابن قدامة ٤/٣٦١ الروض النضير ٤/ ١٨ .

وەك ئەرێکردن و قبوولکردن تایبەت بە دارشتەی گوزارەی گرێبەستەکە، مانای گشتی بریتییە لە هەر توخمێك هەر دەبێت ببێت بۆ بوونی هەڵسوکەوت یان وەسفکردنی وەك جێبەجێبوونی یان پێویستبوونی، لەپێناو ئەم دوو بەکارهێنانەدا بۆ وشەی "رکن" دەبینین لە سەرچاوە فیقهییەکاندا جیاوازی هەیە لە دیاریکردن و هەژمارکردنی پایەکانی بارمتە، هەر کەس مەبەستی پێی مانای تایبەت بێت پایەکانی لە ئەرێکردن و قبوولکردندا کورتکردۆتەوە، وەك ئەوەی زانراوە لە فیقهی حەنەفیدا[1].

هەرکەسیش مەبەستی پێی مانای گشتی بێت پایەکانی بە چوار یان بە پێنج یان زیاتر داناوە، وەك ئەوەی زانراوە لای مالیکییەکان[2]، بۆیە دەڵێن: پایەکانی بارمتە بریتییە لە: گرێبەستکار(بارمتەدەر و بارمتەگر) و بارمتەکراو و بارمتەپێکراو(قەرزەکە)، و دارشتن(شێوان)، هەر بەو جۆرە لای شافیعییەکان پایەکانی بریتییە لە: دارشتن(شێوان) و دوو گرێبەستکارەکە، و بارمتەکراو، و بارمتەپێکراو و دەستبەسەرداگرتن، تێبینی ئەوە دەکرێت "دەستبەسەرداگرتن" پایەیەك نەبوو لەوەی پێشتر باسمان کرد.

**مەرجەکانی بارمتە:**

ئەوەش بریتییە لە مەرجی توخمەکان کە پێی دەوترێت پایەکان، بەم جۆرە:

**مەرجەکانی دارشتن( شێواز ):**

ئەوەی لە دارشتنی فرۆشتندا بە مەرجدەگیرێت لە دارشتنی بارمتەشدا بەمەرجدەگیرێت، لەرووی رۆشنی ئاماژەکردن لەسەر مانای بەمەبەستگیراو و هەماهەنگی ئەرێکردن و قبوولّ کردن، یەکگرتنی دانیشتنی گرێبەستەکە و شتانی تریش لە مەرجەکانی دروستی دارشتنی گرێبەستەکە.

---

[1] بدائع الصنائع للكساني ٨/ ٢٧١٥ .

[2] الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٢/ ١٠١ .

**مەرجەکانی بارمتەدەر:**

بارمتەدەر بریتییە لە کەسی قەرزدار کە هەڵدەستێت بە دانانی بارمتەکراوەکە لەژێر بندەستخستنی کەسی قەرزدەر بەجۆرێك دەیکات بە دەستەبەرکردنێکی تایبەت بۆ وەرگگرتنەوەی قەرزەکەی کاتێك کاتەکەی هاتە بەرەوە و کەسەکە نەیتوانی قەرزەکە بگێڕێتەوە، لە گرنگترین مەرجەکانی:

١- رەهاکردنی تاوتوێکردن لە ماڵەکەیدا، کەسی لێوەشاوە ناتەولو جیاوازی تێدا هەیە، هەندێ لە فەقیهەکان[1] دەڵێن: باڵغبوون مەرج نییە، بۆیە بارمتە لە منداڵی جیاکەرەوەی رێگەپێدرلو دروستە، چونکە ئەوە لە پاشکۆکانی بازرگانییە، بۆیە ئەو کەسەی خاوەنی بازرگانی بێت دەتوانێت گرێبەستی بارمتەش بکات، هەیانە[2] دەڵێت: بارمتەکەی دروست نییە، چونکە باڵغبوون و کامڵبوون لە مەرجەکانی دروستی هەڵسوکەوتە داراییەکانی مرۆڤە.

پارسەنگکراو بریتییە لە بۆچوونی یەکەم گەر تەمەنی پازدە ساڵی تەولو کردبێت و سەرپەرشتیار یان قەزا مۆڵەتی پێدابێت مامەڵەی داراییانە ئەنجام بدات.

٢- کەسەکە بە بارمتەپێکرلو قەرزدار بێت و خاوەن بارمتەکراوەکە بێت، بەلاَم دروستە بۆ سەرپەرشتیاری هەتیو بارمتە وەربگرێت بۆی یان قەرزی بۆ وەربگرێت و ماڵەکەی لە بارمتەی قەرزەکەدا دابنێت لە کاتی پێویستی و بەرژەوەندی کەسی ناکامدا[3].

٣- کەسەکە هەڵبژاردەی خۆی هەبێت، بۆیە بارمتەی زۆرلێکرلو پووچەڵە یان تێکچووە لەسەر جیاوازی بۆچوونەکان.

---

[1] کالحنفیة, البدائع ٨/ ٢٧١٥ .

[2] کالشافعیة, الأنوار ١/ ٤٠٧ , والأباضیة شرح النیل وشفاء العلیل ٩/١١ .

[3] شرائع الإسلام ١/ ٦٩ .

**مەرجەکانی بارمتەگر:**

بارمتەگر بریتییە لە قەرزدەرکە بارمتەی گرتووە بۆ دەستەبەرکردنی قەرزەکەی.

گرنگترین مەرجەکانی:

١-شایستەی مولکداری و پارێزگاری بەرژەوەندی و یەدەککردن لە مالی بەرانبەردا[1] ئەوەش بۆ دەستەبەرکردنی پارێزگاری بارمتەکراو گەر لەلای دانرا یان لەلای کەسی سێیەم دانرا بۆ بەرژەوەندی ئەو.

٢-قەرزێکی جێگیری هەبێت بە ئەستۆگری بارمتەدەر، چونکە بارمتە هەر دەبێ هۆیەکی شەرعی هەبێت، بۆیە بارمتە بەبێ قەرز بەبێ هۆ دەبێت و پابەندبوون بەبێ هۆیەکی رەوا پووچەڵە.

**مەرجەکانی بارمتەکراو:**

بارمتەکراو بریتییە لەو ماڵەی کراوە بە دەستەبەرکردنێکی تایبەت بە جۆرێك بەکاری فرۆشتن دێت کاتی هاتنی گێڕانەوەی قەرزەکە تاکو لە نرخەکەی وەربگیرێتەوە.

**لە گرنگترین مەرجەکانی:**

١-ماڵێك بێت لە ئێستادا توانای دەستبەسەرداگرتنی هەبێت و توانای فرۆشتنی بۆ هەبێت لە داهاتوودا، فەقیهەکان تایبەت بەو مەرجە لە سێ شتدا جیاوازییان لە نێواندا هەیە، ئەو سیانەش: بارمتەی هاوبەش، و بارمتەی قەرز و بارمتەی سوودئامێزن، بەم جۆرە:

**یەکەم-بارمتەی هاوبەش:**

أ. هەیانە بەرەهایی مۆڵەتی پێداوە[1]، جا لەوانە بێت دابەش دەبێت یان لەوانە کە دابەش نابێت، یەکسانە قەرزدەری بارمتەگر بەشدار بێت لەو بەشدارییەدا یان

---

[1] الأنوار المرجع السابق وهو ما اختاره فقهاء المالكية شرح الخرشي ٥/ ٢٣١ .

نە، ئەمەش بە بەلگەی نەقلّ و عەقلّ، بەلگەی نەقلّ بریتییە لە گشتگیری فەرموودەی خودا–سبحانه وتعالى– ﴿فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ جیاوازی نەکردووە لە نێوان هاوبەش و جۆرەکانی تردا، بەلگەی ئەقلّیش ئەوەیە دەستبەسەرداگرتنەکەی گونجاوە بە دەستبەسەرداگرتنی هەموو لەڕووی دەستبەسەرداگرتنەوە لە فرۆشراوی هاوبەشدا، پاشان حوکمی بارمتە بریتییە لە بەدەستهێنانی فرۆشتنی بارمتەکراو لەلایەن بارمتەگرەوە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەی لە جێگەی ئەو، هاوبەش رێگری لە دروستیی فرۆشتن ناکات و مەرجەکەی بریتییە لە دەستبەسەرداگرتن، ئەوەش لە نیوەی هاوبەشدا بە دابەزین لە هەموو گونجاوە.

ب–هەیانە بەرەهایی رێگری لێکردووە[2]، سەرچەرانی ئەم ئاراستەیە دەڵێن: لە بارمتەکراودا بە مەرج دەگیرێت ماڵێکی هەبووی نرخئاشکرا رادەستکراو بێت، بندەستخراوبێت نەك پەرشوبلاو، یەکلاکراوە بێت نەك سەرقاڵکراو، جیاکراوە بێت نەك هاوبەش و بە کەسانی ترەوە پەیوەست نەبێت، یەکسانە هاوبەش بێت و ئەگەری دابەشبوونی هەبێت یان نە، چونکە هاوبەش رێگری دەکات لە دەستەبەرکردنی دەستبەسەرداگرتنی هاوبەش و ئەوەش نادروستی بارمتە پێویست دەکات.

---

[1] الامامية شرائع الإسلام ١/ ٦٧ والظاهرية المحلى ٨/ ٨٨ تیایدا هاتووە"فرۆشتنی بارمتەی هاوبەش دروستە لەو شتانەی تیایدا هاوبەشی دلبەش دەکات و لەلای شتانی تریش بەهۆی ئایەتی(فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ) هاوبەشی لەسەریەخۆ جیانەکردەوە" والشافعية تحفة المحتاج ٥/ ٥٥: بارمتەگری هاوبەش لە شەریك و کەسانی تریش دروستە، دەستبەسەرداگرتنەکەی بە دەستبەسەرداگرتنی هەمووە لەڕووی دەستبەسەرداگرتنەوە لە فرۆشتنی هاوبەشدا"

[2] لە هاوەلآنی ئەم رایە فەقیهە حەنەفییەکانن، البدائع ٨/ ٢٧٢٣ والزيدية الروض النضير ٤/ ٢٤ تیایدا بارمتە دروستە لەو رووەوە کە دەستبەسەرداگرتن لە بارمتەگرەوە گونجاوە، پووچەڵە گەر دەستبەسەرداگرتن نەگونجاو بوو، بۆیە بارمتەگری هاوبەش دروست نییە بەهۆی نەگونجانی دەستبەسەرداگرتنەوە.

ج-هەیانە مۆڵەتی دلوە بۆ هاوبەشێك بەهۆی گونجاوی دەستبەسەرداگرتنەوە تایبەت بەو هاوبەشە، بۆ كەسی تر جگە لە ئەو دروست نییە بەهۆی نەگونجاوی دەستبەسەرداگرتن[1].

د-هەیانە جیاوازی كردووە لە نێوان ئەوەی لەسەرەتاوە هاوبەشە لەگەڵ هاوبەشی ناكاو، دەڵی ناكاو هیچ كاریگەرییەكی نییە، چونكە ماوە لە حوكمی سەرەتادا ئاسانترە.[2].

بە بۆچوونی من لای پارسەنگكراو بریتییە لە دروستیی بارمتەی هەر شتێك بتوانرێت بفرۆشرێت لە كاتی هاتنی گێڕانەوەی قەرزەكە و ئەوەی كەسی بارمتەدەر دلوای لێكردووە بیفرۆشێت بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكەی لە نرخەكەی، ئەمەش كارێكە گونجاوە لە هەر ماڵێكی هاوبەشدا گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە بوونی نەبوو.

**دووەم بارمتەی قەرز:**

فەقیهانی شەریعەت جیاوازیان كردووە لە نێوان بارمتەی قەرز لە داهاتوودا(لە كۆتادا) و بارمتەی قەرز لە سەرەتاوە، وەك لەم ڕۆشنكردنەوەدا:

١-**بارمتەی قەرز لە داهاتوودا(لەكۆتادا)**: ئەوە بریتییە لە گۆڕانی قەرز بۆ بارمتە بە بڕیاریی شەرع یان قەزا بەبێ دەستێوەردانی ویستی دوو گرێبەستكارەكە، بە بارمتەی شەرعی ناوبراوە گەر سەرچاوەكەی شەرع بوو و بارمتەی قەزایی گەر سەرچاوەكەی قەزا بوو.

جیاوازی نییە لە نێوان فەقیهانی شەریعەتی ئیسلامدا لە دروستی بارمتە لە داهاتوودا، یەكسانە بە بڕیاری شەرع یان بە بڕیاری قەزا بێت، لە پیادەكردنەكانی:

أ. هەر كەس بمرێت و قەرزدار و قەرزدەر بێت لێجێماوەكەی بە قەرزەكەشییەوە لە ئەستۆی كەسانی تردا دەبێتە بارمتەی شەرعی[1] و دەستەبەركردن بۆ قەرزی

---

[1] في كتاب النيل وشفاء العليل ١١/ ٤٤ "وجوز لشريك" .

[2] ئەوەش هەڵبژاردەی"أبي يوسف"ە لە حەنەفییەكان، البدائع ٨/ ٢٧٢٣ .

خاوەن قەرزەکان، بەجۆرێك پـێش گەڕاندنـەوەی قـەرز یـان مۆڵـەتی قـەرزدەر هەڵسوکەوتی میراتگران تیایدا جێبەجێ نابێت هەرچەند مولکییەتی لێجێماو لـە چرکەسـاتی مردنـی میراتلـێگیراوەوە دەچـێت بـۆ میراتگـران، شـێخی نـۆدێ[2] دەفەرموێت:

والدين لا يمنع من ان يملكا ورثـــة الميت ما قد تركا

لكن به علق كالمرهـــون لأنه أحــوط للمدفـــون

فلم يكن تصرف فيه نفـذ من وارث إذن الغريم ما أخذ

(قەرز ڕێگری ناکات لەوەی میراتگری مردوو ببێت بـە خـاوەنی لێجێمـاو، بـەلام قەرزەکەی پێوە پەیوەستە هەروەك بارمتـەکراو، ئـەوەش باشـترە بـۆ کەسـی مردوو، هەڵسوکەوت لە میراتگرەوە لە میراتەکەدا جێبەجێ ناکرێت تا مۆڵـەتی قەرزدەر وەرنەگیرێت)

ب- گەر بارمتەگر بارامتەکەی فرۆشت بەبێ مۆڵەتی بارمتەدەر ئـەوە لـە فیقهـی ئیسلامیدا ڕاگیراو دەبێت، بە پێچەوانەی یاساوە کە جێبەجێ دەکرێت، کەسـی قەرزدەری بارمتەگر مـافی هەنگاوهـەلگرتنی هەیـە، لـەدوای مۆڵـەتی بارمتـەدەر جێبەجێ دەکرێت و نرخی بارمتەکە کە قەرزە لە ئەستۆی کڕیاردا بارمتەیـە لـە جێگەی بارمتەکراوی فرۆشراو، هەر بەو جۆرە گەر بە مۆڵەتی ئـەو فرۆشـتی[3]، هەر کەس ماڵی بارمتەکراوی تیابرد بەبێ هیچ پاساوێك ئەوا جێگرەوە(بەدەل)ی ئەوەی لەسەرە لە هاونموونە گەر هاونموونەیی بوو، یان نرخەکەی گەر بـەهادار

---

[1] في تحفة المحتاج ٤/ ٣٤٢ (هەر کەس بە قەرزداری بمرێت و قازانجلێکراوێك یان قـەرزێکی هـەبوو ئـەوا قەرزەکـە پەیوەسـت دەبێـت بـە لێجێماوەکەیـەوە، لـەو لێجێمـاوەوە قازانجلێکراوەکـەی و قەرزەکەی بارمتە پەیوەست دەبێت)

[2] الشيخ معروف في كتابه كشف الغوامض لقطر العارض.

[3] وفي البدائع للكاساني ٨/ ٣٧٤٠ ، "گەر بارمتەگر بارمتەکەی فرۆشت بەبێ مۆڵەتی بارمتەدەر ئـەوا ڕادەگیرێت لەسەر مۆڵەتی ئەو، گەر مۆڵەتی دا دروستە و بەهاکە دەبێتە بارمتە(واتـە بـا هێشـتا لە ئەستۆگری کڕیاریشدا بێت) هەر بەو جۆرە گەر بە مۆڵەتی ئەو فرۆشتی"

بوو، ئەم بەدەلە کە لە ئەستۆگری تیابەردایە دەگۆڕێت بۆ بارمتە وەك جێگرەوەیەك لە ماڵی بارمتەکرلو[1].

ت- گەر دەستبەسەرداگرتن خرایە سەر قەرزدار بەهۆی مایەپووچییەوە یان بەهۆی گێلێتییەوە یان هاوشێوەکانی ئەمانە ئەوا ماڵەکەی بە قەرزەکانیشییەوە لە ئەستۆی کەسانیتردا دەبێتە دەستەبەری قەرزی قەرزدەر و بارمتەیەکی قەزایی، بۆیە هەڵسوکەوت تیایدا جێبەجێ ناکرێت تا قەرزەکە نەدرێتەوە یان مۆڵەتی خاوەن قەرز وەربگیرێت.

٢- **بارمتەی قەرز لە سەرەتاوە:** بریتییە لەوەی بە رێکەوتنی دوو گرێبەستکارەکە هاتووەتە دی، فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام جیاوازیان هەیە لەسەر دروستیی ئەم جۆرە بارمتە لە نێوان رێگری بە رەهایی و دروستیی بە رەهایی و جیاکردنەوە، سەرچاوەی جیاوازییەکەیان بریتییە لە جیاوازی لە قبوولکردنی قەرزدا بۆ دەستبەسەرداگرتن، وەك جیاوازی لە بارمتەی هاوبەشدا.

**بۆچوونی یەکەم:** رێگری لە بارمتەی قەرز بەرەهایی، یەکسانە بارمتەکەی لای قەرزدار بێت یان بارمتەکەی لای کەسێکی تر، سەرەڕای بۆچوونی هەندێکیان بە دروستیی فرۆشتنی قەرزەکە لەو کەسەی لەسەریەتی و لە کەسانی تریش، زۆربەی بەڵگەکانیان ئەوەیە قەرز دەرئەنجامی بەمەرامگیراو لە رەوایەتی بارمتە دەستەبەر ناکات، چونکە قەرز بە سروشتە تایبەتەکەی خۆی ئاسار و حوکمەکان قبووڵ ناکات کە گرێبەستی بارمتە رێکیان دەخات(لەسەری پەیدا دەبن) لە دڵنیاکردنەوەی قەرزەکە و دەستەبەرکردنی وەفا بە قەرزەکە لە کاتی هاتنەبەرەوەی ماوەکەیدا،

---

[1] في تحفة المحتاج ٤/ ٤١٤ ، "گەر بە دلولیەك یان بە رێگەیەك دەستگرتنی بەسەردا کرد ئەوا ماف وەفاکردن پەیوەست دەبێت بە ماڵەکەیەوە خودی شتەکە یان قەرز با ماوە دیاریکراویش بێت" هەروەها تیایدا هاتووە ٣٤١/٤ "جێگرتنەوە بەرەو تاولنکاری لەسەر بارمتەکرلو لە ئەستۆگری تاولنکاردا حوکم بەسەرداکراوە بەوەی بارمتەیە، بۆیە رێگری دەکرێت لە بارمتەدەر خۆی لێ ببوێرێت"

بۆیە لەگەڵ قەرزەکە دڵنیاکردنەوە و هاتنەدی دەستەبەرکردنی وەفا پێی پێکنایەتەوە، چونکە قەرزدار بە قەرزی بارمتە لەوانەیە پێی وەفادار نەبێت، بۆیە دڵنیاکردنەوەکە تیادەچێت و دەستەبەرکردنەکە پووچەڵ دەبێتەوە، بە پێچەوانەی بەندکردنی شتەکە کە بارمتەگر بەندی دەکات و قەرزەکە لە نرخەکەی وەردەگرێتەوە لە کاتی نەگێڕانەوەی لەلایەن قەرزدارەوە، پاشان سروشتی قەرز لەگەڵ مەرجی دەستبەسەرداگرتن لە بارمتە پێچەوانە دەوەستێتەوە، چونکە بارمتە لە قەرزدا یان لەسەر ئەوەی لە ئەستۆگریدایە یان لەسەر خودی ئەستۆگرییەکە یان لەسەر قەواڵەی قەرزەکە دادەمەزرێت، هەریەك لەم قەرزانە قەرزەکە والیّ ناکات ببێتە جێگەیەك بۆ گرێبەستی بارمتە، سەرباری ئەو ترسەی کە تێیدایە[1]، گرێبەستی ترسئامێز نەهیلێکراوە.

**بۆچوونی دووەم**: دروستییەتی بەرەهایی، بەهۆی ئەگەری هاتنەدی مەرامەکەوە لە بارمتە کە بریتییە لە دەستەبەرکردنی قەرزی خاوەن قەرز و گێڕانەوەی لە بارمتەکە گەر بە رێگەیەکی تر بەدەست نەدەهاتەوە، چونکە قەرز واجبە –هۆی واجب بوونەکەی هەرچییەك بێت– بارمتەش بە قەرز بارمتەیەکە بە دەستەبەرکراو[2].

---

[1] ئەستۆگری لە خودی خۆیدا گونجاو نییە بکرێتە جێگەیەك بۆ گرێبەستی بارمتە و شتانی تریش لە هەڵسوکەوتەکان، چونکە ماڵی بە مولکراوی بارمتەدەر نییە، باسکردنی "ماف"یش کە قەواڵەی قەرزەکەیە گونجاو نییە بکرێتە جێگە بۆ گرێبەستی بارمتە، چونکە ماڵێکی راوەستاوی بەها ئاشکرا نییە، بەڵکو شایەتیدانە لە ماڵ، ئەمەش هەڵبژاردەی"زفر"ە لە حەنەفییەکان (*بدائع الصنائع ٨/ ٢٧٣٣*) والأصح عند الشافعية (مغني المحتاج ٢/ ١٢٨) والأم للشافعي (٣/ ١٦٠) ومختلف فيه عند الأمامية الروضة البهية (١/ ٣٥١).

[2] وهو اختيار الحنفية باستثناء زفر ( البدائع ٨/ ٣٧٣٣ ) والخرشي ( ٥/ ٢٣٦ ) تیایدا هاتووە: (تێیدەچێت، واتە لەو شتانەی بارمتەی قەرز و متمانەگری قەرزی تێدا گونجاوە، چونکە فرۆشتنی دروستە و هەروەها فرۆشتنی ئەوەی تێیدایە لە قەرز) وهذا هو رأي الزيدية في البحر الزخار ( ٥/ ١١٤) (بارمتەی قەرز دروست دەبێت لەو کەسەوە کە لەسەریەتی، چونکە ئەوەی لە ئەستۆگریدایە وەك ئامادە وایە جگە لە تیاڕادەستکراو و نرخی ئاڵوگۆڕ بەهۆی ناجێگیربوونیەوە، بۆ کەسانی تر کە لەسەریانە دوو روو هەیە: راستترینیان دروست نەبوونە، ←

**بۆچوونی سێیەم:** بریتییە لە جیاکردنەوە لە نێوان بارمتەی قەرز لە قەرزدارەکە لەگەڵ بارمتەی قەرز لە کەسانی تر جگە لـە قـەرزدار، چـونکە دەستبەسـەرداگرتنی مرۆڤ بەسەر ئەوەی لە ئەستۆگری خۆیدایە نزیکترە لە دەستبەسەرداگرتنی ئەوەی لە ئەستۆگری کەسانی تردایە، با دەستبەسەرداگرتنەکەش راستەقینە نەبێت لەهەردوو شێوازەکەیدا، ئەوەی لەم بۆچوونانەوە پارسەنگ دەدرێت دروستبوونییەتی بەرەهایی گەر مەرجەکانی فەراهەم بوون بۆ گونجاویی هاتنەدی مەرام لێیەوە، هەیانە دروستی بارمتەی سوودئامێز بە دروست دەبینێت بەهۆی دروستیی فرۆشتنیەوە[1].

بە بۆچوونی مـن ئـەم بۆچـوونە پارسـەنگە بـەهۆی دروسـتیی هەڵسـوکەوت لـە سوودئامێزدا بە بریتیدان وەك لە گرێبەستی ئیجـارەدا، یـان بـەبێ بریتیـدان وەك لـە گرێبەستی خواستندا، بۆ نموونە، کەسی وەسێتبۆکراو بـە سـوودئامێزی خانووبـەرە بەدرێژایی تەمەنی دروستە بۆی لـەو سـوودئامێزەدا هەڵسـوکەوت بکـات بـە هـەموو روویەك لە رووەکانی مامەڵەی دارایی و لەوانەش بارمتە، ئەو بۆچوونەی کە سوودئامێز نوێدەبێتـەوە بـە نوێبوونـەوەی سـەردەم هەڵەیـەکی بـاوە فەقیهـە حەنەفییـەکان و ئەوانەی شوێنی ئەوان کەوتوون تێیکەوتوون، ئەوان تێکـەڵیان لا دروسـت بـووە لـە نێـوان سـوودئامێز کـە بریتییـە لـە توانایـەکی شـارلوە لـە خـودی شـتەکەدا لەگـەڵ قازانجبینین کە بریتییە لە تێرکردنی پێویستی بـەو سـوودئامێزە، بۆیـە قـازانجبینین نوێدەبێتەوە بە نوێبوونەوەی سەردەم نەك سوودئامێز، چونکە سـوودئامێزی شـتێك

بەهۆی نەگونجاوی دەستبەسەرداگرتنی، لەم جیاکردنەوەدا هەندێ لە فەقیهـە حەنبەلییـەکان لەگەڵیان هاوڕان لە "کشـف القنـاع"دا ( ٣/ ٢٢١ ) (بارمتـەی قـەرز دروسـتە بـۆ ئـەو کەسـەی مافێك لە ئەستۆیدایە کە بۆ کەسێکی تر کە لە ئەستۆیدایە، ئەمە یەکێکە لە دوو ریوایەتەکـە کـە لە "الإنتصار" دەڵێت: دروستیی لەپێشترە، ئەمەش قسەی ئاشـکرای زۆرێـك لـە هاوەڵانـە کـە دەڵێن بارمتەی شتێك دروستە کە فرۆشتنی دروستە.

[1] ئەمە رای فەقیهە مالیکییەکانە الخرشي ٥/ ٢٣٧ .

بریتییە لە توانای شتەکە بۆ تێرکردنی پێویستی، ئەوەش بریتییە لە توانایەکی شاراوە لە گەردندا.

٢- لە بارمتەکراودا بە مەرج دەگیرێت تێکچوون و تیاچوون رووی لێ نەکات بەر لە هاتنی ماوەی گێڕانەوەی قەرزەکە، گەر رێکەوتن نەکرابێت لەسەر فرۆشتنی و کردنی نرخەکەی بە بارمتە، گەر رووبەڕووی تێکچوون بوویەوە بەر لە هاتنی ماوەکە[١]

٣- بڕی رادەستکراو بەرهەست و شەرعی بێت وەك فرۆشراو، بۆیە بارمتە دروست نییە گەر فرۆشتنی دروست نەبێت، بارمتەی ماڵی داگیرکراو یان دزراو و هاوشێوەی ئەو دوانە پووچەڵە، چونکە لەو شتانەن کە نادەستەبەرن .

٤- ماڵێکی بەهادار بێت، بارمتەی ماڵی بێبەها دروست نییە، چونکە فرۆشتنەکەی دروست نییە.

٥- بە کردار بوونی هەبێت و بە خود یان بە وەسف دیاریکراو بێت.

٦- کەسی بارمتەدەر دەسەڵاتی کرداری هەبێت بەسەریدا لە بنەڕەتدا یان بە نوێنەرایەتی، بۆیە دروستە بۆ سەرپەرشتیار یان وەسێتدار بارمتەی ماڵی ناکام بکات کە لەژێر سەرپەرشتیاری یان وەسێتداری ئەودایە لە باری پێویستی دەستەبەربوونی بەرژەوەندی ناکامەکە.[٢]

---

[١] في المهذب ١/ ٣٠٨ مەرجی فرۆشتنەکەی گەر ترسی تیاچوونی هەبوو پێش ماوەکە دروستە، ئەگەر نە، دروست نییە.

[٢] في شرائع الإسلام ٦٩/١ دروستە بۆ سەرپەرشتیاری منداڵ ماڵەکەی بە بارمتە دابنرێت گەر ئاتاج بوو بە قەرز کردن.

**مەرجەکانی بارمتەبۆکراو( قەرزەکە ):**

**لە گرنگترین ئەو مەرجانە:**

١-دەبێ بە کردار بوونی هەبێت، بۆیە بارمتە بۆ قەرزێك دروست نییە لە داهاتوودا رووبدات با هۆی پێویستبوونەکەشی راستبووبێتەوە لە کاتی بارمتەکەدا، وەك خەرجی هاوسەر لە داهاتوودا، هەر بەو جۆرە دروست نییە بەوەی بە فرۆشتن یان قەرز لە داهاتوودا جێگیر بێت[1]

٢-بڕ و سیفەتی زانراو بێت، بارمتە دروست نییە بە دانانی بەخشش بەر لە تەواوبوونی کارەکە[2]

٣دەبێت قەرزێکی جێگیر بێت لە ئەستۆدا[3].

**دەستبەسەرداگرتن:**

راستێتی و مەرج و ئاستی شەرعی دەستبەسەرداگرتن:

**راستێتی دەستبەسەرداگرتن:**

دەستبەسەرداگرتن لە بارمتەدا وەك دەستبەسەرداگرتن وایە لە فرۆشتندا، گەر ماڵی گوازراوە بوو ئەوە دەستبەسەرداگرتنەکەی بریتییە لە گواستنەوەی یان وەرگرتنی، گەر نرخ(بەها) بوو یان شتێکی سووك بوو ئەوە دەستبەسەرداگرتنەکەی بە دەستە، بۆیە دەستبەسەرداگرتنەکەی و وەرگرتنەکەی بە دەستە، گەر پێوراو بوو دەستبەسەرداگرتنەکەی پێوانییەتی، گەر کێش بوو دەستبەسەرداگرتنەکەی کێشانییەتی، گەر خانووبەرە بوو وەك خانوو و زەوی ئەوا دەستبەسەرداگرتنەکەی

---

[1] الانوار ١/ ٤١٢ والشرح الصغير ٢/ ١-١ تيايدا(لە قەرزی پێویستدا یان سەرکێش بۆ پێویستبوون وەك وەرگرتنی بارمتە لە دروستکەرێك یان لە خوازەر لەبەر ترسی تیاچوون)

[2] في الروضة البهية ٢/ ٣٦ ((شایستەی هیچ شتێك نابێت لەوەی بەدەستی هێناوە لە کار پێش تەولوبوونی بە رەهایی))

[3] تحفة المحتاج ٥/ ٦٤ .

بە چۆڵکردنی بارمتەدەرەکەیەتی لە نێوان ئەو و بارمتەکرلوەکەیدا و هیچ شتێك بوونی نەبێت ئەو کارە پەکبخات[1]

مەرجەکانی دەستبەسەرداگرتن: چەند مەرجێك بۆ دروستی دەستبەسەرداگرتن بەمەرجگیراوە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-بە مۆڵەتی بارمتەدەر بێت، چونکە مۆڵەت بە دەستبەسەرداگرتن مەرجی دروستییەتی لەو شتانەی پێویستی هەیە بەبێ دەستبەسەرداگرتن وەك فرۆشتن، بوون بە مەرجی لەو شتانەی پێویستبوونی نییە بەبێ دەستبەسەرداگرتن لەپێشترە، یەکسانە مۆڵەتەکە راشکاوانە بێت یان ئامـاژە بێت(لەدووتوێیدا) وەك ئەوەی کەسی بارمتەگر بە ئامادەبوونی بارمتەدەر دەستبگرێت بەسەر بارمتەکەدا و ئەویش بێدەنگ بێت و نەهی لێ نەکات[2]

٢-بارمتەکە بندەستی کەسی بارمتەگر بنرێت یان لەلای کەسێك کە جێگەی متمانەی هەردوولا بێت[3].

پوختەی قسان پێویستە دەستبەسەرداگرتن بە جۆرێك بێت دەرئەنجامی بەمەبەستگیرلو لە سەرهەڵدانی بارمتە دەستەبەر بکات، بەوەی بارمتەکراو لە بەردەستی کەسی قەرزدەری بارمتەگردا بێت بەجۆرێك گەر ماوەی قەرزەکە هاتە پێشەوە و نەیتوانی بیگێڕێتەوە بەبێ پەنابردن بۆ فرۆشتنێك کە بە رێکەوتنی رازیبوون یان بڕیاری قەزایی دەفرۆشرێت ئەوا قەرزەکەی لە نرخەکەی وەردەگیرێتەوە.

---

[1] المغني لابن قدامة ٤/ ٣٦٨ شرح النيل وشفاء العليل ١١/ ٤٣ غاية القصوى ١/ ٤٨٣ البدائع ٨/ ٢٧٣٠.

[2] البدائع ٨/ ٢٧٢٢ .

[3] في المهذب لأبي أسحاق الشيرازي ١/ ٣١٥ دروستە بارمتە بدرێتە دەستی بارمتەگر و دروستە بشدرێتە دەستی کەسێکی دادپەروەر.

**ئاستی دەستبەسەرداگرتن:**

ئایا دەستبەسەرداگرتنەکە پایەیە یان مەرجە؟ گەر مەرج بوو ئایا مەرجی دامەزرانی گرێبەستەکەیە یان مەرجی دروستی یان جێبەجێ کردن یان پێویستبوونە؟

گوزارە فیقهییەکان تایبەت بە ئاستی شەرعی دەستبەسەرداگرتن و ڕۆڵی لە گرێبەستی بارمتەدا جۆراوجۆرن.

هەندێکیان بە پایە بە مانای گشتی ناوی دەبەن پاشان بە مەرجی پێویستبوون شرۆڤەی دەکەن[1].

هەیانە بە مەرجی پێویستبوون دایدەنێن، بۆیە دەڵێت: بارمتە پێویست نابێت مەگەر بە دەستبەسەرداگرتن[2]

هەیانە دەڵێت دەستبەسەرداگرتن مەرجی تەواوی گرێبەستە لەڕووی ئاسارییەوە نەك لەڕووی دامەزرانی گرێبەستەکەوە، بەو مانایەی گرێبەستەکە وەك پێویست دادەمەزرێت، بەڵام هەموو ئاسارەکان لەسەری سەرهەڵنادەن، بەڵکو هەندێ لەو ئاسارانە لەسەر دەستبەسەرداگرتنەکە دەوەستێت، بۆیە سەرخەرانی ئەم بۆچوونە دەڵێن[3]: بارمتە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن تەولو دەبێت، سەرەڕای ئەوەش دەڵێن: وەك پێویست بارمتەکە دادەمەزرێت تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن، بۆ بارمتەگر هەیە دلوا لە بارمتەدەر بکات بە دەستبەسەرداگرتنی بارمتەکە و لەڕووی قەزلوە ناچاری بکات گەر بارمتەدەر دلوای بارمتەکەی دەکرد.

هەیانە دەڵێت: دادەمەزرێ نەك وەك پێویست و تەولو دەبێت بە دەستبەسەرداگرتن[4].

---

[1] قال الشافعية الأنوار ١/ ٤١٤ :- پایەی پێنجەم دەستبەسەرداگرتن بارمتە تەنها بەوەوە پێویستە.

[2] المغني ٤/ ٣٦١ تیایدا: بارمتە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن پێویست دەبێت.

[3] كالمالكية الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٢/ ١٠٤ .

[4] قال الحنفية بداية المبتدئ بشرح الهداية ٤/ ١٢٤ بارمتە بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن دادەمەزرێت و بە دەستبەسەرداگرتن تەولو دەبێت.

هەیانە پێیوایە پایەیەکە بە مانای تایبەت، باریی وەك باری قبوولکردن وایە[1].

هەیانە پێیوایە بریتییە لە مەرجی دامەزران بەجۆرێك بارمتەکە پووچەڵە گەر دەستبەسەرداگرتنی دروست تەواو نەبێت[2].

هەیانە بە مەرجی دروستی داناوە، ئەوەش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا تەبایە کە دەڵێت: مەرجی دامەزرانە[3].

هەیانە دەڵێت بەرەهایی مەرج نییە[4].

لە تێڕوانینی منەوە گرێبەستی بارمتە لە گرێبەستە رازیبوونەکانە تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن دادەمەزرێت گەر مەرجەکانی ئەو دوانە فەراهەم بوون و رێگرەکانیان نەرێکران، دەستبەسەرداگرتنیش بریتییە لە مەرجی جێبەجێ کردنی گشتی، چونکە گرێبەست هەموو ئاسارە شەرعییەکانی لە مافەکان و ئەرکەکان سەرهەڵدەدەن لەدوای دەستبەسەرداگرتن، بۆیە قەرزدەری بارمتەگر مافێکی بەرچاو بەدەستناهێنێت لەسەرماڵی بارمتەکرلو گەر دەستبەسەرداگرتنی دروست تەواو نەبوبێت.

پوختەی قسان لەم خستنەرووەوە بۆ ئاستی دەستبەسەرداگرتن ئەنجامگیری دەکەین کە پارسەنگدرلو ئەوەیە دەستبەسەرداگرتن مەرجی تەواوییە واتە گرێبەستی

---

[1] في البدائع ٨/ ٢٧٢١ زانایان بەگشتی دەڵێن ئەوە مەرجە، پێوانەکەی بۆچوونەکەی "زفر" لە پێدانداا ئەوەیە کە پایە بێت، لەبەر ئایەتی: (فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ).

[2] ئەوە بۆچوونی هەندێ لە فەقیهە ئیمامییەکانە لە شرائع الإسلام ١/ ٦٦ ئایا دەستبەسەرداگرتن مەرجە تیایدا؟ وتراوە نەخێر، وتراویشە: بەڵێ، ئەمەیان دروستترە، گەر بەبێ مۆڵەتی بارمتەدەر دەستی بەسەرداگرت دانامەزرێت، هەر بەو جۆرە گەر مۆڵەتی دەستبەسەرداگرتنەکەی دا و پاشان لێی پەشیمان بوویەوە بەر لە دەستبەسەرداگرتنی.

[3] وەك زاهیرییەکان لە المحلى ٨/ ٨٠ بارمتە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن لە خودی گرێبەستەکەدا دروستە، بەهۆی ئایەتی: (فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ). هەروەها وەك زەیدییەکان لە الروض النضير ٤/ ٢٢ بارمتە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن دروستە، چونکە خودا دەفەرموێت: (فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ).

[4] في كتاب – النيل وشفاء العليل.

بارمتـە بـەبیّ دەستبەسـەرداگرتن دادەمـەزریّت و هەنـدیّ لـە ئاسـارەكانی بەرهـەم دەهێنێت كە بریتییە لە پابەندبوونی قەرزداری بارمتەدەر بە رادەستكردنی بارمتەكە بەپێی سروشتی ماڵە بارمتەكراوەكە، هەندێكی تری كە بریتییـە لـە مـافی قـەرزدەری بارمتـەگر لـە بارمتەكـەدا لـەو روەوە كـە دەبێتـە دەسـتەبەر لـەلای تـەنها لـەدوای دەستبەسەرداگرتن دەبێت، ئەمەش مانای"تەواو نابێت"ە، واتە لـەڕووی ئاسـارەوە تەولو نابێت نەك لەڕووی دامەزرانەوە.

## حوكمەكانی بارمتە:

### أ. حوكمەكانی بەر لە دەستبەسەرداگرتن:

١-بەر لە دەستبەسەرداگرتن گرێبەستەكە دادەمەزرێت تەنها بە ئەرێكردن و قبووڵ كـردن گـەر مەرجـەكانی فرۆشـتن فەراهـەم بـوون لـە دوو گرێبەسـتكارەكە و گرێبەست لەسەركراودا، ئەوە گرێبەستێكی رازیبوونییە و بوونـە شـەرعییەكەی لەسەر دەستبەسەرداگرتن راناوەستێت، بەڵكو دەستبەسەرداگرتنی پێویست بۆ جێبەجێ كردنی تایبەت بـە قـەرزدەری بارمتـەگر، بارمتـەدەر ناچـار دەكرێـت لەسەر رادەستكردن گەر گرێبەستی بارمتەكە دروست بوو، ئەمە رای دروستە لە فیقهی ئیسلامیدا[1]

---

[1] في الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ١/ ١٠٤ (بارمتە بە مانای گرێبەسـت بـە "دارشـتن" پێویسـت دەبێت، بۆیە بۆ بارمتەگر هەیە دلوای بارمتەكە لە بارمتـەدەر بكـات و بـەو بارمتەیـە قەرزەكـەی پێ بدات)

وفي الروض النضير ٤/ ٢٤ ("الناصر ومالك و الأوزاعي وأبو ثور" دەڵێن: دەستبەسـەرداگرتن بـە مەرج ناگیرێت و لە ئایەتەكەدا بەڵگەیەك لەسەر ئەوە بوونی نییە، چـونكە مەبەسـت پێـی زۆری متمانەگرییە)

وفي المغني ٢٦٤/٤ (هەندێ لە هاوەڵانمان دەڵێن: ئـەوەی پێـورلو و كێشـرلو بێـت بارمتـەكردنی تەنها بە دەستبەسەرداگرتن پێویست دەبێت، جگە لەوانە دوو ریوایەت هەیە، یەكـەمیان، تـەنها بە دەستبەسەرداگرتن پێویست دەبێت، ئەویتریان: تەنها بە گرێبەستەكە پێویست دەبێت وەك فرۆشتن، ئەحمەد لە ریوایەتێكدا دەقی لەسەر ئەمە هێناوە)

دەستبەسەرداگرتن مەرجە بۆ تەولوی سەرهەڵدانی ئاسار وەك تايبەتكردنی بارمتەگر بە بارمتەكرلو و نەتوانينی بارمتەدەر لە هەڵوەشاندنەوەی بە ويستی يەكلايەنەی خۆی[1].

٢- بارمتە پووچەڵ نابێتەوە دوای دامەزران و پێش دەستبەسەرداگرتنی گەر يەكێك لە دوو بارمتەخوازەكە مرد يان لێوەشاوەيی لەدەستدا، باری وەك باری فرۆشتن وايە[2].

لەسەر بۆچوونی ماليكييەكان پووچەڵبوونەوەی بارمتە بەو بەرهەڵستكارانە پێش دەستبەسەرداگرتن تێبينی دەكرێت[3] بەرهەڵستی ئەو بۆچوونەيان دەكات كە دەڵێت: وەك پێويست دادەمەزرێت پێش دەستبەسەرداگرتن.

**ب- حوكمەكانی دوای لە دەستبەسەرداگرتن:**

١- گرێبەست جێبەجێ دەبێت بۆ قەرزدەری بارمتەگر و مافێكی بەرچاوی پاشكۆی لەسەر بەدەست دەهێنێت كە لە جێبەجێكردنی بەناچاری بەسەريدا سەرپشكی دەكات لەگەڵ وەرگرتنەوەی قەرزەكەی لە نرخی بارمتەكرلو گەر كاتی گێڕانەوەی قەرزەكە هاتە پێشەوە و نەيتوانی جگە لەو رێگەيەوە قەرزەكەی

---

[1] في الشرح الصغير ١/١٠٤ (بارمتە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن تەولو دەبێت پێش دەستبەسەرداگرتن پێشەنگی قەرزدارەكانە و دوای دەستبەسەرداگرتن بارمتەگر پێی تايبەت دەبێت لەوان و لە كەسانی ترەوە وەك تێچوونی ئامادەكردنی ناشتن) واتە مافی قەرزدەری بارمتەگر لە بارمتەكرلودا دوای دەستبەسەرداگرتن پێش خەرجييەكانی گواستنەوەی قەرزداری بارمتەدەرە بۆ دوا جێگەی خۆی ئەگەر مرد.

وفي البداية بشرح الهداية ٤/ ١٢٦ (بارمتە بە ئەرێكردن و قبوولكردن دادەمەزرێ و بە دەستبەسەرداگرتن تەولو دەبێت)

[2] في المغني ٤/ ٢٦٥ (گەر پێش دەستبەسەرداگرتن يەكێك لە دوو گرێبەستكارەكە شێت بوو يان مرد بارمتەكە پووچەڵ نابێتەوە)

[3] في الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٢/ ١٠٥ (پووچەڵبوونەوەی بارمتە بەهۆی رێگرێكەوەيە وەك مردنی بارمتەدەر يان خەرەفان يان شێتێتی يان نەخۆشی پەيوەست بە مردنيەوە پێش لەئامێزگرتنی)

وەربگرێتەوە، کەسی قەرزدار پابەند دەبێت بە بەردەوامی لەسەر بارمتە، بۆیە بەویستی تاکلایەنەی خۆی هەڵیناوەشێنێتەوە تا قەرزەکە هەمووی یان بەشێکی لە گەردنیدا بێت، چونکە هەر بەشێکی قەرزەکە دەستەبەرکراوە بە هەر بەشێکی بارمتەکراوەکە و هەموو بەشێکی بارمتەکراوەکە دەستەبەرکەری قەرزی بارمتەگرەکەیە.

٢- کەسی قەرزداری بارمتەدەر پابەند دەبێت بە دەستنەبردن بۆ بارمتکراو بە جۆرێك زیان بە دەستەبەرکردنی بگەیەنێت، هەموو هەڵسوکەوتێك لە ئەوەوە مولکییەتی بارمتەکراو دەگوێزێتەوە بۆ کەسانی تر هەمووی یان بەشێکی یان مافێکی بەرچاوی لەسەر سەرهەڵدەدات کە لەسەر مۆڵەتی بارمتەگر راوەستاوە یان لەسەر گێڕانەوەی هەموو قەرزەکە[1]

جێبەجێنەبوونی هەڵسوکەوتەکە لە فیقهی ئیسلامیدا لە دروستی و دادپەروەریەوە نزیکترە لە جێبەجێ کردنی و پێدانی مافی هەنگاوهەڵگرتن بۆ بارمتەگر، چونکە هەنگاوهەڵگرتن هەندێ جار خاڵی نییە لە گرفت بەتایبەت گەر بارمتەگر ناکام بێت.

٣- سوودەکانی بارمتەکراو وەك مولکی بارمتەدەر دەمێنێتەوە، بۆیە دروست نییە قەرزدەری بارمتەگر قازانج لە ئەسڵی بارمتەکراوەکە ببینێت یان قازانج لە زیادەکانی بەبێ بەرانبەر، هەر رێکەوتنێك لەسەر پێەوانەی ئەمە پووچەڵە، چونکە پێچەوانەیە لەگەڵ رێکخستنی گشتیدا، بەڵام گەر بارمتەکراو لە پارێزگاری لێی و چاودێری لەسەری پێویستی بە خەرجی هەبوو ئەوا بۆ کەسی

---

[1] خلافا لابن حزم الظاهري حيث يقول في المحلى ٨/ ٩١ (گەر بارمتەدەر یان بارمتەگر مرد، یان بارمتەکە تیاچوو یان تێکچوو یان فرۆشرا هەموو ئەوانە جێبەجێکارن و بارمتەکە پووچەڵبووەتەوە) ئەم ئاراستەیە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ متمانەگری قەرز بە بارمتە لە ئایەتی:(فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ).

رەهنگر هەیە خەرجی بکات بەرانبەر بەدەلێك لـە سـوودبینینی بارمتەکراوەکـە یان قەرزی بارمتەپێکراو، ئەمە ئەوەیە رای جمهوری فەقیهانی لەسەره[1].

٤- دەستەبەری بارمتەکراو: دەستی قـەرزدەری بارمتـەگر لەسـەرماڵی بارمتـەکراو دەستی ئەمانەتە، چونکە بە هۆیەکی شەرعی رادەستی کـراوە کـە بریتییـە لـە گرێبەسـت، هـەروەها بـە مۆڵـەتێکی رەوا کـە بریتییـە لـە مۆڵـەتی قـەرزدار، پێغەمبـەر(صـلى الله علیـه وسـلم) دەفـەرموێت: ((لا ضـمان علـى المـؤتمن- دەستەبەرکردن لەسەر ئەمانەتپێدراو نییـە))، هەریـەك لـە وشـەی "ضـمان" و "مؤتمن" نەناسراون و لە میانەی نەرێدا هاتوون و مانای گشتی دەگەیەنن و بـە بەڵگەی جێگیر تایبەت دەکرێن، ئەوەش جێگیر نەبووە[2]، بۆیە کەسی بارمتەگر دەسـتەبەری تیاچـوونی بارمتـەکراو ناکـات یـان دابـەزینی بەهاکـەی گــەر دەستدرێژکردن و کەمتەرخەمی بارمتەگر نەسەلمابێت، گەر ئەو بارە سەلما ئەوا دەستەبەردەکرێت و بە ئەنـدازەی بەهاکـەی لـە قەرزەکـە لـە رۆژی تیابردنـدا، چـونکە پابەنـدە بـە پارێزگـاری بارمتـەکراوەوە بـەپێی گرێبەسـتەکە، بۆیـە لەسەریەتی ئاگاداری بێت وەك چۆن ئاگاداری ماڵی تایبەت بەخۆی دەبێت.

بەپێچەوانەی حەنەفییەکانەوە[3] و ئەوانەی شوێنی ئەوان کەوتوون کـە دەڵـێن: گەر لە دەستی بارمتەگردا بارمتەکراو تیاچوو ئەوا دەستەبەری بەهاکەی دەکات بـەپێی رۆژی دەستبەسـەرداگرتنی، گـەر بەهاکـەی یەکسـان بـوو بـە بـەهای دەستەبەرییەکەی قەرزەکە بەردەبێتەوە، یەکسانە تیاچوونەکە بە دەستدرێژی بارمتەگر بێت یاخود نە.

---

[1] تحفة المحتاج ٥/ ٨٨ . الروضة البهيـة ١/ ٣٥٧ المحلى ٨/ ٩٧ المغـني ٤/ ٤٤٠ شـرائع الإسـلام ١/ ٧٦ . البدائع ٨/ ٢٧٤١ الشرح الصغير ٢/ ١٠٩ الروض النضير ٤/ ٢٣ .

[2] ئەمە ئەوەیە رای جمهوری لەسەر جێگیر بـووە، المغـني ٤/ ٤٤٠ المحلى ٨/ ٩٧ الروضـة البهيـة ١/ ٣٥٧ المهذب ١/ ٣١٦ تحفة المحتاج ٥/ ٨٨ .

[3] لمزيد من التفصيل يراجع البدائع ٨/ ٣٧٦٠ وما بعدها.

گەر بەهاکەی زیاتر بوو لە قەرزەکە ئەوا قەرزەکە لەسەر بارمتەدەر نامێنێت و زیادەکەشی کەسی بارمتەگر دەستەبەری دەکات گەر تیاچوونی ئەو بارمتەیە بە دەستدرێژی ئەو و هۆی کەمتەرخەمی ئەوەوە بێت لە پارێزگاری کردنی، چونکە ئەمانەت بوو لەدەستی ئەودا.

گەر بەهاکەی کەمتر بوو لە قەرزەکە بەئەندازەی بەهاکەی لە قەرزەکە لادەدرێت و ئەوەی ماوەتەوە لە قەرزەکە کەسی قەرزکەر دەیگێڕێتەوە بۆ کەسی بارمتەگر.

گەر بە کارێکی نامۆ تیاچوو شتێکی تر لە جێگەی دادەنرێت و دەبێتە بارمتە، لەمەدا بە فەرموودەیەکی ناجێگیر پاڵپشتی خۆیان دەکەن ئەوەش(الرهن بما فيه -بارمتە بەوەی تیایدایە) یان (الرهن بما فيها-بارمتە بەوەی تیایدایە)

ئیمامی مالیك جیاکردنەوەی هەڵبژاردووە[1]، ئەوەش گەر بارمتە بە شتێکی ئاشکرا تیاچوو وەك مردنی گیانداری بارمتەکراو یان سوتانی، بۆیە دەستەبەرکردنی نییە، گەر بەهۆیەکی شاراوە تیاچوو دەستەبەر دەکرێت، لە ریوایەتێکی تردا گەر بارمتەکراو لەوانە بوو دەشارێنەوە دەستەبەر دەکرێت، گەر لەوانە بوو دەردەکەون وەك خانووبەرە و گیانداران دەستەبەرکردن لەسەر بارمتەگر نییە، بەڵگەیەکم بۆ ئەم جیاکردنەوەیە نەبینیوە.

٥- بۆ قەرزدەری بارمتەگر هەیە بامتەکراو بفرۆشێت بە رێکەوتنێکی رازیبوونانە یان بریارێکی قەزاییانە و قەرزەکەی لە نرخەکەی وەربگرێتەوە گەر نەیتوانی بیگێڕێتەوە بە شتێکی تر جگە لەوە دوای هاتنەبەرەوەی ماوەی قەرزەکە، پلەی گێڕانەوەی قەرزی ئەو کەسە دەخرێتە پێش دوو قەرزدەری ئاسایی و دوو بارمتەگر کە بەدوای ئەودا هاتوون لە پلەی بارمتەکەدا[2]

---

[1] الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٢/ ١١٥ .

[2] تحفة المحتاج ٥/ ٨٣ .

٦- زیادەی بارمتەکە جیاوازی لەسەرە، هەیانە دەڵێت دەخرێتە سەر ئەسڵی بامتەکە و دەبێت بە بارمتەکراو، بەڵام ئەمانەت دەبێت لە دەستیدا بە کۆدەنگی هەموو فەقیهان، هەیانە دەڵێت: ناچێتە ناو بارمتەوە[1]، بەهۆی ئەو فەرموودەوە: ((بارمتە لەخاوەنەکەی کە خستوویەتە بارمتەوە داناخرێت, مەڕەکانی هی خۆیەتی و قەرزەکانی لەسەریەتی))[2].

من پێمولیە درێژەدان لەم بابەتەدا پێویستە، گەر بنەڕەتی بارمتەکە بەس بوو بۆ گێڕانەوەی قەرزەکە لە نرخەکەی ئەوا پاساونییە زیادەکەی بکرێتە بارمتە، ئەگەر نە، دەخرێتە سەری بە ئەندازەی پێویست.

**کۆتاهاتنی بارمتە:**

بارمتە بە چەند هۆیەك کۆتایی پێ دێت، گرنگترینیان:

١- کۆتاهاتنی قەرزەکە، هەر کات قەرز بەتەواوی کۆتایی پێهات هۆیەکەی[3] هەرچییەك بێت بارمتە کۆتایی پێ دێت، چونکە پاشکۆی ئەوە.

٢- دابەزینی قەرزدەری بارمتەگر لە بارمتەکە، چونکە گرێبەست تایبەت بە ئەو بەپێویست نابینرێت پێش دەستبەسەرداگرتن و دوای دەستبەسەرداگرتن کە بۆ بەرژەوەندی ئەو بڕیاری لەسەردراوە، بۆی هەیە لەو بەرژەوەندییە دابەزێت هەرکات ویستی.

٣- تیاچوونی بارمتەکراو بەهێزێکی زاڵ بەتیاچوونێکی تەواو، گەر بە کاری کەسێك تیاچوو قەرەبووی لەسەر پێویست دەبوو، ئەوا بریتییەکە لە جێگەی بارمتەکە دادەنرێت، وەك پێشتر باسمان کرد.

---

[1] المغني ٤/ ٤٤٧ . المهذب ١/ ٣١٠ . الشرح الصغير للدردير مع حاشية الصاوي ٢/ ١٠٨ .

[2] رواه أبو هريرة. أورده الألباني في (التعليقات الرضية)٢/٤٨١ وقال: صحيح على شرط مسلم

[3] وەك گێڕانەوە و گەردن ئازادبوون و یەکگرتنی ئەستۆگری و رازیبوون و قەرەبوو، و شتانی تر لە کۆتاهاتنی پابەندبوون.

بارمتە بە مردنی هەریەك لە دوو بارمتەخوازەكە كۆتایی پێ نایەت، هەر بەو جۆرە بە لەدەستدانی لێوەشاوەیی كۆتایی پێ نایەت، بەڵكو لە جێگەی كەسەكە میراتگر یان سەرپەرشتیار یان وەسێتدار لە مافەكان و ئەركەكاندا جێگەیان دەگرنەوە.

**ئەنجامگیری و بۆچوونی پارسەنگدراو:**

دەتوانین لەوەی باسمان كرد ئەم ئەنجامانە دەربهێنین:

١- هەر شتێك بتوانرێت بفرۆشرێ لە كاتی هاتنە پێشەوەی ماوەی قەرزی بارمتەپێكراو ئەوا بارمتەكەی دروستە، یەكسانە موڵكێكی تەواو بێت یان ناتەواو(وەك سوودئامێز)، هەروەها یەكسانە قەرز بێت یان شتێكی هاویەش یان نە.

٢-گرێبەستی بارمتە گرێبەستی رازیبوونییە و بەئەرێكردن تەواو دەبێت.

٣-دوو قبوڵكردنە دروستەكە و دەستبەسەرداگرتن مەرجی جێبەجێ كردنە[1].

٤-مردنی یەكێك لە دوو بارمتەخوازەكان یان لەدەستدانی لێوەشاوەیی هیچ كاریگەرییەكی نییە لەسەر بەردەوامبوونی گرێبەستەكە، یەكسانە ئەو كارە بەر لە دەستبەسەرداگرتن بێت یان دوای دەستبەسەرداگرتن.

٥-زیادەی بارمتەكراو نابێتە بارمتە گەر ئەسڵی بامتەكە بەس بوو بۆ گێڕانەوەی قەرزەكە، قازانجەكانی بارمتەكراو بۆ خاوەنەكەی دەگەڕێتەوە،بارمتەگر مافی ئەوەی نییە بارمتەكراو بكاتە موڵكی خۆی تەنها بە هاتنی كاتی قەرزەكە و نەبوونی توانا بۆ گێڕانەوەی قەرزەكە، بەڵام گەر فرۆشتن بە زیادكردن بوو ئەوا ئەو فرۆشتنە دروستە، هەموو رێكەوتنێك لە نێوان دوو بارمتەخوازەكەدا بە پێچەوانەی ئەوەوە پووچەڵە، چونكە پێچەوانەی رێسا فەرمانكەرەكانە لە

---

[1] وهذا الرأي اخذ بـه القانون المدني اليماني رقم (١٩) لسنة ١٩٩٢ المادة (١٠٠١) (بە رازیبوون لە مەجلیسەكەیدا بارمتە دادەمەزرێت تەنها بە دەستبەسەرداگرتن پابەند دەبێت(جێبەجێ دەبێت)) بەڵام گوزارەی "پابەند دەبێت" لەم مادەیەدا زیادەیە، چونكە جێبەجێكردن جیایە لە پابەندبوون.

شەریعەتی ئیسلامدا[1].

٦-هەموو هەڵسوکەوتێکی زیانگەنەر بە متمانەکردن لە قەرزدارەوە لەسەر مۆڵەتی قەرزدەری بارمتەگر رلوەستاوە، فرۆشتنی و بەخشینی و هاوشێوەکانی تەنها بە رازیبوونی قەرزدەر جێبەجێ دەبێت، بەپێچەوانەی ئەوەی یاسا لەسەریەتی لە گواستنەوەی مولکداری بۆ ئەو کەسەی دەستێوەردانی بۆ هەیە و پێدانی مافی بەدواداچوون بۆ خاوەن قەرز.

٧-بە مەرجگرتنی هەموو رووالەتکارییەك لە گرێبەستی بارمتەدا بۆ زیادە دەستەبەرکردن دروست و تەبایە لەگەڵ قورئاندا کە فەرمان بە رووالەتکاری دەکات لە ئایەتی قەرزدا.

٨-دەستی قەرزدەری بارمتەگر بەسەر بارمتەکراودا دەستی ئەمانەتە، بۆیە تیاچوونی یان دابەزینی بەهای دەستەبەر ناکات گەر دەستدرێژکار و کەمتەرخەم نەبێت.

**هەڵوێستی یاسا لە گرێبەستی بارمتە**

یاسای وڵاتە عەرەبییەکان لە زۆربەی نوخمەکان و حوکمەکانی بارمتەدا لەگەڵ فیقهی ئیسلامیدا هاوڕان و بەم فیقهە بە رێژەی جۆراوجۆر کاریگەرن، بۆیە بە پێویستی نازانم خاڵە هاوبەشەکان بخەمە روو، بۆیە تەنها ئاماژە بە گرنگترین خاڵی جیاوازیان دەکەم، بەم جۆرە:

١- دابەشکردنی بارمتە: یاسای وڵاتە عرەبییەکان-ئەوەندەی من ئاگاهیم لێیان هەبێت- بە هەڵواردەی یاسای یەمەنی کۆکن لەسەر ئەوەی بارمتە دوو بەشی لەیەکتر جودایە، هەر بەشێك لەو دوانە پێناسەیەکی تایبەتی پێدراوە[2] و

---

[1] باستثناء الاتفاق على كون الزيادة رهنا فهنا جائز بالتراضي. الشرح الصغير المرجع السابق ٢/ ١٠٩ .

[2] بارمتەی دابینکاری پێناسەکراوە بەوەی گرێبەستێکە بەهۆیەوە قەرزدەر خانوویەرەیەك بەدەست دەهێنێت کە مافێکی بەرچاو تایبەتکراوە بە وەفای قەرزەکەی کە پێی ئەوە بۆی هەیە لە قەرزدەرە ئاساییەکان و قەرزدەرەکانی دوای خۆی لە پلەدا پێش بکەوێت و مافی خۆی لە ←

چارەسەرێكی تایبەت بە توخمەكان و حوكمەكانی بۆكراوە كە سەریكێشاوە بۆ ناواخن و دووبارەبوونەوە و بێمانایی[1]، بە پێچەوانەی فیقهی ئیسلامییەوە كە چارەسەری بارمتەی كردووە لەژێر یەك پێناسەدا لەگەڵ پێدانی هەر شێوازێك لە شێوازەكانی ئەوەی تایبەتە پێی.

٢- شێوەگری(رووالەتكاری): یاسا عەرەبییەكان تۆماری خانوویەرە لە فەرمانگەی تایبەتكراو بە مەرج دادەنێن بۆ گرێبەستی بارمتە، ئەم شێوەگرییە(رووالەتكارییە) لە فیقهی ئیسلامیدا نەهاتووە، ئەمەش بەهۆی چەندین هۆوە لەوانە: سادەیی ژیان لە سەردەمی پێشوودا و گەشەنەكردنی ژیانی ئابووری و كۆمەلایەتی، سەرباری هێزی گیانی ئایینی و دەسەلاتی متمانە لە نێوان تاكەكانی كۆمەلگەدا و نەبوونی جیاكەرەوە لە نێوان گوازراوە و خانوویەرەدا بەوەی ئەمڕۆ لەسەریەتی.

---

بەهای ئەو خانوویەرەیە وەریگرێتەوە لە هەر دەستێكدا بێت، المدني العراقي م/١٢٨٥ والأردني م/١٣٢٢ والكويتي م/٩٧١ والمصري م/١٠٣٠ والسوري م/١٠٧١ والليبي م/١١٠٠.

بارمتەی بندەستخستنی پێناسەكردووە بەوەی گرێبەستێكە بارمتەدەر ماڵێكی بەندكراو دەخاتە دەستی بارمتەگرەوە یان دەیخاتە دەستێكی دادپەروەرەوە كە بارمتەگر دەتوانێت لێیەوە قەرزەكەی بگێڕێتەوە هەمووی یان بەشێكی پێشكەوتوو لە خاوەن قەرزە ئاساییەكان و ئەو قەرزدەرانەی لە پلەدا بەدوای ئەودا هاتوون، ماڵەكە لە هەر دەستێكدا بێت. المدني العراقي م/١٣٢١ والأردني م/١٣٧٢ والكويتي م/١٠٢٧ والمصري م/١٠٩٦ والسوري م/١٠٢٨.

لەم دوو پێناسەدا ناواخن و دووبارەبوونەوە دەبینین كە دەتوانرێت دووربخرێنەوە بە پێناسەیەكی گشتگیر بۆ هەردوو بەشەكە و بە دەربڕینی پوخت كە ئەمەیە: بارمتە گرێبەستێكە بەهۆیەوە ماڵی شایستە بە فرۆشتن دەبێتە دڵنیاكاری بۆ قەرز و لە بەهاكەی قەرزەكە وەردەگیرێتەوە گەر نەیتوانی بیگێڕێتەوە.

[1] چونكە زۆربەی توخمەكان و حوكمەكانی هەردوو بەشەكە هاوبەشن.

بەلاّم ئەوەی لەم یاسایانەدا هاتووە لـە بەمـەرجگرتنی تۆمـارکردنی گرێبەسـتی بارمتەی خانووبەرە[1] لەگەلّ قورئاندا بەرهەلّستی ناکات، بەلّکو قورئان فەرمانی کردووە بە تۆمارکردنی گرێبەستی قەرزخوازی و ماوە بۆ دیاریکراو بە فەرمانێکی پێویستکەر و پابەندکەر وەك لە جۆری سێیەمدا رۆشنی دەکەینەوە.

٣- یاسـا دانـراوە عەرەبییـەکان-بـە هـەلّواردەی یاسـای مـەدەنی یەمـەنی[2]- دانیاننـاوە بـە جێبـەجێ کردنـی هەلّسوکەوتی قـەرزداری بارمتـەدەر لـە مالّـە بارمتەکراوەکەدا بە هەلّسوکەوتێك کە مولّکدارییەکەی بگوێزرێتەوە بۆ کەسانی تـر لەگـەلّ مـافی هەنگاوهـەلگرتن لـە هەردەسـتێکدا بێـت[3]، مەبەسـت لـە "هەنگاوهەلگرتن" ئەوەیـە قـەرزدەری بارمتـەگر مـافی جێبـەجێ کردنـی هەیـە لەسەر مالّی بارمتەکراوکە مولّکدارییەکەی گوازراوەتەوە بۆ کەسێکی تر جگە لە قەرزدەری بارمتەگر، لەو بارەدا مولّکداری کەسانی تر تایبەت بە ئـەو جێبـەجێ نـەکراوە، بۆیـە ئـەوە لـەڕووی مانـا و سـەرئەنجامەوە لەگـەلّ قسـەی فەقیهـە موسلّمانەکان پێکدێتەوە بـە جێبـەجێ نـەکردنی هەلّسـوکەوت لـە مـافی ئـەودا، لەگەلّ ئەوەش کاری فەقیهانی شەریعەت راستتر و نزیکترە بـە دلنیـایی و دوورترە لەو گرفتانـەی سـەرهەلّدەدەن و لەمپـەر بـۆ کـردەی جێبـەجێ کـردن دروست دەکەن.

٤- لە قەرزی بارمتەپێکراودا جێگیربوون لە ئەستۆگریدا بە کردار بەمەرج ناگیرێت، بەلّکو یاسا مۆلّەتی داوە داهاتووە قەرز بێـت یـان قـەرزێك بێـت پەیوەسـت بـە مەرجێکەوە یان گریمانەیی بێت[4] بە پێچـەوانەی فیقهـی ئیسـلامییەوە کـە بـە

---

[1] گرێبەستی دابینکاری گرێبەستێکی شێوەگرییە و دانامەزرێت گەر لە فەرمانگەی تایبەتکراو تۆمـار نەکرێت، المدني العراقي م/١٢٨٦ والأردنـي م/١٣٢٣ واليمـاني م/١٣٨٩ والكويتي م/٩٧٢ والمصـري م/١٠٣١ والسوري م/١٠٩١ والليبي م/١٠٣٤ واللبناني م/١٢٦.

[2] م/ ١٠٠٩ .

[3] المدني العراقي م/١٠٣٦ والأردني م/١٣٥٢ والكويتي م/١٠٠٤ والمصري م/١٠٦٠ .

[4] المدني العراقي م/١٢٩٣ .

مەرجی دەگرێت قەرزەکە لە ئەستۆگریدا جێگیر بێت لە کاتی سەرهەڵدانی بارمتەکەدا تاکو لە مەترسی دووربخرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش رێگرێک لە شەریعەتی ئیسلامدا نابینینەوە دەستبردن بۆ ئەم ئاراستە یاسایییە قەدەغە بکات بەرهەمی گەشە و گۆڕانی ژیانی بازرگانی بە مەرجێ زیان لەسەر ئەوە سەرهەڵنەدات رووبەرووی یەکێك لە دوو بارمتەخوازەکە ببێتەوە.

٥-یاسای مەدەنی ئوردەنی(م/١٣٩٦) مەزهەبی "أبي حنيفة"ی وەرگرتووە لەوەی کە دەستی قەرزدەری بارمتەگر دەستی دەستەبەرکردنە، بۆیە گەر بارمتەکراو لە دەستی ئەودا تیاچوو بەهاکەی دەستەبەر دەکات لە رۆژی دەستبەسەرداگرتندا، وا دەبینم یاسادانەری ئوردەنی سەرکەوتوو نەبووە لە دەستبردن بۆ ئەم رایە، چونکە-لەگەڵ پایەداری پلە و پایەی ئەبی حەنیفە- لەگەڵ رێسا گشتییەکان لە شەریعەتی ئیسلامدا بەرهەڵستی دەکات.

## دووەم: گرێبەستی پێدان(الهبة)

پێدان(الهبة) لەڕووی زمانەوانییەوە ریشەکەی لە "الوهب-بکسر الواو" وەرگیراوە، "الواو" لابراوە و "التاء" لە جێگەی دانراوە و "الهاء" کەسرەی بۆ دانراوە بۆ ئەوەی ئاماژە بێت لەسەر "الواو"، ئەوەش بریتییە لە کردن بە موڵکی شتێك بەبێ بریتی بەرەهایی.

لەڕووی شەرعەوە بریتییە لە هەڵسوکەوت لە باری ژیاندا کە داواکارییەکەی بریتییە لە بە موڵککردن بەبێ بریتی.

توخمەکانی بەخشین: بریتین لەو پایە و مەرجانەی بەخشینی لەسەر وەستاوە.

**پایەکانی:**

هەرکەس[1]مەبەستی بە "پایە" مانا تایبەتەکەی بێت ئەوا پایەکانی تەنها لە ئەرێکردندا کورتکردۆتەوە بە سەرنجدان لە مانا زمانەوانییەکەی، یان لە قبوولکردندا لەو روەوە کە هەڵسوکەوتێکی شەرعییە[2]یان لە هەردووکیان و لە دەستبەسەرداگرتندا, چونکە حوکمەکەی تەنها بە دەستبەسەرداگرتن جێگیر دەبێت، هەر کەسیش مەبەستی پێی مانای گشتی بێت(هەر شتێك کە هەر دەبێ ببێت) بە چواریان[3] داناوە یان زیاتر[1].

---

[1] وەك حەنەفییەکان لە البدائع ٨/ ٣٦٦٩ (پایەی بەخشین بریتییە لە ئەرێکردن لە پێدەرە، قبوولکردنیش لە پێبەخشراوەوە پایە نییە لەرووی بەباش بینینەوە، پێوانە ئەوەیە کە پایە بێت، ئەوەش قسەی "زفر" لە بۆچوونێکدا دەڵێت: دەستبەسەرداگرتنیش پایەیە...رووی بەچاکبینین پێدان لە زماندا تەنها بریتییە لە ئەرێکردنی خاوەنەکە بەبێ مەرجی قبوول، قبوولکردن و دەستبەسەرداگرتن بۆ جێگیرکردنی حوکمەکەیەتی نەك بوونی لە خودی خۆیدا...رووی پێوانەش پێدان هەڵسوکەوتێکی شەرعییە، هەڵسوکەوتی شەرعیش بوونیەتی لەرووی شەرعەوە بە بایەخپێدانی، ئەوەش بریتییە لە دامەزرانی لە حەقی حومەکەدا، حوکمیش بە هەمان ئەرێکردن جێگیر نابێت، بۆیە خودی ئەرێکردنەکە پێدان نییە لە رووی شەرعەوە)

[2] هەروەها لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پێدان تەنها لەبەری دەستبەسەرداگرتن و بندەستخستندا دروستە) ناوی پێدان بەبێ دەستبەسەرداگرتن بۆ بندەستخستن بەکاردەهێنرێت، واتە خاوەن شەرع دەستبەسەرداگرتن و بندەستخستنی کردووە بە سیفەتەکانی پێدان، سیفەتیش بوونەکەی دواکەوتووە لە بوونی مەوسوفەکەی، بینا لەسەر ئەوە بوونی پێدان لەسەر بوونی دەستبەسەرداگرتن ناوەستێت.

[3] وەك مالیکییەکان لە: الشرح الصغیر ٢/ ٢٨٩ (پایەکانی چوارن: پێدەر، و پێدراو، بۆپێدراو، و داڕشتن، مەرجی یەکەم ئەوەیە کەسە شایستەیی بەخشینی هەبێت، مەرجی دووەم ئەوەیە موڵکی پێدەرەکە بێت، مەرجی سێیەم بۆپێدراو شایستە بێت پێدراوەکە بکات بە موڵك بۆ خۆی) ئەوەی رۆشنە ئەوەیە داڕشتن لە دوو پایە پێکدێت ئەو دوانەش ئەرێکردن و قبوول کردنە، بۆ دەبێت مەرجی پێویستی ئەو دوانە فەراهەم بێت لە ئەرێکردن و قبوولکردنی هەموو گرێبەستێکدا.

**مەرجەکانی پێدان:**

ئەمانە مەرجی پایەکانن، یەکسانە پایە بە مانای تایبەت وەرمانگرتبێت یان بە مانای گشتی، بەم شێوەیە:

١-شایستەبوونی هەڵسوکەوت و هەڵبژێردن مەرجی کەسی پێدەرە بەوەی کەسێکی باڵغی ئاقڵی خاوەن هەڵبژاردە بێت لە کاتی سەرهەڵدانی پێدانەکەدا، بەجۆرێك پێدەر بەزۆری بریتییەکی مادی وەرناگرێت بەرانبەر ئەوەی دەیدات بە کەسی پێدرلو، هەڵسوکەوتی زیانبەخشانە گەر لە کەسی ناشایستە وەشایەوە بە پووچەڵ دادەنرێت، سەرپەرشتیار مۆڵەتی دابێت یان نەیدابێت، ئەوەش کە پەیوەندی بە هەڵبژاردنەوە هەیە لەمەڕ هەڵسوکەوتی زۆرلێکرلو فەقیهان جیاوازییان هەیە لەسەری، هەندێکیان دەڵێن پووچەڵە-وەك شافیعییەکان- و هەندێکی تر دەڵێن تێکچووە-وەك حەنەفییەکان- هەیانە دەڵێن راگیراوە لەسەر مۆڵەتی زۆرلێکرلو دوای لاچوونی کاریگەری زۆرلێکردنەکە، یاسادانەری عێراقی ئەمەیانی وەرگرتووە(م/١٣٤)، هەشیانە دەڵێت جێبەجێکەری ناپێویستە-وەك مالیکییەکان- ئەمەیان لەگەڵ فیقهی خۆرئاواییدا پێکدێتەوە و هاوواتای گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوەیە.

٢-لە شتە پێدراوەکەدا بە مەرج دەگیرێت لە کاتی پێدانەکەدا هەبوو بێت، چونکە بە موڵککردنە لە دەمی ئێستادا، بە موڵککردنی نەبووش نەشیاوە، بە پێچەوانەی

---

[1] وەك شافیعییەکان، ئەوان کردوویانە بە چوار بە پوختی و کردوویانە بە پێنج و شەش بە دووردرێژی، چونکە دوو گرێبەستکارەکە دوو پایەن، هەر بەو جۆرە دارشتن لە: في الأنوار ١/ ٦٥٧ (بۆ پێدان پایەی یەکەمی بریتییە لە دوو گرێبەستکارەکە مەرجەکانیان وەك مەرجەکانی فرۆشیار و کڕیار وان، دووەمیان بریتییە لە دارشتن(ئەرێکردن و قبوولکردن، سێیەم پێدراو، هەرشتێك فرۆشتنی دروست بێت بارمتەی دروستە، ئەوەش فرۆشتنی دروست نییە بارمتەی دروست نییە، چوارەم دەستبەسەرداگرتن، موڵك لە پێدان و صەدەقەدا تەنها بە دەستبەسەردا بەدەستدێت بەدەستنایەت، لە: تحفة المحتاج ٦/ ٢٩٥ دا: پایەکانی بوونی بریتییە لە دوو گرێبەستکارەکە و پێدراون، تەنها بە دەستبەسەرداگرتن پێدرلو دەبێتە موڵك.

وەسێتەوە، هەروەها دەبێت لـە خۆیـدا موڵـك بێـت[1]، بۆیـە بەخشـینی موباحــەکان دروست نییە، چونکە بە موڵککردنە، بە موڵککردنی شتێك کـە موڵـك نـەبێت محاڵـە، سەرئەنجام ئەوەی فرۆشتنی دروستە پێدانی دروستە[2].

هەندێك بە مەرجی دەگرن پێدانەکە هاوبـەش نـەبێت، سەرچـاوەی جیاوازییەکـە جیاوازییە لە ناوەندی دەستبەسەرداگرتن لە پێدان و توانـای دەستبەسـەرداگرتنیدا، گەر دەستبەسەرداگرتن شیاو بوو دروستە، ئەگەر نە دروست نییە.

پێدانی سوودئامێزەکان دروستە، وەك پێدانی کاوڕێك(چتیرێك) بـە مرۆڤێـك تـاکو شیرەکەی بۆخۆی بدۆشێت و کاوڕەکە(چتیرەکە) لە موڵکی خاوەنەکەیدا بێـت، یـان پێدانی درەختێك بۆ ئەوەی لەبەرەکەی بخوات و درەختەکەش مـوڵکی خاوەنەکـەی بێت[3].

پارسەنگدراو ئەوەیە پێدانی قەرز بەو کەسەی لەسەریەتی و بـە کەسـانی تـریش دروسـتە، گـەر بـۆ ئـەو کەسـە بـوو کـە لەسـەریەتی دەبێتـە ئەسـتۆپاکی، گـەر ئەستۆپاکییەکەی چۆناند بەوەی بە موڵککردنە قبووڵ کردن پێویسـت دەبێـت، گـەر چۆناندی بەوەی بەریوونەوەیە ئەوا پێویسـت بـە قبـووڵ ناکـات، گـەر پێدانەکـە بـۆ کەسانێکی تر بوو جگە لەو کەسەی قەرزەکەی لەسەرە دەبێتە موڵککردن و پێویست بە قبووڵ کردن دەکات، پێدانی قەرز رووالەتی(شێوەگری) دەبێت وەك بارمتەکـەی، چونکە داوای شایەت و پێدادانی بەڵگەنامەی قەرز بە کەسی پێدراو دەکات[4]

٣-لە کەسی پێـدراودا شایسـتەبوونی موڵکـداری بـە مـەرج دەگیرێـت، یەکسـانە کەسەکە کەسێکی سروشتی بێت وەك زەید لە مرۆڤەکان، یـان مەعنـەوی بێـت وەك

---

[1] البدائع ٨/ ٣٦٧٧ .

[2] نە بە پێچەوانەوە بەهۆی دروستی پێدانی نادیار بەبێ فرۆشتنی، شرح النیل ١٢/ ١١ .

[3] شرح النیل ١٢/ ١٠٠ .

[4] الشرح الصغیر مع حاشیة الصاوي ٢/ ٢٩٠ .

دەوڵەت و دەمەزراوەکان کە خاوەنی کەسایەتی مەعنەوین، بۆیە وەسێت بۆ ئاژەڵان و بێگیانان دروست نییە بەهۆی نەشیاوییانەوە بۆ موڵکداری.

٤-لە دەستبەسەرداگرتندا مۆڵەتی پێدەر بە مەرج دەگیرێت بە راشکاوانە یان بە ئاماژە، حەنەفییەکان دەڵێن گەر کەسی پێدرلو لە دانیشتنی ئەرێکردن و قبوولکردندا بەبێ بڕیاری پێدەر دەستیبەسەرداگرت ئەوە لەڕووی بەچاکزانینەوە دروستە، گەر دوای جیابوونەوە دەستیبەسەرداگرت دروست نییە مەگەر بە مۆڵەتی پێدەرەکە، پێوانە لە دوو رووەکەوە دروست نییە، چونکە دەستبەسەرداگرتن هەڵسوکەوتە لە موڵکی پێدەردا، پێش دەستبەسەرداگرتن موڵکەکەی دەمێنێتەوە، بۆیە بەبێ مۆڵەتی ئەو دروست نییە[1].

من وا دەبینم دەستبەسەرداگرتن لە دانیشتنەکەدا و بە ئامادەبوونی پێدەرەکە و بێدەنگبوون و بەرهەڵستی نەکردن لەسەری بە دەستبەسەرداگرتنی مۆڵەتدار دادەنرێت بە ئاماژە، چونکە بێدەنگی لە میانەی پێویستبوون بە قسە رازیبوونە.

**پایەی دەستبەسەرداگرتن لە بەخشیندا:**

لە بۆچوونەکانی جمهوری فەقیهانی موسڵمانەوە ئەنجامگیری دەکەین دەستبەسەرداگرتن مەرجێکی راوەستاوە بۆ گواستنەوەی موڵکداری پێدراوەکە لە پێدەرەکەوە بۆ کەسە پێدراوەکە، چونکە گرێبەستی پێدانی گوازراوە تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن دادەمەزرێت بە دامەزرانێکی ناتەواو، هەندێ لە ئاسارەکان بەرهەم دەهێنێت وەك پابەندبوونی پێدەر بە رادەستکردنی شتە پێدراراوەکە بۆ کەسە پێدراوە، هەندێك ئاساری تر بەرهەم ناهێنێت وەك گواستنەوەی ماف موڵکداری شتە پێدراوەکە بۆ کەسی پێدراو، ئەوە تەنها بە دەستبەسەرداگرتن دەبێت، بینا لەسەر ئەمە پێویستە گوزارەی "تەولو نابێت" لە هەر جێگەیەکی دەقە فیقهییەکان و یاساییەکاندا هاتبێت بەو جۆرە شرۆڤە بکرێت کە باسمان کرد، دروست نییە شرۆڤە

---

[1] الهداية ٣/ ٢٢٤ .

بکرێت بەوەی مەبەست لێی "گرێبەستەکە دانامەزرێت" چونکە ئەوە رایەکی شازە و پێچەوانەی رای جمهوری فەقیهانی موسڵمانە لەوەی دەستبەسەرداگرتن لە پێدانی شتی گوازراوەدا نە پایەیە و نە مەرجی دامەزران، بەڵکو ئەوە مەرجی جێبەجێکردنە تایبەت بە مافی کەسی پێدراو[1]، بەڵکو هەندێ وای بۆدەچن موڵکداری شتی پێدراو دەگوێزرێتەوە بۆ کەسی پێدراو تەنها بە گرێبەستەکە.

**حوکمەکانی پێدان:**

بەزۆری حوکمەکانی پێش دەستبەسەرداگرتن لە حوکمەکانی دوای دەستبەسەرداگرتن جیاوازن.

**یەکەم: لە گرنگترین حوکمەکانی پێش دەستبەسەرداگرتن:**

١- لەلای جمهوری فەقیهانی موسڵمان موڵکداری شتی پێدراو بۆ کەسی پێدراو پێش دەستبەسەرداگرتن[2] دەمێنێتەوە(مەرەکانی بۆ خۆیەتی و قەرزەکانی لەسەریەتی) لای مالیکییەکان و لە ریوایەتێکی ئیمام ئەحمەددا موڵکداری دەگوێزرێتەوە تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن و بەخشەرەکە ناچار دەکرێت بە رادەستکردن، لە نێوان ئەوە و فرۆشتندا جیاوازی نییە[3].

٢- **پەشیمانبوونەوە لە بەخشین:** جمهوری فەقیهان پێیانوایە کەسی پێدەر بۆی هەیە لە پێدانەکەی پەشیمان ببێتەوە پێش دەستبەسەردا گرتن بەرەهایی،

---

[1] في الباجوري ٢/ ٤٩ تەنها بە دەستبەسەرداگرتن دەبێتە موڵك و جێبەجێ ناکرێت بە مۆڵەتی پێدەرەکە نەبێت.

[2] في حاشية الباجوري ٢/ ٤٩ بە موڵك ناکرێت و جێبەجێ ناکرێت بە بێ دەستبەسەرداگرتن و مۆڵەتی پێدەرەکە.

[3] في الشرح الصغير و حاشية الصاوي ٢/ ٢٩٠ (کەسی پێدەر ناچاردەکرێت شتە پێدراوەکە بدات بە کەسی پێدرلو، چونکە پێدان بە قبوولکردن دەبێتە موڵك ئەوەی کە مەشهورە، بۆیە بۆی هەیە داوای بکات لێی گەر رێگری کرد، با لای دادەوەریش بێت بۆ ناچارکردنی بە پێدانی شتە پێدراوەکە بۆ کەسی پێدراو)

بەڵام من وا دەبینم ئەوە پێویستە هەڵبدرێتە سەر پەشیمانبوونەوە لەڕووی قەزاوە، بەڵام لەڕووی ئاینداریەوە ئەو کارەی دروست نییە نە پێش دەستبەسەرداگرتن نە دوای دەستبەسەرداگرتن، مەگەر لە هەندێ باری هەڵواردەییدا کە ڕۆشنکردنەوەیان دەخەینە روو، ئەوەش بەم بەڵگە هاتووانە:

أ.کەسی پێدەر بەڵێنی داوە(لە ڕێگەی ئەرێکردنەوە) بە ویستی ئازادانە و پەیبەرانەی خۆی ئەو ماڵە پێدراوە بدات بە کەی پێدراو بەبێ بەرانبەر یان بە بەرانبەر دوای قبووڵ کردنی کەسی پێدراو، گەڕانەوە لە بەڵێن بەبێ پاساوێکی رەوا لە ئیسلامدا دروست نییە[1]، بۆیە لەبەردەم خودادا پرسیاری لێ دەکرێت بەپێی ئایەتی: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾[2].

ب-پێدان دادەمەزرێ تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن، وەفاکردن بە گرێبەستەکان و پابەندوونە. سەرهەڵدراوەکان لەسەریان خودا-سبحانە وتعالی- فەرمانی پێکردووە بە فەرمانپێکردنێکی پێویست و یەکلاکەرەوە﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[3]، واتە وەفادار بن بەو پابەندبوونانەی لەسەر گرێبەستەکان سەرهەڵدەدەن، لەوانە پێویستبوونی گواستنەوەی موڵکداری شتی پێدراو بۆ کەسی پێدراو بە رادەستکردن، وشەی "العقود" لەم ئایەتەدا لە دەربڕینە گشتییەکانە، چونکە بە "ال-الإستغراق" دەستپێدەکات و هەموو جۆرەکانی گرێبەست دەگرێتەوە لە ناویاندا گرێبەستی پێدان.

---

[1] في الميزان الكبرى ٢/ ٨٦ (ئیمامان هاوڕان لەسەر ئەوەی پێدان بە ئەرێکردن و قبووڵکردن دادەمەزرێت، و کودەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی وەفاکردن بە بەڵێنەوە لە خێردا دڵواکراوە، و دەستەیەك دەڵێن پێویستە)

[2] الإسراء / ٣٤ .

[3] المائدة / ١ .

ج- پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: ((نموونەی ئەو کەسەی لە صەدەقەکردنەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەك سەگێك وایە دەرشێتەوە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سەر رشاوەکەی و دەیخواتەوە))[1]، لە ئیبن عەباسەوە(ﷺ) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((گەڕاوە لە پێدانەکەی وەك گەڕاوە وایە لە رشانەوەکەیدا)) لە ریوایەتێکی تردا: ((گەڕاوە لە پێدانەکەیدا وەك سەگێك وایە دەرشێتەوە و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سەر رشاوەکەی))[2].

د- لای هەندێ لە فەقیهان وەك مالیکییەکان مولکداری دەگوازرێتەوە بۆ کەسی پێدرلو تەنها بە گرێبەستەکە، وەك چۆن پەشیمانبوونەوە لە فرۆشتن دروست نییە پێش دەستبەسەرداگرتن هەر بەو جۆرە لە پێداندا پێش دەستبەسەرداگرتن دروست نییە.

٣- پارسەنگدراو لە فیقهی ئیسلامیدا پێدان بە مردنی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە یان بە لەدەستدانی لێوەشاوەیی بەهۆی رووداوێك لە رووداوەکانەوە هەڵناوەشێتەوە[3]، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە مالیکییەکان دەڵێن هەڵدەوەشێتەوە[4] سەرەڕای ئەو بۆچوونەیان کە دەڵێن مولکداری تەنها بە

---

[1] صحیح مسلم کتاب الهبات ٣/ ١٢٤٠، رقم الحدیث (١٦٢٢).

[2] صحیح مسلم کتاب الهبات ٣/ ١٢٤٠، رقم الحدیث (١٦٢٢).

[3] حاشیة الباجوري ٢/ ٤٩ .

[4] في الشرح الصغیر و حاشیة الصاوي ٢/ ٢٩٠ پێدان پێش دەستبەسەرداگرتن پووچەڵ دەبێتەوە: بە شێتبوونی پێدەرەکە و نەخۆشی پەیوەست بە مردن و مردنی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە و پێدانی بە کەسێکی تر لەگەڵ دەستبەسەرداگرتن.

سەرباری ئەوە مالکییەکان لە هەمان سەرچاوەدا (٢/ ٢٩٠): دەڵێن(پێش دەستبەسەرداگرتن پێدان پووچەڵ دەبێتەوە، بە دانەوەی ماڵەکە لە قەرزدا بەوەی هەموو ماڵەکە بگرێتەوە، هەروەها بە شێتبوون و نەخۆشی پەیوەست بە مردنی پێدەرەکە و پێدانی بە کەسێکی پێدرلوی تر)

ئەرێکردن و قبوولکردن دەگوێزرێتەوە، لەمەدا دژایەتییەکی ڕۆشن هەیە لە قسەکانیاندا.

٤-گەر مولکداری پێدەر بۆ کەسی پێدرلو پێش دەستبەسەرداگرتن نەما پاشان مولکدارییەکەی گەڕایەوە بە لادان یان ڕەدکردنەوە بەهۆی نەنگییەکەوە یان بەهۆی میراتەوە ئەوا پێدانەکە ناگەڕێتەوە[1].

٥-کەمبوونی پێدراو یان زیادبوونی پێش قبوول کردن یان پێش دەستبەسەرداگرتن هیچ کاریگەرییەکیان لەسەری نابێت.

**دووەم: لە گرنگترین حوکمەکانی پێدان دوای دەستبەسەرداگرتن:**

١-گواستنەوەی مولکداری پێدەر بۆ کەسی پێدراو لە بەرواری رادەستکردنەوەیە نەك بە ئەسەرێکی گەڕاوە، چونکە مولکداری شتی پێدراو پێش دەستبەسەرداگرتن بۆ پێدەرەکە ماوەتەوە(مەرەکانی بۆ خۆیەتی و قەرزەکەی لەسەریەتی)، هەروەها لەبەرئەوەی پێدانە، بۆیە پابەندکردنی پێدەر دروست نییە بە زۆرتر لە ئەسڵی جێگەی گرێبەستەکە.

٢-مافی پەشیمان بوونەوە: پێدەر مافی ئەوەی نییە پەشیمان ببێتەوە لە پێدانێك خەڵاتی لەسەر وەرگرتووە[2]، یان مەبەستی پێی ڕووی خودا بووە، چونکە

---

[1] في الشرح الصغير و حاشية الصاوي ٢/ ٢٩٠ پێدان پووچەڵ بووەتەوە پێش دەستبەسەرداگرتن بە شێتبوونی پێدەر و نەخۆشی پەیوەست بە مردنەوە ومردنی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە و پێدانی بە کەسێکی تر لەگەڵ دەستبەسەرداگرتندا.

سەرباری ئەوە مالیکییەکان لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێن(٢/٢٩٠): (پێش دەستبەسەرداگرتن پێدان پووچەڵ دەبێتەوە، بە دانەوەی ماڵەکە لە قەرزدا بەوەی هەموو ماڵەکە بگرێتەوە، هەروەها بە شێتبوون و نەخۆشی پەیوەست بە مردنی پێدەرەکە و پێدانی لەلایەن پێدەرەکەوە بە کەسی دووەمی پێدرلو)

[2] في الروض النضير ٤/ ٣٤ (زەیدی کوڕی عەلی بۆی باسکردم لە باوکیەوە لە باپیریەوە لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە: هەر کەس پێدانێکی بەخشی بۆی هەیە لێی پەشیمان ببێتەوە گەر ←

لـەباری یەکەمـدا وەك گرێبەسـتی فرۆشـتن وایـە و لـە بـاری دووەمـدا وەك صەدەقە وایە و دروست نییە لێی پەشیمان ببێتەوە، هەر بەو جۆرە دروست نییە بۆ خاوەن قەرز پەشیمان ببێتەوە لە پێدانی(بەخشینی) قەرزەکەیدا بەو کەسەی لەسەری بووە دوای قبووڵ کردنی قەرزدارەکە، چونکە بەریوونەوەیە و بەریوونەوەش ناگەڕێتەوە.

فەقیهان بەدەر لەوە جیاوازی دووروودرێژیان هەیە، بەم شێوەیە:

هەیانە[1] جیاوازی کردووە لە نێوان بێگانـە و خزمـدا، پەشـیمانبوونەوەی لـەباری یەکەمدا بە دروست داناوە ، بەڵام لەباری دووەمدا بە نادروست.

هەیانە[2]ڕێگەیداوە گەر کەسی پێدراو لە منداڵەکانی پێدەر بوو، چونکە ئـەوەی منداڵ خاوەنییەتی وەك موڵکی باوك وایە، وەك پێغەمبەر(صلی الله علیـه وسـلم) بـە منداڵی یەکێك لە هاوەڵانی دەفەرموێت: ((تۆ و ماڵەکەت هی باوکتن))[3].

هەیانە جیاوازی کردووە لە نێوان پێدانی هەڵواسراو لەسـەر مـەرجی هاتنـەدی، ئەمەیان پەشیمانبوونەی تێدا دروست نییە، لەگەڵ پێدانی رەهـا، ئەمـەیان دروستە لێـی پەشـیمان ببێتـەوە گـەر ڕێگرێـك بـوونی نـەبێت لـەدوای دەستبەسـەرداگرتن

---

لەسەری شتێکی وەرنەگرتبوو، هەموو پێدانێك یان صەدەقەیەك بۆ خودا خاوەنەکەی بۆی نییە لێی پەشیمان ببێتەوە)

[1] کالحنفیة الهدایة ٣/ ٢٢٧ والأمایة الروضة البهیة ١/ ٢٦٨ والاباضیة شرح النیل ١٢/ ١٥ .

[2] کالشافعیة في الباجوري ٢/ ٥٠ (گـەر کەسـی پێدراو دەسـتی بەسـەرداگرت بـۆ پێـدەر نییـە لێـی پەشـیمان ببێتـەوە مەگـەر بـاوك یـان دایـك بێـت دەوڵەمەنـد بێـت یـان هـەژار، هـەروەها وەك مالیکییەکان لە: الشرح الصغیر ٢/ ٢٩٣ هەروەها دروستە بۆ باب، چـونکە بـەزۆر لـە کوڕەکـەی سەندووە)

[3] أخرجه ابن حبان في صحیحه برقم (٤٢٦٢).. في المغني ٥/ ٦٦٨ (بـۆ بـاوك هەیـە پەشـیمان ببێتـەوە لەوەی دلویەتی بە منداڵەکەی، ئەوەش لە مەزهەبی احمـد و مالـك والأوزاعـي والشـافعي واسـحاق وأبی ثور ئاشکرایە).

روویدابێت[1].

من وا دەبینم پەشیمانبوونەوە لە بەخشین دروست نییە بەرەهایی، بەو هۆیانەوە پێشتر باسمان کرد بۆ پەشیمانبوونەوە پێش دەستبەسەرداگرتن، بەلام لە هەندێ باری هەڵواردەییدا دروستە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-لە باری دەستەوسانی دارایییانەی پێدەر و پێویستی زۆری بە شتە پێدراوەکە، لە کاتێکدا کەسی پێدراو لەڕووی مادییەوە توانادار بێت، لەو بارەدا پەشیمانبوونەوەی بۆ هەیە گەر رێگرێك بەسەریدا نەهابێت رێگری لە کارەکە لێ بکات[2].

٢-گەر هەڵسوکەوتێکی گوتاری یان کرداری لە کەسی پێدراو وەشایەوە دژ بە پێدەرەکە یان دژ بە کەسێك کە ئازیزی پێدەرەکەیە، بەجۆرێك بەڵگە بێت لەسەر خراپی ئەدەب و بێوەفایی بەرانبەر بە چاکە.

٣-گەر پێدانەکە بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجێکی رەوا بوو، بەلام دەستەبەر نەبوو، لەوبارەدا بۆ پێدەرەکە هەیە شتە پێدراوەکە وەربگرێتەوە، بۆ نموونە، گەر ژنەکە هەموو مارەیەکەی یان مارەییە دواخراوەکەی بەخشی بە مێردەکەی بە مەبەستی ئامانجی بەهێزبوونی پەیوەندی هاوسەرگیری نێوانیان و بەردەوامی ژیانی هاوسەرییان، پاشان مێردەکە تەلاقی بدات، لەو بارەدا بۆی هەیە داوای مارەیی پێدراو بکاتەوە، چونکە پێدراو بۆ ئامانجێکی بالا بووە و نەهاتۆتە دی.

---

[1] في الميزان الكبرى للشعراني ٢/ ٨٦ هەندێ لە هاوەڵانی مالیك دەڵێن: بەڵێن گەر بە هۆیەك مەرجدار کرابوو، وەك وتنی: ژن بهێنە و ئەو شتە بۆ تۆ یان هاوشێوەی ئەوە ئەوا وەفاکردن پێی پێویست بووە گەر تەلاقیدا پێویست نابێت.

[2] وەك زیادەی پەیوەست لە پێدراودا یان دەرچوونی لە مولکداری ئەو یان سەرهەڵدانی مافی کەسانی تر لەسەری یان بەجۆرێك گۆڕانی بەسەردا هات ناوی نوێی لێبنرێت وەك قوماش کاتێك دەکرێت بە پۆشاك یان وەك زەوی بینای لەسەر راستبکرێتەوە، و هاوشێوەکانی ئەمانە، الروض النضير ٤/ ٣١ / الميزان الكبرى ٢/ ٨٦.

شایانی باسە جیاکاری لە نێوان منداڵدا لە پێدان و هەدیەدا لە شەریعەتی ئیسلامدا حەرامە، چونکە سەردەکێشێت بۆ رق و کینە لە نێوانیاندا و لەوێشەوە ئەوەی چاکترینیانە لەلای ببێتە کەسێکی خراپ بۆ دایك و باوکی، سەرباری ئەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەهیکردووە لەو جیاکارییە[1].

هەر بەو جۆرە پێدانێك دروست نییە زیان بە میراتگر بگەیەنێت، پێدانەکانی حاڵەتی نەخۆشی مردن حوکمەکانی وەسێتیان بەسەردا گوزەر دەکات، بۆیە زیاتر لە سێیەك دروست نییە لەلای هەندێ لە فەقیهە مالیکییەکان، زیادەش دەبێت گەر مۆڵەتدەر شایستەی[2] بەخشین بێت.

**رووالەتکاری(شێوەگەری) لە پێداندا:**

لە ئایەتی قەرزەوە لە قورئاندا ئەنجامگیری دەکرێت بە تۆمارکردنی قەرزی ماوە بۆ دیاریکراو و بوونی شایەت لەسەر گرێبەستەکە کە جێگەکەی ماڵێکی بەنرخ بێت وەك خانووبەرە، لە گرێبەستی رووالەتی(شێوەگەری)دا بەدرێژی باسی دەکەین، هەر بەو جۆرە لە رێسا شەرعییە گشتییەکان و دەقە فیقهییەکانەوە ئەنجامگیری دەکرێت کە پێدانی خانووبەرە گرێبەستی شێوەگرییە، وەك چۆن یاسا دانراوەکان کاریان پێکردووە، بۆیە پێویستە پێدانی خانووبەرە تۆمار بکرێت لای لایەنی تایبەتکراو بەو کارە، هەر بەو جۆرە پێدانی قەرز(بەخشینی لە قەرزەکە) بۆ کەسانێك جگە لەو کەسەی کە قەرزەکەی لەسەرە گرێبەستێکی رووالەتییە، بەهۆی پێویستی رادەستکردنی قەواڵەی قەرزەکە بە کەسی پێدراو و شایەت لەسەری لە باری

---

[1] في صحيح مسلم ٣/ ١٢٤١- ١٢٤٣ : لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە دەڵێت: باوکم هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(من دارخورمام داوە بەم کوڕەم، پێغەمبەر فەرمووی: ئایا هەموو کوڕەکانت دارخورمات پێداون؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر فەرمووی: دەی بیگێڕەوە) ریوایەتی تر دووپاتی ئەم فەرموودە دەکاتەوە.

[2] الميزان الكبرى ٢/ ٨٦ . الروض النضير ٤/ ٤٤ .

رازیبوونی قەرزداردا[1]

بەلاَم پێدانی گوازراوە لە شتە بەرچاوەكان لە گرێبەستە رازیبوونەكانە كە تەنها بە ئەرێكردن و قبوولّ كردن تەواو دەبێت گەر مەرجەكانی هەردووكیان فەراهەم بوون.

دانانی پێدانی گوازراوە بە گرێبەستی بەرچاو هەڵەیەكی باوە، گەر گرێبەستی بەرچاو شرۆڤە بكرێت بەوەی گرێبەستێكە تەنها رازیبوونی هەردوولا بەس نییە بۆ دامەزرانی، بەڵكو هەردەبیّ رادەستكردنی ماڵی پێدراو بخرێتە سەر ئەوانە، بەلاَم گەر گرێبەستی بەرچاو شرۆڤە بكرێت بەوەی لەڕووی ئاسارەوە بە رادەستكردنی شتە بەرچاوە پێدراوەكە تەواو دەبێت، ئەوا دەتوانرێت بخرێتە ناو پۆلی گرێبەستە بەرچاوەكانەوە.

**هەڵوێستی یاسا:**

یاسای وڵاتە عەرەبییەكان دەربەچوون لەوەی سەروەری هەیە لە فیقهی ئیسلامیدا، جا ئەوە تایبەت بێت بە توخمەكانی پێدان لە پایەكان و مەرجەكان یان تایبەت بێت بە حوكمەكانی، یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێكار چارەسەری كردووە لە (م/٦٠١ – ٦٢٥) والأردني (م/٥٥٧ – ٥٨١) والكويتي (م/٥٢٤ – ٥٤٢) والمصري (م/٤٨٦ – ٥٠٤) والسوري (م/٤٥٤ – ٤٧٢) والليبي (م/٤٧٥ – ٤٩٣) واللبناني (م/٥٠٤ – ٥٢٥) پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی نویّ (م/٧١٥ – ٧٢٩).

جیاوازییەكی ئاشكرا نابینین لە نێوان ئەو یاسایانە و ئەوەی هەیە لە فیقهی ئیسلامیدا، جا تایبەت بێت بە هەموو مەزهەبەكان یان بە یەكێك لە مەزهەبەكان، بە هەڵواردەی رووالەتكاری(شێوەگری) پێدانی خانووبەرە كە لە هەندیّ لەو یاسایانەدا هاتووە، وەك عێراقی(م/٦٠٢) (گەر شتی پێدراو خانووبەرە بوو بۆ دامەزرانی پێدانەكە تۆماركردنی لە فەرمانگەی تایبەتكراو پێویستە) یاسای میسری(م/٤٤٨) و سوری(م/٤٥٦) و لیبی(م/٤٧٧) و لبنانی(م/٥٠٩) لەگەڵی تەبان.

---

[1] الشرح الصغير ٢/ ٢٩٠ .

ئەم رووالّەتکارییە هەرچەند لە فیقهی ئیسلامیدا نەهاتووە بە سەرنجدان لە متمانەی زۆر لە نێوان خەڵکیدا لە چاخی زێڕینی ئەو دەمەدا، لەگەڵ ئەوەش قورئان فەرمانی پێکردووە لە هەر گرێبەستێکدا ئەگەری کێبەرکێ و دوژمنایەتی تێدا بێت، وەك چۆن ئەوە لە باسی رووالّەتکاری لە شەریعەتی ئیسلامدا باسی لەبارەوە دەکەین.

ئاراستەی زاڵ لەم یاسایانەدا ئەوەیە گرێبەستی پێدانی خانووبەرە گرێبەستێکی رووالّەتییە، گرێبەستی پێدانی گوازراوەش گرێبەستی رازیبوونییە، مەگەر بە دەقێکی تایبەت هەڵواردە کرابێت، لە هەردوو بارەکەدا بە گرێبەستی بەرچاو دانانرێت وەك هەندێ وا گومان دەبەن، تەنها بە رازیبوونی هەردوو لا(ئەرێکردن و قبووڵ کردن) پێش دەستبەسەرداگرتن گرێبەستی پێدان دادەمەزرێت، بەڵام مولّکداری پێدراوەکە لە دوای دەستبەسەرداگرتن دەگوێزرێتەوە بۆ کەسە پێدراوەکە یان ئەوەی جێگەی دەستبەسەرداگرتن دەگرێتەوە وەك تۆماری خانووبەرە و هاوشێوەکانی، بارودۆخی هەروەك باروودۆخی ماڵی هاونموونەی دیاریکراو وایە بە جۆری و بە شێوەی، ئەوە مولّکداری فرۆشراو تەنها دوای جیاکردنەوە دەگوێزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی هیچ کەس نەیوتووە ئەو جۆرە گرێبەستە گرێبەستی بەرچاوە، ئەمەش لە هەندێ لەو یاسا باسکراوانەدا رۆشنە، وەك یاسای ئوردەنی(م/٥٥٨/١)(بە ئەرێکردن و قبوولکردن پێدان دادەمەزرێت و بە دەستبەسەرداگرتن تەواو دەبێت)، یاسای عێراقی(م/٦٠٣/١)(پێدان تەواو نابێت لە گوازراوەدا مەگەر لەدوای دەستبەسەرداگرتن) واتە لەڕووی ئاسارەوە تەواو نابێت نەك لەڕووی دامەزرانەوە، چونکە لە خودی خۆیدا دادەمەزرێت، بەڵام مولّکداری لەدوای دەستبەسەرداگرتن دەگوێزرێتەوە بۆ کەسی پێدراو، تەواو نەبوون تایبەتە بە ئاسار نەك تایبەت بێت بە دامەزران، ئەگەر وا نەبوایە یاسادانەری عێراقی گوزارەی "تەواو نابێت"ی بەکارنەدەهێنا لە جێگەی "دانامەزرێت" بە بەڵگەی ئەوەی هاتووە لە مادەکانی تری ئەم یاسایەدا،

لەوانە(م٥٠٨) (فرۆشتنی خانووبەرە لە دوای تۆمارکردنی لە فەرمانگەی خانووبەرەی تایبەتکراو دادەمەزرێت و ئەو شێوەیە وەربگرێت یاسا بە دەق هێناویەتی)

شایانی باسە لە یاسای کوێتیدا دژیەکییەکی رۆشن هەیە لە نێوان مادەی(٥٢٥/١)(پێدان دانامەزرێت مەگەر هاوتا بێت لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی شتی پێدرلو یان لە بلاوکراوەیەکدا رگەیەنرابێت) لەگەڵ مادەی (٥٣٠/١) (پێدەر پابەند دەبێت بە رادەستکردنی مالی پێدراوەوە) گەر گرێبەستەکە دانامەزرێت پێش دەستبەسەرداگرتن ئەوا ئەو پابەندبوونە لە کوێوە دێت؟ ئەم دژایەتییە کە یاسادانەری کوێتی تێیکەوتووە بە هۆی تێنەگەیشتن لە گوزارەی(تەولو نابێت) لە هەندێ لە یاسا مەدەنییە عەرەبییەکاندا لەوانە یاسای مەدەنی عێراقی وەك باسمان کرد، هەر بەو جۆرە کەوتوتە ناو دژایەتییەوە لە نێوان دانانی گرێبەست وەك سەرچاوەی پابەندبوون لەگەڵ دانانی وەك هۆیەك بۆی، وەك لە مادەی (٣١)دا هاتووە گرێبەستی پێناسە کردووە بەوەی: (بەستنەوەی ئەرێکردنە بە قبوولکردنەوە لەسەر سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا رێکی دەخات) ئەم مادەیە راشکاوە لەوەی سەرچاوەی ئاساری گرێبەست لە مافەکان و ئەرکەکان بریتییە لە یاسا نەك گرێبەست، لە کاتێکدا لە بەشتی یەکەم، دەروازەی یەکەمی ئەو یاسایەدا باسی گرێبەستی کردووە لە ئامێزی سەرچاوەکانی پابەندبووندا.

یاسا باسکراوەکان رێگەیان داوە بە پێدانی قەرز بەو کەسەی لەسەریەتی و بە کەسانی تریش، وەك لە یاسای عێراقی(م/٦٠٧) و ئوردەنی(م/٥٦٠) هەروەها پێدانی هاوبەشی عێراقی(م/٦٠٩/٢) و کوێتی(م/٥٢٨).. هەموو ئەم یاسایانە کۆدەنگن لەسەر پووچەڵی پێدانی مالی داهاتوو، وەك یاسای عێراقی(م/٦٠٩) و کوێتی (م/٥٢٦) و میسری(م/٤٩٢) و سوری(م/٤٦٠) و لیبی(م/٤٨١) و لبنانی(م/٥١٣).

**پاساوەکانی پەشیمانبوونەوە لە بەخشین لە یاسا عەرەبییەکاندا:**

١-گەر کەسی پێدرلو کەمتەرخەمی کرد بەوەی لەسەریەتی بەرانبەر پێدەر.

٢-گەر پێدەر دەستەوسان بێت لە فەراهەم کردنی هۆیەکانی ژیانی خۆی بەوەی گونجاو بێت لەگەڵ پلەی کۆمەلأیەتی ئەودا یان وای لێهات نەتوانێت وەفا بکات بەوەی یاسا بەسەریدا سەپاندووە لە خەرجکردن بۆ کەسانی تر.

٣-گەر منداڵێکی پێدرا دوای پێدانەکە و لە کاتی پەشیمان بوونەوە لە ژیاندا بوو، یان منداڵێکی هەبوو لە کاتی پێدانەکەدا وا گومانی برد مردووە، بەلأم دوای پێدانەکە بۆی دەرکەوت زیندووە.

٤-گەر کەمتەرخەمی کرد بەوەی لەسەری بە مەرجگیرلوە بەبێ بیانوویەکی رەوا.

یاسای عێراقی(م/٦٢١) حاڵی چوارەم لەم مادەیە زیادەیە، چونکە دووبارەبوونەوەیە لەگەڵ حاڵەتی یەکەمدا، بۆیە لە یاسای میسری(م/٥٠١) و سوری (م/٤٦٩) و لیبی(م/٤٩٠) و لبنانی(م/٥٢٤)دا نەهاتووە.

گەر کەسی پێدرلو پێدەرەکەی کوشت ئەوا بۆ میراتگران هەیە لە پێدانەکە پەشیمان ببنەوە، یاسای عێراقی(م/٦٢٢)

ئەمە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا پێکدێتەوە پێوانە بۆ سەر کوشتنی میراتگر لەلایەن میراتلێگیرلوانیەوە، هەر بەو جۆرە کوشتنی وەسێتبۆکرلو لەلایەن وەسێتبۆکراوەوە، و کوشتنی وەقفکەر لەلایەن بۆوەقفکرلوەوە و کوشتنی پێدەر لەلایەن کەسی پێدرلوەوە.

هۆیەکە لە هەموویاندا هاوبەشە کە بریتییە لە پارێزگاری لە گیانی بێگوناهان، سەرباری رێسای: (هەر کەس پەلە بکات بۆ گەیشتن بە شتێك بەر لە هاتنی کاتی خۆی بە بێبەشکردن لەو شتە سزا دەدرێت)[1]

[1] مجلة الأحكام العدلية المادة (٩٩).

**ڕێگرییەکانی پەشیمانبوونەوە لە بەخشین سەرەڕای ڕاستبوونەوەی پاساوەکانی :**

١-زیادەیەکی پەیوەست بە شتی پێدراو و ئەوەش سەریکێشا بێت بۆ زیادە لە بەهاکەیدا.

٢-مردنی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە.

٣-هەڵسوکەوتی کەسی پێدراو لە شتە پێدراوەکەدا بە هەڵسوکەوتێك تیابەری موڵکداریەکەی بێت، گەر هەڵسوکەوت لە بەشێکدا بوو ئەوا پەشیمانبوونەوە لە بەشەکەی تر دروستە.

٤-پێدانی(بەخشینی) یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بەویتریان گەڕانەوەی تێدا نییە نە حاڵی ڕاستبوونەوەی هاوسەرێتی نە حاڵی جیابوونەوەیان لەیەکتر.

٥-پێدان بە کەسێکی نزیکی حەرامکراو.

٦-پێدان بە بریتییەك کە پێدەر دەستیبەسەردا گرتووە.

٧-تیاچوونی شتە پێدراوەکە.

٨-پێدانی(بەخشینی)نی قەرز بە قەرزدار، چونکە بەردەبێتەوە و بەرپووەوەش ناگەڕێتەوە.

٩-پێدانێك لەڕووی صەدەقەوە بەخشرابێت.

یاسای عێراقی(م/٦٢٣) و ئوردەنی(م/٥٧٩) بە هەڵواردەی پێدان بە کەسی نزیکی حەرامکراو چونکە ئەوە لە یاسادا نەهاتووە، هەروەها میسری(م/٥٠٢) بە هەڵواردەی پێدانی قەرز لەسەر ئەو بنچینەی کە بە موڵککردنە، هەر بەو جۆرە یاسای میسری لەگەڵ سوری (م/٤٧٠) و لیبی(م٤٩١) و لبنانی(م٥٣٠)

## سێیەم: گرێبەستی خواستن(عقد العارية أو الإعارة):

"العارية-بتشديد الياء وتخفيفها" ناوێكە بەكاردەهێنرێت بۆ ئەو شتانەی دەخوازرێت لەسەر گرێبەست، وەك چۆن "الرهن" بەكاردەهێنرێت بۆ بارمتەكراو لەسەر گرێبەست[1].

فەقیهان لە پێناسەی شەرعی ئەم جۆرە گرێبەستەدا جیاوازیان لە نێواندایە، ئەوەش بەپێی جیاوازییان لە چۆناندنیدا، ئایا بە مولككردنی سوودئامێزێكە بەبێ بریتی یان موباحكردنییەتی، لەسەر ئاراستەی یەكەم بە چەندین پێناسە پێناسەكراوە هەرموویان بە دەوری یەك ماناداد دەسورێنەوە ئەوەش ئەوەیە كە "خواستن" بریتییە لە بە مولككردنی سوودئامێزی ماڵی خوازراو بەبێ بریتی لەلایەن خواستیارەكەوە.

لە سەرخەرانی ئەم چۆناندنە حەنەفییەكان[2] و مالكییەكانن[3]، ئەوانەش كە لەسەر ئاراستەی دووەمن شافیعییەكان[4] و زەیدییەكانن[5].

ئەم ئاراستەی دووەمە ئاراستەی دروستە، چونكە كەسایەتییەكەی و پێویستی خواستیار بە هەند وەردەگیرێت لەلای لێخوازراوەكەوە لە كاتی خواستنیدا.

---

[1] تحفة المحتاج ٥/ ٤٠٩ . الأنوار ١/ ٥١٦ إعانة الطالبين ٣/ ١٢٧ .

[2] مرشد الحيران (م ٦٦٣) (خواستن بریتییە لە بەمولككردنی سوودی شتە خوازراوەكە لەلایەن خواستیارەكەوە بەبێ بریتی)

[3] في الشرح الصغير مع الصاوي ١/ ١٩٠ (خواستن بەمولككردنی سوودێكی كاتییە بە كاتێك یان بە كردارێك بە دەق یان عورف بەبێ بریتی)

[4] في تحفة المحتاج ٥/ ٤٠٩ والإعانة ٣/ ٤٠٩ (ناوێكە بۆ ئەو شتانەی دەخوازرێن هەروەها بۆ گرێبەستەكە كە موباحكردنی سوودبینینەكە پێی لەئامێز دەگرێت لەگەڵ مانەوەی خودی شتەكەدا بۆ گێرانەوەی)

[5] في الروض النضير ٤/ ٢٥ (لە شەرعدا خواستن موباحكردنی سوودەكانە بەبێ مولكداری شتەكە )

**بەڵگەکانی ڕەوایەتی خواستن:**

قورئان و سوننەت و ئیجماع و ماقووڵ(ژنەوراو) بەڵگەن لەسەر ڕەوایەتییەکەی.

أ.قورئان: خودا–سبحانه وتعالى– زەمی ئەوانەی کردووە ڕێگری لە خواستن دەکەن سەرباری هەڕەشە بە سزا، بۆیە دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾[1]، جمهوری شرۆڤەکەرانی قورئان وشەی "الماعون"یان بەوە لێکداوەتەوە کە جیران هەندێکیان لە هەندێکی تریان دەیخوازن[2]، بەڵام بواری خواستن تەنها لەسەر جیران کورتنەبووەتەوە، بەڵکو خواستن هەموو ناسراوان دەگرێتەوە جا جیرانی بێت یان نە، هەروەها خزمان و کەسانی تریش جگە لەوان، چونکە بنچینەی خواستن بریتییە لە هاوکاری و هاریکاری لەسەر چاکە کە قورئان فەرمانی پێکردووە: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾، هەندێك پێیان وایە لە سەرەتای ئیسلامەوە واجب بووە، دواتر واجبوونەکەی نەسخ بووەتەوە و بەباشزانینەکەی ماوەتەوە.

ب–سوننەتی پێغەمبەر: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((خواستن دەبێ بدرێت، و پێدراوەکەش دەبێ بگەڕێتەوە))[3].

ج–ئیجماع: فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگییان هەیە لە سەرەتای ئیسلامەوە تاکو ئەمڕۆ لەسەر ئەوەی پێویستە هاریکاری و هاوکاری و کۆمەکی و دەست لەناو دەستی لە نێوان مرۆڤەکاندا بە گشتی و موسڵماناندا بە تایبەتی بوونیان هەبێت.

ئەم سیفەتانە بە پێشکەشکردنی یارمەتی بەو کەسەی پێویستی پێیەتی دێتە دی و پڕکردنەوەی ئاتاجی خەڵکانی ئاتاج و پاڵپشتی کردنی مادی و مەعنەوی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان.

---

[1] سورة الماعون / ٤ – ٧ .

[2] تحفة المحتاج ٥/ ٦١١ .

[3] صححه الألباني في السلسلة الصحيحة ١٦٧/٢.

د- ماقوول(ژنەوراو): مرۆڤ بە سروشت کۆمەڵایەتییە، بۆیە هەموو مرۆڤێك ئاتاج دەبێت بە کەسانی تر لە هەندێ لە کاروبارەکانیدا، سەرەڕای دەسەڵاتی دارایی و جەستەیی و ئەقڵی، شەرعی ئیسلامی حوکی خواستنی وەك واجب یان وەك مەندوب بڕیارداوە لەسەر بنچینەی ئەو سروشتە مرۆییە، ئەو قسەیەی کە خواستن واجب بووە لە سەرەتای ئیسلامەوە و پاشان سڕاوەتەوە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی پاڵپشتی ناکات، بەڵکو لەسەر حاڵەتی یەکەمی ماوەتەوە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە، بۆیە لەوانەیە واجب بێت یان مەندوب، هەندێ جاریش لەوانەیە حەرامکراو یان مەکروه بێت، وەك چۆن دەکرێت موباح بێت بەپێی ئەو ڕەوشەی ئابلۆقەی داوە و ڕەوشی لێخوازراوەکە و خواستیارەکە.

**توخمەکانی خواستن:**

پێشتر باسی ئەوەمان کرد توخمی هەموو شتێك ئەوەیە کە ئەو شتە لە بوونیدا یان لە سیفەتێك لە سیفەتەکانیدا لەسەری دەوەستێت، ئەم توخمانە پایەکان و مەرجەکان دەگرنەوە، گەر پایە بە مانای تایبەت وەربگرین ئەوا پایەکانی لە ئەرێکردن و قبوولکردندا کورتدەبنەوە، وەك حەنەفییەکان دەڵێن[1]، گەر مەبەست پێی مانای گشتی بێت ئەوا پایەکانی بریتین لە لێخوازراو و خواستیار و خوازراو و دارشتن[2].

---

[1] في البدائع ٨/ ٣٨٩٧ (پایەکەی ئەرێکردن لە لێخوازراوەوە، بەڵام قبوولکردن پایە نییە لەلای سێ هاوەڵەکەمان ئەمەش وەك بە چاکبینین، پێوانەش دەیکات بە پایە ئەوەش بۆچوونی "زفر"ە لە پێداندا)

[2] تحفة المحتاج ٥/١٠١, الأنوار ١/٥١٩ (پایەکانی چوارن: لێخوازراو، و خواستیار، و خوازراو، و دارشتن) هەروەها لە: الخرشي ٦/١٢٠ (وأركانها أربعة المعير والمستعير والشيء المستعار وما به العارية) أي صيغتها.

**مەرجەکانی:**

ئەوەش بریتییە لە مەرجەکانی پایە بە مانای گشتی، بەم جۆرە:

**أ.مەرجەکانی لێخوازراو:**

١-دەبێ خاوەنی سوودئامێزەکە بێت یەکسانە خاوەنی خودی شتەکە بێت وەك لە مولکداری تەواودا یان تەنها خاوەنی سوودەکەی بێت بەبێ خاوەنداریێتی تەواو وەك لە وەسیێتبۆکراو بە سوودئامێزێك، هەروەها لە کرێگرتەدا، هەریەك لەو دوانە خاوەنی سوودی شتەکەن و دەتوانێت بیدات بە خواستن لەبەر خاوەنداریێتی سوودەکەی[1].

٢-کەسەکە هەڵبژاردەی بۆ هەبێت، خواستن بۆ کەسێك دروست نییە زۆری لێکرابێت لەسەری بەبێ مافێك، کارەکە دروستە گەر بە مافێك زۆر کرابێت، وەك لە باری ناچاری و پێویستی زۆری خواستیارەکەدا بە جۆرێك لێخوازراوەکە ناچار دەکرێت لەسەر خواستن بۆ لابردنی ئازار لەسەر خواستیارەکە[2].

٣-لێخوازراوەکە شایستە بێت بە بەخشین، بەوەی باڵغ و ئاقڵ و پێگەیو بێت، بۆیە خواستن لە کەسی ناشایستە دروست نییە بەهۆی منداڵییەوە یان بەهۆی شێتێتی و هاوشێوەکانی ئەمانە، هەروەها خواستن لە کەسی کەم شایستەش لەلای جمهوری فەقیهان دروست نییە[3].

---

[1] في شرح الخرشي ٦/ ١٢٢ (بۆ خاوەنی سوودەکە هەیە بیدات بە خواستن نەك بۆ خاوەنی سوولێبینینەکە، ئەوەش ئەو کەسەیە خاوەنی سوودێکی دیاریکراوە)

[2] في تحفة المحتاج ٥/ ٤١٠ وقد تجب لدفع مود.

[3] في شرح الخرشي ٦/ ١٢١ (خواستنی منداڵی جیاکەرەوە دروست نییە با لە بازرگانیشدا مۆڵەتی پێدرابێت، چونکە لە بریتیدانەکاندا رێگەی بازرگانی پێدراوە و لە شێوەی خواستندا مۆڵەتی پێنادرێت مەگەر هاوتای بازرگانی بێت، خواستنی نەخۆش بە زیاتر لە سێیەکی ماڵەکەی دروست نییە)

وفي المهذب ١/ ١٩٠ (لێخوازراو خاوەنی سوودەکەیە با خاوەنی خودی شتەکەش نەبێت بەبێ دەستگرتندابەسەریدا)المعير هو مالك المنفعة ولو لم يملك الذات بلا حجر عليه.

←

حەنەفییەکان خواستن لە منداڵی جیاکەرەوەی مۆڵەتدرلو بە بازرگانی بەدروست دەبینن، چونکە ئەوەش پاشکۆی بازرگانییە، وەك چۆن دروستە بۆی بە هەندێ کاروباری بازرگانی هەڵبستێت بە مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی یان بە مۆڵەتی قەزا هەر بەو جۆرە دەتوانێت بە کاری خواستنیش هەڵبستێت[1].

لەسەر ئەم بۆچوونە تێبینی دەکرێت بازرگانی بریتیدان لە نێوان قازانج و زیاندا هاتووچۆ دەکات، بۆیە بە مۆڵەتی پێشوەخت یان مۆڵەتی دواتر دروست دەبێت، بە پێچەوانەی خواستنەوە کە زیانگەیەنەرە بە زیانگەیاندنێکی پەتی لەڕووی مادییەوە، سەرباری ئەوە زۆر کەم خواستنی پەیوەندار بە کاری بازرگانی دەبینییەوە.

**ب-مەرجەکانی خواستیار:**

١-کەسەکە ناسراو و دیاریکراو بێت بۆیە خواستنی کەسی نادیار و نەناسراو دروست نییە.

٢-شایستەیی خاوەندارێتی تێدا بێت.

٣-شایستەی هەڵسوکەوت بێت، بۆیە خواستنی ناشایستە دروست نییە، بۆیە گەر کەسێكماڵێکی بە خواستن دا بە منداڵێك کە جیاکردنەوەی نەبوو یان بە شێتێك و ماڵەکە تیاچوو ئەوا تیاچوونەکە لەسەر خۆیەتی نەك لەسەر خواستیارەکە[2].

---

وفي الروضة البهية والمعة الدمشقية ١/ ٣٨٨ (بەمەرجەدەگیرێت لێخوازرلو کامڵ بێت و هەڵسوکەوتەکەی گونجاو بێت)

[1] في البدائع ٨/ ٣٨٩٨ (بالغبوون مەرج نییە لەلای ئێمە تەنانەت خواستن لە منداڵی جیاکەرەوەی مۆڵەتدرلوەوە دروستە، چونکە لە پاشکۆکانی بازرگانییە، ئەو خاوەنی بازرگانییە بۆیە خاوەنی پاشکۆکانی ئەوانەشە، لەلای شافعی دروست نییە)

[2] في اعانة الطالبين:- في الفقه الشافعي – العلامة محمد شطا الدمياطي على حل ألفاظ فتح المعين للعلامة زين الدين المليباري ٣/ ١٣٠ (گەر منداڵێك بنێرێت بۆ ئەوەی شتێکی بۆ بخوازێت دروست نییە، گەر لە دەستیدا تیابچێت یان تیایبرد ئەوا منداڵەکە و نێرەرەکەی دەستەبەری ناکەن)

**ج-مەرجەکانی خوازراو:**

١-لەوانە بێت کە سوودی لێ دەبینرێت لەگەڵ مانەوەی خودی شتەکە، نابێت سوودبینینەکە لەو جۆرانە بێت خودی شتەکە تیادەبات، بۆ نموونە دروست نییە مۆم بخوازی بۆ رۆشنکردنەوە، یان خواردن بۆ خواردن بخوازی[1].

٢-سوود لێبینینەکە موباح بێت، بۆیە دروست نییە شتێك بخوازرێت بەکاربهێنرێت لە دەستەبەرکردنی ئامانجێکی ناڕەوادا، وەك خواستنی چەکێك مەبەستی بێت مرۆڤێکی بێگوناهی پێبکوژێت[2].

٣-بە خود زانراوبێت یان بە جۆر یان بە رەگەز ئاشکرابێت لەگەڵ سیفەتی جیاکەرەوە، بۆیە خواستنی شتی نادیار پووچەڵە.

٤-پێویستە دەستبەسەرداگرتنەکەی بە مۆڵەتی لێخوازراوەکە بێت، ئەگینا کەسەکە دەبێتە داگیرکەر نەك خواستیار.

د-مەرجەکانی داڕشتن: ئەوەی لە داڕشتنی گرێبەستەکانی تردا بەمەرج دەگیرێت لە داڕشتنی گرێبەستی خواستنیشدا بەمەرج دەگیرێت، ئەم داڕشتنە بەڕەهایی و بەسنووورداری دروستە.

---

[1] في البدائع ٨/ ٣٨٩٧ (مەرجەکانی ئەوەیە خوازراو لەوانە بێت بتوانرێت سوودی لێ ببینرێت بەبێ تیابردنی) قارن الخرشي ٦/ ١٢٢ . الروضة البهية واللمعة الدمشقية ١/ ٣٨٨ .

[2] في تحفة المحتاج ٥/ ٤١٤مەرجەکانی خوازراو ئەوەیە سوودبەخش بێت بە سوودبەخشینێکی موباحی بەمەرامگیرلو.

## چۆناندنی خواستن لەرووی سروشتی هەڵسوکەوتەوە و لەرووی سیفەتە شەرعییەکەیەوە

### أ. لەرووی سروشتەوە:

تێڕوانینی فەقیهانی شەریعەت جیاوازی لە نێواندا هەیە، هەندێکیان چۆناندنی بۆ کردووە بەوەی موباحە[1]، و هەندێکیش دەڵێن بە موڵککردنە[2].

بەری جیاوازییەکە: گەر خواستن چۆناندنی بۆ بکرێت بەوەی بە موڵککردنی سوودئامێزە ئەوا خواستیار مافی خۆیەتی هەڵسوکەوتی تێدا بکات بە بریتیدان یان بەبێ بریتیدان لەدوای دەستبەسەرداگرتنی شتەکە، گەر بەڵگەیەك یان رێکەوتنێك

---

[1] في تحفة المحتاج ٥/ ٤٠٩ (خواستن(العارية–بتشديد الياء وتخفيفها) ناوێکە بۆ ئەو شتانەی دەخوازرێ و بۆ گرێبەستی ئامێزگر بۆ موباحکردنی سوودلێبینینەکە بەوەی سوودلێبینی حەلاڵ دەکات لەگەڵ مانەوەی خودی شتەکە تاکو بیگێڕێتەوە)
وفي المغني ٥/ ٢٢٠٩(خواستن موباحکردنی سوودلێبینینە لە شتێك لە شتە بەرچاوەکانی ماڵ)
في المحلى ٩/ ١٦٨ (خواستن بریتییە لە موباحکردنی سوودەکانی هەندێ شت، وەك ولاخ بۆ سواری و جلوبەرگ بۆ پۆشین)
في الروض النضير ٤/ ٢٥ (لە شەرعدا خواستن بریتییە لە موباحکردنی سوودەکان بەبێ بەموڵککردنی شتەکە)

[2] ابن عابدين ٥/ ٦٧٩ (بریتییە لە بەموڵککردنی سوودەکان بێ بەرانبەر، لەلای شافیعی بریتییە لە موباحکردنی سوودئامێزەکان) في البدائع ٨/ ٣٨٩٧ (خواستن بریتییە لە بەموڵککردنی سوودئامێز بێ بریتی، چونکە لێخوازراو خواستیارەکە دەسەپێنێت بەسەر بەدەستهێنانی سوودەکانی و بەکارهێنانی بۆ خۆی بەجۆرێك دەستی ئەوی لێدەکێشرێتەوە، و سەپاندن بەسەردا بریتییە لە بەموڵککردن و نەبوونی سوودئامێزەکان لە کاتی گرێبەستەکەدا رێگری ناکات لە بەموڵککردنی وەك لە بەکرێداندا) في شرح الخرشي ٦/ ١٢٠ (خواستن(الإعارة) چاوگە لە "أعرت المتاع إعارة–خواستنی شتێکی بەسوود" ناو لەو چاوگەوە بریتییە لە"عارية–بتشديد الياء–خواستیاری" وەك ئەوەی درابێتە پاڵ "عار–خەجاڵەتی" چونکە داواکەی خەجاڵەتی تێدایە، "ابن عرفة" بە چاوگ و ناوی دلناوە وەك چۆن نەرێتەکەی گوزەر دەکات، گەر بۆ راستەقینەیەکی عورفی بوو دوو مانای هەیە: مانای چاوگی بریتییە لە بەموڵککردنی سوودێکی کاتی نەك بە بریتیدان، وەك ناویش دەڵێت: ماڵێکی خاوەن سوودی کاتییە بەبێ بریتی بەموڵککراوە)

پێچەوانەی ئەوە راستنەبوویەوە، بەپێچەوانەی ئەوەی گەر چۆناندنی بۆ بکرێت بەوەی موباحی سوودئامێزە، لەوبارەدا خواستیار وەك میوانێك وایە خواردنی پێشکەش دەکرێت و تەنها بۆی هەیە سوودی لێ ببینێت، بەلآم ناتوانێت هەڵسوکەوتی تێدا بکات بەوەی بیدات بە کەسێکی تر نە بەرانبەر بە بریتیدان نە بێ بەرانبەر.

هەر بەو جۆرە ئەویش مافی ئەوەی نییە بە خواستن بیدات بە کەسێکی تر، بە پێچەوانەی ئەوەی گەر بەموڵککردن بێت، لەو بارەدا هەموو ئەوانەی بۆ هەیە لەسەر بۆچوونی پارسەنگدراو لە فیقهی ئیسلامیدا گەر بەلگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە[1].

**ب-لەرووی سیفەتی شەرعییەوە( یان یاساییەوە ):**

ئەم سیفەتە لەبارێکدایە کە گرێبەستەکە دروست یان پووچەڵ بێت، دروستەکەش راگیراو یان جێبەجێکراو بێت، و جێبەجێکراوەکەش پێویست یان ناپێویست بێت، مەبەست لێرەدا بەشی کۆتاییە، ئایا خواستن گرێبەستێکی پێویستە یان گرێبەستێکی ناپێویست؟ فەقیهانی شەریعەت کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی کە گرێبەستی خواستن گرێبەستێکی دروستە گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون و رێگرەکانی هەڵگیران، و ناپێویستە بەپێی بە خودی خواستنەکە و سروشتەکەی تایبەت بە هەریەك لە لێخوازراوەکە و خواستیارەکە، بۆیە هەریەك لەو دوانە مافی خۆیەتی گرێبەستەکە کۆتا پێبهێنن بە مەرجێ ئەو کارە زیان بەویتریان نەگەیەنێت، ئەگەر نە، قەرەبووکردنەوەی لەسەرە، ناپێویستە تایبەت بە خاوەن خواستنەکە چونکە بەخشینە و خاوەن خواستنەکە خۆبەخشە، بۆیە هەرکات هەستی بە پێویستی کرد بە گێڕانەوەی خوازراوەکە دەتوانێت داوای بکاتەوە.

---

[1] في الميزان الكبرى ٢/ ٧٦ :- (ئەبو حەنیفە و مالیك دەڵێن: گەر شتێك خوازرا بۆی ئەوا بۆی هەیە بیدات بە کەسانی تریش) ئەوەی رۆشنە ئەوەیە خواستن لەلای ئێمە بەموڵککردنە.

ئـەوەش کـە پێویسـت نییـە بـۆ خواسـتیار، چـونکە خـاوەنی بەرژەوەندییـە و سوودمەندە لە قازانجی خواستنەکە، بۆیە بۆی هەیە واز لـەو بەرژەوەندییـە بهێنێـت هەر کات بیەوێت بەمەرجێ زیان بە کەسی لێخوازراو نەگەیەنێت[1].

**حوکمەکانی خواستن:**

مەبەست بە حوکمەکان بریتین لەو ئاسارانەی لەسەر خواستن سەرهەڵدەدەن لـە مافەکان و ئەرکەکان، تەنها باس لە ئەرکەکان دەکەین ئەمەش بە دوو هۆ:

یەکەمیان هەر پابەندبوونێك بۆ یەکێك لە دوو لاکە مافێك بەرانبەریەتی بۆ لایەکەی تر، بۆیە مافی تاکەکەسی و پابەندبوون پێویستی یەکترن، واتە بوونی یەکێکیان بوونی ئەویتریان پێویست دەکات، وەك چۆن نەبوونی یەکێکیان نەبوونی ئەویتریان پێویست

[1] في اعانة الطالبين ٣/ ١٣٢ (ئەو گرێبەستانەی تیایانـدا بایـەخ بـە دوو گرێبەسـتکارەکە دەدرێـت بـۆ سێ بەش دابەش دەبن: یەکەمیان گونجاوە(پێویست نییە) لە هەردوو لاکەوە، بـۆ هـەر یـەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە هەیـە هەڵیبوەشێنێتەوە، ئـەوەش بریتییـە لـە خواسـتن و بریکـاری و شەراکەت و قەرزکاری و دانان و بەخشین پێش دەستکردن بە کارەکە و دوای دەسـتپێکردنی و پێش تەواوبوونی، و وەسێتکردن بۆ کەسانێك بە شتێکی دیاریکراو لە ماڵ و شتانی تریش جگە لەوانە، وەك بارمتە پێش دەستبەسەرداگرتن و پێدان هـەر بـەو جـۆرە، دووەم پێویسـتە و بـۆ هـیچ کـام لـە دوو کەسـەکە نییـە هەڵیبوەشـێننەوە بـەبێ داخوازییـەك کـە دلوای دەکـات وەك نەنگییەك، هەروەها ئەوە فرۆشتن و سەلەمە لەدوای کۆتاهاتنی هەڵبژاردن و سـولح و حەواڵـە و بەکرێدان و بۆناردن و پێدان لەدوای دەستبەسـەرداگرتن، لـەدوای مـردن مـافی لـق و وەسـێتە و شتانی تریش وەك هاوسەری و تەلاقی خولع، سێیەمیان بۆ یەکێکیان گونجاوە(ناپێویستە) کـە بریتییە لە بارمتە دوای دەستبەسەرداگرتن بـە مۆڵـەت، لـە لای بارمتـەگرەوە گونجـاوە لـە لای بارمتـــەدەرەوە پێویســـتە، دەســـتەبەرکردن(کەفالەت) لـــەلای بۆدەســـتەبەرکراو گونجاوە(ناپێویستە) و لـەلای دەستەبەرکەرەوە پێویسـتە، لـە هـەروەها پێدانی بنـەڕەت بـە لقەکەی لەدوای دەستبەسەرداگرتن بە مۆڵەت، ئەوە لـەلای بنەڕەتـەوە گونجاوە(ناپێویستە) و لەلای لقەوە پێویستە، و شتانی تریش ) قارن تحفة المحتاج ٥/ ٤٢٥ .

وفي البدائع ٨/ ٣٩٠٣ (سیفەتی حوکم ئەوەیە موڵکی جێگیر بۆ خواستیار موڵکێکی ناپێویسـتە، چونکە موڵکێکە بریتیدانی بەرانبەر نییە، بۆ لێخوازراو هەیـە خوازراوەکـە بگێڕێتـەوە رەهـا بێـت یان ماوەبۆدیاریکراو)

دەکــات، هــۆی دووەم ئەوەیـــە کـــە بابـــەتی ئـــەم باســـەمان بریتییـــە لـــە پابەندبوونەکان(ئەرکەکان).

**حوکمەکانی خواستن بەر لە دەستبەسەرداگرتن:**

خواستن بەر لـە دەستبەسـەرداگرتن هـیچ پابەنـدبوونێکی لەسـەر سـەرهەڵنادات تایبەت بە هەریەك لە لێخوازراو و خواستیارەکە لـەڕووی قەزاییـەوە، بـەڵام لـەڕووی ئایینەوە لەسەر لێخوازراو پێویستە وەفا بە بەڵێن و پەیمانی خۆی بکات گەر بـەڵێنی پێدانی خواستنی دا، خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾[1].

هەروەها پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفـەرموێت: ((بەڵگـەی کەسـی دووڕوو سـێ شـتە: کاتێـك قسـە دەکـات درۆ دەکـات، کاتێـك بـەڵێن دەدا بەڵێنشـکێنی لێدەوەشێتەوە، کاتێك ئەمانەتی دەدرێتە دەست ناپاکی لێ دەکات))[2].

**حوکمەکانی خواستن دوای دەستبەسەرداگرتن:**

لەسەر خواستن دوای دەستبەسەرداگرتنی خوازراو کۆمەڵە ئەرکێك سەرهەڵدەدەن تایبەت بە هەریەك لە لێخوازراوەکە و خواستیارەکە:

**أ.ئەرکەکانی لێخوازراو:**

١-لێخوازراو پابەند دەبێت بە پێدانی خوزراوەکە بۆ خواستیارەکە تاکو سـوودی لێ ببینێت.

٢-پابەند دەبێت بە نەگێڕانەوەی لە کاتی سوود لێبینینیدا گەر پاساوێك بـوونی نەبوو.

٣-پابەنـد دەبێـت بـە نەگێڕانـەوەی خوازراوەکـە پـێش کۆتاهـاتنی مـاوەی خواستنەکە گەر ئەوە سەریکێشا بۆ زیانگەیاندن بە خواسـتیار بـەبێ ئـەوەی

---

[1] سورة الإسراء / ٣٢ .

[2] صحيح البخاري / كتاب الأيمان / باب ٢٤ .

خواستیار هیچ دەستدرێژییەك یان كەمتەرخەمییەكی هەبێت لە پارێزگاری كردنی شتە خوازراوەكە و جۆری سوود بینین لێی.

**ب-ئەركەكانی خواستیار:**

١-پێویستە لەسەر خواستیار گرنگی بدات بە پارێزگاری شتە خوازراوەكە و گرنگیدانەكەی وەك گرنگیدان بێت بە ماڵی خۆی، گەر كەمتەرخەمی بەرانبەر ئەم پابەندبوونە هەبوو ئەوا دەستەبەركردنی لەسەرە لەبەر ڕۆشنایی قەبارەی ئەو زیانەی بەهۆی ئەوەوە ڕووبەڕووی خوازراوەكە دەبێتەوە[1].

٢-گەر كەسی لێخوازراو جۆری بەكارهێنانەكە یان كاتەكەی یان شوێنەكەی دیاریكرد ئەوا خواستیار بەو دیاریكردنەوە پابەند دەبێت، گەر بەو جۆرە بەكاریهێنا كە بۆی دیاریكراوە یان كەمتر لەوە لەڕووی زیانەوە ئەوا ئەو كارەی بۆ دروستە، ئەگەر نە دەبێ ناتەواوییەكە یان تیاچوونەكە كە بەهۆی ئەو كارەوە سەرهەڵدەدات دەستەبەر بكات، بۆ نموونە گەر بۆ چاندن یان بۆ بینا لێی خواست ئەوا كشتوكاڵی بۆ هەیە نەك بە پێچەوانەوە، گەر بۆ كشتوكاڵی گەنم و جۆ خواستی ئەوا بەكارهێنانی لە كشتوكاڵی مەرەزەدا بە سەرپێچی دادەنرێت، بۆیە دەبێت دەستەبەری زیانەكە بكات بەبێ پێچەولنەكەی[2].

٣-پابەند دەبێت بە گێڕانەوەی خوازراوەكە بۆ خاوەن خوازراو یان بۆ بریكارەكەی گەر لە ماڵی بەنرخ بوو.

٤-خەرجی خوازراوەكەی لەسەرە، چونكە بەبێ بریتیدان وەریگرتووە تاكو بێ بەرانبەر سوودی لێ ببینێت.

---

[1] شرح النيل وشفاء العليل ١٢/ ١٢١ .

[2] في الأنوار ١/ ٥٢٣ پێویستە خواستیار بەپێی مۆڵەتی لێخوازراو یان لە خوار بڕی مۆڵەتەكەوە لە زیان سوود لە خوازرلوەكە ببینێت، گەر بۆ چاندنی گەنم خواستی ئەوا دەتوانێ پێی بچێنێت یان جۆ یان پاقلە، بەڵام بۆی نییە گەنمەشامی یان مەرەزە یان لۆكەی پێ بچێنێت گەر پێی چاند داگیركەرە، في مرشد الحيران م ٧٧٦ (پێویستە لەسەر خواستیار گرنگی بدات بە پارێزگاری خودی شتە خوازراوەكە و هەڵگرتنی وەك چۆن گرنگی بە ماڵی خۆی دەدات)

٥-خەرجی گێڕانەوەی خوازراوەکەی بۆ خاوەن لێخوازراو لەسەرە بەهۆی هەمان هۆوە[1].

**دەستەبەری خواستیاری:**

فەقیهانی شەریعەت جیاوازیان هەیە لەسەر دەستەبەری خواستیاری لەسەر چەند رایەك گرنگترینیان پێنجن، کە ئەمانەن:

**یەکەمیان:** بەرەهایی دەستەبەردەکرێت، و دەستی خواستیار دەستی دەستەبەرییە، بۆیە گەر بەتەواوی یان بەشێکی تیاچوو دەستەبەری ئەوەی لەسەرە گەر دەستدرێژکار و کەمتەرخەم نەبوو، یەکسانە مەرجی دەستەبەری لێگیرابێت یان نە، ئەم ئاراستەیە رای فەقیهە حەنبەلییەکان و رایەکی شافیعییەکانە، سەرخەرانی ئەم بۆچوونە بە چەندین بەڵگە بەڵگە دەهێننەوە، لەوانە:

أ.ئەوەی دەگێڕنەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ((رۆژی حونەین دورعێکی خواست، کەسەکە وتی: ئایا داگیری دەکەی ئەی محەمەد؟ فەرمووی: بەڵکو خواستنێکی دەستەبەرکراوە))[2].

ب-شتی خوازراو گێڕانەوەی دەستەبەرکراوە لە کاتی راستبوونەوەیدا، بۆیە بەهاکەی دەستەبەرکراوە لە باری تیاچوونیدا وەك داگیرکراو، چونکە شتەکە ناوێکە بۆ شێوە و مانا(بەها)ی شتەکە، گەر خواستیار دەستەوسان بوو لە گێڕانەوەی شێوەکە دەستەوسان نییە لە گێڕانەوەی ماناکە، چونکە بەهای شتێك بریتییە لە مانای شتەکە، بۆیە پێویست دەبێت لەسەری بە ماناکەی بیگێڕێتەوە.

ج-خواستیار خوازراوەکە بۆ قازانجی خۆی دەستبەسەرادەگرێت بۆیە دەستەبەرکراوە وەك دەستبەسەرداگرتن بەسەر فرۆشراودا لە فرۆشتندا.

---

[1] في الأنوار ١/ ٥٢٢ تێچوونی گێڕانەوەی خوازراو بۆ لێخوازراو لەسەر خواستیارە.
[2] أخرجه أبو داود، جامع الأصول في أحاديث الرسول ١٦٣/٨، رقم الحديث (٥٩٩٤)

ئـەم بەلگانـە گفتوگۆیـان لەسـەر کـراوە لەلایـەن ئەوانـەوە کـە دەڵـێن: دەسـتی خواستیار دەستی ئەمانەتە بۆیە دەستەبەر ناکرێت گەر تیاچوو یان بەهایەکەی لەلای ئەو کەمی کرد بەبێ دەستدرێژی یان کەمتەرخەمی، بەلگە بەمانە دەهێننەوە:

أ.خواسـتیار هەڵنەسـتاوە بـە کارێـك ببێتـە هـۆی پێویسـتبوونی دەسـتەبەری، خواستن وەك ئەمانەت و ئیجارە وایە، بۆیە دەستەبەری تێدا نییـە مەگـەر بـە دەستدرێژیکردنە سەر شتەکە یان کەمتەرخەمی، کەوابوو دەسـتەبەری بـەبێ کرداری ناڕەوا لەسەر کەسەکە پێویست نابێت.

ب-دەستبەسەرداگرتنی بە مۆڵەت نابێتە دەستدرێژی بەوەش پایەیەکی بنەڕەتی لە پایەکانی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی لوادەکـەوێت کـە بریتییـە لـە کـاری ناڕەوا(دەستدرێژی)+زیان+پەیوەندی هۆگەرایی.

ج-هیچ پێویستکارییەك نابینرێتەوە لە نێوان پێویستبوونی گێرانەوەی شتەکە لە کاتی راستبوونەوەی لەگـەڵ پێویسـتبوونی گێڕانـەوەی بەهایەکـەی لـە بـاری تیاچوونیدا[1].

**دووەم:** خواستن تەنها بە دەستدرێژیکردنە سەر و کەمتەرخەمی دەسـتەبەرکراوە، بۆیە دەستەبەری ماڵی خوازراو لـە دەروازەی بەرپرسـیارێتی کەمتەرخەمییـە نـەك لـە دەروازەی بەرپرسـیارێتی گرێبەسـتی، وەك چـۆن ئـەوە ئاراسـتەی بۆچوونی یەکەمە کە دەستەبەری بەڕەهایی بڕیاردەدەن.

گەورەترین بەلگەیان ئەوەیە: کەسی خواستیار دەست بەسەر ماڵی خوازراودا دەگرێت بینا لەسەر گرێبەستێك یـان رێکـەوتنێك لـە نێـوان ئـەو لێخـوازراودا، هەریـەك لـە گرێبەسـت(یان رێکـەوتن) و دەستبەسـەرداگرتن نابنـە هـۆ بـۆ

---

[1] البدائع للكاساني ٨/ ٣٩٠٥ .

بەرپرسیارێتی بەمەرام یان کەمتەرخەمی، ئەمەش بۆچوونی جمهوری فەقیهانی شەریعەتە[1]

**سێیەم**: خواستن دەستەبەرکراوە گەر دەستەبەری بەمەرجگیرا بوو، گەر بەمەرج نەگیرابوو ئەوا دەستەبەری بۆ نییە مەگەر بە دەستدرێژیکردنە سەر یان کەمتەرخەمی، ئەمەش هەڵبژاردەی ئیبازییەزەکان[2] و ئەهلی عەترە(ئالوبەیت)ە[3]، گەر لەسەری بەمەرجگیرا بۆ ئەوەی دەستەبەرکراو بێت ئەوا وەك دوو حاڵەتی دەستدرێژی کردنە سەر و کەمتەرخەمی وایە، گەر دەستدرێژی و کەمتەرخەمی و مەرج بوونی نەبوو ئەوا دەستەبەری بوونی نییە.

**چوارەم**: ئەوەیە کە شافیعییەکان بۆی دەچن لە جیاکردنەوە نێوان تیابردن بەهۆی بەکارهێنانی مۆڵەت تیادراوەوە کە دەستەبەر ناکرێت، لەگەڵ تیاچوون بەبێ بەکارهێنان کە دەستەبەردەکرێت، بۆیە دەڵێن: تیابردنی خوازراو بە

---

[1] في الروض النضير ٤/ ٢٩ (خواستیاری ئەمانەتە لە دەستی خواستیاردا و دەستەبەرکردنی لەسەر پێویست نابێت گەر بەبێ تاوانکاری و کەمتەرخەمی تیاچوو، ئەمەش بریتییە لە مەزهەبی ئەهلولبەیت و "قتادة و الحسن البصري و والنخعي و شريح وأبي حنيفة" و هاوەڵەکانی ئەبی حەنیفە)

في المحلى ٩/ ١٧٤ (دەستەبەرکردنی خواستیار بەبێ دەستدرێژیکردنە سەر و کەمتەرخەمی خواردنیماڵی کەسانی تر بە باتڵ، خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ هەروەها دەفەرموێت ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ هەروەها ﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ﴾ وفي البدائع ٨/ ٣٩٠٥ (لە خواستیارەوە هۆیەك نابینرێتەوە دەستەبەرکردن پێویست بکات، بۆیە پێویست نییە لەسەری)

[2] في شرح النيل ١٢/ ١١٢ (هەڵبژێرراو هەرکات خواستیار گێڕانەوەی بەمەرج گرت یان لێی بەمەرجگیرا یان دەستدرێژی کردە سەری دەستەبەری دەکات گەر تیابچێت)

[3] في الروض النضير ٤/ ٢٩ (ئالوبەیت و ئەوانەی لەگەڵ ئەوانن دەڵێن گەر دەستەبەری بە مەرج نەگیرابوو)

بەکارهێنانی مۆڵەت تیادراو وەك ئەوەی پۆشاکێك بێت لەبەریکرێت و بەتەواوی بدرێت یان بەشێکی بدرێت دەستەبەری لەسەر نییە.

**پێنجەم:** جیاکردنەوەی فەقیهە مالیکییەکان کە وتویانە خواستیار خواستن دەستەبەر دەکات گەر لەوانە بوو دەتوانرا بشاررێتەوە لە بەرچاوی خەڵکی وەك پۆشاك و خشڵ و ئەو شتانەی مرۆڤ خۆی پێ دەڕازێنێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی ناتوانرێت بشاررێتەوە، ئەمەیان دەستەبەر ناکرێت، مەگەر بە دەستدرێژیکردنە سەر و کەمتەرخەمی[1].

شایانی باسە ئەوانەی بۆچوونیان دەستەبەرکردنە هەیانە دەڵێت بەهای خودی شتە خوازراوەکە لە رۆژی تەواوبوونی کاتی خواستنەکەدا دەستەبەر دەکرێت[2]، هەیانە دەڵێت لە رۆژی تیاچوونیدا دەستەبەر دەکرێت[3].

پارسەنگدراو بە بۆچوونی من بریتییە لە دەستەبەر نەکردن گەر خواستیار دەستدرێژکار یان کەمتەرخەم نەبێت لە پارێزگاری لێکردنی، چونکە دەستی

---

[1] في شرح الخرشي ٦/ ١٢٣ (کەسی خواستیار خواستیاری دەستەبەر دەکات گەر لەوانە بوو دەتوانرا بشاررێتەوە وەك جلوبەرگ و خشڵ، بەڵام ئەو خواستنانەی کە ناشاررێنەوە وەك خانووبەرە و گیانداران ئەمەیان دەستەبەر ناکرێت، گەر گیاندارەکە دەستەبەر نەکرێت ئەوا زین یان کورتان و رەشوە و لەغاوی دەستەبەر دەکرێت)

[2] في شرح الخرشي ٦/ ١٢٤ (لە"المقدمات"دا دەڵێت: گەر دەستەبەری خواستیاری لەسەر خواستیار پێویست بوو ئەوا بەهای خودی شتەکە لە رۆژی کۆتاهاتنی ماوەی خواستیارییەکە دەستەبەر دەکات لەسەر ئەو کەمییەی بەکارهێنانی مۆڵەت تیادراو رووی لێکردووە دوای سوێندخواردنی بەوەی شتەکە بە جۆرێك تیاچوو کە لە هیچ رێگەیەکەوە نەدەتوانرا بگێڕرێتەوە، چونکە تۆمەتبار دەکرێت لەسەر بردنی بە نرخەکەی بەبێ رازیبوونی خاوەنەکەی)

[3] في الإعانة ٣/ ١٣١ (پێویستە لەسەر خواستیار دەستەبەری نرخی رۆژی تیاچوونەکە بدات بە لێخوازراو گەر هەمووی یان بەشێکی لە دەستی ئەودا تیاچوو با ئافەتێکیش بێت بەبێ کەمتەرخەمی جا بە جێگرەوەی ئەوە یان بە پارە، گەر دەستەبەرنەکردنی بەمەرجگیرا بەهۆی فەرموودەکەی "أبي داود" و کەسانی ترەوە(خواستیاری دەستەبەرکراوە) واتە بە نرخی رۆژی تیاچوونەکەی نەك رۆژی دەستبەسەرداگرتنەکەی لەو شتانەی بەهادارن، لەوانەش هاونموونەن بە هاونموونەکەی)

خواستیار دەستی ئەمانەتە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (دەستەبەری لەسەر ئەمانەتپێدراو نییە)[1]، هەروەها لەبەر ئەوەی خواستیار خودی شتە خوازراوەکە بە مۆڵەتی لێخوازراو و بە هۆیەکی ڕەوا وەردەگرێت، بۆیە جیاکردنەوە لە نێوان دەستی داگیرکار و بندەستخستنی ناڕەوا لەگەڵ وەرگرتن بە مۆڵەتی خاوەنەکەی و بندەستخستنی ڕەوا پێویستە، بەڵام گەر خواستیار لەڕووی داراییەوە دەسەڵاتدار بوو ئەوا قەرەبووکردنەوەی لێخوازراو لەو زیانەی تووشی بووە بەرهەمی تیاچوونی خوازراوەکە بە تەواوی یان بەشێکی لەلای خواستیار لە دەروازەی پاداشت بە چاکە و چاکە بە چاکەیە، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾، بەمەش دەتوانرێت بۆچوونە جیاوازەکان کۆبکەینەوە.

**بەکرێدانی خوازراو:**

گەر خوازراو بەکرێدرا ئەوا بۆ خاوەنەکەی پاداشتی هاوشێوە هەیە لە هەر کەسێکی بوێت داوای دەکات لە لێخوازراو(لێخوازراوی دووەمجار) و خواستیار، گەر خواستیار دەستەبەری کرد دەگەڕێتەوە سەر لێخوازراو بەوەی غرامەی کردووە، چونکە بەو کارەی فریوی داوە[2]، کەسی لێخوازراو دەستەبەری ئەو زیانە ناکات تووشی خواستیار دەبێت بەرهەمی ئەوە یان بەهۆی نەنگییەکی شاراوە گەر کەمتەرخەم نەبێت لە شاردنەوەی هۆی بەکرێدانەکە یان نەنگییە شاراوەکە.

**گرنگترین هۆیەکانی کۆتاهاتنی خواستن لە فیقهی ئیسلامیدا:**

١–مردنی لێخوازراو یان خواستیار.

٢–کۆتاهاتنی ماوەی خواستنەکە.

٣–تیاچوونی خوازراوەکە.

---

[1] رواه أبو داود في البيوع / ٨٨ .

[2] المغني لابن قدامة ٥/ ٢٣٣ .

٤-هەڵوەشانەوەی خواستن لە لێخوازراو یان خواستیار یان بە ڕێکەوتن.

٥-سەرپێچی خواستیار بۆ مەرجەکانی لێخوازراو.

**هەڵوێستی یاسا:**

به شێوەیەکی گشتی یاسای مەدەنی وڵاتە عەرەبییەکان لە پێناسە و توخمەکان و حوکمەکانی خواستندا لە فیقهی ئیسلامی دەرناچن، سەرەڕای جیاوازی ئەو یاسایانە لە نێوان خۆیاندا لەوەی باسمان کرد وەك لەم ڕۆشنکردنەوەیەدا.

ئەم یاسایانە لە دیاریکردنی سروشتی خواستندا جیاوازییان هەیە, هەیان بە "بەموڵککردن" چۆناندنی بۆ کردووە وەك یاسای ئوردەنی(م/٧٦٠)(خواستن بریتییە لە بەموڵککردنی سوودئامێزی شتێك بۆ کەسێك بەبێ بریتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان بۆ مەرامێکی تایبەت لەسەر ئەوەی دوای بەکارهێنانان بیگێڕێتەوە)، هەیانە چۆناندنی بۆ کردووە بە موباحدانانی وەك یاسای یەمەنی(م/٩٦٥)(خواستن بریتییە لە موباحکردنی خوازراو لەڕووی بەموڵکردنی سوودئامێزێکەوە بۆ خواستیاری شتەکە بەبێ بریتی و بۆ ماوەیەك لە کات یان بۆ کارێکی دیاریکراو).

هەیانە پێناسەکەی ڕەهاکردووە و دەستی بۆ سروشتی خواستن نەبردووە وەك یاسای عێراقی(م/٨٧٤) و میسری(/٦٣٥ و لیبی/٦٣٤ و سوری/٦٠٢ و تونسی/١٥٥ و موێتی/٦٤٩ و مەراکشی/٨٣٠.

هەیانەدەستبەسەرداگرتنی نەکردووە بە تەواویی گرێبەستەکە، وەك یاسای عێراقی م/٨٤٧ و ئوردەنی/٧٦١، زۆربەی ئەم یاسایانە دەستبەسەرداگرتنیان نەکردووە بە مەرج، بەڵکو تەنها گرێبەستیان بە پێویست زانیوە بۆ رادەستکردن و تەواوی حوکمەکانی تری تایبەت بە لێخوازراو و خواستیار[1].

---

[1] كما يأتي التزامات المعير.

**ئەو پابەندبوونانەی کە لەسەر خواستن سەرهەڵدەدەن لە یاسادا:**

**أ.لە پابەندبوونەکانی لێخوازراو:**

١–دەسەڵات بە خواستیار بدات سوود لە خوازراوەکە ببینێت، یاسای عێراقی(م/٨٤٨) و کوێتی/٦٣٥ و میسری/٦٣٦ و لیبی/٦٣٥ و سوری/٦٠٣ و پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی نوێ/٧٩٦.

شایانی باسە لێخوازراو تەنها بە گرێبەست پابەند دەبێت بە رادەستکردنی خوازراوەکەوە بۆ خواستیارەکە، گەر بە ویستی خۆی رادەستی نەکرد ناچار دەکرێت لەسەری[1].

٢–گێڕانەوەی خەرجییە پێویستییەکان کە خواستیار بۆ پارێزگاری لە خوازراوەکە خەرجی کردووە، یاسای عێراقی/٨٤٩ و کوێتی/٦٥١ و میسری/٦٣٧ و لیبی/٦٣٦ و لبنانی/٧٤٩ و پرۆژە یاسای عێراقی/٧٩٧.

٣–دەستەبەری لەسەر لێخوازراو نییە گەر دەرکەوت خوازراو بە کرێدراوە گەر بە ئەنقەست هۆی بەکرێدانەکەی نەشاردبێتەوە، یان نەنگی شاراوەی تێدا نەبێت گەر شاردنەوەی نەنگییەکە بە ئەنقەست نەبوو، یاسای عێراقی/٨٥٠، ئوردەنی/٧٦٨(تێگەیشتنی پێچەوانە دەستەبەر دەکرێت گەر بە ئەنقەست هۆی حەق وەرگرتن لەسەری یان نەنگی شاردەوە)، هەروەها کوێتی/٦٥٢ و میسری/٦٣٨ و لیبی/٦٣٧ و سوری/٦٠٤ و پرۆژە یاسای عێراقی/٧٩٨.

---

[1] في المذكرة الإيضاحية نقلا عن أنور طلبة: التعليق على نصوص القانون المدني/ ٢ / ٧ ئەم مادەیە دوو پابەندبوون بەسەر لێخوازراودا دەسەپێنێت:

یەکەم–پابەندبوون بە رادەستکردنی شتەکە بۆ خواستیارەکە، گەر بە هەڵبژاردەی خۆی لێخوازراو پێی هەڵنەستا ئەوا لەسەری ناچار دەکرێت گەر وەفاکردن بە خودی شتەکە گونجاو بوو، ئەگەر نە بە قەرەبوو حوکم بەسەریدا دەکرێت.

دووەم–پابەندبوون بە وازهێنان لە شتە خوازراوەکە بەدرێژای ئەو ماوە دیاریکراوە لە گرێبەستەکە، گرێبەستەکە بڕیار دەدات بەسەریدا شتەکە نەگێڕێتەوە بەر لە کاتی لەسەر رێکەوتوو، هەروەها خواستیار لە بەکارهێنانیدا دەستدرێژی نەکاتە سەر شتەکە.

٤-بەر لە تەواوبوونی کاتی خواستنی ماوە بۆدیاریکراو بە کاتێکی دیاریکراو گەر خوازراو گەڕێنرایەوە ئەوا قەرەبووکردنەوەی زیانەکەی لەسەرە کە بەرهەمی ئەوە تووشی خواستیارەکە بووە، یاسای عێراقی/٨٤٨، و ئوردەنی/٧٦٩و میسری/٦٣٦ و لیبی/٦٣٥ و سوری/٦٠٣.

شایانی باسە دەستەبەری لەسەر لێخوازراو نییە لەو شێوە باسکراوەدا بەپێی یاسای یەمەنی/٩٧٩.

**ب-لە پابەندبوونەکانی خواستیار:**

١- گەر لێخوازراو شوێن و کات و جۆری سوودلێبینینی دیاریکرد لەسەر خواستیار پێویستە پابەندی ئەوانە ببێت، یاسای عێراقی/٨٥١، یەمەنی/٩٧٥، کوێتی/٦٥٣، میسری/٦٣٩، لیبی/٦٣٨، سوری/٦٠٥، لبنانی/٧٣٥، تونسی/١٠٦٢، مەراکشی/٨٣٧، پرۆژە یاسای عێراقی/٧٩٩.

٢- لەباری پابەند نەبوونی بەوەی باسکرا خۆی ڕیووبەڕووی دەستەبەرکردن دەکاتەوە.

٣- گەر چۆنێتی سوودلێبینین ڕەها کرا خواستیار پابەند دەبێت بەوەی کە سنووری عورف تێنەپەڕێنێت، یاسای عێراقی/٨٥٢.

٤- خواستیار مافی ئەوەی نییە سوودبینین بۆ کەسانی تر بگوێزێتەوە مەگەر بە مۆڵەتی لێخوازراو، یاسای عێراقی/٨٥٥، ئوردەنی/٧٧٤، کوێتی/٦٥٤.

٥- لەسەر خواستیار پێویستە گرنگی بدات بە پارێزگاریکردنی خواستنەکە، وەك چۆن هەوڵی پارێزگاری لەسەر ماڵی خۆی دەدات، عێراقی/٨٥٨، میسری/٦٤١، سوری/٦٠٧، لبنانی/٧٣٤.

٦- کە ماوەی خواستن تەواو بوو لەسەر خواستیارەکە پێویستە بەبێ دواخستن بیگێڕێتەوە، گەر پاساوێك بوونی نەبوو، ئەگەر نە، دەستەبەرکردنی تیاچوونی لەسەرە، عێراقی/٨٦٠، ئوردەنی٧٧٨، کوێتی/ ٦٥٧، میسری/٦٤٢، لیبی/٦٤١، سوری/٦٠٨، لبنانی/٧٤٠، مەراکشی/٨٤٤.

٧- لەسەر خواستیار پێویستە خەرجی پارێزگاری لـە خوازراوەکـە و گێڕانـەوەی لەئەستۆ بگرێت، عێراقـی/٨٥٦، ئـوردەنی/٧٧٠، یەمـەنی/٩٨٠، کـوێتی/٦٥٥، پرۆژە یاسای عێراقی/٨١٠.

**کۆتاهاتنی خواستن:**

بە یەکێك لەم هۆیانە خواستن کۆتایی پێ دێت:

١-تەواوبوونی ماوەی لەسـەر رێکـەوتوو یـان لێبـینی سـوودی تـەواو کـە جێگـەی خواسـتنەکەیە. عێراقـی/٨٦١، ئـوردەنی/٧٧٧، یـەمانی/٩٨٧، کـوێتی/٦٥٨، میسری/٦٤٣، لیبی/٦٤٢، سوری/٦٠٩، لوبنانی/٧٤٠.

٢-تەنها بە مردنی خواستیار لـە هەنـدێ یاسـادا، وەك عێراقـی/٨٦٣، کـوێتی/٦٦٠، میسری/٦٤٥، لیبی/٦٤٤، یان بە مردنـی هەریـەك لـە خواسـتیار و لێخـوازراو لـە هەندێ یاسای تردا، وەك ئوردەنی/٧٧٦، یەمەنی/٩٨٧.

٣-بە گێڕانەوەی خواستنەکە لەم بارانەدا:

أ.گەر پێویستییەکی بەپەلە بۆ شتەکە بۆ لێخوازراو هاتە پێشەوە و پێشبینیکراو نەبوو.

ب-گەر خواستیار خراپ بـەکاری دەهێنـا یـان کەمتـەرخـەم بـوو لـە پاراسـتنی خوازراوەکە.

ج-گەر تەنگەژەی بۆ خواستیار دروست دەکرد یان پـێش خواسـتنەکە دژواری پێـوە دەردەکـەوت و لێخوازراوەکـە پێـی نـەدەزانی، عێراقـی/٨٦٢، ئوردەنی٦٥٩، میسری٦٤٤، لیبی/٦٤٣، سوری/٦١٠، لوبنانی/٧٤٢.

**ئەنجامگیری:**

لەو خستنەڕووەوە بۆ رای فەقیهانی شـەریعەتی ئیسـلام و ئاراسـتەکانی یاسـا لـە وڵاتـانی عـەرەبی لەگـەڵ بـە هەنـدوەرگرتنی واقیعـی کـرداری لـە ژیـانی کرداریـدا ئەنجامگیری ئەمانە دەکەین:

١- خواستن پەسەندە بەڵکو زۆرجار واجبە بەپێی توانای لێخوازراو و پێویستی خواستیار، وەڵامدانەوەی ئاتاجان بە پێشکەش کردنی یارمەتی مادی لە ڕێگەی خواستنەوە پێویستە، بەتایبەت لەنێوان موسڵماناندا، زۆر تایبەتتر لە نێوان خزم و جیران و دۆستاندا، چونکە هاوکاری و دەستدانە دەستی یەکتر و هاریکاری و کۆمەك لەناو خەڵکیدا لە مەرامەکانی شەریعەتی ئیسلامن.

٢- خواستنی گوازراوەکان لە نێوان جیران و خزم و دۆستان و ناسراواندا بریتی نییە لە گرێبەست، بەڵکو بریتییە لە موباحکردنی سوودی ماڵی خوازراو پاشان گەڕاندنەوەی خوازراوەکە دوای تەواوبوونی پێویستییەکە، وەك ئەو خواردنە وایە کە پێشکەش بە میوانان دەکرێت، ئەوان بۆ خۆیان سوود لە خواردنەکە وەردەگرن، بەڵام هەڵسوکەوتیان نییە لە خواردنەکەدا و بۆیان نییە سوودەکەی بۆ کەسێکی تر بگوێزنەوە، بەبێ مۆڵەتی خاوەنی خواردنەکە، بۆیە میوان تەنها ماف سوود لێبینینی بۆ خۆی هەیە نەك ماف سوودئامێزەکە، وەك سوودبینین لە ماڵی گشتی ئەوە موباحە بۆ ئەو کەسەی کە شایستەیەتی، بەڵام ناتوانێ هەڵسوکەوتی تێدا بکات.

٣- خواستنی زەویوزار بە مەبەستی کشتوکاڵ یان بینا یان چاندن وەك گرێبەستی هاتوو وایە بەسەر سوودئامێزدا بەبێ بریتیدان، و حوکمەکانی هەموو گرێبەستەکانی هاتوو بەسەر سوودئامێزدا بەبێ بەرانبەر بەسەریدا تێدەپەڕێنرێت و پابەندبوونەکانی دوو گرێبەستکارەکەی لەسەر پەیدا دەبێت، لە پێش هەموویانەوە دروست نەبوونی هەستانی هەر یەك لەو دوانە بە کارێك کە زیان بەویتر بگەیەنێت لە ڕێگەی خواستنەوە.

٤- گەر خواستن بە گرێبەست دابنرێت ئەوا بریتییە لە بەموڵککردنی سوودئامێز و لێخوازراو-لەڕووی ئایینەوە، نەك لەڕووی قەزاوە- پابەند دەبێت بەرادەستکردنی خوازراوەکە بۆ خواستیارەکە و پێدانی دەسەڵات بۆ سوودبینین لێی و دەست بۆ نەبردنی لە کاتی سوودلێبینیدا و نەگێڕانەوەی خوازراوەکە

پێش ماوەی دیاریکراو، مەگەر لە باری پێویستی زۆر بە خوازراوەکە یان خراپ بەکارهێنانی لەلایەن خواستیارەکەوە، چونکە بەڵێن(یان پەیمان) لەسەر بەڵێندەر پابەندبوون بە وەفاکردن بە بەڵێنی خۆی پێویست دەکات، خودا- سبحانە وتعالى- دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾.

٥- خواستن گرێبەستی بەرچاو نییە، بەڵکو گرێبەستێکی رازیبوونییە لە خانووبەرە و زەوی زار و موباحکردنی سوودئامێز لە گوازراوەکاندا.

٦- دەستی خواستیار لەسەر شتەکە دەستی ئەمانەتە، بۆیە خواستیار دەستەبەرکەر نییە مەگەر لەباری دەستدرێژیکردن و کەمتەرخەمیدا یەکسانە خواستنەکە گرێبەست بێت یان موباحکردن بێت.

٧- گرێبەستی خواستن لەم سەردەمەدا گرنگییەکەی کەم بووەتەوە دوای ئەوەی ژیانی ئابووری گەشە و گۆڕانی بەخۆوە بینی، و ئەنگێزەی مادیانە زاڵ بوو بەسەر ئەنگێزەی مەعنەوی(رۆحی)یانەدا، وای لێهات زۆربەی خەڵکی تەنها بیر لە گرفتە ئابوورییە تایبەتەکانی خۆیان دەکەنەوە، بۆیە هەر کەس پارچە زەوییەکی هەبێت بۆ چاندن یان بینا یان کشتوکاڵ گونجاو بێت خۆی بەرهەمی دەهێنێت یان بە کرێ دەیدات بە کەسێك بەرانبەر بە بریتییەك، بۆیە زۆر کەم دەبینن کەسێك بوونی هەبێت سوود و قازانجەکەی بدات بە یەکێکی تر با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت.

٨- بەم دوور و درێژییە لە ئەنجامگیری دەتوانرێ را لەیەکتر جیاوازەکان لە خواستندا کۆبکرێنەوە وەك ئەوەی کە بەموڵککردنی سوودئامێزە لە خانووبەرە و موباحکردنییەتی لە گوازراوەدا.

## چوارەم: گرێبەستی قەرز:

قەرز هەندێ جار بۆ گرێبەست بەکاردەهێنرێت و هەندێ جاریش بۆ ماڵی قەرزکراو، فەقیهەکان لە پێناسەکردنی شەرعییانەیدا جیاوازیان لە نێواندا هەیە لەو

رووەوە کە بە مانای بەموڵککردنی شتێکە بەرانبەر گێڕانەوەی هاوتاکەی بەپەهایی، جا جێگەکەی ماڵێکی هاونموونە(مال مثلي) بێت یان بەهایی(قیمي) یاخود بەموڵککردنی شتێکی هاونموونەییە بەرانبەر گێڕانەوەی هاونموونەکەی، هەرکەس لەسەر یەکەمیانە پێناسەی دەکات بەوەی بەموڵککردنی شتێکە بەرانبەر گێڕانەوەی هاوتاکەی، سنوورداری نەکردووە بەوەی هاونموونە بێت، هەر کەس لەسەر دووەمیانە دەڵێت بریتییە لە بەموڵککردنی شتێك بەگێڕانەوەی نموونەی ئەوە.

جمهوری فەقیهان لەسەر ئاراستەی یەکەمن، بۆیە ڕێگەیان بە قەرز داوە لە هاونموونەکان و بەهادارەکاندا[1].

---

[1] في تحفة المحتاج ٥/٣٦ (بریتییە لە بەموڵککردنی شتێك بە گێڕانەوەی هاوتاکەی) هەروەها تیایدا هاتووە: ٥/٤١: (دروستە قەرزکردنی هەر شتێك تیایدا جۆرەکەی رادەستبکرێتەوە) هەروەها تیایدا: ٥/٤٤ (لە ماڵە بەهادارەکاندا پێویست گێڕانەوەی هاونموونەکەیەتی لەڕووی شێوەوە)
في الروضة البهية واللمعة ٣٤٢/١ (ئەو قەرزەی بەشەکانی لە بەها و سووددا یەکسانن و سیفەتەکانی نزیکن لە یەکتر وەك دانەوێڵە و ڕۆن لە ئەستۆدا هاونموونەکەی جێگیر دەبێت، ئەوەش بەشەکانی یەکسان نین لەوەی باسکرا بەهایەکەی جێگیر دەکرێت لە کاتی دەستبەسەرداگرتندا چونکە کاتی بە موڵککردنەکەیە)
في شرح الخرشي ٥/ ٢٢٩ (قەرز لەڕووی شەرعەوە بریتییە لە پێدان لەلایەن خاوەن ماڵەوە سەرپێچی شەرعی تێدا نەبێت لە بریتییەك بەڵکو تەنها بۆ فەزڵ و چاکە، تەنها قەرزی ئەوانەی رادەست دەکرێن دروستە، هەموو ئەوەی رادەست دەکرێت دروستە وەك شمەك و گیانداران، هەر شتێك رادەست کردنی دروست نییە قەرزکردنی دروست نییە وەك خانووبەرە و خۆڵی کانزاکان و موجەوهەراتە بەنرخەکان)
في المغني ٤/ ٣٥٠ (هەر شتێك لە ئەستۆدا جێگیر بوو قەرزکردنی دروستە بەڕادەست کردن جگە لە مرۆڤ...چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وشترێکی گەنجی قەرز کرد لەگەڵ ئەوەش ناپێورێت و ناکێشرێت) هەروەها تیایدا هاتووە: ٤/ ٣٥٢ (پابەندبوونەکانی قەرزکەر گێڕانەوەی نموونەکەیەتی لە پێوراوەکان و کێشراوەکاندا و جگە لە دوانەش دوو ڕوویان هەیە: یەکەمیان: پێویستە بەهاکەی ڕۆژی قەرزکردنەکە بگێڕێتەوە چونکە هاونموونەی نییە بۆیە بە بەهاکەی دەستەبەری دەکات وەك باری تیابردن و داگیرکردن، دووەم: پێویستە هاونموونەی لەڕووی شێوەوە بگێڕێتەوە چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وشترێکی گەنجی قەرزکرد و هاوشێوەی ئەوەی گێڕایەوە)

حەنەفییەکان دەڵێن قەرز تەنها لە هاونموونەکاندا(کێشراوەکان و پێوراوەکان و ژمێرراوەکان و چێنراوەکان) دروستە، بۆیە دەڵێن: قەرز ئەوەیە کەسێك شتێکی زانراو لە بەرجەستە هاونموونەکان کە تیادەبرێت بدات بە کەسێکی تر بۆ سوودلێبینینی تاکو نموونەی ئەوە بگێڕێتەوە[1].

یاسا مەدەنییەکان لە وڵاتە عەرەبییەکاندا–بە هەڵواردەی یاسای یەمەنی– مەزهەبی "ئەبی حەنیفە"یان وەرگرتووە، لەوەی قەرز تەنها لە هاونموونەکاندا دروستە، بۆیە ئەو یاسایانە قەرزیان پێناسە کردووە بەوەی بەموڵککردنی ماڵێکی هاونموونەیە بۆ کەسێکی تر بەجۆرێك نموونەی ئەوە لەڕووی بڕ و جۆر و سیفەتەوە بگێڕێتەوە بۆ قەرزدەرەکە لە کۆتایی ماوەی قەرزەکەدا، یاسای عێراقی م/٦٨٤، ئوردەنی م/٦٣٦، کوێتی م/٥٤٣، میسری م/٥٣٨، سوری م/٥٠٦، لیبی م م/٥٢٧، لوبنانی م/٧٥٤.

یاسای یەمەنی[2] رای جمهوری فەقیهانی شەریعەتی ئیسلامی وەرگرتووە، رێگەی قەرزی داوە لە هاونموونە و بەهادارەکاندا، بۆیە مادەی(م/٦١٢) دەڵێت: قەرز بریتییە لە پێدانی ماڵێکی هاونموونەیی یان بەهاداری بێگیان یان گیاندار بە قەرزکەر بە مەرجێ تاکەکانیان بە جیاوازییەکی گەورە لەیەکتر جیاواز نەبن ببێتە هۆی جیاوازی بەهایەکەی، وەك گیانداران، بە پێچەوانەی خانوو و زەویوزار و خشڵ و موجەوهەرات کە بەهایان جیاواز دەبێت، بۆیە بە قەرزدانیان دروست نییە و لەسەر قەرزکەر

---

[1] مرشد الحيران (م/ ٦٨٦). وفي الدر المختار ٥/١٦١ (قەرز ئەوەی لە هاونموونەکان دەدرێت بۆ ئەوەی وەریبگریتەوە، قەرز لە هاونموونەدا دروستە چونکە ناتوانرێت سوودی لێ ببینرێت بە تیابردنی خودی شتەکە، بۆیە هاونموونە لە ئەستۆگریدا پێویست دەکات ئەمە بەسەر جگە لە هاونموونەدا نایەت پێوانەکراو و کێشانەکراو و ژمێرراو و بەیەکتر نزیك وەك گێزەر و هێلکە، لە جگە لە هاونموونەکاندا دروست نییە لە بەهادارەکان چونکە قەرز لە سەرەتاوە خواستنە و لە کۆتاییدا بریتیدانە)

[2] رقم ١٩ لسنة ١٩٩٢ .

پێویست دەبێت بریتییەکی هاونموونە بگێڕێتەوە بۆ قەرزدەر کە پەیوەست بووە بە ئەستۆگری قەرزکەرەکەوە.

تێبینی دەکرێت ئەم مادەیە ناواخن و درێژکردنەوەیەکی زۆری تێدایە وەك چۆن دژایەتییەکی ڕۆشن لەخۆ دەگرێت لەنێوان وتنی دروستی قەرز لە بەهادارەکان لەگەڵ بەمەرجگرتنی نەبوونی جیاوازی تاکەکانی ماڵی قەرزدەر بە جیاوازییەك بەهایەکە پێی جیاواز بێت، چونکە ئەو پێوەرە تەنها لە هاونموونەکاندا دابین دەبێت.

**بەڵگەی ڕەوایەتی قەرز:**

قەرز گرێبەستێکی ڕەوا و هەڵسوکەوتێکی پەسەندە لە قورئان و سوننەت و ئیجماع و ماقووڵدا.

**أ.قورئان:**

بە قەرزدان بەبێ سوود و ڕاکێشانی قازانج بۆ قەرزدەرەکە لە دەروازەی هاوکارییە لە چاکەدا و قورئان فەرمانی پێکردووە بە شێوەیەکی پابەندکردن وەك دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1].

**ب-سوننەتی پێغەمبەر:**

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وشترێکی گەنجی قەرز کرد، دواتر وشتری صەدەقەی بۆ هات، "أبو رافع" دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردم وشترێکی گەنج بۆ ئەو پیاوە بگێڕمەوە، وتم: هیچ وشترێکم لەناو وشترەکاندا نەبینییەوە جگە لە وشترێکی هەڵبژاردە کە چوار دانی کەوتبوو، فەرمووی: پێی بدە، چونکە باشترینی خەڵکی ئەوەیانە بە باشترین شێوە قەرز دەگێڕنەوە[2].

---

[1] المائدة/ ٢ .

[2] الموطأ بشرح المنتقى ٥/ ٩٦ .

شایانی باسە ئەوانەی قەرز بە دروست دەبینن لە بەهادارەکاندا بەلگەیان بەم فەرموودەیە هێناوەتەوە[1]، بەلاَم تایبەت بە ئێمە هیچ بەلگەیەکی تێدا نابینینەوە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە ئەنگێزەی مادیانە زاڵ بووە بەسەر ئەنگێزەی مەعنەوی(رۆحی)دا، چونکە پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) وشترێکی چوار دانکەوتووی گێڕایەوە لە جێگەی بەچکە وشترێك، ئەهلی ئەم سەردەمە کاتێك وشترێکی هەڵبژاردە قەرز دەکەن بەچکە وشترێك دەگێڕنەوە، پاشانیش قەرز لە بەهادارەکاندا سەردەکێشێت بۆ خراپەی ناکۆکی و دوژمنایەتی و راستبوونەوەی کێبەرکێ و ململانێ لە نێوان قەرزدەر و قەرزکەردا یان لە نێوان میراتگرانیاندا لە دیاریکردنی ئەوەی پێویستە لە گێڕانەوەی بەهاداردا، ئەوەی رۆشنە هەر پرۆژەیەك سەربکێشێت بۆ خراپە و تێکچوون یان بۆ زیان پێویستە دەرگای لێ دابخرێت.

**ج-ئیجماع:**

فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام لە سەرەتای ئیسلامەوە تاکو ئەمڕۆ کۆدەنگیان هەیە لەسەر رەوایەتی قەرز، چونکە لە دەروازەی هاوکاری و هاریکاریە لەسەر چاکە و دەستگرتنی یەکتر و کۆمەکی کردنە.

**د-ماقوول:**

ژیری تەندروست بڕیار لە رەوایەتی قەرز دەدات، چونکە لە خودی خۆیدا هەڵسوکەوتێکی باشە، تەنانەت ئەوە جێگیر بووە پاداشتی قەرز لە پاداشتی صەدەقە زۆرترە، چونکە کەسی قەرزکەر تەنها لەباری پێویستی زۆردا قەرز دەکات، بەلاَم لەوانەیە برێك لە صەدەقە یان بەخشینێك بە کەسێك بدات لە کاتێکدا کەسەکە پێویستی پێی نەبێت وەك پێویستی کەسی قەرزکەر.

---

[1] في المغني ٤/ ٣٥٠ (هەر شتێك لە ئەستۆگریدا جێگیر ببێت قەرزکردنی بەڕادەست کرد دروستە، چونکە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وشترێکی گەنجی قەرزکرد لەگەڵ ئەوەی نە کێشراوە و نە پێوراو)

**توخمەکانی قەرز:**

توخمەکانی شتێك ئەوانەن ئەو شتەیان لەسەر دەوەستێت جا بەشێك بن لە شتەکە یان لە دەرەوەی چییەتی شتەکەوە بن، بۆیە توخمەکان بریتین لە پایەکان و مەرجەکان:

أ.پایەکانی قەرز: سیانن/ قەرزدەر(ئەو کەسەی ماڵەکە دەدات)، قەرزکەر(ئەو کەسەی ماڵەکە وەردەگرێت)، قەرزکراو(ئەو ماڵەی وەردەگیرێت و سوودی لێ دەبینرێت)

ب-مەرجەکانی قەرز: بریتین لە مەرجی پایەکانی، بەم جۆرە:

**یەکەم-مەرجەکانی قەرزدەر:**

١-خاوەنی ئەو ماڵە بێت بە قەرزی دەدات، بۆیە بە قەرزدانی ماڵی خەڵك دروست نییە، کەسی سەرپەرشتیار و وەسێتدار نە دەتوانێت ماڵی ئەو کەسەی لەژێر سەرپەرشتی ئەودایە یان لەژێر وەسێتداری ئەودایە بدات بە قەرز نە دەتوانێ قەرزی بۆ بکات.

٢-کەسەکە شایستە بێت بە بەخشین[1]، چونکە قەرز سەرەتاکەی بەخشینە یان خەڵتەی بەخشینی تێدایە و کۆتاییەکەشی بریتیدانە.

٣-کەسەکە نیێتی باش بێت و لە پشتی قەرزەکەوە مەبەستی راکێشانی سوودێکی نەبێت بۆ خۆی لەسەر گیرفانی قەرزکەرەکە[2].

**دووەم-مەرجەکانی قەرزکەر:**

١- شایستە بێت بە هەڵسوکەوت.

٢- نیێتی باش بێت و سووربێت لەسەر گێڕانەوەی قەرزەکە.

٣- قەرزکردنەکەی بۆ مەرامێکی ناڕەوا نەبێت.

---

[1] في المغني ٤/ ٣٤٨ (قەرز تەنها لە کەسێکەوە دروستە هەڵسوکەوتی ڕێگەپێدرلو بێت)

[2] شرح الخرشي ٥/ ٢٣٣ .

**سێیەم-مەرجەکانی قەرزکراو:**

١- ئامادەگی مامەڵە پێکردنی تێدا بێت، بۆیە دروست نییە شتێك قەرز بکرێت کە لەڕووی شەرعەوە حەرامە.

٢- دەبێت ماڵێکی هاونموونە بێت ئەوەش بۆ دوورخستنەوەی ناکۆکی و دوژمنایەتی، وەك شوێنکەوتنی بە مەزهەبی ئەبی حەنیفە و ئەوانەی لەگەڵ ئەو تەبان، هەروەها بەوەی زۆربەی یاسا دانراوەکان لە جیهانی ئیسلامدا لەسەری جێگیربوون.

٣- کە بڕ و جۆر و سیفەتەکەی رونبکاتەوە.

**حوکمەکانی قەرز:**

حوکمەکانی بریتین لە مافەکان و ئەرکەکانی هەریەك لە قەرزدەر و قەرزکەر، لێرەدا تەنها ئەرکەکان دەخەینە روو، چونکە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە، هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو پابەندبوونێك لەسەر کەسێك مافی کەسێکی تر لە بەرەکەی ترەوە بەرانبەریەتی.

**یەکەم-ئەرکەکانی قەرزدەر:**

١-قەرزدەر تەنها بە گرێبەستەکە پابەند دەبێت بە رادەستکردنی ماڵە قەرزکراوەکە بۆ دەستی کەسی قەرزکەر، چونکە گرێبەستە و پێویستە وەفای پێ بکرێت لەدوای دامەزرانی، گرێبەستەکە پێش رادەستکردنی قەرزەکە دادەمەزرێ گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون.

سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە بریتییە لە قورئان: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[1]

هەروەها پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((بەڵگەی کەسی دووڕوو سێ شتە: کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێك بەڵێن دەدا

---

[1] المائدة/ ١ .

بەڵێنشکێنی لێدەوەشێتەوە، کاتێک ئەمانەتی دەدرێتە دەست ناپاکی لێ دەکات))[1]

راگرتنی گواستنەوەی موڵکداریماڵەکە بۆ کەسی قەرزکەر لەسەر رادەستکردنی مانای دانەمەزرانی گرێبەستەکە نییە، هاوشێوەی ئەمە فرۆشتنی هاونموونەییەکان کە گرێبەستەکەیان دادەمەزرێت لەگەڵ ئەوەش گواستنەوەی موڵکداری شتەکە بۆ کەسی کڕیار لەسەر جیاکردنەوە وەستاوە، فرۆشیار پابەندە بە جیاکردنەوە و گواستنەوەی موڵکداری، فرۆشتنی خانووبەرە لە یاسای میسریدا لە دەرەوەی فەرمانگەی ئاشکراکردن دادەمەزرێت و فرۆشیار پابەند دەبێت بە گواستنەوەی موڵکداری لە رێگەی تۆمارەوە، مافی تاکەکەسی جێگیر لە ئەستۆی قەرزداردا مافێکی راوەستاوە و قەرزدار پابەند دەبێت بە وەفا پێکردنی بە هەڵبژاردەی خۆی، ئەگەر نە، ناچاردەکرێت لەسەری، سەرەڕای ئەوەش کەسی قەرزدەر مافی ئەوەی نییە دەستێوەردان بکات بۆ ئەو مافە تاکەکەسییە پێش دەستبەسەرداگرتنی لە رێگەی قەرزدارەکەوە یان لە رێگەی ئەو کەسەی نوێنەرایەتی ئەو دەکات.

٢- کەسی قەرزدەر پابەند دەبێت بە وەرنەگرتنەوەی قەرزە کات بۆ دیاریکراوەکە بەر لە کۆتاهاتنی ماوەکەی هەروەها داوانەکردنەوەی قەرزی کات بۆ دیارینەکراو گەر زیانی بە قەرزکەر دەگەیاند.

٣- پابەند دەبێت بە پێدانی قەرەبوو هاوتا بەو زیانەی تووشی قەرزکەر دەبێت بەهۆی نەنگییەکی شاراوە لە ماڵەکەیدا گەر پێی دەزانی و لە قەرزکەرەکەی دەشاردەوە.

٤-پابەند دەبێت بەوەی هیچ قازانجێکی مادی لەسەر گیرفانی کەسی قەرزکەر بەدەست نەهێنێت لە رێگەی قەرزەکەیەوە[1]، گەر قەرزکەر زۆرتر یان باشتری

---

[1] فتح الباري (٥٠٧/١٠) حديث رقم (٦٠٩٥)، مختصر صحيح المسلم، (١٠٧/٥٩)، حديث رقم (٢٧)، صحيح سنن النسائي: ٥٠٢١

لە جێگەی قەرزەکەی گێڕایەوە ئەوا بەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) کەوتووە کە دەفەرموێت: ((باشترینی ئێوە ئەو کەسەیە بە باشترین شێوە قەرزەکەی دەگێڕێتەوە))

٥-پابەند دەبێت بە قبوولّ کردنی هاوتای قەرزەکە هەرکات قەرزکەر گێڕایەوە پێش هاتنە بەرەوەی کاتەکەی یان لە شوێنێکی تر جگە لەو شوێنەی قەرزەکەی لێکردووە گەر زیانێك سەرهەڵنەدات تووشی ببێت وەك تالآنکردنی یان پێویستی بە کرێی گواستنەوە و هەلگرتن.

**دووەم- ئەرکەکانی قەرزکەر:**

١- گێڕانەوەی هاونموونەی ماڵی قەرزدەر بە جۆر و بە سیفەت و بە رادە لەدوای کۆتاهاتنی ماوەکە گەر ماوە بۆ دیاریکراو بوو و لەدوای تەواوبوونی پێویستییەکەی و بوونی توانا بۆ گێڕانەوەی گەر قەرزدەر[2] داوای کردەوە، بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم): ((دواخستنی گێڕانەوەی قەرز لەلایەن کەسی دەوڵەمەندەوە ستەمە و ناموسی موباح دەکات و سزای بۆ پێویست دەبێت))[3]

شایانی باسە قەرزی ماوە بۆ دیاریکراو بە مردنی قەرزدەر کاتەکەی تەواو دەبێت هۆی قەرزەکە هەرچییەك بێت، بەپێی ئایەتی: ﴿وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا﴾[4] یان مردنی قەرزدار، هەندێ لە فەقیهان پێیان وایە قەرز بە مردنی

---

[1] المحلى ٨/ ٧٧ (گێڕانەوەی زۆرتر لەوەی وەریگرتووە حەڵاڵ نییە ئەوە سووە و هەڵوەشاوەتەوە، گەر خۆبەخشانە لە کاتی گێڕانەوەدا ویستی زیاتر لەوەی وەریگرتووە بدات یان باشتر لەوە کارێکی پەسەند و شیاوە)

قارن المغني ٥/ ٣٥٧ . الروضة البهية واللمعة الدمشقية ١/ ٣٤٢ .

[2] المحلى ٨/ ٨٥ .

[3] مختصر صحيح المسلم، (١٥٦٤/٣٣).

[4] الأنعام/ ١٦٤ .

قەرزدار ماوەکەی تەولو دەبێت نەك بە مردنی قەرزدەر[1].

٢- قەرزکەر پابەند دەبێت بە تێچوونی گێڕانەوە گەر پێویستی بە تێچوون هەبێت، گەر ڕێکەوتن پێچەوانەی ئەوە بوونی نەبێت[2].

٣- پابەند دەبێت بە گێڕانەوەی شتە قەرزکراوەکە گەر مایەپووچ بوو، شتەکە مابێتەوە لە بندەستیدا و تیانەچووبێت، پێوانە لەسەر فرۆشتن گەر کڕیار مایەپووچ بوو دەبێ فرۆشراوەکە بگێڕێتەوە گەر مابێتەوە و نرخەکەی نەدابێت.

٤- پابەند دەبێت بە دانی دەستەبەری دارایی یان تاکەکەسی بۆ دەستەبەرکردنی قەرزەکە کە لە قەرزکردنەوە سەریهەڵداوە گەر قەرزدەر داوای کرد و لە گرێبەستەکەدا بە مەرجیگرتبوو.

٥- پابەند دەبێت بە پێدانی قەواڵەی قەرزەکە[3] بە قەرزکەرەکە گەر قەرزەکە ماوە بۆ دیاریکراو بوو، بەپێی ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ...﴾[4].

گرێبەستی قەرز بە ڕادەستکردنی ماڵی قەرزکرلو بۆ قەرزکەرەکە یان بۆ کەسێ کە نوێنەرایەتی ئەو دەکات تەواو دەبێت، گەر شتە قەرزکراوەکە تیاچوو لەدوای گرێبەستەکە و پێش دەستبەسەرداگرتنی تیاچوونەکە ئەوا لەسەر قەرزکەرە.

---

[1] الروضة واللمعة ١/ ٣٤٣ .

[2] تحفة المحتاج ٥/ ٤٦ .

[3] في المحلى ٨/ ٨٠ (گەر قەرزەکە ماوە بۆ دیاریکرلو بوو ئەوا لەسەر هەردووکیان(قەرزکەر و قەرزدەر) پێویستە بینووسن و دوو شایەتی دادپەروەری و باشتریش لەسەر بگرن یاخود پیاوێك و دوو ژن دادپەروەرین و باشتریش، گەر ئەو کارە لە سەفەردا بوو و نووسەرێکیان نەبینییەوە ئەوا قەرزدەر سەرپشك دەکرێت لەسەر وەرگرتنی بارمتە یان وەرنەگرتنی، لە قەرزی دەمودەستدا نە لە سەفەر و نە لە باری نیشتەجێبووندا هەموو ئەوانە پێویست ناکات، بەلگەی ئەوە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ...﴾).

[4] سورة البقرة/ ٢٨٢ .

**کاریگەری گۆڕانی هێزی کڕین بۆ پارە لەسەر وەفاکردن پێی:**

کەسی مەعنەوی وەك کەسی سروشتی وایە بە رەوشـە هـەلوواردەیی و نـاوەکی و دەرەکییەکان کاریگـەر دەبێـت، ئـەو رەوشـەش کاردەکاتـە سـەر هێـزی کـڕین بـۆ پارەکەی، گەر ئەو هێزە بەرزبوویەوە یان نزم بوویەوە ئایا وەفـاکردن دەکرێـت بـە هەمان بڕ(ژمارەی قەرزکراوەکە)؟

بۆ رۆشنکردنەوە: گەر کەسێك هەزار دینار قەرز بکـات لـە کاتێکدا کـە ئـەو بـڕە پارەیە پەنجا مسقالێ لە ئالتوون بکات، لە کاتی گێڕانەوەی قەرزەکەدا هەزار دینارەکە یەکسان بێت بە یەك مسقالێ ئالتوون یان کارەکە بە پێچەوانەی ئەوەوە بوو، ئایـا لـە هـەردوو بارەکـەدا کەسـی قەرزکـەر هـەمان بـڕە پـارەی قەرزکراو(هـەزار دینـار) دەگێڕێتەوە یان پێویستە ئەو گۆڕانە لە هێزی کڕیندا بۆ پـارە قەرزکراوەکـە بەهەنـد وەربگیرێت و یەکسان بەو پارە قەرزکراوە لە هێزی کڕین بگێڕێتەوە نەك تەنها لەڕووی ژمارەوە؟

هەنـدێ لـە فـەقیهانی پێشـین وەڵامـی ئـەم پرسـیارەیان داوەتـەوە و لـەم سەردەمەشدا هەندێ لە زانایان قسەیان لەسەر کردووە بەوەی کەسی قەرزکەر هەمان بڕ(هـەمان ژمـارە) دەگێڕێتـەوە بـە چاوداخسـتن لـە گـۆڕان لـە هێـزی کـڕینی پـارە قەرزکراوەکەدا بەرزبوونـەوە یـان دابـەزین، گـەورەترین بەڵگـەیان ئـەو فـەرموودەی پێغەمبەری خودایە(صـلی الله علیـە وسـلم)((ئـەوەی وەرگـیراوە لەسـەر دەسـتە تـا دەیگێڕێتەوە))[1].

هەنـدێکی تـر پێیـان وایـە دەبێـت هاوتـای بـەهای بـڕە پارەکـە لـە کـاتی دەستبەسەرداگرتندا یان لە دوایین رۆژی بایەخیدا(رەواجیدا) بگێڕێتەوە.

---

[1] رواه أبو داود في البيوع/ ٨٨ .

**بە بۆچوونی ئێمە لەم بابەتەدا پێویستە بچین بۆ ئەم درێژەپێدانە:**

ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەوەیە پارە لـە هاونموونەییەکانـە، زانایـانی موسـڵمان لـە ئوسوڵییەکان و فەقیهەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هاوتای نموونەیی بریتییە لە نموونەکەی، گەر نموونەکە نەشیاو بوو ئەوا دەچێت بۆ بەهایەکەی، هەر بەو جۆرە کۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی کە نموونەی شتێك ئەوەیە پێی یەکسانە لە شێوە و لە مانادا، مەبەستیش لە مانا لەم جێگەیەدا بریتییە لە بەها، بـەهاش بـە سـوودئامێز دەخەملێنرێت، بۆیە پابەندبوونی قەرزداریان دابەش کردووە بۆ پێهەستان و دانەوەی قەرزەکە[1]، پێهەستان بریتییە لە رادەستکردنی هەمان پێویست(واتە خودی شتەکە) بۆ خاوەن مافەکەی، دانەوەش گێڕانەوە یان رادەستکردنی نموونەی پێویستەکە یان بەهایەکەی، هەر بەو جۆرە هەریەك لە پێهەستان و دانەوەشیان دابەش کـردووە بـۆ تەواو و ناتەواو:

١- **پێهەستانی تەواو:** بریتییە لە رادەسـتکردنی هـەمان پێویسـت(خودی شـتەکە) وەکو پێویست لەڕووی شەرعەوە بەبێ هیچ گۆڕانێـك لـە وەسـف و خودیـدا لـە دوای گرێبەسـتەکە و پـێش رادەسـتکردن وەك رادەسـتکردنی ئۆتۆمـۆبێلی فرۆشراو بۆ کڕیارەکە بەو وەسف و مەرجانـەی لەسـەری رێکـەوتوون لـە کـاتی گرێبەستەکەدا.

٢- **پێهەستانی ناتەواو:** بریتییە لە رادەستکردنی خودی پێویست لەگەڵ دواکەوتنی وەسفێك لە وەسفەکانی یان مەرجێك لە مەرجەکانی کە لەسەری رێکەوتوون لـە گرێبەستەکەدا، وەك رادەست کردنی ئۆتـۆمبێلێکی فرۆشـراوی ناتـەواو بـەهۆی نەنگییەك تیایدا روویداوە لەدوای گرێبەستەکە و پێش دەستبەسەرداگرتن، لـەو بارەدا کڕیار سەرپشك دەکرێت لـە نێـوان قبـووڵ کـردن سـەرەڕای بـوونی ئـەو

---

[1] ينظر التقرير والتحبير على التحرير ٢/ ١٢٧ جمع الجوامع وشرحه مـع حاشـية اللبنـاني ١/ ١١٧ أصـول البزدوي مع الكشف ١/ ١٥٢ . التوضيح على التنقيح ٢/ ٨٧ . أصول السرخسـي ١/ ١٢٤ . أصـول الشاشي ص ٤٢ .

ناتەواوییە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە، گەر نەنگییەکە ئەوەی پێویست دەکرد، بۆی هەیە داوای باربووکردنەوەی ناتەواوییەکەی بۆ بکرێت(ئەوەش بریتییە لە جیاوازی نێوان بەهایەکەی لەباری سەلامەتی فرۆشراوەکە و باری ناتەواوی فرۆشراوەکەدا) گەر گێڕانەوە ئەستەم بوو لە دوای زانست بە نەنگییەکە.

٣-**دانەوەی کامڵ(یان دانەوە بە هاوشێوەی ماقوول)**: ئەوەش بریتییە لە گێڕانەوە یان رادەستکردنەوە هاونموونە لەڕووی شێوە و ماناوە(بەهاوە)[1] بەوەی یەکسان بێت بە هاوتای ئەوەی لە ئەستۆی قەرزداردایە لەڕووی شێوە و بەهاوە، وەك گێڕانەوەی تەنێك لە گەنم لە جێگەی تەنێك لە گەنمی قەرزکراو لە هەمان پۆل(جۆر).

٤-**دانەوەی ناتەولو(یان دانەوە بە هاوشێوەی ناماقوول)**: ئەوەش بریتییە لە گێڕانەوەی هاونموونەی شتەکە لەڕووی ماناوە نەك لەڕووی شێوەوە، وەك ئەو کەسەی کە تەنێك چەڵتووك قەرز دەکات لە جۆرێکی دیاریکراو پاشان ئەو جۆرە لە بازاڕ و لە دەستی خەڵکیدا نامێنێت، بۆیە پێویست دەبێت لەسەر هاوتاکەی لە بەهادا بگێڕێتەوە(بەهای رۆژی دەستبەسەرداگرتنی قەرزەکە).

هەر بەو جۆرە بەڵگەنەویستە بەهای هەر شتێك بە سوودەکەی دیاریدەکرێت، سوودی شتێك یان خودییە و وەرگیراوە لە خودی شتەکە، وەك وزەی خۆراکی خودی کە لە مادەی ماڵدا شاراوەتەوە لە خۆراکەکان یان لابەلاکانی وەرگیراو لە یاسا یان لە هێزی دەسەڵات لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاسایشی و ئارامی و هاوشێوەکانی ئەمانەوە، بینا لەسەر ئەم راستییانە:

أ. گەر ماڵی قەرزکراو لە کەرەستەی خۆراك بوو پاشان لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە نێوان قەرزکردنەکە و کاتی هاتنە بەرەوەی گێڕانەوەی قەرزەکەدا نرخەکەی

---

[1] هاونموونە هەر ماڵێك تاکەکانی بەجۆرێك جیاواز نابن بەهایەکەی پێ جیاواز بێت، بەهاییش هەر ماڵێك تاکەکانی بە جۆرێك جیاواز نابن بەهایەکەی پێ جیاواز ببێت.

بەرز بوویەوە یان نرخەکەی دابەزی ئەوا ئەو بەرزبوونەوە و دابەزینە لەڕووی چەندێتییەوە هیچ ڕۆڵێکی نییە، لەسەر قەرزکەر پێویستە بەکسان بە مالی قەرزکراو بۆ قەرزدەرەکە بگێڕێتەوە لەڕووی چەندێتییەوە با لەڕووی چۆنێتیشەوە جیاوازی بکەوێتە نێوانیانەوە، گەر گەنمی قەرزکراو دە تەن بوو ئەوا لەسەریەتی هەمان بڕ(دە تەن) بگێڕێتەوە، بە چاوداخستن لە بەرزبوونەوە و دابەزینی نرخی گەنم لە بازاڕدا، چونکە سوودەکەی(وزەی خۆراکی) گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و بە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوە کاریگەر نەبووە، وەك ڕۆشنە لەلای هەموو خاوەن ژیرییەکی تەندروست.

ب- گەر مالی قەرزکراو بڕێك لە پارە بوو یەکسانە لە پارەی ولاتی قەرزەکە بێت یان پارەی ولاتێکی تر پاشان هێزی کڕین و فرۆشتنی ئەو پارەیە لە ماوەی نێوان دەستبەسەرداگرتنی قەرزەکە و گێڕانەوەی بەرزبوویەوە یان دابەزی، ئەوا پێویست لەسەر قەرزکەر بریتییە لە دانەوەی ناتەولو واتە بەهای پارەی قەرزکراو نەك چەندێتییەکەی.

با وا دابنێین(أ) لە (ب) هەزار دیناری قەرز کرد و دینارێك لە کاتی دەستبەسەرداگرتندا یەکسان بوو بە یەك مسقالٚ زێڕ، پاشان وای لێهات هەزار دینار هاوتا بوو بە یەك مسقالٚ زێڕ، ئەوا گێڕانەوە بە هەمان بڕە پارە پووچەڵە بەهۆی هاونموونە نەبوون لە نێوان دەستبەسەرداگیراو و پارەی گەڕاوەدا، بەهۆی جیاوازی ماناکەیانەوە(بەهاکەیانەوە).

بەڵکو لەو حاڵەتەدا پێویستە لا بەلای بەهادا بکرێتەوە، لەسەر قەرزکەر پێویستە بەها قەرزکراوەکە لە ڕۆژی دەستبەسەرداگرتندا بگێڕێتەوە، حوکمەکە بە هەمان شێوەیە گەر کارەکە بە پێچەوانەوە بوو.

بۆیە پەند لە باری گۆڕانی هێزی کڕین و فرۆشتندا بە بەهایە لە ڕۆژی دەستبەسەرداگرتندا جا گۆڕانەکە لە بەرزبوونەوەی هێزی کڕین و فرۆشتندا بێت یان لە دابەزینیدا، چونکە ئەو گۆڕانە وەك لەدەستدانی مالی هاونموونە وایە لە بازاڕ و

لەدەستی خەڵکیدا، ئەم گۆڕانە لە دیناری عێراقیدا روویدا لە ساڵانی ١٩٩١ بۆ ١٩٩٥، بە جۆرێك لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٥ەوە پارەی عێراقی دابەزینی گەورەی بەخۆوە بینی، تا وای لێهات نرخی یەك دۆلاری ئەمریکی سێ هەزار دیناری عێراقی بێت، پاشان دیناری عێراقی لە هەمان ساڵدا هێزی پەیدا کردەوە لە کەمترین ماوەدا وای لێهات نرخی یەك دۆلاری ئەمریکی چوارسەد دیناری عێراقی بوو، ئەمەش سەریکێشا بۆ هەژاندنی بازاڕی عێراق و لەوێوە سەرهەڵدانی کێبەرکێ و ناحەزی لەنێوان قەرزدەران و قەرزارەکاندا.

هەندێ لە زانایانی عێراق فتوایان دا کە لەسەر قەرزدار پێویستە هەمان بڕ پارە بۆ خاوەن قەرز بگێڕێتەوەن بەچاوداخستن لە بەرزبوونەوە و دابەزینی هێزی کڕین و فرۆشتنەکەی، پاڵپشت بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)((ئەوەی وەرگیراوە لەسەر دەستە تا دەیگێڕێتەوە))

لەگەڵ ڕێزم بۆ پلە و پایەی زانستی هاوەڵانم لە زانایان ئەوان بە هەڵەداچووبوون لە شرۆڤەکردنی ئەم فەرموودەیەدا، چونکە هاونموونەیی لەباری گۆڕانی هێزی کڕین و فرۆشتندا فەراهەم نەهاتووە، بینا لەسەر ئەوە گەر قەرزدار هەمان بڕە پارە بگێڕێتەوە ئەوا پێچەوانەی فەرموودەکەی پێغەمبەرە(صلی الله علیە وسلم)(ئەوەی وەرگیراوە لەسەر دەستە تا دەیگێڕێتەوە)

هەر بەو جۆرە خاوەنی "المغي"[1] لە فیقهی حەنبەلی بە هەڵەداچووە کاتێك پێوانەی گۆڕانی هێزی کڕین و فرۆشتن لە پارەدا دەکاتە سەر گۆڕانی نرخی کەرەستەی خۆراکی و دەڵێت: (هەرزانبوونی نرخ ڕێگر نییە لە گێڕانەوەی قەرزەکە، یەکسانە نرخەکەی سەرکەوتبێت وەك دە دانق[2] (شەش یەکی درهەمێك) بووبێت بە بیست دانق، یان کەمی کردبێت، چونکە شتێك تیایدا نەگۆڕاوە، بەڵکو تەنها نرخ گۆڕاوە، بۆیە وەك گەنم وایە کاتێك گران یان هەرزان دەبێت)

---

[1] ٤/ ٣٦٠ .

[2] الدانق سدس الدرهم.

ئەم فەقیهە مەزنە تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە جیاوازی نێوان سوودی پارە کە بریتییە لە هێزی کڕین و گۆڕانی بەسەر هاتووە لەگەڵ سوودی گەنم کە بریتییە لە هێزی خۆراکی و بە گۆڕانی نرخەکەی گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە وەك لای هەموو کەسێکی خاوەن ژیری تەندروست ڕۆشنە.

**هەڵوێستی یاسا لە گرێبەستی قەرز:**

١- یاسا مەدەنییە عەرەبییە هاوچەرخەکان لەگەڵ مەزهەبە فیقهییە ئیسلامییەکاندا یان لەگەڵ هەندێکیاندا تەبا و هاودەنگن لە چییەتی قەرز و توخمەکانی و حوکمەکانیدا، هەندێکیان بە ڕاشکاوانە پایەکانی و مەرجەکانی بە دەق هێناوە، وەك یاسای مەدەنی یەمەنی کە دەقی مادەی(٦١٣) بە دەق هاتووە کە پایەکانی قەرز سیانن: قەرزدەر و قەرزکەر و ماڵی قەرزکرلو، هەر بەو جۆرە مادەی(٦١٥) بە دەق هاتووە لەسەر ئەوەی مەرجەکانی قەرز ئەوەیە کە دەبێت کەسەکە شایستەی بەخشین بێت و قەرزەکە لەو شتانەدا بێت کە دەتوانی بیفرۆشیت و بڕەکەی بە پێوانەیەکی زانرلو دیاریکرابێت کێشانە یان پێوانە یان ژمارە یان باڵکاری.

بەڵام ئەم مەرجەی کۆتایی لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەم یاسادا بۆ قەرز لە ماڵی بەهادار دژ بەیەکن، چونکە ئەو پێوەرانە تایبەتن بە ماڵی هاونموونەیی و لە ماڵی بەهاییدا دەستەبەر نابن.

٢- زۆربەی ئەم یاسایانە بە دەق ڕایانگەیاندووە کە قەرزی ڕازیبوون بەپێی ئەوە قەرزدەر پابەند دەبێت بە ڕادەستکردنی ماڵە قەرزکرلوەکە بۆ قەرزکەرەکە تەنها بە گرێبەست، لەو یاسایانە یاسی کوێتیم/٥٤٣، و یاسای میسریم/٥٣٨، و یاسای سوری م/٥٠٦، و یاسای لیبی م/٥٣٧، و یاسای لوبنانی م/٧٥٤، و پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی م/٧٠٦.

٣- یاساکان هاودەنگن لەوەدا قەرزکەر پابەندە بە گێڕانەوەی هاونموونە لەسەر خەرجییەکەی، گەر نموونەی شتەکە گونجاو نەبوو ئەوا مافی قەرزدەرەکە

دەچێت بۆ بەهاكەی لە رۆژی دەستبەسەرداگرتنی قەرزەكەدا، یاسای عێراقی م/٦٨٩، و یاسای ئوردەنی م/٦٤٤، كوێتی م/٥٥١، یەمەنی م/٦١٦، پرۆژە یاسای عێراقی م/ ٧١١ و ٧١٤.

٤- یاساكان هاودەنگن مولكداری ماڵی قەرزدەر تەنها لەدوای دەستبەسەرداگرتن دەگوێزرێتەوە بۆ قەرزكەر، یاسای عێراقی م/٦٨٦، ئوردەنی م/٦٣٧، هەروەها لەسەر ئەوەی گەر ماڵی قەرزدەر لەدوای گرێبەستەكە و پێش دەستبەسەرداگرتن تیاچوو ئەوا لەسەر قەرزكەرەیە گەر قەرزدەرەكە لەوەدا كەمتەرخەم نەبێت، یاسای عێراقی م/٦٧٤، ئوردەنی م/٦٣٧، میسری م/٥٣٩، سوری م/٥٠٧، لیبی م/٥٣٨، پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی م/٧٠٨.

٥- ئەم یاسایانە ئاراستەی هەندێ لە فەقیهە موسڵمانەكانیان وەرگرتووە لەوەدا كە پەند لە گۆڕانی بەهای ماڵی قەرزكرلودا نییە(پارەكە) لە كاتی گێڕانەوەدا، یاسای عێراقی م/٦٨٩، ئوردەنی م/٦٤٤، كوێتی م/٥٥٠، میسری م/١٣٩، سوری م/١٣٥، لیبی م/ ١٣٦.

ئەم ئاراستەیە هەڵەیە و پێچەوانەی دادپەروەرییە كە لە ئامانجەكانی شەریعەتی ئیسلام و سەرجەم شەریعەتە خودابیە پێشوەكان و یاسای دانراوی سەرجەم دەوڵەتانی جیهانە.

بۆیە پێویستە یاسادانەران سەرلەنوێ پێداچوونەوە بەم بابەتەدا بكەن و ئەم یاسایانە هەموار بكەنەوە بە جۆرێك لەگەڵ بەشێك لە بۆچوونی فیقهی ئیسلامیدا تەبابێت كە پێیوایە پارەی قەرزكرلو گەر هێزی كڕین و فرۆشتنەكەی گۆڕانی بەسەردا هات لە ماوەی نێوان دەستبەسەرداگرتن و ماوەی گێڕانەوەی قەرزەكە ئەوا هاونموونەیی لەدەست دەدات، چونكە نموونەی شتێك ئەوەیە كەپێی یەكسان بێت لە وێنە و لە مانادا(بەهادا) و دەگۆڕێت بۆ بەهایی، بۆیە لەسەر قەرزكەر پێویستە بەهایەكەی رۆژی دەستبەسەرداگرتن بگێڕێتەوە.

٦- یاسای وڵاتە عەرەبییەکان لە حوکمی سوودی قەرزی سووئامێز جیاوازیان هەیە، بەم جۆرە:

أ.یاسا کاریگەرەکان بە شەریعەتی ئیسلام لە بابەتی سوودی قەرزدا بەرەهایی ئەو سوودە بە حەرام دادەنێن، بەڵکو هەر سوودێك و هەر مەرجێك قەرزدەر لەپشتی قەرزەکەیەوە بەدەستی دەهێنێت لەو سۆنگەیەوە پووچ و بێبنەمایە، وەك یاسای ئوردەنی م/٦٤٠: (گەر لە گرێبەستی قەرزەکەدا سوودێکی زیادە بەمەرجگیرا بەپێی گرێبەستەکە جگە لە دڵنیاکردنەوەی مافی قەرزدەر ئەوا مەرجەکە دەسڕێتەوە و گرێبەستەکە دروستە)/ یاسای کوێتی م/٥٤٧: (قەرزدان بەبێ قازانجە، هەر مەرجێك بە پێچەوانەی ئەوە بە پووچەڵ دادەنرێت بەبێ دەستێوەردان لە خودی گرێبەستی قەرزەکە، هەر سوودێك قەرزدەر بە مەرجی بگرێت بە حوکمی قازانج دادەنرێت)، یەمەنی م/٦١٤: (دروست نییە قەرز هیچ قازانجێك بۆ قەرزدەر دەستەبەر بکات)

ب-ئەو یاسایانەی کاریگەرن بە فیقهی خۆرئاوایی لەم بابەتەدا رێگەیان بە سوود داوە لە قەرزدا لەو سنوورەی یاسا دیاری دەکات، جێگەی داخە یاسای عێراقی ناسراو بە کاریگەربوونی بە فیقهی ئیسلامی دەبینین یەکێکە لەو یاسایانەی کە لە شەریعەتی ئیسلام و دەستوور دەرچووە، ئەو دەستوورەی دەڵێت: ئایینی فەرمی دەوڵەت ئایینی ئیسلامە.

یاسای میسری ئەم ئاراستە خۆرئاواییەی گرتوتە م/٥٤٢: (لەسەر قەرزکەر پێویستە سوودی لەسەر رێکەوتوو بدات لە کاتی هاتنە بەرەوەی ماوەی گێڕانەوەی قەرزەکەدا، گەر رێکەوتن لەسەر سوود نەبوو ئەوا قەرزەکە بەبێ کرێ دادەنرێت)، یاسای سووریش لەمەدا لەگەڵی تەبایە م/٥١٠ و هەروەها یاسای لیبی م/٥٤١، و عێراقی م/٦٩٢، و پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی م/٧٠٥.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەرووەی پەیوەست بە قەرزەوە ئەنجامگیری ئەمانە دەکەین:

١- قەرز گرێبەستێکی رازیبوونییە تەنها بە رازیبوونی هەردوولا بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن دادەمەزرێت، و پابەندبوون لەسەر قەرزدەر دروست دەکات بەرادەستکردنی ماڵی قەرزکراو(جێگەی قەرزەکە) بۆ قەرزکەر لەگەڵ بەستنی گرێبەستەکەدا گەر رێکەوتن بۆ رادەستکردنی لە کاتێکی دیاریکراوی تردا نەبێت، بەڵام مولکداری ماڵە قەرزکراوەکە ناگوێزرێتەوە بۆ سەر قەرزکەرەکە تا کاتی دەستبەسەرداگرتنی قەرزەکە، هەروەك گرێبەستی فرۆشتن وایە کە جێگەکەی ماڵی هاونموونەیی جیانەکراوەیە و مولکدارییەکەی دوای جیاکردنەوەی بۆ کڕیار دەگوێزرێتەوە.

٢- جێگەی قەرزەکە هەمیشە ماڵێکی هاونموونەییە، چونکە قەرزی بەهایی سەردەکێشێت بۆ ناحەزی و ناکۆکی لە کاتی گێڕانەوەی برییەکەیدا، بەهۆی نەبوونی پێوەرێکی ورد لە کێشانە و پێوانە و ژمارە و مەترەکاری لە ماڵە بەهاییەکاندا.

٣- گەر ماڵی هاونموونە لە بازاڕدا و لە دەستی خەڵکیدا نەما و نەتوانرا وەفا بەو جۆرە ماڵە بکرێت ئەوا رەوانەی بەها دەکرێت، بۆیە پێویستە لەسەر قەرزکەر بەهای رۆژی دەستبەسەرداگرتنی قەرزەکە بگێڕێتەوە بۆ قەرزدەر.

٤- گەر هێزی کڕین و فرۆشتنی پارەی قەرزکراو بەرزبوویەوە یان دابەزی ئەوا هاونموونەیی خۆی لەدەستدەدات و وەردەگەڕێت بۆ ماڵی بەهایی، چونکە نموونەی شتێك ئەوەیە یەکسان بێت پێی لە شێوە و مانا(بەها)دا، کەوابوو لەسەر قەرزکەر پێویستە یەکسان بە بەهاکە(هێزی کڕین و فرۆشتن) بگێڕێتەوە بۆ قەرزدەر بەرانبەر ئەو پارەیەی کاتی دەستبەسەرداگرتن، ئەگەر هەمان بری بۆ گێڕایەوە گەر هێزی کڕین و فرۆشتن لە رۆژی گێڕانەوەکەدا زیاتر بوو ئەوا تەنها بە رازیبوونی دوور لە لێڵی زۆرلێکردنی مادی یان مەعنەوی ئەو دەبێت،

گەر هێزی کڕین و فرۆشتن دابەزی ئەوا لەسەر قەرزکەر پێویستە هاوتای بەهای پارە قەرزکراوەکە لە کاتی دەستبەسەرداگرتن بگێڕێتەوە بۆ قەرزدەر.
گەر هەمان بڕ پارەی بۆ بگوێزێتەوە ئەوا وەفادارییەکەی بە گێڕانەوە دروست نییە، بەڵکو ناتەواوە، گەر رازیبوونی تەواوی خاوەن قەرزی لەسەر نەبێت، رازیبوونێك دوور بێت لە لێڵی زۆرلێکردن.

٥- رەچاوکردنی شێوەگری لە قەرزی ماوە بۆ دیاریکراودا:

هەموو قەرزێکی ماوە بۆ دیاریکراو پێویستە ماوەکەی دیاریکرابێت و لە تۆماردا لای نووسەری داد بە بوونی شایەت تۆمارکرابێت، گەر بڕی پارەکە کەم و بێبایەخ نەبوو، ئەمەش وەك جێبەجێ کردنی ئەم ئایەتە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ...الآية﴾[1].
ئەوەش وەك دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی و ناحەزی لە کاتی وەفا بە گێڕانەوەی قەرزدا و بەتایبەت گەر یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە(قەرزدەر و قەرزکەر) مرد و مافەکە یان پابەندبوونەکە گوێزرایەوە بۆ میراتگران.

## پێنجەم: گرێبەستی لادانان

"لادانان" بە چەندین پێناسە پێناسە کراوە[2]، هەر هەمووی بە دەوری یەك ناوەرۆکدا دەسوڕێتەوە، ئەوەش ئەوەیە کە "لادانان" گرێبەستێکە بەپێی ئەو

---

[1] سورة البقرة/ ٢٨٢ .

[2] مرشد الحيران (م/ ٨١٠) (لادانان بریتییە لە سەپاندنی کەسێکی تر لەلایەن خاوەنماڵەوە بەسەر پارێزگاری لە ماڵەکەی راشکاوانە یان بە ئاماژە، دانراو بریتییە لە ماڵی دانراو لای کەسە ئەمینەکان)
في شرح الخرشي (٦/ ١٠٨) (دانراو(الوديعة) لە "الودع–وازهێنان" وەرگیراوە لەوانە ئایەتی:﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ واتە عادەتی چاکەی خۆی لە وەحیکردن بۆت واز لێ نەهێناوە، لەڕووی زمانەوانیشەوە ئەمانەتە بەکاریش دەهێنێت بۆ نوێنەرایەتی کردن لە پارێزگاریدا، گەورەم خەلیل دەڵێت: "الإيداع" نوێنەرایەتی بریتییە لە بەبریکارکردن لە پارێزگاری ماڵدا.

گرێبەستە کەسی لادانرلو ماڵێکی لە کەسی "دانەر"ەوە وەردەگرێت بۆ پارێزگاری لێکردنی خودی شتەکە یان بریتییەکەی(أو بدلا)[1].

**توخمەکانی:**

پێشتر باسی ئەوەمان کرد توخمی هەر شتێك بریتییە لەوەی شتەکە لەسەری دەوەستێت لە پایەکان و مەرجەکان.

---

في حاشية الباجوري (٢/ ٦٢) ("الوديعة–دانراو" لەسەر کێشی "فعلية" بە مانای"المفعولة" گەر لە "ودع" وەرگیرابێت، بە مانای "ترك" وازلێهێنان، چونکە "مودعة–دانرلو" لای لادانرلو، هەروەها بە مانای "فاعلة" گەر لە "وَدع" بە مانای "سکن–نیشتەجێبوون" وەرگیرابێت، چونکە لای لادانرلو نیشتەجێبووە

لەڕووی زمانەوانییەوە بۆ شتی دانرلو بەکاردەهێنرێت لەلای کەسانێك جگە لە خاوەنەکەی بۆ پارێزگاری لێکردنی، لەڕووی شەریعیشەوە بۆ گرێبەستێك بەکاردەهێنرێت کە داوای پارێزگاری لێکردن دەکات)

في الروضة البهية واللمعة الدمشقية (١/ ٣٨٤) (دانرلو بریتییە لە نوێنەرایەتی لە پارێزگاریدا، ئاتاجی ئەرێکردن و قبوڵ کردنە بە گوفتار یان بە کردار، چونکە مەرامەکە رازیبوونە پێی)

في الروض النضير (٤/ ٢٩) ("الوديعة" ناوێکە بۆ شتێك خاوەنەکەی یان نوێنەرەکەی لای کەسێکی تر دایدەنێت بۆ پارێزگاری لێکردنی)

[1] کۆتوبەندی "أو بدلاً"بۆ پێناسەی"الإيداع" پێویستە هەرچەند لە سەرچاوە فیقهییەکاندا نەمبینیوەتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی دانرلوی باقەکانیش بگرێتەوە، ئەو دانرلوانەی کە لای لادانرلو تیادەچن بە دەستدرێژی یان بە کەمتەرخەمی پێویست دەبێت لەسەری "بدل"ەکەی بگێڕێتەوە یان ئەوەی لەلای کەسێکی بیانییەوە تیادەچێت بۆیە پێویستە حوکم بکرێت بەسەریدا بە قەرەبوو و لادانرلو ئەو بریتییە(بدل) بۆ دانەرەکە بگێڕێتەوە.

گوزارەی"الإيداع"م لە ناونیشان و لە پێناسەدا هەڵبژارد بەسەر گوزارەی"الوديعة"دا، چونکە هاوبەشە لە نێوان گرێبەست و خودی شتەکەدا، بۆیە پێویستە–گەر توانرا– وشەی هاوبەش لە پێناسەدا بەدوور بگیرێت.

**پایەکانی:**

گەر پایە بە مانا تایبەتەکەی وەربگرین ئەوەش ئەوەیە گرێبەستەکەی لەسەر وەستاوە و بەشێکە لە گرێبەستەکە ئەوا پایەکانی دانان لە ئەرێکردن و قبوڵ کردندا کورت دەبنەوە.

گەر مەبەست پێی مانا گشتییەکە بێت ئەوەش ئەوەیە کە لەسەری وەستاوە بەرەهایی ئەوا پایەکانی دانان چوارن: دانەر، دانرلو، لادانرلو، و دارشتن[1].

**مەرجەکانی:**

مەرجەکانی دانان بریتین لە مەرجی پایەکانی لەسەر بنچینەی مانای تایبەت بە پایە.

**مەرجەکانی دانەر:** تیایدا بەمەرج دەگیرێت کەسەکە شایستەی هەڵسوکەوتی شەرعی هەبێت، لای هەندێ لە فەقیهان[2] بەمەرج دەگیرێت کەسەکە باڵغ و ئاقڵ بێت، لای هەندێکی تریان[3] بەسە کەسەکە ئاقڵ(جیاکەرەوە) بێت گەر لە سەرپەرشتیارەوە

---

[1] في البدائع ٨/ ٣٨٨٠ (ركنه هو الإيجاب والقبول).
في المهذب ١/ ٣٥٩ ئەوەی بریکاری پێ دادەمەزرێت "دانرلو"یشی پێ دادەمەزرێت لە ئەرێکردن و قبوڵ کردن، قبوڵ کردن بە کردارە، هەر بەو جۆرە ئەوەی بریکاری پێ هەڵدەوەشێتەوە "دانرلو"یشی پێ هەڵدەوەشێتەوە.

[2] كالشافعية والمالكية. في المهذب ١/ ٣٥٩ (دانرلو تەنها لە کەسی هەڵسوکەوت شیاو لە ماڵدا دروستە، گەر منداڵێك یان گێلێك دلینا قبوڵ ناکرێت، چونکە ئەو کارە هەڵسوکەوتە لە ماڵدا، هەڵسوکەوتیش لە منداڵ و گێلەوە دروست نییە هەروەك فرۆشتن)

[3] وەك حەنەفییەکان لە: البدائع ٨/ ٣٨٨٠ (مەرجەکانی پایە بریتییە لە ژیری دانەر بۆیە دلنان لە شێتەوە یان لە منداڵەوە کە ناژنەوێت دروست نییە، چونکە ژیری مەرجی لێوەشاوەیی هەڵسوکەوتی شەرعییە، بەڵام باڵغبوونی لە لای ئێمە(حەنەفییەکان) مەرج نییە بۆیە دلنان لە منداڵێکی مۆڵەتپێدرلو دروستە، چونکە ئەوە بریتییە لەوەی بازرگان پێویستی پێی دەبێت، ئەوە لە پاشکۆکانی بازرگانییە بۆیە منداڵی مۆڵەتپێدرلو دەبێت بە خاوەنی وەك چۆن دەبێت بە خاوەنی بازرگانی، لەلای شافیعی نابێتە خاوەنی بازرگانی بۆیە نابێتە خاوەنی پاشکۆکانی بازرگانیش)

یان لەلایەن قازییەوە مۆڵەتی درابوو تاکو هەستێت بە جێبەجێ کردنی هەندێك لە مامەڵەی دارایی، لەسەر بۆچوونی یەکەم گەر کەسێك ماڵەکەی لای منداڵێکی جیاکەرەوە یان لای کەسێکی گێل دانا و ماڵەکە تیاچوو بە دەستدرێژیکردنە سەری یان بە کەمتەرخەمی ئەوەوە، ئەوا نابنە دەستەبەرکەر(واتە منداڵەکە یان کەسە گێلەکە)، چونکە کەسی دانەر کەمتەرخەمە لە رادەستکردنی ماڵەکەی بە کەسێك شایستەی ئەو رادەستکردن و لەدەست وەرگرتنە نییە.

**مەرجەکانی لادانراو:** هەمان مەرجەکانی دانەرە بەپێی جیاوازی باسکراو[1].

**مەرجەکانی دانراو:** تیایدا بەمەرج دەگیرێت ماڵێك بێت گونجاو بێت بە دانانی دەست لەسەری.

**مەرجەکانی دارشتن:** بریتییە لە مەرجەکانی بریکاری[2].

**حوکمی داواکاری بۆ لادانان:**

ئەم حوکمە تایبەتە بە لادانراو، چونکە دانان بە تێگەیشتنی فیقهی بۆ بەرژەوەندی دانەر پوختە دەبێت لە پارێزگاری لادانراو بۆ دانراوەکە، ئەو کارە لە دەروازەی هاوکاریکردنە لەسەر چاکە، ئەم چاکەیە حوکمەکەی بە گۆڕانی رەوشی دەوروبەر بە گرێبەست و دانەر و لادانراو دەگۆڕێت، لەوانەیە پەسەند یان پێویست بێت[3]گەر ماڵی دانراو رووبەڕووی تالانکردن یان داگیرکردن یان تیاچوون یان دزی

---

[1] في شرح الخرشي ٦/ ١٠٩ من جاز ان يوكل جاز ان يودع. وفي أيضا (٦/ ١١٩):-
(گەر منداڵ و گێل دانراوێك یان قەرزێکی وەرگرت یان شمەکێکی کڕی و شتەکە تیاچوو هەمووی یان بەشێکی ئەوا دەستەبەری لەسەر نییە چونکە خاوەنەکەی ئەوو کەسەیە بووەتە هۆی تیاچوونی یەکسانە قبوولکردنەکەی بۆ ئەو شتە بە مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی بێت یان نە) هەر ئەمەیە یاسا وەزعیەکان کاریان پێکردوە.

[2] في المهذب ١/ ٣٥٩ (دانراو دادەمەزرێت بەوەی بریکاری پێ دادەمەزرێت)

[3] في المهذب ١/ ٣٥٨ (پەسەندە بۆ کەسێك توانای پاراستنی دانراو و گێڕانەوەی ئەمانەتی هەبێت قبوولی بکات بەهۆی ئایەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ هەروەها بەهۆی فەرموودەی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) ((هەر کەس ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی دونیا لەسەر
←

ببێتەوە.

گەر سەرنجێکی گەشە و گۆڕانی ژیانی ئابووریانە بدەین لەم سەردەمەدا و لە سەردەمەکانی داهاتوودا دەبینین دانان لە بانقەکاندا لە کارە پەسەندەکانە گەر لە کارە پێویستەکان نەبێت، ئەمەش بۆ کۆمەڵە هۆیەك دەگەڕێتەوە، لەوانە: پارێزگاری لە پارەی دانراو کە ئەگەری رووبەڕووبوونەوەی تالآنکردن و داگیرکردن و دزی و دەستدرێژکردنە سەر خاوەنەکەی بوونی هەیە، سەرباری ئەوەی کە هەلگرتنی پارە لە ماڵدا و بەرهەم نەهێنانی لە پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا و بەختکردنی لە پێناوی خودادا(بەرژەوەندی گشتی) لە ئیسلامدا قبووڵ نەکراوە، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1]، مەبەست بە ئاڵتوون و زیو هەموو پارەیەکی کاغەزی و کانزاییە کە لە جێگەی ئاڵتوون و زیو لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕدا دانیشتوون، هەموو ئەوەی لەو دوو جۆرە کانزادا(ئاڵتوون و زیو) پێویستە لەو پارانەدا پێویست دەبێت، دانان لە خەرجکردنە لە پێناوی خودادا، چونکە مەبەست لەم گوزارەیە(لە پێناوی خودادا) لە

---

موسڵمانێك لابدات خودا بەو کارەی ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی رۆژی دوایی لەسەر لادەدات))

في الميزان الكبرى ٢/ ٧٥ (کارێکی پەسەندە و لە پارێزگاری لێکردنی پاداشت هەیە و ئەمانەتێکی رووتە و دەستەبەری لەسەر لادانراو نییە مەگەر بە دەستدرێژی کردنە سەر یان کەمتەرخەمی)

في الباجوري ٢/ ٦٣ (بۆ ئەو کەسەی بە ئەمانەت هەڵدەستێت قبووڵ کردنی پەسەندە، بە ئایەتی: ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ لادانراو چاکەکارە بەپێی فەرموودەکەی "مسلم"((خودا لە کۆمەکی بەندەیەکدایە تا بەندەکە لە کۆمەکی براکەیدا بێت)) بۆیە بەپەسەندبینینەکە فەرزی کیفایەیە گەر کەسانی تر هەبوون بۆی، ئەگەر نە فەرزی عەینە، بەڵکو قبوولکردنی واجبە گەر کەسێکی تر نەبوو)

في الروض النضير ٤/ ٢٩ بنەڕەت تیایدا(ليود الذي ائتمن امانته) ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ((ئەمانەت بگێڕەرەوە بۆ ئەو کەسەی تۆی کرد بە ئەمانەتدار، ناپاکی مەکە لەو کەسەی ناپاکی لێکردیت))

[1] التوبة : ٣٤

هەر شوێنێکی قورئان و فەرموودە هاتبێت بەرژەوەندی گشتییە، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە دەوڵەت پارەی فەراهەم لە بانقەکاندا بەرهەم دەهێنێت لەپێناو سوودی گشتیدا جا لە ڕێگەی خەرجکردنی مووچەوە بێت یان خەرجکردن لەسەر خزمەتگوزارییە گشتییەکان یان بەکارهێنانی بۆ بەرهەمهێنانی پرۆژە بەرهەمهێنەرەکان.

**حوکمەکانی لادانان:**

مەبەست بە حوکمەکانی گرێبەست بریتییە لە ئاسارەکانی لە ئەرکەکان و مافەکان، لێرەدا باس لە پابەندبوونەکان(ئەرکەکان) دەکەین چونکە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی هەر پابەندبوونێك مافێك بەرانبەریەتی، بۆیە بوونی یەکێکیان بوونی ئەویتریان پێویست دەکات.

**ئەرکەکانی لادانراو:**

١- **وەرگرتن:** لادانراو تەنها بە گرێبەستەکە پابەند دەبێت بە وەرگرتنی دانراوەکە، بینا لەسەر ئەمە دانان دەبێت بە گرێبەستێکی ڕازیبوونی و هۆی پابەندبوونەکەی بریتییە لە گرێبەستەکە و سەرچاوەکەشی قورئانی پیرۆزە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[1] هەروەها ئایەتی ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾[2].

٢- **پارێزگاری لە دانراوەکە:** لەسەر لادانراو پێویستە چاودێری دانراوەکە بکات لە پارێزگاریکردن لێی وەك چۆن چاودێریماڵی خۆی دەکات، چونکە دانان لەلایەن دانەرەوە داوای پارێزگاریکردنە و لەلایەن لادانراوەوە پابەندبوونە بە پارێزگاری لێکردن و ئەو ئەهلی پابەندبوونە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(صلی

[1] المائدة / ١ .
[2] الإسراء / ٣٤ .

الله عليه وسلم) كە دەفەرموێت: ((موسڵمانان لەپای مەرجەكانی خۆیانن))[1]، گەر دلوای پارێزگاری رەها بوو ئەوا بۆ لادانراو هەیە خۆی یان ئەوانەی لەگەڵی نیشتەجێن پارێزگاری لە دانراوەكە بكەن و خەرجی پارێزگاری لێكردنەكەی لەسەرە[2]، هەندێ لایان وایە[3]دانراوەكە تەنها بە دەستی خۆی دەپارێزێت، بەڵام دەتوانێت كۆمەكی لە كەسانی تر دلوا بكات بە مەبەستی پارێزگاری لێكردنی.

رای یەكەم بریتییە لە رای پارسەنگدراو، گەر دانانەكە سنووردار نەكرابوو بەوەی كەسی هەستاو بە پارێزگاری لێكردن تەنها لادانراو بێت، چونكە بابەتی پابەندبوونەكە بریتییە لە پارێزگاری، مرۆڤ بەوە پابەند دەبێت لە پارێزگاری ماڵی كەسانی تر كە ماڵی خۆی پێ دەپارێزێت جارێك بە دەستی خۆی و جارێك بە دەستی ئەندامانی خێزانەكەی.

٣- دەستەبەركردن لەباری دەستدرێژیكردنە سەر و كەمتەرخەمیدا: دانرلو ئەمانەتە لە دەستی لادانراودا، دەستی ئەمانەتیش دەستەبەركەر نییە مەگەر بە دەستدرێژیكردنە سەر یان كەمتەرخەمی یان هەردووكیان بێت[4]:

---

[1] لەسەر رێگەی هەندێ لە ئەهلی فەرمووده دروستە، الإلمام بأحاديث الأحكام، ابن دقيق العيد، (٥٣١/٢).

[2] البدائع ٨/ ٣٨٨٢ .

[3] كالشافعي. حاشية الباجوري ٢/ .

[4] في البدائع ٨/ ٣٨٩١ ئەوەی بەدولیدا دێت(ئەوەی باری گرێبەست لەسەركراوەكە دەگوازێت لە ئەمانەتەوە بۆ دەستەبەری بریتییە لە وازهێنان لە پارێزگاری چونكە بە گرێبەست پابەندبوونی پارێزگاری دلنرلو كراوە، هەروەها سەرپێچی لە لادانراودا بە بەكارهێنانی یان دلنانی لە جێگەیەك جێگەی خۆی نەبێت یان پارێزگاری لێكردنەكە بداتە دەستی كەسێك پارێزگاری پێ نەكرێت) في شرح الخرشي ٦/ ١٠٩ (بنەڕەت لە لادانانی دەستەبەرنەكردنە لەلایەن لادانراوەوە گەر تیاچوو یان كەمی كرد گەر بە كەمتەرخەمی ئەو رووینەدابێت، دەستەبەری دەكات گەر سوودی لێبینی بەبێ مۆڵەتی دانەر، هەر بەو جۆرە دەستەبەری دەكات گەر سەفەری بە دانراوەكە كرد لەگەڵ ئەوەش دەیتوانی بیداتە دەستی كەسێكی ئەمانەتدار)

أ.لای کەسێکی تر دایبنێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی و لادانرلو هیچ پاساوێکی بەدەستەوە نەبێت.

ب–سەفەرکردن بە دانراوەکەوە بەبێ پاساو لەگەڵ توانا لەسەر گێڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی، چونکە رووبەڕووی تیاچوونی کردۆتەوە، پارێزگاری لە سەفەردا وەك پارێزگاری لە نیشتەجێبووندا نییە.

ج–لە گەڕەکێکەوە یان لە ماڵێکەوە بۆ شوێنێکی تر بیگوێزێتەوە کە لە پارێزگاری لێکردندا لە خوار ئەوانەوە بێت.

د–بەبێ پاساو نکوڵی لە بوونی دانرلو بکات و دانی پیادا نەنێت لەدوای داوای خاوەنەکەی بۆی، بە پێچەوانەی ئەوەی نەتوانێت بیگێڕێتەوە بە پاساوێك وەك دەرکردن و پاڵپێوەنانی ستەمکارێك یان داگیرکارێك لە خاوەنەکەی.

هـ–بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی سوودی لێ ببینێت.

و–سەرپێچی بکات لەوەی رێکەوتنی لەسەر کراوە لە گرێبەستەکەدا تایبەت بە پارێزگاری لێکردنی دانرلوەکە[1].

ز–نەیەوێت بیگێڕێتەوە بەبێ بیانوو لەدوای تەولوبوونی ماوەی دانرلوەکە یان هەڵوەشاندنەوە یان مردن یان هەر هۆیەکی تر[2].

---

[1] حاشية الباجوري على شرح الغزي على الغاية والتقريب لأبي شجاع في الفقه الشافعي ٢/ ٦٢ .

[2] في الميزان الكبرى ٢/ ٧٥ (هەموو هاوڕان کە وەرگرتنی دانرلو لەو کارانەیە مرۆڤ لە خودا نزیك دەکاتەوە و کارێکی پەسەندە و لە پارێزگاری لێکردنی پاداشت بوونی هەیە و ئەمانەتێکی رووتە، دەستەبەری پێویست نابێت مەگەر بە دەستدرێژی کردنە سەر، قسە قسەی ئەوە لە تیاچوون و گێڕانەوەدا بەرەهایی، هەر کات خاوەنەکەی دلوای کردەوە لەسەر لادانرلو پێویست دەبێت بیگێڕێتەوە لەگەڵ بۆ گونجان ئەگەر دەرچوونی لە رادەی ئەمانەت دەستەبەر دەکات)
في الروضة واللمعة ١/ ٣٨٦ (دەستەبەری لەسەر نییە گەر تیاچوو یان بزربوو مەگەر بە دەستدرێژی تیایدا یان کەمتەرخەمی بەوەی بێباك بووە لە پاراستنی گەر گێڕانەوەی پشتگوێ خست دەستەبەری دەکات یان لای کەسێکی تر دلینا بەبێ پێویستبوون)
في الروض النظير ٤/ ٣٠ (لادانرلو دەستەبەر ناکات گەر سەرپێچی نەکردبێت)
←

٤-لەسەریەتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی لەدوای تەوبوونی ماوەی دانراوەکە یان هەڵوەشاندنەوە یان مردن یان هەر هۆیەکی تر.

**بەربوونەوەی دەستەبەری بە تێپەڕبوونی کات:**

فەقیهان جیاوازیان کردووە لە نێوان دانراوێکی بێ پەیمانگیریدا کە بە تێپەڕبوونی کات بەردەبێتەوە لەدوای مردنی لادانرلو لەگەڵ دانراوێکی پەیمانگردا ئەمەیان بەرنابێتەوە، بۆیە دەڵێن هەر کەس دانراوێك بەبێ بەڵگەی رۆشنکەرەوە لە ئەستۆ بگرێ و پاشان بمرێت و لە لێجێماوەکەدا نەبینرایەوە و لە کاتی مردنیشیدا وەسێتی پێ نەکردبوو، ئەوا لە لێجێماوەکەی دەبرێت، مەگەر کارەکە لە رۆژی دانانەوە تا دە ساڵ درێژەی کێشا بێت لەو بارەدا دەستەبەری ناکات، ئەمەش هەڵدەدرێتە سەر ئەوەی کە بۆ خاوەنەکەی گێڕاوەتەوە گەر وەسێتی پێ کردبێت نابێتە دەستەبەرکەری، گەر مابێتەوە خاوەنەکەی دەیباتەوە، گەر تیاچوو دەستەبەری بۆ نییە، بەلاّم گەر دانراوەکەی بە بەلگەگیری بەمەرامگیراو وەرگرت ئەوا لە لێجێماوەکەی وەردەگیرێت گەر وەسێتی پێ نەکردبوو و شتەکە نەدەبینرایە و درێژخایەنی لە کارەکەدا بوونی نەبوو.

**ئەرکەکانی دانەر:**

١-لەسەریەتی قەرەبووی لادانرلو بکاتەوە بۆ هەر زیانێك بەهۆی دانراوەکەوە بەو گەیشتووە.

٢-خەرجی و تێچوونەکانی پارێزگاری لە دانراو و گێڕانەوەی لەسەرە.

٣-دەبێ کرێکەی بدات گەر دانان بە کرێ بوو.

---

وفي الروضة البهية واللمعة ١/ ٣٨٥ (دانراوەکە پووچەڵ دەبێتەوە بە مردنی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە و شێتبوونی و بێهۆشبوونی)

في المهذب ١/ ٣٥٩ (دانرلو هەڵدەوەشێتەوە بەوەی بریکاری پێ هەڵدەوەشێتەوە لە کەناردان و شێتی و بوورانەوە(بێهۆشی) و مردن)

**هەڵوێستی یاسا:**

یاسای وڵاتە عەرەبییەکان جیاوازیان نییە لە فیقهی ئیسلامی لە زۆربەی توخمەکان و حوکمەکانی دانرلو، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەیەدا:

پێناسە: دانان گرێبەستێکە کەسی لادانرلو بەپێی ئەو گرێبەستە پابەند دەبێت بەوەی لە دانەرەوە شتێك وەربگرێت بۆ پارێزگاری لێکردنی و وەکو خۆی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، العراقي م ٩٥١ الأردني م ٨٦٨ الكويتي م ٧٢٠ اليماني م ٩٤٥ المصري م ٧١٨ السوري م ٦٨٤ الليبي م ٧١٨ اللبناني م ٦٩٠ ، ثرۆژة ياساي عێراقي م ٨٩٧ .

**پایەکان و مەرجەکان:**

هەندێ لەم یاسایانە بە شێوەیەکی کورت و پوخت دەست بۆ پایەکان و مەرجەکانی دانرلو دەبەن، لەوانە یاسای یەمەنی، بە دەق هێناویەتی کە لە دانانـدا بەمەرج دەگیرێت هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە هەڵسوکەوتیان دروست بێت م/٩٤٦، گەر لادانرلو شایستەیی نەبوو یان شایستەییەکەی ناتەولو بوو و مۆڵەتپێدرلو نەبوو لە بازرگانیدا یان لە وەرگرتنی دانرلودا ئەوا دەستەبەری بۆ نییە لەباری تیاچوون و تیابردنی دانرلوەکەدا م/٩٤٨، بۆ دروستی گرێبەستەکە بە مەرج دەگیرێت دانرلوەکە ماڵێك بێت ئامادەیی دەستبەسەرداگرتنی تێدا بێت م/٨٦٩، گرێبەستی دانان بە دەستبەسەرداگرتنی ماڵی دانرلو بە شێوەیەکی راستەقینە یان لەڕووی حوکمەوە تەولو دەبێت م/٨٧٠.

**ئەرکەکانی لادانراو:**

١–کەسی لادانرلو پابەند دەبێت بە وەرگرتنی دانرلوەکە لەدوای گرێبەست، کوێتی م/٧٢١، میسری م/٧١٩، سوری م/٦٨٥، لیبی م/٧١٩، پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨١.

٢–گرنگیدان بە پارێزگاری دانرلو وەك گرنگیدان بە پارێزگاری ماڵی خۆی، لە باری وەرگرتنی کرێدا پێویستە لەسەری وەك گرنگیدانی پیاوێکی کارامەی تەرخانکرلو

گرنگی پێبدات العراقي م/٩٥٢ – ٩٥٣ الأردني م/٨٧٣ اليماني م/٩٤٧ الكويتي م/٧٢٢ المصري م/٧٢٠ السوري م/٦٨٦ الليبي م/٧٢٠ اللبناني م/٦٩٦ .

٣–ناتوانێت سوود و قازانج لە دانراوەکە ببینێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، العراقي م/٩٥٦ الأردني م/٨٧٥ المصري م/٧١٩ السوري م/٦٨٥ الليبي م/٧١٩، پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨٣ .

٤–پابەندبوون بە پیادەکردنی مەرجی لەسەر رێکەوتووی سوودبەخشی گونجاو، یاسای عێراقی م/٩٥٩.

٥–دەستەبەری: دانراو ئەمانەتە لە دەستی لادانراودا تەنها بە دەستدرێژی و کەمتەرخەمی دەستەبەر دەکرێت، دەستەبەری هاونموونەکان بە نموونەی ئەوە و دەستەبەری بەهاییەکان بە بەهای رۆژی دەستبەسەرداگرتن یان هاوتای تیاچوونەکە گەر بەدەست دەهات(بەوەی تیابردنەکە لە بێگانەوە بێت) العراقي م/٩٦٠ و ٩٦٢ الأردني م/٨٧٢ اليماني م/٩٤٩ – ٩٥٠ ، پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨٥.

٦–لەسەریەتی فرۆشتنی بە مۆڵەتی دادگا بێت گەر رووبەرووی تیاچوون یان تالآنیکردن بوویەوە و کەسی دانەر ئامادەنەبوو یان بێسەروشوێن بوو، عێراقی م/٩٦٥، ئوردەنی م/٨٧٩.

٧–هەرکات ماوەی دانراو تەواو بوو بە هەر هۆیەك ئەوا لەسەریەتی بیگێڕێتەوە هەر بەو جۆرە گێڕانەوەی بەروبوومەکەی لەسەر خەرجی دانەرەکە، العراقي م/٩٦١ الأردني م/٨٧٦ و ٨٧٧ الكويتي م/٧٢٤ المصري م/٧٢٢ السوري م/٦٨٨ الليبي م/٧٢٢ اللبناني م/٧١١ پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨٤.

٨–کەسی تر نەکات بە نوێنەری خۆی لە پارێزگاری دانراوەکەدا بەبێ مۆڵەتی دانەرەکەی، مەگەر لەباری زۆر پێویستدا، العراقي م/٩٥٢ الكويتي م/٧٢٣ المصري م/٧٢١ السوري م/٦٨٧ الليبي م/٧٢١ اللبناني م/٦٩٧ ، پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨٢ .

٩- بۆ کەسی لادانرلو نییە دلوای کرێی پارێزگاری دانراوەکە بکات گەر ئەوە لە گرێبەستەکەدا بەمەرج نەگیرابوو العراقي م/٩٦٨ الأردني م/٨٨٣ الكويتي ٧٢٦ المصري م/٧٢٤ السوري م/٦٩٠ الليبي م/٧٢٤ ، پرۆژە یاسای عێراقی م/٨٨٦.

١٠- لەباری بزربوون و بێسەروشوێنی دانەردا لەسەر لادانرلو پێویستە دانراوەکە بگێڕێتەوە بۆ میراتگران، گەر میراتگری نەبوو یان نادیار بوو ئەوا لە بەرژەوەندی گشتیدا بەختدەکرێت، یەمەنی م/٩٥٤.

١١- لەباری جیاوازی لە گێڕانەوەی دانراودا یان تیاچوونیدا بە سوێندخواردنی لادانرلو باوەڕی پێ دەکرێت، یەمەنی م/٩٥٨[1].

١٢- گەر لادانرلو ناشایستەبوو ئەوا دەستەبەری لەسەر نییە لە تیابردنی دانراوەکە هەر بەو جۆرە گەر منداڵێك بوو جیاکردنەوەی نەبوو یان کەسێك لە حوکمی ئەودا بێت ئەوا دەستەبەر ناکات مەگەر منداڵەکە ڕێگەپێدراو بێت بە بازرگانی یان بە دەستبەسەرداگرتنی دانرلو لەو بارەدا دەستەبەر دەکات، یەمەنی م/٩٤٨، ئەم یاسایە مەزهەبی ئەبی حەنیفەی وەرگرتووە، ئەوەش لەبەر کەمتەرخەمی دانەرەکەی.

**ئەرکەکانی دانەر:**

١- گەر لەسەر کرێیەك ڕێکەوتن ئەوا پێدانی کرێکە لەسەریەتی بەپێی ڕێکەوتنەکە العراقي م/٩٦٨ الكويتي م/٧٣٦ الأردني م/٨٧١ و ٨٨٣ المصري م/٧٢٤ السوري م/٦٩٠ الليبي م/٧٢٤ اللبناني م/٦٩٠ ثرۆنة یاساي عیَراقي م/٨٨٦.

٢- ئەوەی لادانرلو خەرجی کردووە لە پارێزگاری دانرلوەکە بۆی بگێڕێتەوە، هەروەها قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە تووشی بووە ئەگەر هەبوو العراقي م/٩٦٧ الأردني م/٨٨٤ اليماني م/٩٥٢ الكويتي م/٧٢٧ المصري م/٧٢٥ .

---

[1] ئەمە هاوڕایە لەگەڵ ڕای جمهوری فەقیهانی شەریعەت.

٣–لەسەر دانەر خەرجی گێڕانەوەی دانراوەکە پێویستە لەگەڵ خەرجی پارێزگاری لێکردنەکەی العراقي م/٩٦٦ الأردني م/٨٨٥ – ٨٨٦ الكويتي ٧٢٧ المصري م/٦٢٥ السوري م/٦٩١ الليبي ٧٢٥ اللبناني م/٩١٧ المشروع م/٨٨٨.

## لقی سێیەم:
## گرێبەستی رووالەتی(شێوەگری)

گرێبەستی رووالەتی(شێوەگری) ئەوەیە بۆ دامەزرانی تەنها یەکگرتنی ئەرێکردن و قبوولّ کردن بەس نییە، بەلکو دەبێت ئەو یەکگرتنە لە شێوەیەکی تایبەتدا بێت کە یاسا دیاریکردووە بەجۆرێك بە پایەیەك لە پایەکانی دامەزرانی داناوە، بۆ نموونە برگەی دووەم لە مادەی سێیەمی یاسای تۆماری خانووبەرەی عێراقی[1] بە دەق هێناویەتی کە ((هەلّسوکەوتی خانووبەرەیی تەنها بە تۆمارکردن لە فەرمانگەی خانووبەرە دادەمەزرێ))، هەر بەو جۆرە مادەی(٥٠٨) لە یاسای مەدەنی عێراقی[2] بە دەق هێناویەتی کە (فرۆشتنی خانووبەرە تەنها لەو بارەدا دادەمەزرێت کە لە فەرمانگەی تایبەتکراو تۆماردەکرێت و ئەو شێوەیە وەردەگرێت یاسا بە دەق هێناویەتی)

بەلاّم دانانی شێوەگەری لە گرێبەستەکاندا وەك پایەیەك لە پایەکانی و مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزرانی گرێبەستەکان لە ناو یاسای ولاّتە عەرەبییەکان حوکمێك نییە کۆدەنگی لەسەر بێت، بۆ نموونە یاسای مەدەنی میسری[3] دانی ناوە بە دامەزرانی هەر هەلّسوکەوتێکی خانووبەرە پێش تۆمارکردن و سەرپێهەلّدانی پابەندبوونی تایبەت بە خاوەنی خانووبەرەکە بە تۆمارکردنی لە فەرمانگەی ئاشکراکردنی خانووبەرەدا، بەلاّم مولکداری خانووبەرەکە دوای تۆمارکردنی لە فەرمانگەی ئاشکراکردنی خانووبەرە بۆ کڕیارەکە دەگوێزرێتەوە، مادەی (٩٣٤) بە دەق دەلّێت: (لە مادە خانووبەرەییەکاندا مولکداری مافە بەرچاوەکانی تر ناگوێزرێنەوە جا ئەوە

---

[1] رقم (٤٣) لسنة ١٩٧١ .

[2] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١ .

[3] رقم ١٣١ لسنة ١٩٤٨ .

لە نێوان دوو گرێبەستکارەکەدا بێت یان لە ماف کەسانی تردا مەگەر رەچاوی حوکمە رۆشنکەرەوەکان لە یاسای رێکخستنی ئاشکراکردنی خانووبەرە بکرێت).

بەڵام هەر کات تۆمارکردن تەواو بوو موڵکدارییەکە بە گوازراوە دادەنرێت لە کاتی گرێبەستەکەوە نەك لە کاتی تۆمارکردنەوە، چونکە هۆی گواستنەوەی موڵکداری بریتییە لە گرێبەست[1].

## جیاکاری لە نێوان شێوە و جێگیرکردن:

گەر یاسا بۆ جێگیرکردنی جۆرێکی تایبەت لە گرێبەست نووسینی بەمەرج گرت ئەوا ئەو نووسینە لەو بارەدا بە پایەیەك لە پایەکانی گرێبەستەکە دانانرێت، چونکە گرێبەستەکە دادەمەزرێت بە رەچاونەکردنی تۆمارکردن یان نەکردنی بە نووسین، بەڵکو مەرام لەو متمانەگرییە تەنها جێگیرکردنە وەك لە مادەی (٦٥) لە یاسای باری کەسێتی عێراقی هەموارکراودا هاتووە[2] (بە وەسێت دانانرێت مەگەر بە بەڵگەی نووسراوی واژووکراو لەلایەن وەسێتکەرەوە یان مۆرکراو بە مۆری ئەو یان پەنجەمۆرکراو بە پەنجەی ئەو، گەر وەسێتپێکراو خانووبەرە بوو یان ماڵی گوازراوە بوو گەر نرخەکەی لەسەرو ٥٠٠ دیناری عێراقییەوە بوو ئەوا بەڕاستزانینی لای نووسەری داد پێویستە)، شایانی باسە کارکردن بەپێی ئەم مادەیە ئەمڕۆ پشتگوێخراوە دوای ئەوەی قەزای عێراقی تۆمارکردنی وەسێتی لە تۆمارە تایبەتەکانیدا لەئەستۆگرت.

## شێوەگری لە شەریعەتی ئیسلامدا:

قورئان فەرمانی بە شێوەگری کردووە بەر لە یاسا بە سەدان ساڵ، ئەوەش بۆ رەچاوکردنی دامەزرانی مامەڵەکان و دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی و دوژمنایەتی نێوان

---

[1] الوسيط السهنوري (أسباب كسب الملكية) ٩/ ٣٣٦ .

[2] رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩ .

گرێبەستكارەكان، خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا[١] إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ[٢] إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ[٣] بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ[٤] وَلَا يَأْبَ[٥] كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ[٦] فَلْيَكْتُبْ[٧] وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ[٨] وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ[٩] وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا[١٠] فَإِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ[١١] سَفِيهًا[١٢] أَوْ ضَعِيفًا[١٣] أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ

---

[١] ئەم ئایەتە درێژترین ئایەتی قورئانە رێكخستنی زۆرێك لە حوكمەكانی مامەڵە دارایيەكان لەئامێز دەگرێت بە رێگەیەكی قووڵی دادپەروەرانە كە تاكو ئێستا یاسای دانراو پێینەگەیشتووە سەرەڕای گەشە و پێشكەوتنی درێژ و بەردەوامی.

[٢] (واتە "تعاملتم–مامەڵەتان كرد" لە دەروازەی "مفاعلة"یە ئاماژەیە بۆ ئەو گرێبەستە پابەندكرانەی هەردوو لایەن، ئەوەش لەڕووی بەدەڵەوە ماوە بۆ دیاریكراوە یەكسانە نرخ بێت وەك دواخستن یان نرخدار بێت وەك سەلەم)

[٣] هەردوو فرمانە داخوازییەكە(فاكتبوه و ليكتب) بۆ پێویستبوونە لە ماڵی بەنرخ و قەرزی بڕ زۆر، واتە قەرزەكە بنووسن لە چەكێكدا یان گرێبەستەكە تۆمار بكەن لە تۆمارەكانی لایەنی تایبەتكراودا.

[٤] شەریعەتی ئیسلام یەكەم شەریعەتە نووسەری دادی زانیبێت.

[٥] "لا" بۆ نەهیكردنە فرمانەكەش "مجزوم"ە بە لادانی پیتی "ألف" و بوونی "فتحة"بەڵگەیە لەسەر "ألف"ەكە.

[٦] واتە فەزڵەكەی بە نووسین، بۆیە لەسەریەتی دەستنوقاو نەبێت پێی.

[٧] دووبارەكردنەوەی ئەمرەكە بۆ دڵنیاكردنەوەیە.

[٨] واتە ئەو قەرزدارەی قەرزەكەی لەسەر شانە

[٩] واتە لە خوێندنەوەیدا بەسەر نووسەرەكەدا بۆیە دڵندەنێت بەوەی لەسەریەتی

[١٠] شرۆڤەی فەرمان بە تەقوا واتە پێویستە لەسەری قسەیەك وەهەمی زیادە یان كەمی دروست دەكات دووری بخاتەوە.

[١١] قەرزدار

[١٢] كێل بریتییە لە دەستبڵاو با دەستبڵاوییەكەش لە رێگەی خێردا بێت.

[١٣] بەهۆی بچووكی تەمەن یان پیری یان ناتەواوییەك لە ژیریدا یان هەر بەرهەڵستییەكی تر لە بەرهەڵستكاری لێوەشاوەیی.

أَنْ يُمِلَّ هُوَ[١] فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ[٢] بِالْعَدْلِ[٣] وَاسْتَشْهِدُوا[٤] شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى[٥] وَلَا يَأْبَ[٦] الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا[٧] وَلَا تَسْأَمُوا[٨] أَنْ تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا[٩]

---

[١] بەهۆی نەزانی زمانی گرێبەستکارەکەی تر یان بەهۆی کەڕولاڵییەوە یان بەهۆی هەر ڕێگرێکی ترەوە.

[٢] مەبەست لە "الولي" لێرەدا مانا گشتییەکەیەتی واتە هەر کەسێك کاروباری کەسانی تر دەگرێتە دەست لە سەرپەرشتیار یان وەسێتدار یان سەرۆکار یان وەرگێڕ، ویلایەت لەسەر ماڵ بریتییە لە دەسەلاتی هەڵسوکەوت لە ماڵی کەسانی تردا، ئەوەش بۆ باوك دواتر بۆ وەسێتدار کە پێی دەوترێت وەسێتداری هەڵبژێررلو(یان خاوەن هەڵبژاردە) جێگیر دەبێت، پاشان باپیر(باوکی باوك) پاشان قازی، پاشان ئەو وەسێتدارەی کە پێی دەوترێت وەسێتداری دیاریکرلو، سەرۆکار ئەو کەسەیە دادگا دیاریدەکات بۆ سەرپەرشتیاری کاروباری ئەو کەسانەی دەستیان بەسەردا دەگیرێت دوای باڵغبوون بەهۆی شێتی یان تێکچوون یان گێلێتی یان بێئاگابوون، موشریفیش کەسێکە دادگا لە پاڵ وەسێتداردا دیاریدەکات بۆ هەڵبژاردنی ئەو وەسێتدارە یان یارمەتیدەری، هەر بەو جۆرە لەپاڵ سەرۆکار و بریکار لە کەسی نادیارەوە.

یاریدەدەری قەزایی قازی دیاریدەکات و ئەرکەکەی کورتدەبێتەوە لە یارمەتیدانی ئەوانەی یارمەتیدانیان بریاری لێ دەدرێت ئەوەش بە هاوبەشی لەگەڵی لەو هەڵسوکەوتانەی کە وەسێتدار پێویستی بە مۆڵەتی قازی دەبێت، پێمان وایە ویلایەت دوای باوك بۆ دایکە، چونکە سۆز و بەزەیی و ئەمانەتی لە هەمووان زۆرترە.

[٣] پەیوەستە بە "فليملل" واتە زیاتر لەوەی دەیڵێت و کەمتر لەوە نانوسێت.

[٤] واتە لەسەر گرێبەست و قەرزی ماوە بۆ دیاریکرلو"الإستشهاد-داوای شایەتی" دەکرێت.

[٥] ڕۆشنکردنەوەی حیکمەتی هاوتابوونی پیاوێك بە دوو ژن، واتە ئەوە بە کەمدانان نییە بۆ پلە و پایەی ئافرەت و دانی فەزڵی پیاو بەسەر ئافرەتدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئافرەت لێی تێکدەچێت واتە کارەکە پەیوەستەکەی بە شایەتی و شتانی ترەوە زیاتر لە پیاولەبیر دەچێت نەك بۆ ناتەواوی ئەقڵی یان ناتەواوی کەسایەتی ئەو، بەڵکو بەهۆی زۆری پابەندبوونی خانەوادەیی و دەرەکییەوە و سەرقاڵبوونی زیاتر و زۆرتری لە پیاو، وەك دایکێك بۆ کۆمەڵگە و پەروەردەکار و فەرمانبەر و بەرپرسیار لە کاروباری ماڵ، زانست و واقیع سەلماندوویانە هەر کەس سەرقاڵی زۆرتر بێت لەبیرچوونی زۆرترە.

[٦] واتە بەبێ بیانوو ڕێگری نەکات.

[٧] واتە بۆ شاندانە ژێر شایەتی یان پێ هەستانی یان هەردووکیان.

إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ[3] عِنْدَ اللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلَّا تَرْتَابُوا إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ[4] وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ[5] وَإِنْ تَفْعَلُوا فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ[6] وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ[7]. وَإِنْ كُنْتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ[8] قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[9].

### ئەو حوکمانەی لەو دوو ئایەتە ئاماژەبۆکراوانەدا دەردەهێنرێن:

لەم دوو ئایەتەوە زۆرێك لە حوکم دەربارەی مامەڵەی دارایی دەردەهێنرێن، تەنها ئەوانە ئاماژە پێدەکەم پەیوەستن بە شێوەوە کە لەو دووئایەتەدا بە دەق هێناویەتی:

١- فەرمانەکان لەو دوو ئایەتەدا بۆ "پێویستبوون"ن[10]، چونکە فەرمان حەقیقەتە

---

[1] واتە شەکەتی و بێزاری رووتان تێنەکات.

[2] واتە ئەوەی شایەتیتاندا لەسەری لە راستی کەم بێت یان زۆر بێت مادام ئەگەری رووبەڕووبوونەوەی ئینکارکردن و ناکۆکی و دوژمنایەتی تێدایە.

[3] واتە دادپەروەرانەترە.

[4] واتە شایەتی بدەن لەسەری چونکە باشترین پاڵنەرە بۆ کۆتاهێنان بە جیاوازی.

[5] خاوەن حەق و ئەوەی لەسەریەتی بە لادان یان خۆگرتنەوە لە شایەتی یان نووسین یان خاوەن ماف زیانیان پێ نەگەیەنێت بە داوالێکردنیان بە شتێك کە شایستەی نووسین و شایەتی نیە، بەوەی فەرمانی پێ بکات شتێك بنووسێت کە لێی بەئاگا نییە.

[6] واتە ئەو کارە بکەن کە نەهیتان لێکراوە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی یان خۆی دەگرێتەوە لە پێدانی کرێ پێیان.

[7] سورة البقرة / ٢٨٢ .

[8] وەلامی مەرجە، دڵی بکەری خراپە و گوناهە.

[9] سورة البقرة / ٢٨٣ .

[10] المحلى ٨/ ٨٠ – ٨١ (گەر قەرزەکە بۆ ماوەیەك بوو ئەوا لەسەر هەردووکیان(هەردوو گرێبەستکارەکە) فەرزە بینووسن و دوو شایەتی دادپەروەر و سەرو دادپەروەری لەسەر بگرن، یان پیاوێك و دوو ژنی دادپەروەر و سەرو دادپەروەر، گەر ئەوە لە سەفەرەکەیدا بوو و نووسەرێکی نەبینییەوە ئەوا قەرزدەر سەرپشك دەکرێت لە نێوان بارمتە یان نەبوونی بارمتە، ←

بۆ پێویستبوون و دروست نییە لادەین بۆ مەجاز گەر حەقیقەت نەگونجاو بوو، ئەو نەگونجانە لەم دوو ئایەتەدا بوونی نییە.

بەڵام ئەم گشتگیرییە تەنها بەسەر گرێبەستێکدا پیادە دەکرێت جێگەکەی بەبایەخ بێت لەڕووی دارایی و ئابوورییەوە بەجۆرێك متمانەگری نەکردنی بە تۆمارکردن یان شایەت لەسەری رووبەڕووی جیاوازی و ناکۆکی و دوژمنایەتی بکاتەوە لە داهاتوودا.

جمهوری فەقیهان ئەو فەرمانە باسکرلوانەیان هەڵدلوەتە سەر رێنموونی یان هەڵیاندلوەتە سەر پەسەند(ندب) سەرەڕای ئەو قسەیان کە هەموو فەرمانێك حەقیقەتە لە پێویستبووندا، گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە.

ئەوان پێیان وایە نیمچەبەڵگەیەك بوونی هەیە ئەو فەرمانانە لە مانای حەقیقی(پێویست) لادەدات، ئەوەش بریتییە لە کاری پێشینی سالَح کە قەرزیان کردووە بەبێ تۆمارکردنی قەرزەکە، هەروەها فرۆشتنیان کردووە بەبێ تۆمارکردن و شایەت، سەرباری ئەوە چاودێری کردنی شێوەگری بارگرانی و ناڕەحەتییە و قورئان

---

هەموو ئەوانە لە قەرزی دەمودەستدا پێویست نییە نە لە سەفەردا نە لە نیشتەجێبووندا، بورهانی ئەمەش ئەم ئایەتەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ... الآية﴾گەر قەرزەکە دەمودەست بوو یان کاتەکەی هاتە بەرەوە ئەوا بۆ قەرزدەر هەیە داوای قەرزەکەی بکاتەوە و بۆ داوەریش هەیە ناچاری بکات بۆ وەفاکردن بە قەرزەکە جا ئەوە لەو شوێنەدا بێت کە قەرزەکەیان تێدا رێکخست یان نە، بەڵام قەرزدەر ناچار ناکرێت بە قبوولکردنی قەرزەکەی تەنها لەو شوێنەی قەرزەکەیان تێدا رێکخستووە، بورهانی ئەوە: دواخستنی قەرز لەلایەن دەوڵەمەندەوە ستەمە.

وفي تفسير القرطبي ٣/ ٤٠٢ (لە ئیبراهیمەوە دەڵێت: شایەت دەگرم گەر شتێکم بفرۆشتبایە یان شتێکم بکڕیبایە با گورزە باقلەیەکیش بێت، لەوانەی رایان بەم جۆرەیە و پارسەنگی دەدات "الطبري"ە، دەڵێت: حەلاڵ نییە بۆ موسڵمانێك کاتێك دەفرۆشێت یان دەکڕێت شایەت نەگرێت، ئەگەر نە سەرپێچی کردووە لە کتێبەکەی خودا، هەر بەو جۆرە گەر بۆ ماوەیەك بوو لەسەریەتی بینووسێت و شایەت دیاری بکات گەر نووسەری بینییەوە).

ئەو دوانەش رەد دەكاتەوە ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1] هەروەها دەفەرمویَت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2].

لە دیدی منەوە ئەم ئاراستەی جمهوری فەقیهان گەر لە چاخی زێرینی ئەواندا دروست بوویێت ئەوا بۆ چاخی نویێ و ئەو چاخانەی بەدوایدا دێن گونجاو نییە، چونكە رەچاونەكردنی شێوەگری لە چاخی ئەواندا بۆ ئەم هۆیانە دەگەڕێتەوە:

أ.ژیان لەو سەردەمەدا سەرەتا و سادە بوو گەر بە ژیانی ئابووری پەرەسەندووی ئالۆزی ئەمڕۆی ئێمە بەراورد بكرێت، لەو كاتەدا پێویست بە متمانەگری نەبوو لە مامەڵەكانیاندا.

ب–گیانی ئایینی لە سەردەمی ئەواندا بەهێز بوو، ئەمانەت و متمانە لەناو خەڵكیدا دوو سیفەتی بەربڵاوی زاڵ بوون بەسەر سیفەتە ناباشەكانی دڵی مرۆڤ، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە لەسەرینی لە زاڵبوونی ژیانی مادیانە بەسەر ژیانی مەعنەویدا، بەجۆرێك مرۆڤ بە رێگەی رەوا و ناڕەوا پەلاماری كۆكردنەوەی ماڵ و دارایی دەدات، بینا لەسەر ئەم راستییە رۆشنانە ئەوەی یاسای دانراو لەسەریەتی لە بەمەرجگرتنی تۆماركردن و متمانەگری لە گرێبەستە هاتووەكان بەسەر ماڵ و سامانی بەنرخدا و هەروەها لە قەرزێك كە هەند و بڕی زۆر و گەورەیە پڕاوپڕە لەگەڵ ئەوەی قورئان رایدەگەیەنێت پێش یاسا بە چەندین سەدەیەك.

ج–لە رەچاونەكردنی شێوەگری لە هەندێ لە گرێبەستەكاندا لەم سەردەمەدا بارگرانی و ناڕەحەتی دروست دەكات، چونكە قەرزی متمانەگیرلو و گرێبەستی تۆمارنەكرلو بەزۆری سەردەكێشێت بۆ سەرهەڵدانی ناكۆكی و دوژمنایەتی كە سەرئەنجامە نەرێنییەكانی بریتین لە بارگرانی و ناڕەحەتی بۆ خەڵكی.

لەسەر نووسەری داد و فەرمانگەی تایبەتكرلو پێویستە خانووبەرە و قەرز تۆمار بكەن وەك وەلامدانەوەیەك بۆ دلوای هەركەسێك متمانەگری قەرزەكەی یان

---

[1] سورة الحج / ٧٨ .

[2] سورة البقرة / ١٨٥ .

گرێبەستەکەی دەوێت، چونکە لە قورئاندا بە پێویستبوون فەرمان بەوە کرلوە، داوای کرێ(پاداشت) لەسەر "واجب" دروست نییە، بەلاّم لە هەمان کاتدا گەر ئەم کارە فەرمانگەیەکی بۆ تایبەت کرا، ئەوا خەرجی بەرێوەبردن و بەردەوام بوون پێویست دەکات، سەریاری مووچەی فەرمانبەران، بۆیە وەرگرتنی باجی تۆمارکردن دروستە پالّپشت بەو داواکارییە داراییانە، لە ئایەتی﴿وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ﴾، ئەگەری سێ مانای هەیە[1]:

یەکەمیان: نووسەرەکە رێگر نەبێت لە نووسینی و شایەتیش رێگر نەبێت لە شایەتیدان بەبێ پاساوێك، چونکە نووسین و شایەتیدان فەرمانیان پێکراوە و ئەو دوانە لە دەروازەی هاوکارییە لەسەر چاکە بۆ پارێزگاری لە تیاچوونی مافەکان و دوورخستنەوەی ناکۆکی و دوژمنایەتی و کێبەرکێ، چونکە رێگری زیان بە خاوەنی ماف دەگەیەنێت.

دووەم: نووسەر شتێك نانوسێك پێینەوترابێت و شایەتیش شتێك لەسەر شایەتیدانەکەی زیاد ناکات، و هەر بەو جۆرە شتێکی لێ کەم ناکات، ئەگەر نە زیان بە خاوەن ماف دەگەیەنن.

سێیەم: زیان بە نووسەر و شایەت ناگەیەنرێت و ناچار ناکرێن لەسەر نووسین و شایەتی گەر پاساویان هەبوو، بۆیە گەر تووشی زیان بوون پێویستە لەسەر خاوەن ماف ئەو زیانەیان بۆ قەرەبوو بکاتەوە، وەك زیانی وازهێنان لە کارەکانیان یان کرێی رێگە و هاوشێوەکانی ئەمانە.

فەرمانی "لا يضار" لەسەر دوو مانای یەکەم "مبني للفاعل"ە ریشەکەی "لا يضارر-بكسر الراء الأولى" پاشان "إدغام" روویداوە و "الراء" لە "جزم"دا فەتحەی وەرگرتووە بەهۆی سووکبوونی فەتحەوە، لەسەر مانای سێیەم فەرمانەکە "مبني

---

[1] ينظر القرطبي ٣/ ٤٠٥ – ٤٠٦ .

للمفعول"ە و ریشەکەی"لا یضار–بفتح الراء الأولى" پاشان "إدغام" و فەتحی "الراء" لە "جزم"دا.

هەندێ پێیان ولیە[1]: ئەم بەشەی ئایەتە پیرۆزەکە ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ﴾ ئەوەی پێش خۆی سڕیوەتەوە کە فەرمان کردنە بە نووسین و شایەتی و بارمتە، ئەم سێ ڕێگەیە بۆ متمانەگری قەرزی ماوە بۆ دیاریکراو و گرێبەستی فرۆشتن، ئەمەش هەڵە و تێکەڵییەکە لە نێوان سڕینەوە(نسخ) و تایبەتکردنی گشتیدا یان سڕینەوە و سنووردارکردنی ڕەهادا، چونکە شێوازی فەرمانەکانی پێشوو گشتی یان ڕەهان، گشتی تایبەت کرد و ڕەهای سنووردارکرد بەم مەرجە، تایبەتکردن یان سنووردارکردن بە مەرجەوە لە ڕێسا ئوسوڵییەکانە کە کۆدەنگیان لەسەرە.

ئەو قسەیەش کە فەرمانی هاتوو لەو دوو ئایەتەدا بۆ پەسەند(ندب)ە بە نیمچەبەڵگەی سەرپشك کردنی هاتوو لەم بەشەی ئایەتەکەدا﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ قسەیەکی هەڵەیە بەهۆی نەبوونی سەرپشککردنەوە لەم مەرجەدا، بەڵکو ئەوە بۆ تایبەتکردنە گەر فەرمانە پێشووەکان گشتی بن یان بۆ سنووردارکردنە گەر فەرمانەکانی پێشوو بە ڕەها دابنرێن، هەر بەو جۆرەی ئەو قسەی

[1] في القرطبي ٣/ ٤٠٤ (("الهدوي و النحاس و مكي" لە دەستەیەکەوە دەگێڕنەوە کە وتوویانە:﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ نەسخکراوە بە ﴿إِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾ الآية "النحاس"لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ﴾ تا ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾ الآية وتی ئەم ئایەتە پێش خۆی نەسخکردۆتەوە، "النحاس"دەڵێت ئەمە قسەی"الحسن و الحكم و عبدالرحمن بن يزيد"ە "الطبري" دەڵێت: ئەمە مانای نییە چونکە ئەم حوکمە جیایە لەوەی سەرەتا، بەڵکو ئەمە حوکمی ئەو کەسەیە کە نووسەری نەبینیوەتەوە، گەر دروست بولیە ئەمە نەسخکەر بولیە ئەوە دروست بوو فەرموودەکەی–عز وجل– ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ﴾ نەسخکەری ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ﴾ بولیە، هەروەها دروست بوو ئایەتی ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ نەسخکەری ئەم بەشەی ئایەتەکە بولیە ﴿تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ﴾)).

کە دەڵێت لە دەروازەی سوککردن و روخسەتە قسەیەکی هەڵەیە، بۆیە "واجب"بوون لەسەر حاڵی خۆی ماوەتەوە تایبەت بە هەر گرێبەست و قەرزێك کە دەبنە جێگەی جیاوازی و ناکۆکی بەهۆی ئەوەی جێگەی گرێبەستەکە ماڵێکی بەنرخ بێت، وەك خانوویەرە یان فرۆکە یان کەشتی یان ئۆتۆمبێل و بڕی قەرزەکە زۆر بێت، بەجۆرێك گەر متماگری بۆ نەکرێت جیاوازی لە نێوان دوو گرێبەستکارەکەدا یان لە نێوان میراتگرانیاندا سەرهەڵبدات.

**بەری دابەشکردن:**

لەسەر دابەشکردنی سیانی بۆ گرێبەست لەڕووی پێکهاتنەیەوە بۆ رازیبوونی و بەرچاوی و شێوەگری ئەم ئەنجامانە سەرهەڵدەدەن:

١-گەر گرێبەستەکە رازیبوونی بوو ئەوا لەگەڵ دامەزرانی ئاساری شەرعی(یان یاسایی) لەسەری سەرهەڵدەدات لە مافەکان و ئەرکەکان تایبەت بە دوو گرێبەستکارەکە و کەسانی تریش، لەو سۆنگەیەوە کە هەڵسوکەوتێکی شەرعی(یان یاسای)یە، گەر رێگرێك بوونی نەبوو وابکات ئەو سەرهەڵدانە روونەدات، وەك لە گرێبەستی راگیراودا، هەموو گرێبەستێکی رازیبوونی بە دروستی دادەمەزرێت، بەڵام ئاساری لەسەر سەرهەڵنادات بەهۆی رێگرێکەوە، ئەو رێگرەش بریتییە لە پەیوەستبوونی ماف کەسانی تر پێیەوە.

٢-گەر شێوەگری بوو، ئەوا شێوەگری یان پایەیە وەك لە فرۆشتنی خانوویەرەدا لە یاسای عێراقیدا[1]، گەر ئەو پایەیە لێی دواکەوت سەردەکێشێت بۆ پووچەڵبوونەوەی گرێبەستەکە، یان مەرجی تەواوبوونە وەك هەڵسوکەوتی خانوویەرەیی لە یاسای میسریدا، ئەو گرێبەستە بە دروستی دادەمەزرێت و پابەندبوون رێکدەخات لەسەر خاوەن خانوویەرە بە گواستنەوەی موڵکدارییەکەی بۆ کڕیار بە تۆمارکردنی لە فەرمانگەی ئاشکراکردنی خانوویەرە.

---

[1] م ٥٠٨ من المدني العراقي رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١ و م ٣ من قانون التسجيل العقاري.

یان شێوەگرییە بۆ مەرامی جێگیرکردن، وەك لە تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری و گرێبەستی وەسێت لە تۆمارە قەزاییەکاندا[1].

٣-گرێبەستی بەرچاو: درلوەتە پاڵ چاوگەی جێگەکە، ئەوەش لە شێوازەکانی دانەپاڵی هەمووە بۆ لای بەش، وەسفکردنی بە بەرچاو لەسەر ئەو بناغەیە کە تەنها بە رادەستکردنی شتە بەرچاوەکە تەواو دەبێت، لەسەر گوزارەی "تەواو نابێت" جیاوازی سەریهەڵداوە، هەر کەس بە "دانامەزرێت" لێکدانەوەی بۆ کردووە دەڵێت: رادەستکردن پایەیەکە، لەڕاستیدا گرێبەستی بەرچاو سیفەتێکی دوو لایەنەی هەیە، ئەو ناوەندە لە نێوان گرێبەستی رازیبوونی و گرێبەستی شێوەگریدا، لەرووی دامەزرانەوە رازیبوونییە، بۆیە دەستبەسەرداگرتن نە پایەیە و نە مەرجە تیایدا وەك پێشتر لە پێنج گرێبەستە زانراوەکەدا ئەمەمان یەکلاکردەوە، بەوەی تەنها بە دەستبەسەرداگرتن تەواو دەبێت، لەم رووەوە بە گرێبەستی رازیبوونی دادەنرێت، بەڵام هەموو ئاسارەکانی لەسەر سەرهەڵنادەن مەگەر لەدوای دەستبەسەرداگرتن، لەم رووەوە بە گرێبەستێکی شێوەگری دادەنرێت، چونکە پێدان و دەستبەسەرداگرتن لە کارە روواڵەتییەکانە کە تەواوی ئاساری لەسەر دەوەستێت.

بینا لەسەر ئەوە پێناسەی گرێبەستی بەرچاو ئەوەیە کە گرێبەستێکە بۆ دامەزرانی تەنها ئەرێکردن و قبووڵ کردن بەس نییە، بەڵکو لەسەرو ئەوەوە یەکگرتنی دوو ویستەکە بە رادەستکردنی شتەکە(بابەتی گرێبەستەکە) لە یەکێکیانەوە بۆ ئەویتریان[2] پێویست دەکات، ئەم پێناسەیە پێناسەیەکی نادروستە لە ترازووی شەریعەتی ئیسلامدا کە بڕیاری دامەزرانی گرێبەست دەدات تەنها بە ئەرێکردن و قبووڵ کردن گەر دەقێك پێچەوانەی ئەوە بوونی نەبێت.

---

[1] م ١٠ گرێبەستی هاوسەرگیری لە دادگای تایبەتکراو تۆمار دەکرێت بەبێ رەسم لە تۆماری تایبەت، هتد... م ٦٥ لبە وەسێت دانانرێت بە بەڵگەیەکی نووسراو نەبێت، هتد..

[2] الدكتور سليمان مرقس اصول الالتزامات ص ٤٠ .

# مەبەستی دووەم:
# لەڕووی چۆناندنەوە

گرێبەست لەڕووی وەسفی شەرعی(یان یاسای)یەوە لای جمهوری فەقیهان دابەش دەبێت بە دابەشبوونێکی چواری، بۆ: پووچەڵ و دروست و راگیرلو و ڕێپێدرلو(جێبەجێکاری ناپێویست) یان قابیلی پووچەڵکردنەوە و جێبەجێکاری پێویست، هەروەها دابەشکردنێکی پێنجی لای حەنەفییەکان[1] و ئەوانەی لەگەڵیان هاوڕان، بۆ: دروست و نادروست، نادروستیش دابەش دەکەن بۆ پووچەڵ و تێکچوو، هەروەها دروست دابەش دەکەن بۆ راگیرلو و ڕێپێدرلو(ناپێویست) و جێبەجێکاری پێویست، هەروەها دابەشبوونێکی سیانی لە فیقهی خۆرئاواییدا.

بۆچوونەکانی فەقیهانی شەریعەت و یاسا لە دیاریکردنی ئەم دابەشکردنانەدا لەیەکتر جیاوازن لەبەر رۆشنایی چۆناندنی گرێبەست لەڕووی وەسفی شەرعی و یاساییەوە، بەم جۆرە:

## یەکەم: دابەشکردنی چواری:

جمهوری فەقیهانی ئیسلام دابەشکردنی چوارییان بۆ گرێبەست هەڵبژاردووە بۆ: پووچەڵ و دروست و دروستیش دابەش دەبێت بۆ راگیرلو و جێبەجێکاری ناپێویست و جێبەجێکاری پێویست.

---

[1] ينظر تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق للزيعلي (عثمان بن علي) ٤/٧٣.
وبدائع الصنائع للكاساني ٣٢٢٣/٧، تیایدا هاتووە(فرۆشتن لەپای حوکمدا خاڵی نییە لەوەی یان دروستە یان تێکچووە، یان پووچەڵە، یان راگیرلوە، دروست خاڵی نییە لەوەی یان هەڵبژاردەی تێدایە یان هەڵبژاردەی تێدا نییە)
تێبینی دەکرێت لەسەر قسەکەی "الكاساني" راگیرلوی کردووە بە هاوبەشی دروست ئەمەش جیایە لە ئاراستەی باو لە مەزهەبەکەیدا، ئەوەش ئەوەیە کە راگیرلو بەشێکە لە دروست.

أ-گرێبەستی پووچەڵ:

ئەو گرێبەستەیە یەکێك لە پایە شەرعییەکانی(یان یاساییەکانی) یان مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزرانی لیّ دواکەوتبێت، گرنگترینیان ئەرێکردن و قبوولکردنە لە کاروبارە جەوهەرییەکاندا و یەکگرتنی دانیشتنەکە و فرەیی گرێبەستکارەکان و جیاکردنەوەی بریتیدانەکان و ژیری لە بەخشینەکاندا و جێگەکە(شتەکە) دیاریکراو بێت یان گونجاو بێت بۆ دیاریکردن و گونجاو بێت بۆ مامەڵەپێکردن و بتوانریّ رادەست بکرێت، گەر توخمێك لەم توخمانە دواکەوت گرێبەستەکە پووچەڵە، پووچەڵ و نەبووش یەکسانن، بۆیە ئاساری شەرعی(یان یاسایی) ئەسڵی لەسەر پەیدا نابێت بە سەرنجدانی وەك ئەوەی هەڵسوکەوتێکی شەرعی یان یاسایی بێت، بەلاّم هەندیّ جار لقە ئاساری لەسەر پەیدا دەبێت بەو پێیەی کە رووداوێکی یاساییە.

ب-گرێبەستی راگیراو:

ئەو گرێبەستەیە دروست دادەمەزرێت بەهۆی فەراهەمبوونی مەرجەکانی دامەزران و دروستییەوە، بەلاّم ئاساری شەرعی(یان یاسایی) لەسەر پەیدا نابێت، بەهۆی بوونی رێگرێکەوە کە رێگری لەوە دەکات، کارکردن بە پێی رێسای(گەر رێگر و دلواکەر بەرهەڵستی یەکتریان دەکرد ئەوا رێگر پێشدەخرێت)[1]

گرێبەستی راگیراو ئەو گرێبەستەیە بە دروستی دامەزراوە، بەلاّم ئاسارەکانی راگیراون، واتە مافەکان و ئەرکەکانی تەنها دوای مۆڵەت لەو کەسەی مۆڵەتی بەدەستە سەرهەڵدەدەن، گرێبەست لە یەکێك لەم حاڵەتانەدا راگیراوە:

حاڵەتی یەکەم: یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە لێوەشاوەیی ناتەولو بێت، واتە چووبێتە ناو تەمەنی جیاکردنەوە، بەلاّم نەچووبێتە ناو تەمەنی پێگەیشتنەوە.

حاڵەتی دووەم: نەبوونی ولایەتی گرێبەستکار بەسەر گرێبەست لەسەرکراودا، وەك فرۆشتنی فزولیانە، بەوەی کەسێك ماڵی کەسێکی تر بەبیّ نوێنەرایەتی شەرعی یان

---

[1] م/٤٦، مجلة الأحكام العدلية.

یاسایی یان ڕێکەوتنی بفرۆشێت، یان بەبێ نوێنەرایەتی ئەو ماڵێکی بۆ بکڕێت.

حاڵەتی سێیەم: هەڵسوکەوت لە ماڵێکدا کە مافی کەسانی تری، پێوە بەستراوە، وەك فرۆشتنی بارمتەکراو لەلایەن قەرزدەری بارمتەگرەوە بەبێ مۆڵەتی بارمتەدەر، یان وەسێت بە زیاتر لە سێ یەك لە لێجێماودا.

گەر مۆڵەتی پێدرا لەلایەن ئەو کەسەوە کە مافی مۆڵەتی بۆ هەیە و مەرجەکانی ئەو مۆڵەتە فەراهەم بوون ئەوا ڕێگر هەڵدەگیرێت و ئاساری شەرعی(یان یاسایی) لەسەری سەرهەڵدەدات بە ئەسەرێکی گەڕاوە، واتە لە بەرواری سەرهەڵدانی نەك لە کاتی مۆڵەتدانەکەوە، کارکردن بە ڕێسای(گەر ڕێگر هەڵگیرا ڕێپێنەدراو دەگەڕێتەوە)[1]

ئەو لایەنەی جێگەی گرێبەستەکەی بۆ دەگوێزرێتەوە مەڕەکانی خۆی بۆ خۆیەتی و باجەکەشی لەسەریەتی(ئاماژە بە فەرموودەکەی پێغەمبەر دەکات) لە بەرواری سەرهەڵدانییەوە.

بۆ ڕاگیرانی گرێبەست زۆرێك لە هۆ بوونیان هەیە[2]، ئەو هۆیانە لە ڕاستەقینەیاندا ڕێگرن وەك باسمان کرد، دەتوانین هەر هەموویان بۆ سێ هۆی سەرەکی بگێڕینەوە کە ئەمانەن:

١–نەبوونی سەرپەرشتیاری گرێبەستکار بەسەر جێگەی گرێبەستەکەدا وەك لە هەڵسوکەوتی فزولیانەدا[1].

---

[1] م/٢٤، مجلة الأحكام العدلية.

[2] فتح القدير ٦/٤٠٠ (گرێبەستی ڕاگیراو پازدە دانەیە: فرۆشتنی منداڵی دەستگیراو بەسەردا ڕاگیراوە لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیار یان وەسێتدار، فرۆشتنی ناکامڵ ڕاوەستاوە لەسەر مۆڵەتی قازی، فرۆشتنی بارمتەکراو بەکرێدراو و ئەوەی لە بەکشتوکاڵکردنی کەسانی تردایە ڕاگیراوە لەسەر مۆڵەتی بارمتەگر یان بەکرێدەر یان جوتیارەکە، فرۆشتنی فرۆشیار بۆ شتی فرۆشراو لەسەر مۆڵەتی کڕیار ڕاگیراوە، ...تا کۆتایی)

ڕۆشنە ئەم بەشانە و بەشەکانی تریش دەگەڕێنەوە بۆ سیان کە باسمان کرد، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ تەنها دوو هۆ، ئەو دوانەش ناتەواوی لێوەشاوەیی گرێبەستکار و پەیوەستبوونی مافی کەسانی تر بە گرێبەست لەسەرکراوەکە.

٢-نەبوونی سەرپەرشتیاری گرێبەستکار بەسەر جۆری هەڵسوکەوتەکەدا وەك لە گرێبەستی شایستە ناتەواودا.

٣-پەیوەستبوونی مافی کەسانی تر بە جێگەی گرێبەستەکەوە، وەك وەسێت بە زۆرتر لە سێیەکی لێجێماوەوە، بۆیە زیادە لە سێیەك لەسەر مۆڵەتی میراتگران وەستاوە لەدوای مردنی وەسێتکەر ئەمەش وەك دوورکەوتنەوە لە ناچارکردنی مەعنەوی، هۆی راوەستانەکە بریتییە لە پەیوەستبوونی مافی میراتگران بە لێجێماوەوە، بۆیە فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی کە بەخشینەکانی نەخۆش بە نەخۆشی مردن دەچێتە ژێر حوکمەکانی وەسێتەوە، هەروەها وەك گرێبەستی فزولیانە و تێپەڕاندنی بریکار لە سنووری بریکارییەکەی، و تێپەڕاندنی وەسێتکەر لە سنووری وەسێتدارییەکەی و فرۆشتنی بارمتەکراو بەبێ مۆڵەتی قەرزدەری بارمتەگر، هەروەها فرۆشتنی بەکرێدراو بەبێ مۆڵەتی کرێگرتە، هەروەها گرێبەستی نزیکبوو بە هەڵبژاردنی مەرج.

---

[١] شافیعی و زاهیرییەکان رێگریان لێکردووە چ فرۆشتن چ کڕین، ئیمامی مالیك رێگەی پێداوە لە هەردوو بارەکەدا، ئەبو حەنیفە جیاوازی کردووە لە نێوان فرۆشتن و کڕیدا، لە یەکەمیاندا رێگەی پێداوە و لە دووەمیاندا پێویستی بە جیاکردنەوەیە، گەڕانەوەی جیاوازییەکە بۆ دواکەوتنی پایەی جێگەکە دەگەڕێتەوە لەلای شافیعی، جیاوازی مالیك و ئەبی حەنیفە بۆ شرۆڤەی فەرموودەکەی "عروة البارقي" دەگەڕێتەوە، کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دینارێکی پێدا تاکو کاوڕێکی پێ بکڕێت، ئەویش دوو کاوڕی پێ کڕی، یەکێکیانی بە دینارێك فرۆشت و دینارەکە و کاوڕەکەی تری هێنا بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: (خودایە بەرەکەت بخە ناو سودای خێریەوە)، بۆیە ئیمامی مالیك دەفەرموێت: هەڵسوکەوتی فزولی بەسەر کڕین و فرۆشتنەکەی عوروەدا جێبەجێ دەبێت، ئەوەی باوە ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: تەنها بەسەر فرۆشتنی یەکێك لە دوو کاوڕەکەدا جێبەجێ دەبێت، لە "شرح المنهاج"ی "زکریا الأنصاري الشافعي"دا ٣/٣٢ هاتووە: (فرۆشتنی فزولی دروست نییە با خاوەنەکەش مۆڵەتی بدات بەهۆی نەبوونی سەرپەرشتیاری بەسەر گرێبەست لەسەرکراودا).

ج-گرێبەستی ڕێگەپێدراو(جێبەجێکاری ناپێویست):

ئەمەش هەندێ جار لەگەڵ گرێبەستی قابیل بە هەڵوەشاندنەوە یان هەڵوەشاندنەوەی ڕێژەیی لە فیقهی خۆرئاواییدا یەکدەگرنەوە، هەندێ لە زانایانی یاسا تێکەڵیان لا دروست بووە لە نێوان گرێبەستی ڕاگیراو لە فیقهی ئیسلامیدا و گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوە لە فیقهی خۆرئاواییدا، گەیشتوونەتە ئەو قسەیەی کە دووەم مۆڵەتی لەگەڵدایە وەك یەکەم، لە کاتێکدا سروشتی مۆڵەت لە هەردووبارەکەدا جیاوازە، مۆڵەت لە گرێبەستی ڕاگیراودا وەك بریکاری پێشینە وایە، کە پێکدەهێنرێت بۆ سەرهەڵدانی ئاسار، لە کاتێك مۆڵەت لە گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە بە مانای تێپەڕاندن یان سەرپشکی دێت، مەبەست لێی پێویستبوونی گرێبەست و ڕووبەڕوو نەبوونەوەی بە هەڵوەشانەوە، پاشان مۆڵەت لە گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە قابیلیەتی پووچەڵکردنەوە بۆ بەرژەوەندی ئەوە، لە کاتێکدا مۆڵەت لە گرێبەستی ڕاگیراودا هەندێ جار لە خودی گرێبەستکارەکەوەیە، وەك گرێبەستی ڕاگیراو بۆ ناچارکردن لەلای ئەوانەی ڕایان لەسەریەتی، یان وەك گرێبەستی شایستە ناتەواو گەر گەیشتە تەمەنی کامڵبوون دوای گرێبەستەکە و پێش مۆڵەتەکە، لەوانەیە لە کەسانی ترەوە بێت جگە لە گرێبەستکار وەك سەرپەرشتیار و وەسێتدار لە گرێبەستی شایستە ناتەواودا، هەروەها بریکارگر لە تێپەڕاندنی بریکار لە سنووری بریکارییەکەیدا، و خاوەن موڵك گەر کەسانی تر بەبێ مۆڵەتی پێشینەی ئەو هەڵسوکەوتیان لەماڵەکەیدا کرد، هەروەها قەرزدەر لە فرۆشتنی بارمتکراوەکەدا و کرێگرتە لە فرۆشتنی شتە بەکرێگیراوەکەدا و هاوشێوەکانی ئەمانە.

سەرباری ئەوە بێدەنگی لە قابیل بەپووچەڵبوونەوە ماوەیەکە یاسا یان عورف دیاریدەکات، قابیلییەتی پووچەڵبوونەوەکە هەڵدەگرێت و دەیگۆڕێت بۆ پێویست، گەر ئەو ماوەیە تێپەڕی بەپێچەوانەی بێدەنگبوون لە گرێبەستی ڕاگیراو ئەوا بە مۆڵەت دانانرێت گەر نیمچە بەڵگەیەك لەسەر ئەوە بوونی نەبوو، بینا لەسەر ئەم

جیاوازیە جەوهەریانە مۆڵەت لە گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوە جیایە لە مۆڵەت لە گرێبەستی ڕاگیراودا.

هۆیەکانی ناپێویستی گرێبەست زۆرن، هەیانە خودییە و سەرچاوەکەی سروشتی گرێبەستەکەیە، هەیانە لایەلایە دەگەڕێتەوە بۆ لابەلا دەرەکییەکان لە چییەتی گرێبەست، هۆکارە لابەلاکان هەیانە بەویستە و هەیانە بێویستە، لە هەموو بارەکاندا یان لە گرێبەست پێشکەوتوون یان هاودەمن پێی یان دوایکەوتوون.

لەو گرێبەستانەی بە سروشتی خۆیان ناپێویستن بۆ دوو گرێبەستکارەکە گرێبەستی هاوبەش و بریکاری و وەسیەت و خواستن و بەخشین پێش خاڵیبوونەوە.

بنچینەی ناپێویستبوونی ئەم گرێبەستانە ئەوەیە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە خاوەنی بەرژەوەندییە و هەرکات بیەوێ دابەزینی بۆ هەیە لێی، ئەویتریان خۆبەخشە و بۆی هەیە واز لە خۆبەخشییەکەی بهێنێت هەر کات ویستی، بۆ نموونە لە گرێبەستی بریکاریدا، بریکارگر خاوەنی بەرژەوەندییە و بریکارەکە خۆبەخشە، بۆ یەکەمیان هەیە دووەم کەنار بدات هەر کات ویستی با بێ زانستی ئەویش بێت، دووەمیش وازهێنانی بۆ هەیە لە بریکارییەکەی هەر کات ویستی، بە مەرجێ مافی کەسی تری پێوە پەیوەست نەبێت، ئەگەر نە بە ویستێکی یەکلایەنە لە هیچ کام لەو دوانەوە هەڵوەشانەوەی دروست نییە، هەروەها دەبێ بە کرێیەك نەبێت، ئەگەر نە دەکەوێتە ژێر ڕێسا و حوکمەکانی گرێبەستی بەکرێگرتنەوە.

شایانی باسە هەڵوەشانەوە لە هەموو گرێبەستە باسکراوەکاندا بە ویستی یەکلایەنە زیان نەگەیاندن بە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە یان بە کەسانی تر بەمەرجگیراوە.

لەو گرێبەستانەی بۆ یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکان پێویستە بۆ ئەویتریان ناپێویست بەپێی سروشتی گرێبەستەکە بریتییە لە: گرێبەستی بارمتە، و گرێبەستی دەستەبەری، بۆیە بارمتە پێویستە تایبەت بە قەرزداری بارمتەدەر، چونکە گرێبەستەکەی بۆ دەستەبەری قەرزی قەرزدەرەکەیە، بۆیە مافی هەڵوەشانەوەی بۆ

نییە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی، بە پێچەوانەی قەرزدەری رەهنگرەوە، ئەو خاوەنی بەرژەوەندییە و دابەزینی بۆ هەیە لێی و دەتوانێ بە ویستی یەکلایەنەی خۆی و شانداد‌ان لەسەر متمانە بە قەرزداری بارمتەدەر بارمتەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

هەریەوجۆرە دەستەبەری گرێبەستێکی پێویستە تایبەت بە دەستەبەرکەر، بۆیە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی هەڵوەشانەوەی بۆ نییە، بەڵام "بۆدابینکراو" مافی ئەو هەڵوەشانەوەی هەیە، چونکە بۆ بەرژەوەندی ئەو بڕیاری لێدراوە، هەر کات بیەوێت دەتوانێت لێی دابەزێت گەر ئەو کارەی زیان بە کەسانی تر نەگەیەنێت.

نەنگییە شارلوەکان لە بەرهەڵستییە پێشینەکانە لەسەر گرێبەست، گەر کڕیار نەنگییەکی پێشینەی لەسەر دەستبەسەرداگرتن بینییەوە لە فرۆشرلوەکەدا بەجۆرێك بەهایەکەی کەم بکات لە عورفی بازرگانەکاندا ئەوا سەرپشکی بۆ هەیە لە نێوان واژووکردنی(تێپەڕاندنی) گرێبەستەکە بە هەموو نرخەکەیەوە لەگەڵ قبوولکردنی نەنگییەکە یان هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە[1]، بەڵام گەر رێگرێك بۆ هەڵوەشاوەکە بەرهەم هات ئەوا بۆ کڕیار هەیە جیاوازی بەهاکە لە نێوان بەهای فرۆشتن بە بێنەنگی و بەهای فرۆشتن بە نەنگییەوە وەربگرێت[2]، لە بەرهەڵستییە هاودەمەکان بە

---

[1] في تبيين الحقائق للزيلعي ٤/٣١: (هەرکەس نەنگییەکی لە فرۆشراودا بینییەوە بە هەموو نرخەکە وەریدەگرێت یان رەدی دەکاتەوە، چونکە دلواکاری گرێبەست سەلامەتی لە نەگی دلوا دەکات، بۆیە سەلامەتی وەك بەمەرجگیرلو ولیە لە گرێبەستدا راشکاوانە چونکە بە عادەت دلواکراوە، بۆیە لە کاتی نەبوونیدا سەرپشك دەکرێت تاکو زیانی پێ نەگات)

[2] في شرح المنهج لشيخ الإسلام زكريا الأنصاري ٣/١٣٣: (گەر لە دوای دەستبەسەرداگرتنی کڕیار فرۆشراوی ناسووخۆری تیاچوو بە جۆرەکەی فرۆشتنە یان لەڕووی شەرعەوە وەك ئەوەی رایگرتبێت پاشان نەنگییەکی تێدا بینییەوە، ئەوا گێڕانەوەیەك لە نرخەکەی بۆ هەیە بە هۆی نەتوانی گێڕانەوەی فرۆشرلوەکە چونکە تیاچووە، ئەوەی وەریدەگرێتەوە لە بەهاکە پێی دەوترێت "أرش"چونکە پەیوەندی بە نەیارییەوە هەیە، بۆیە "أرش" بەشێکە لە نرخی فرۆشرلوەکە رێژەکەی بۆ فرۆشرلوەکە وەك ئەو رێژەیە ولیە نەنگییەکە لە بەهاکەی دابەزلندووە کاتێك فرۆشرلوەکە سەلامەت بولیە، گەر بەهاکەی بەبێ نەنگی سەد بێت و بە نەنگییەکەوە نەوەد بێت ئەوا "أرش"ەکە دەیە، واتە دەیەکی نرخەکەی)

گرێبەستی نەویست بریتییە لە نەنگییەکانی رازیبوون کە سیانن: ترس لەباری زۆرلێکردندا، و هەڵەی راستەوخۆ یان بەهۆی فریودانەوە کە سەربکێشێت بۆ ستەمی گەورە، هەروەها باری دەروونی کەسی پێشێلکار بەهۆی ئارەزووەوە یان نەشارەزایی یان پێویستی و هاوشێوەکانی ئەمانە، ئەوەی باوە لە لێکدانەوەی یاساکاندا لەوەی نەنگییەکانی ویست(یان رازیبوون) چوارن: زۆرلێکردن، فریودان لەگەڵ ستەم، هەڵە، و پێشێلکاری، هەموو ئەوانە لە مەنتقی یاساوە رەدکراوەن، بە هەڵواردەی هەڵە، چونکە نەنگی ویستی تێدا راوەستاوە، لە کاتێکدا هەریەك لە زۆرلێکردن و فریودان و پێشێلکاری سیفەتێکی کرداریانەن بەلایەکەی ترەوە راوەستاوە، بۆیە دروست نییە یەکێك لەم دوو سیفەتە بۆ ئەویتریان بەکاربهێنرێت، چونکە هەریەك لەو دوو سیفەتە بە کەسێکەوە راوەستاوە کە جیایە لەو کەسەی سیفەتەکەی تری پێوە راوەستاوە، پاشان بەتەنها فریودان هۆ نییە بۆ سەرپشککردن، بەڵکو هۆی راستەوخۆ بریتییە لە هەڵە کە کەسی گرێبەستکاری فریوخواردوو تێیکەوتووە، بینا لەسەر ئەوە بیرۆکەی هەڵە بێنیازمان دەکات لە بیردۆزەی فریودان.

بەڵام گەر هەڵە لە فریودانەوە سەریهەڵدابوو ئەوا لایەکەی تر شان دەداتە ژێر بەرپرسیارێتی قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی تووشی کەسی فریوخواردوو یان تێکەوتوو هاتووە.

هەروەها لە بەرهەڵستکارە هاودەمەکان بە گرێبەست کە بریتین لە ویستنامێزی هەڵبژاردەکان لەوانە هەڵبژاردەی بینین[1] و هەڵبژاردەی رەخنە و هەڵبژاردەی ستەم، و هەڵبژاردەی دیاریکردن، و هەڵبژاردەی دانیشتن لەلای ئەو کەسانەی بە هەڵبژاردەی

---

[1] هەڵبژاردەی بینین: ئەوەی گرێبەستکار نایبینێت گونجاوە، بۆی هەیە بیگێڕێتەوە کاتێك بینی با پێشتریش رازی بووبێت، هەندێ لە فەقیهان(لەوانە شافیعی) دەڵێن: فرۆشتن دروست نییە چونکە فرۆشراو نادیارە گەر تەنها ناوی غرۆشراوەکەی دەزانی بەڵگەی گونجاوی فەرموودەکەی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) ((هەر کەس شتێکی کڕی کە نەیبینیبوو ئەوا هەڵبژاردەی بۆ هەیە کاتێك بینی)).... الزيعلي، المرجع السابق.

دادەنێن، ئەمانە و زۆرێکی تر لە هەڵبژاردە، بە هەڵواردەی هەڵبژاردەی مەرج، چونکە گرێبەستی هاودەم بە مەرج راگیراوە.

**د-گرێبەستی جێبەجێکاری پێویست:**

ئەو گرێبەستەیە مەرجەکانی دامەزران و جێبەجێکاری و پێویستبوونی تێدا فەراهەم بووە.

**بەری دابەشکردن:**

بۆ دابەشکردنی گرێبەست- لەڕووی وەسفەوە بۆ: پووچەڵ و راگیراو و جێبەجێکاری ناپێویست(رێگەپێدراو) و جێبەجێکاری پێویست، سیانەکەی دوایی بەشەکانی گرێبەستی دروستن- کۆمەڵە ئەنجامێك بەرهەم دێن، گرنگترینیان:

**یەکەم تایبەت بە گرێبەستی پووچەڵ:**

ئەم گرێبەستە لە هەموو بەشەکانی تر جیادەبێتەوە بەوەی بوونێکی شەرعی یان یاسایی بۆ نییە، ئەو و نەبوون یەکسانن و گرێبەستی شەرعی(یان یاسایی) هیچ ئاسارێکی بنەڕەتی لە مافەکان و ئەرکەکان لەسەر رێك ناخرێت، هیچ کام لە دوو گرێبەستکارەکە مافی ئەوەیان نییە ئەویتریان پابەند بکات بە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی، چونکە پابەندبوون نەبووە(معدوم)، و پووچەڵبوونەوەی بە حوکمی شەرع یان یاسایە، بۆیە ئاتاج نییە قازی حوکمی پێ بکات، بەڵام گەر یەکێك لە دوو لایەنەکە پابەندبوونەکەی جێبەجێ کرد پێش زانست بە پووچەڵبوونەوەی گرێبەستەکە و ناکۆکی لە گێڕانەوەیدا سەریهەڵدا ئەوا پێویستە قازی حوکم بە پووچەڵبوونەوەی بکات لە کاتی لێ وردبوونەوەیدا، بۆ دەرکردنی حوکم بەسەر دەستبەسەرداگر بە گێڕانەوەی ئەوەی دەستی بەسەرداگرتووە، وەك چۆن ناگۆڕێت بۆ دروست نە بە مۆڵەت و نە بە لادانی هۆی پووچەڵبوونەوەکەی، بەڵکو پێویستە جارێکی تر گرێبەستەکە دابڕێژرێتەوە گەر دوو گرێبەستکارەکە ئەوەیان ویست دوای لادانی هۆی پووچەڵبوونەوەکە، هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە مافی خۆیانە پاڵ بە

پووچەڵبوونەوە بنێن گەر ئەویتریان جێبەجێ کردنی گرێبەستەکەی دلوا کرد، ئەم پاڵپێوەنانە بە تێپەڕبوونی کات بەرنابێتەوە بە پێچەوانەی دلوای پووچەڵبوونەوە ئەوەیان بە تێپەڕبوونی کات بەردەبێتەوە، بۆ نموونە گەر فرۆشتنی پووچەڵ جێبەجێکرا پاشان فرۆشیار یان کڕیار دەستی بە پووچەڵبوونەکەوە گرت بۆ ئەوەی ئەو شتە بگێڕێتەوە کە ئەویتر وەریگرتووە لە فرۆشراو یان نرخ ئەوا گوێ بۆ دلوا‌کەی ناگیرێت گەر پازدە ساڵ بەسەر سەرهەڵدانی گرێبەستەکەدا تێپەڕی بوو لای هەندێ لە فەقیهان[1]، زۆربەی یاساکانی وڵاتە عەرەبییەکان ئەمەیان وەرگرتووە[2]، هەندێ لە فەقیهان وای بۆدەچن[3] کە ماوەی بەسەرچوونەکە دە ساڵ بێت، بەڵام پاڵپێوەنان بە تێپەڕبوونی کات بەرنابێتەوە، نهێنی ئەوەش ئەوەیە ماوە لە کاتدا لەم پاڵنانەدا لە بەرواری بەرزکردنەوەی دلوا‌کەوە دەست پێدەکات نەك لە بەرواری گرێبەستەکەوە.

گرێبەستی پووچەڵ سەرەڕای سەرهەڵدانی ئاساری بنەڕەتی لەسەری لەو سۆنگەیەوە کە هەڵسوکەوتێکی شەرعی(یان یاسایی)ە، لەگەڵ ئەوەش هەندێ جار لقە ئاساری لەسەر سەرهەڵدەدات بە دانانی وەك ڕوودلوێکی شەرعی(یان یاسایی)، لە گرنگترین ئەو ئاسارانە گۆڕان و کەمکردنەوەن:

یەکەم، گۆڕانی گرێبەست: ئەوەیە گرێبەستی پووچەڵ بگۆڕێت بۆ هەڵسوکەوتێکی تر کە پایەکان و مەرجەکانی لەو گرێبەستە پووچەڵەدا فەراهەم هاتبن، بینا لەسەر

---

[1] م/١٥١ مرشد الحيران (هەر کەس دەستی گرت بەسەر خانوویەرەیەکدا یان بەسەر شتانی تردا و هەڵسوکەوتی تێدا کرد وەك هەڵسوکەوتی خاوەنێك کە نە کێبەرکێکاری هەیە نە بەرهەڵستکار بۆ ماوەی پازدە ساڵ، ئەوا گوێ بۆ دلوای مولکداری کەسێك ناگیرێت بەبێ میرات کەسەکە خاوەنی عوزرێکی شەرعی نەبێت گەر نەناسرلو بوو)

[2] أصول الإلتزامات للدكتور سليمان مرقس، ص٢١٦.

[3] فەقیهە مالیکییەکان بۆچوونیان لەسەر دیاریکردنی فەرموودەی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) لەوانە: (هەر کەس دە ساڵ شتێکی لا بوو بۆ ئەوە)، هەروەها(هەر کەس پازدە ساڵ شتێکی لا بوو بۆ ئەو لەپێشترە) يُنظر شرح الحطاب ٢٢٤/٦، ٢٢٩. تبصرة الحكام لأبن فرحون على هامش فتح العلي المالك للشيخ عليش ٣٣٦/٢، ٣٦٢.

ئەوەبۆ گۆڕانی گرێبەست سێ مەرج بە مەرج دەگیرێت:

١-گرێبەستەکە پووچەڵ بێت، گەر گرێبەستەکە دروست بێت ئەوا پێویست بە گۆڕان ناکات.

٢-لە گرێبەستی پووچەڵدا هەموو توخمەکانی گرێبەستی بۆگۆڕلو فەراهەم هاتبن، گەر توخمێکی تازەی خرایە سەر پێی ناوترێت گۆڕان، بەڵکو بریتییە لە راستکردنەوەی گرێبەستەکە[1].

٣-نییەتی دوو گرێبەستکارەکە رووبکاتە ئەو هەڵسوکەوتە گەر هەردووکیان پووچەڵبوونەوەی هەڵسوکەوتی بنەڕەتییان زانی.

بینا لەسەر ئەمە کۆمپیالە کە مەرجی تەندروستی تێدا فەراهەم نەهاتووە بە پووچەڵ دادەنرێت لەو سۆنگەیەوە کۆمپیالە قەواڵەی یاساییە، بەڵکو دەگۆڕێت بۆ قەواڵەیەکی ئاسایی و گونجاوە قەرزدەر دەستی پێوە بگرێت گەر پێشتر قەواڵەی ئاسایی پێنەدرابێت، بە پێچەوانەی ئەوەوە مەرجی سێیەم لە مەرجەکانی گۆڕان دوادەکەوێت، لەوێشەوە گۆڕان سەرهەڵنادات، هەندێ شرۆڤەکارانی یاسا[2] پێیان وایە بیرۆکەی گۆڕانی گرێبەست لە داڕێژەرانی یاسای ئەڵمانییەوە لە سەدەی نۆزدەیەم وەرگیراوە، ئەم گومانە گەر لەڕووی رێکخستنی بیردۆزەی گۆڕانی گرێبەستەوە

---

[1] راستکردنەوەی گرێبەست: هەر کەس شتێکی کڕی و باوەڕی وابوو شتێکی ئەنتیکەیە پاشان پێچەوانەی ئەوەی بۆ دەرکەوت، گەر فرۆشیارەکە بەردەست بوو ئەوا ئەو شتە ئەنتیکەی مەبەستی بوو بیکڕێت پێیدەدات، لەمەدا فرۆشتنی شتێکی نا ئەنتیکە دەگۆڕێت بۆ شتێکی ئەنتیکە، چونکە فرۆشتنی دووەم توخمێکی نوێی هێنا ناوەوە کە لە فرۆشتنی یەکەمدا بوونی نەبوو، ئەوەش بریتییە لە شتێکی ئەنتیکە بە خود بەوەش مەرجێك لە مەرجەکانی گۆڕان دوادەکەوێت. مصادر الحق ١٠٣/٣.

[2] وەك مامۆستا سەنهوری، مصادر الحق ١٠٠/٤ تیایدا هاتووە(ئەوە بیردۆزەیەکی ئەڵمانییە فەقیهەکانی ئەڵمان لە سەدەی نۆزدەیەمدا دایانڕشتووە یاسای مەدەنی میسریش وەریگرتووە لە دەقێکی راشکاودا مادەی(١٤٤) لەسەر میتۆدی یاساڕێژی ئەڵمانی یاساڕێژی مەدەنی میسری نوێ هاتۆتە ئاراوە)واتە لە م/ ١٤٤دا.

دروست بێت، ئەوا وەك داهێنانی بیرۆکەکەی راست نییە، گۆڕان بیرۆکەیەکی فیقهی ئیسلامییە، فەقیهە موسڵمانەکان دە سەدە لەمەوبەر پێیگەیشتوون، فیقهی ئیسلامی پڕە لە پیادەکردنی گۆڕانی گرێبەست، لەوانە ئەمانەن:

أ.گەر کەسێك پەیمانێکی بە کەسێکی تر دا بەوەی ئەو دەبێتە میراتگری و پەیوەندی خزمایەتی و هاوسەرێتیش لە نێوانیاندا نەبوو، ئەوا پەیمانەکەی پووچەڵە، بەڵام ئەگەر مرد دەگۆڕێت بۆ وەسێت .

ب–دەستەبەری بە مەرجی ئەستۆپاکی بنەڕەتی پووچەڵ دەکرێتەوە و دەگۆڕێت حەواڵە.

ج–حەواڵە بە مەرجی نەبوونی ئەستۆپاکی کەسی نێرەر دەگۆڕێت بۆ دەستەبەری.

دووەم، کەمبایەخ کردنی گرێبەست: لەو ئاسارە لابەلایانەی کە لەسەر گرێبەستی پووچەڵ بە پووچەڵبوونێکی بەشەکی سەرهەڵدەدەن بریتییە لە کەمبایەخ کردنی گرێبەست، وەك چۆن گۆڕان لە ئاساری لابەلای پووچەڵە بە پووچەڵبوونێکی هەمووەکی، فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام پێناسەی بیرۆکەی کەمبایەخ کردنی گرێبەستیان کردووە و چارەسەریان بۆ داناوە لەژێر ناونیشانی جیاکردنەوەی سەودا، بەڵام لەسەر یەك ئاراستە رێکنەکەوتوون تایبەت بە گونجاوی و نەگونجاوی کەمبایەخ کردن، هەر کەس شوێنپێی بۆچوونە فیقهییەکان لە مەزهەبە جیاجیاکاندا هەڵبگرێت دەبینێت ئەم فیقهە سێ ئاراستەیە: ئاراستەی گونجاویی بەرەهایی، و ئاراستەی نەگونجاویی بەرەهایی، ئاراستەی درێژەپێدان و جیاکردنەوە.

ئاراستەی یەکەم: بریتییە لە گونجاوی و رێگەپێدان بەرەهایی، ئەمەش ئەوەیە زۆربەی فەقیهە مالیکییەکان و شافیعییەکان و هەندێ لە مەزهەبەکانی تر بۆیدەچن[1]

---

[1] المهذب لأبي اسحاق الشيرازي ٢٦٩/١.

بۆ نموونە هەر کەس کاوڕێك(چتێرێك)ی مردارەوە بوو و کاوڕێکی سەربڕاوی بینییەوە ئەوا لە سەربڕاوەکەدا گرێبەستەکە دروستە و لە مردارەوەبووەکەدا پووچەڵە، دەستیان بە چەند بەڵگەیەکەوە گرتووە، لە گرنگترینیان:

١-پووچەڵبوونەوەی گرێبەستەکە لە هەردووکیاندا بە پووچەڵبوونەوەی لە یەکێکیاندا لەپێشتر نییە لە دروستی گرێبەستەکە لە هەردووکیاندا بە دروستییەکەی لە یەکێکیاندا، بۆیە هەڵدانی یەکێکیان بۆ سەر ئەویتریان پووچەڵ و هەردووکیان لەسەر حوکمی خۆیان دەمێننەوە و لەوەی گونجاوە دروستە و لەوەی نەگونجاوە پووچەڵە.

٢-بۆ هەریەکێك لەوانە حوکمێکی تایبەت هەیە گەر تەنها بێت، گەر هەردووکیان کۆکرانەوە لەلایەن کەسی خۆیەوە و لە جێگەی خۆی و بە مەرجی خۆی ئەوا لە بەشێکیدا دروستە وەك ئەوەی تاك کەوتبێتەوە و لە بەشەکەی تریدا هەر بەو جۆرە پووچەڵ دەبێتەوە.

٣-فرۆشتن حوکم لە هەردوو جێگەکەدا دلوا دەکات و لە یەکێك لە دوو جێگەکەیدا نەشیاو دەبێت، بۆیە بۆ ئەویتریان دروست دەبێت، وەك ئەوەی بە شتێك وەسێتکرابێت بۆ مرۆڤێك و گیاندارێك، بۆ مرۆڤەکە دروستە و بۆ گیاندارەکە پووچەڵە.

ئاراستەی دووەم: بریتییە لە جیانەکردنەوەی سەودا بەرەهایی، ئەوەش یەکێکە لە دوو بۆچوون لە فیقهی شافیعیدا[1] و فیقهی مالیکی[2] و "زفر"[3] لە حەنەفییەکان و کەسانی تریش، گەورەترین بەڵگەی ئەم دەستەیە ئەمانەن:

---

[1] المهذب ١/٢٦٩ تیایدا(گەر لە فرۆشتندا لە نێوان ئەوەی فرۆشتنی گونجاوە و ئەوەی فرۆشتنی نەگونجاوە کۆکرینەوە کرا، ئەوا دوو قسەی لەسەرە، یەکەمیان: سەوداکە جیادەکرێتەوە ئەوەی فرۆشتنی گونجاو نییە پووچەڵ دەکرێتەوە و ئەوەش فرۆشتنەکەی گونجاوە دروستە)

[2] القواعد الفقهية لأبن جزي، ص .

[3] تبين الحقائق للزيعلي ٤/ .

١-گرێبەستەکە حەڵاڵ و حەرامی کۆکردۆتەوە، بۆیە حەرامکردن زاڵبووە بەسەر ڕێگەپێداندا، گفتوگۆ لەسەر ئەمە دەکەن و دەڵێن: پووچەڵبوونەوەی گرێبەستەکە لە هەردووکیاندا بە پووچەڵبوونەوەی لە یەکێکیاندا لەپێشتر نییە لە دروستی گرێبەستەکە لە هەردووکیاندا بە دروستییەکەی لە یەکێکیاندا، بۆیە هەڵدانی یەکێکیان بۆ سەر ئەویتریان پووچەڵە وەك باسمان کرد.

٢-پێوانە بۆ سەر کۆکردنەوەی دوو خوشك لە یەك هاوسەرگیریدا، هەڵدەوەشێتەوە بەوەی پێوانەیە لەگەڵ جیاوازی، چونکە قابیلییەت بۆ مامەڵە بوونی هەیە لە یەکێك لە دوو بەشەکەی جێگەی گرێبەستدا، بە پێچەوانەی ئەوەی لە نێوان دوو خوشکدا هەیە، چونکە یەکێکیان لەپێشتر نییە بە پووچەڵبوونەوە یان دروستی لەویتریان، بۆیە هاوسەرێتی هەردووکیان پووچەڵ دەبێتەوە گەر هەردووکیان پێکەوە بە یەك گرێبەست مارە برابوون، بە پێچەوانەی گرێبەستی دراییەوە کە حەڵاڵ و حەرام کۆدەکاتەوە.

٣-نەزانینی نرخ لە کاتی سەرهەڵدانی گرێبەستەکەدا گەر سەوداکە بە تەواوی جیاکرایەوە، چونکە گەر هەردوو بەشەکە بفرۆشێت(قابیل بە مامەڵە و ناقابیل بە مامەڵە) -بۆ نموونە- بە هەزار ئەوا ئەوەی ناقابیلە لە نرخەکە بەردەبێتەوە، ئەو کات قابیلەکە دەبێت بە فرۆشراو بەوەی ماوەتەوە، ئەوەش لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەدا نادیارە، بۆیە پووچەڵ دەبێتەوە، لەسەر ئەم بەڵگەیە گفتوگۆ دەکرێت بەوەی نەزانی لە یەکێك لە دوو بڕیتییەکەدا بە پووچەڵ دادەنرێت گەر سەریکێشا بۆ ناکۆکی، لەم حاڵەتەدا ناکۆکی بوونی نییە، چونکە هەڵبژاردە بۆ کڕیار بوونی هەیە لەنێوان هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە و قبوڵکردنی جیاکردنەوەی سەوداکە، پاشان نەزانی ڕێگرە گەر هەر لە سەرەتاوە راوەستاو بوو، مانەوەشی لە جیاکردنەوەی سەودادا بەو جۆرە نییە.

ئاراستەی سێیەم: جیاکردنەوە(درێژەپێدان) کە بریتییە لە هەڵبژاردەی هەندێ لە فەقیهان، لەوانە "أبو يوسف و محمد" دوو هاوەڵەکەی ئەبو حەنیفە، دەڵێن: گەر نرخی هەریەك لە دوو بەشەکە ڕۆشن بوویەوە لەکاتی سەرهەڵدانی گرێبەستدا ئەوەیان قابیلە بۆ مامەڵە تیایدا دروستە و لەویترياندا پووچەڵە، گەورەترین بەڵگەیان ئەوەیە گەر نرخی ئەو دووانە ڕۆشن بوویەوە لە کاتی گرێبەستدا دەبن بە دوو سەودا، بۆیە تێکچوونەکە بە بڕی تێکدەرەکە دەپێورێت(ئەندازەگیری دەکرێت)، بە پێچەوانەی ئەوەی نرخێك بۆ هەر یەکێکیان دیاری نەکرێت، بۆیە ئەوە بۆ نەزانی دروست نییە، ئەمەش گفتوگۆی لەسەر دەکرێت بەوەی لەسەر بەڵگەی سێیەمی ئاراستەی دووەم کرا.

شایانی باسە جیاوازی باسکراو لە گرێبەستێکدا جاری دەبێت یەکێك لە دوو بەشەکەی جێبەجێکرلو بێت و لەویترياندا ڕاگیرلو، وەك ئەو کەسەی ماڵی خۆی و ماڵی کەسانی تر دەفرۆشێت لە یەك سەودادا، چونکە ڕاگیراو گەر مۆڵەتی پێ نەدرێت لەلایەن ئەو کەسەوە مافی مۆڵەتی هەیە دەگۆڕێت بۆ پووچەڵ و وا دادەنرێت لە بنەڕەتدا نەبوویێت.

**کەمبایەخ کردن لە فیقهی خۆرئاواییدا:**

فیقهی خۆرئاوایی لەگەڵ ئاراستەی یەکەم لە فیقهی ئیسلامی جیاواز نیە، بەڵام ئەم فیقهە بۆ کەمبایەخ کردنی گرێبەست ئەم مەرجانە تیایدا بەمەرج دەگرێت:

أ-جێگەی گرێبەستەکە قابیلی بەش کردن بێت.

ب-ویستی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە ڕووی نەکردبێتە یەکبوونی سەوداکە، بەجۆرێك ڕازی نەبێت بە دابەشکردنی هەردووکیان یان یەکێکیان.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەڕووەوە دەتوانین دوو ئەنجام دەربهێنین:

أ-پارسەنگکراو ئەو بۆچوونەیە کە سەودا جیادەکاتەوە و بڕیار لەسەر شیاویی کەمبایەخ کردنی دەدات گەر جێگەکە قابیلی بەشکردن بوو، بۆیە لەو بارەدا

هەڵبژاردە دەدرێتە دەستی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە گەر لە کاتی سەرهەڵدانی گرێبەستەکەدا بە پووچەڵبوونەوەیان نەدەزانی لە یەکێك لە دوو بەشەکەیدا، هەر کەس لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەدا ئەوەی دەزانی ئەوا هەڵبژاردەی بۆ نییە بەهۆی کەمتەرخەمییەکەیەوە.

رووی پارسەنگدان دلواکارییەکانی مەنتقی یاسایی رلوەستاوە لەم رێسایەدا: (کارپێکردنی قسە لەپێشترە لە پشتگوێ خستنی) و (گەر حەقیقەت نەشیاو بوو رەوانەی سەر مەجاز دەکرێت).

ب-بنچینەی کەمبایەخ کردن لە فیقهی ئیسلامیدا بابەتیانەیە وەك باسمان کرد، بەلاَم لە فیقهی خۆرئاواییدا تاکەکەسی و خودییە، چونکە لەم فیقهەدا گرێبەست کمبایەخ دەبێت گەر رۆشن بوویەوە تەواو نابێت بەبێ ئەو بەشەی پووچەڵیەکەی تێکەوتووە، بۆیە پەندوەرگرتن بە مەرامی دوو گرێبەستکارەکەیە بە پێچەوانەی کەمبایەخبوون لە فیقهی ئیسلامیدا، لێرە لەسەر بنچینەیەکی بابەتیانە تەواو دەبێت بەجۆرێك هەر لە سەرەتاوە فرۆشتن بە بەش لە نرخەکە رێگە پێنەدرلوە، بەلاَم لەرووی مانەوەوە رێگە پێدرلوە.

**دووەم: تایبەت بە گرێبەستی راگیراو:**

گرێبەستی راگیرلو وەك گرێبەستی پووچەڵ و گرێبەستی تێکچوو وایە پێش مۆڵەت بە جۆرێك مافەکان و پابەندبوونەکان تەنها دوای مۆڵەت لەسەری سەرهەڵدەدەن، بەلاَم لە چەند بارێکی جەوهەریدا لەو دوانە جیاوازە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١-گرێبەستی رلگیراو هەڵسوکەوتێکی شەرعی(یان یاسایی)ە و بوونێکی شەرعی متمانەپێکرلوی هەیە، چونکە پایەکان و مەرجەکانی دامەزران و دروستیی تێدا فەراهەم بووە، بەلاَم رێگرێك هەیە پێش مۆڵەت رێگری دەکات لە سەرهەڵدانی ئاسارە شەرعی و یاساییەکان لەسەری، ئەم رێگرەش وەك باسمان کرد یان نەبوونی سەرپەرشتیارییە لەسەر "گرێبەست لەسەرکرلو" یان نەبوونی

سەرپەرشتیاری لەسەر جۆری هەڵسوکەوتەکە، یاخود پەیوەستبوونی ماڧ کەسانی تر پێیەوە و هاوشێوەکانی ئەمانە[1]، بۆیە سەرهەڵدانی ئاسار بۆ نەبوونی داخوازی بۆ هەڵسوکەوتی شەرعی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ بوونی رێگر و پێشکەوتنی لەسەر داخوازی لە کاردا دەگەڕێتەوە، بینا لەسەر رێسای(گەر داخوازی و رێگر بەرهەڵستی یەکتریان کرد، رێگر پێشدەخرێت)

٢-گرێبەستی راگیراو مۆڵەت شوێنی دەکەوێت لەو کەسەوەی مۆڵەتەکەی بەدەستە، و ئاسارە شەرعییەکانی(یان یاساییەکانی) بەرهەم دەهێنێت، لە بەرواری سەرهەڵدانیەوە(بە ئەسەرێکی گەڕاوە) نەك لە کاتی مۆڵەتەوە، بە پێچەوانەی گرێبەستی پووچەڵ و گرێبەستی تێکچوو بەبێ زۆرلێکردن، ئەو دوانە مۆڵەت شوێنیان ناکەوێت.

دوای مۆڵەتی دروست بۆ گرێبەستی راگیراو پێویستە لەسەر هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە پابەندبوونەکەی بە ویستی خۆی جێبەجێ بکات، ئەگەر نە، لەڕووی قەزاوە ناچاردەکرێت لەسەری، گەر مۆڵەت بەدەست نەهات یان نادروست بوو بەهۆی فەراهەم نەبوونی مەرجەکانی گرێبەستەکە وەك ئەوەیە لە بنەڕەتدا نەبووبێت، و حوکمەکەی حوکمی گرێبەستی پووچەڵی هەیە لەوەی ئەو و نەبوون یەکسانن.

**سێیەم: گرێبەستی جێبەجێکراوی نا پێویست(رێگە پێدراو):**

ئەم گرێبەستە لە سێ بەشەکەی گرێبەستە باسکراوەکانی تر بەم جیاکەرەوانە جیادەبێتەوە، گرنگترینیان:

١-گرێبەستێکی دروستە و ئاسارە شەرعییەکانی(یان یاساییەکانی) بەرهەم دەهێنێت لەگەڵ دامەزرانی بە جێبەجێکردنی پابەندبوونەکەی گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبوویەوە.

---

[1] في رد المختار لأبن عابدين ١١٣/٥: (فرۆشتنی راگیراو سی تا ٣٨ جۆرە، حوکمی فرۆشتنی فزولیانە مۆڵەت قبوڵە گەر فرۆشیار و کڕیار و فرۆشراو راوەستاو بوون)(البيع الموقوف نيف وثلاثون واصله في النهر الى (٣٨)

٢-هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە یان یەکێکیان-بەپێی سروشتی گرێبەستەکە و هۆی پابەندنەبوونی- مافی خۆیەتی گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی، یان خۆلادان لەو هەڵوەشانەوەیە، و قبوولکردنی گرێبەستەکە لەگەڵ ئەو هۆیەی هەڵبژاردەی هەڵوەشانەوەکەی بۆ موباح کردووە، گەر پێی رازی بوو دەبێ بە جێبەجێکرلو و پێویست، ئەو کات مافی ئەو لە هەڵوەشانەوە بەردەبێتەوە، بەرانبەر ئەم گرێبەستە گرێبەستی قابیل بە هەڵوەشانەوە لە فیقهی خۆرئاواییدا بوونی هەیە، ئەوەی باوە کە بەرانبەر "گرێبەستی راگیرلو"ە هەڵەیەکە چاوگەکەی نەبوونی وردەکارییە لە گوزارەی نێوان راگیرلو و قابیل بە هەڵوەشانەوە.

**چوارەم: گرێبەستی جێبەجێکراوی پێویست:**

ئەو گرێبەستەیە مەرجەکانی دامەزران و دروستی و جێبەجێکاری و پێویستبوونی تێدا فەراهەمە، ئەم گرێبەستەیە کە تایبەتە بە سەرهەڵدان، چونکە هاندەری پاڵنەر لە هەر گرێبەستێکدا بریتییە لە سەرهەڵدانی ئاساری شەرعی و یاسایی لەسەر ئەو گرێبەستە و پابەندبوونی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە بەوەی لەسەری پێویستە بەرانبەر ئەویتریان بەبێ رووبەڕووکردنەوەی ئەم گرێبەستە بۆ رووخان.

شایانی باسە ئەم دابەشکردنە پێنجییە فەقیهە حەنەفییەکان و ئەوانەی رێچکەی ئەوانیان گرتۆتە بەر لە مەزهەبەکانی تر پێویستە یاسای وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان لە مامەڵەی دارایی و باری کەسێتیدا بیگرنە بەر، ئەوەش لەبەر ئەوەی گرێبەستی تێکچوو کە قۆناغێك داگیر دەکات لە نێوان گرێبەستی دروست و گرێبەستی پووچەڵدا بە هۆکارێکی یاریدەدەری چالاك دەژمێررێت بۆ جێگیربوونی مامەڵەکان و رووبەڕوونەبوونەوەی زۆربەیان بۆ رووخان، چونکە گرێبەستی تێکچوو راستەوخۆ دەگۆرێت بۆ گرێبەستی دروست تەنها بە لادانی هۆی تێکچوونەکەی، بەبێ پێویستی بە سەرهەڵدانی سەرلەنوێی، بە پێچەوانەی گرێبەستی پووچەڵەوە ئەمەیان

گەر هۆی پووچەڵییەکەشی لابدەی پێویستە سەر لە نوێ پیاهەڵچوونەوەی بۆ بکرێت.

**دووەم: دابەشکردنی پێنجی:**

ئەوەش هەمان دابەشبوونی چوارییە لەگەڵ بەشی پێنجەم کە بریتییە لە گرێبەستی تێکچوو، ئەمەش هەڵبژاردەی فەقیهە حەنەفییەکانە، فەقیهە حەنەفییەکان ئەم قسەی خۆیان لەسەر دوو بنچینە بیناکردووە:

یەکەمیان: جیاکردنەوەی هەڵبژاردە لە رازیبوون، دووەمیان جیاکردنەوەی ئەسڵی گرێبەستەکە و وەسفی گرێبەستەکە لەیەکتری، ئەو فەقیهەش بۆچوونی لەسەر گرێبەستی تێکچوو نییە ئەو جیاکردنەوەی رەد کردۆتەوە و رازیبوون و هەڵبژاردنی بە دوو وشەی هاوواتا لێکداوەتەوە، هەر بەو جۆرە ئەسڵی گرێبەستەکە و وەسفی گرێبەستەکەی بە یەکسان داناوە لەڕووی حوکمەوە سەرەڕای گۆڕانکاری خودیانەی ئەو دوانە.

جیاوازی یەکەم، دەڵێن: هەڵبژاردن بریتییە لە دەستبردن بۆ هۆیەکە بە ویستێکی ئازادی پەیەر کە ئامانجییەتی هۆکارەکەی لەسەر سەرهەڵبدات، رازیبوونیش بریتییە لە ئارەزوو لە رێکخستنی هۆکار لەسەر هۆیەکەی، لە فیقهی خۆرئاواییدا ویستی دەربڕین و ویستی ئەسەر بەرانبەرینی.

حەنەفییەکان دەڵێن: هەڵبژاردن و رازیبوون دوو پایەی مەعنەوین بۆ گرێبەست، گەر هەردووکیان پێکەوە هاتنە دی گرێبەستەکە دروستە، گەر پێکەوە دواکەوتن گرێبەستەکە پووچەڵە، گەر رازیبوون دواکەوت وەك لەباری زۆرلێکردندا گرێبەستەکە تێکچووە، رووی چوارەم وێنا ناکرێت کە بریتییە لە هاتنە دی رازیبوون و دواکەوتنی هەڵبژاردن.

جیاوازی دووەم، دەڵێن: هەر گرێبەستێك ئەسڵ و وەسفی خۆی هەیە، گەر هەردووکیان رەوا بوون گرێبەستەکە دروستە، گەر هەردووکیان ناڕەوابوون گرێبەستەکە پووچەڵە، گەر ئەسڵەکە رەوا بوو و وەسفەکە ناڕەوا گرێبەستەکە

تێکچووە، بەڵام وێنای ڕووی چوارەم ناکرێت ئەوەش ئەوەیە وەسفەکە ڕەوا بێت ئەسڵەکە ناڕەوا بێت.

**ئەسلی گرێبەست و وەسفی گرێبەست چییە؟**

سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە گرێبەستیان پێناسە کردووە بەوەی بریتییە لە گرێدانی ئەرێکردنی دەرچوو لە یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکەوە بە قبووڵکردنی ئەویتریان بەجۆرێك ئەسەرەکەی لەسەر گرێبەست لەسەرکرلو جێگیر دەکات[1]، لەسەر ئەم بنچینەیە توخمەکانی گرێبەستیان بیناکردووە، چونکە هەموو ئەوەی لە پێناسەی زاراوەی شەرعی یان یاسایی وەردەگیرێت بریتییە لە توخمەکەی، لەسەر ئەم بنچینەیە بە پوختی توخمەکانی گرێبەست سیانن(داڕشتن و گرێبەستکار و گرێبەست لەسەرکراو) ، بە درێژیش توخمەکانی شەشن(ئەرێکردن و قبووڵ کردن لە داڕشتندا و دوو گرێبەستکارەکە و دوو بریتیدانەکە لە گرێبەست لەسەرکراودا).

هەروەها دەڵێن: ئەم توخمانە کۆمەڵە مەرجێکیان هەیە کە ئەمانەن:

١-یەکگرتنی ئەرێکردن و قبووڵ کردن لە کاروبارە جەوهەرییەکاندا.

٢-یەکگرتنی مەجلیسی ئەرێکردن و قبووڵکردن لە نێوان دوو ئامادەکەدا.

٣-فرەیی گرێبەستکار بە حەقیقەت یان بە حوکم[2].

٤-جیاکردنەوە لە بریتیدانەکاندا، و بوونی ژێری لە بەخشینەکاندا.

٦-جێگەکە دیاریکراو بێت بێت یان قابیلی دیاریکردن بێت.

٧-جێگەکە قابیلی رادەست کردن بێت.

---

[1] مرشد الحيران للمرحوم محمد قدري باشا، المادة (٢٦٢).

[2] فرەیی لە حوکمدا وەك فرۆشتنی ماڵی سەرپەرشتیار بە ناکام کە لەژێر سەرپەرشتی ئەودایە یان کڕینی ماڵی ناکامەکە بۆ خۆی، ئەمە لەڕووی حەقیقەتەوە یەکێکە و لەڕووی حوکمەوە فرە، چونکە ئەرێکردن و قبووڵکردن پێکەوە لە ئەستۆ دەگرێت، یەکەمیان بە بنەڕەت و ئەویتریان بە نوێنەرایەتی.

دەڵێن: ئەم حەوت مەرجە ئەسڵی گرێبەست و مەرجەکانی دامەزرانیەتی، گەر یەکێك لەوانە دواکەوت گرێبەستەکە پووچەڵە، بەڵام هاتنەدییەکەیان بۆ دروستی گرێبەست بەس نییە، بەڵکو ئەوانە(بە هەڵوارەدەی سێ مەرجی یەکەم) پێویستیان بە وەسفگەلێکە تەواویان بکات بەم جۆرە:

أ.توخمی رازیبوون شان لەسەر جیاکردنەوە یان ژێری دادەدات، بۆیە ئاتاجە بە وەسفێکی تەواوکەر بۆی کە بریتییە لە خاڵیبوون لە زۆرلێکردن، کەوابوو گرێبەستی زۆرلێکراو تێکچووە.

ب–جێگەی گرێبەستەکە دیاریکراو بێت یان قابیلی دیاریکردن بێت ئاتاجە بە وەسفێکی تەواوکار ئەوەش خاڵیبوونیەتی لە فریودان، گەر فریودان لە دیاریکردنیدا هەبوو گرێبەستەکە تێکچووە.

ج–جێگەکە قابیلی رادەست کردن بێت ئاتاجە بە وەسفێکی تەواوکار ئەوەش بریتییە لە خاڵیبوونی لە زیان، بۆیە هەر رادەستکردنێك زیان بۆ دوو گرێبەستکارەکە یان یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە بهێنێت سەردەکێشێت بۆ تێکچوونی گرێبەستەکە.

د–جێگەکە قابیلی مامەڵە بێت ئاتاجە بە دوو وەسفی تەولوکار، ئەو دوانەش خاڵیبوونیەتی لە سوو و مەرجی تێکدەر، شایانی باسە هۆیەکانی تێکچوون درێژکردنەوەی زۆری تێدایە، هەندێ لە حەنەفییەکان کردوویانە بە بیست و پێنج هۆ، بەڵام هەرهەمووی بۆ پێنج هۆ دەگەڕێنەوە کە ئەمانەن: زۆرلێکردن، فریودان، زیان، سوو، مەرجی تێکدەر.

لە دیدی منەوە بۆ چوار هۆ دەگەڕێنەوە، چونکە سوو دەچێتە ژێر مەرجی تێکدەرەوە.

لەسەر ئەوەی باسمان کرد بۆچوونیان بۆ گرێبەستی تێکدەر وەك پلەیەك لە نێوان دوو پلەدا(پووچەڵ و دروست) پێناسە کردووە، گەر گرێبەستەکە لە بنەڕەت و وەسفیدا رەوا بوو ئەوە دروستە، گەر لە بنەڕەت و وەسفیدا ناڕەوا بوو ئەوە

پووچەڵە، گەر لە بنەڕەتیدا ڕەوا بوو و لە وەسفیدا ناڕەوا بوو ئەو گرێبەستە تێکچووە، ئەمەشیان بە هۆی مەنتقی هۆدار کردووە و دەڵێن:

گەر گرێبەستی تێکچوو بە پووچەڵ دابنرێت-وەك جمهوری فەقیهان دەڵێن- ئەوا یەکسانبوون پێویست دەکات لە نێوان ئەوەی ڕەوایە لە بنەڕەتدا و ناڕەوایە لە وەسفدا لەگەڵ ئەوەی ناڕەوایە لە بنەڕەت و وەسفدا، ئەمەش پێچەوانەی ژیری تەندروست و مەنتقە، گەر بە دروست دابنرێت یەکسان بوون لە نێوان ڕەوا لە بنەڕەت و ناڕەوا بە وەسف لەگەڵ ڕەوا لە بنەڕەت و لە وەسفدا پێویست دەبوو، ئەمەش دیسان پێچەوانەی ژیری و مەنتقە.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای باری کەسێتی جێبەجێکاردا لە (م/٦٠) و (م/٢٢٠) دەستی بۆ گرێبەستی تێکچوو بردووە.

## سێیەم: دابەشکردنی سیانی:

ئەوەش ئاراستەی فەقیهە خۆرئاواییەکانە، بۆیە دەڵێن: گرێبەست یان دروستە یان پووچەڵە، پووچەڵیش یان ڕەهایە یان ڕێژەیی.

١-گرێبەستی دروست ئەوەیە پایەکان و مەرجە بابەتییە شێوەگرییەکانی فەراهەم هاتوون، وەك فرۆشتنی خانووبەرەی بە موڵککراوی تۆمارکراو لە فەرمانگەی تایبەتکراو وەك فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە لە لایەن خاوەنەکەیەوە.

٢-گرێبەستی پووچەڵ بە پووچەڵبوونەوەیەکی ڕەها وەك دواکەوتنی پایەیەك لە پایەکانی گرێبەست یان مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزرانی گرێبەست.

٣-گرێبەستی پووچەڵ بە پووچەڵبوونەوەیەکی ڕێژەیی وەك گرێبەستی ئەو کەسەی لێوەشاوەیی ناتەواوە، هەروەها گرێبەستێك نەنگییەك لە نەنگییەکانی ڕازیبوونی تێدایە لە زۆرلێکردن و فریودان و پێشێلکاری و هەڵە، پووچەڵبوونەوەی ڕێژەیی لە زاراوەی خۆرئاواییدا پێی دەوترێت گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە، ئەوەش ئەوەیە ئەو کەسەی بڕیاری پووچەڵکردنەوە

دەدات بۆ بەرژەوەندی خۆی مافی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەی هەیە، شایانی باسە گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوە گرێبەستی راگیراو و گرێبەستی جێبەجێکاری ناپێویست دەگرێتەوە.

**دابەشکردنی گرێبەست لەڕووی چۆنانەوە لە یاسا عەرەبییەکاندا:**

یاسای وڵاتە عەرەبییەکان لە دابەش کردنی گرێبەستدا لەسەر یەك ئاراستە کۆدەنگیان نییە لەڕووی سیفەتی یاساییەکەیەوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە یاساڕێژی مەدەنی وڵاتە عەرەبییەکان هەیانە کاریگەرە بە فیقهی ئیسلامی و هەیانە ئاراستەی فیقهی خۆرئاوایی وەرگرتووە، پاشان هەریەك لەم دوو ئاراستەیە یەك میتۆدیان نەگرتۆتە بەر، بەم جۆرە:

**ئەو یاسایانەی کاریگەرن بە فیقهی ئیسلامی:**

لەو یاسایانەی کاریگەر بوون بە فیقهی ئیسلامی یاسای مەدەنی عێراقی و ئوردەنی و یەمەنی.

**یەکەم: یاسای مەدەنی عێراقی:**

سەرەڕای کاریگەربوونەکەی بە فیقهی ئیسلامی زۆرتر لە یاساکانی وڵاتە عەرەبییەکانی تر لەگەڵ ئەوەش یەك ئاراستەی نەگرتۆتە بەر و نەیتوانیوە خۆی لابدات لە کاریگەربوون بە فیقهی خۆرئاوایی کاریگەرییەك سەرپێدەکێشێت بۆ تێکەڵی و نەبوونی وردەکاری لە هەندێ لە دەقەکانیدا کە چارەسەری بەشەکانی گرێبەست دەکەن لەڕووی سیفەتی یاساییەوە، لە یاسای مەدەنیدا دابەشکردنی چواری وەرگرتووە[1]، هەروەها وەرگرتنی دابەشکردنی پێنجی لە یاسای باری کەسێتیدا[2]، سەرباری ئەوەی تێکەڵییەکە لە نێوان گرێبەستی راگیراو و گرێبەستی

[1] رقم ٤٠ لسنة ١٩٥١.

[2] رقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩.

قابیل بە پووچەڵکردنەوە لە هەندێ لە دەقەکانیدا[1]، پاشان ئەوەی لە هۆیەکانی پێویستنەبوونی گرێبەستە بە کۆدەنگی هەردوو فیقهی ئیسلامی و خۆرئاوایی بە هۆی جێبەجێنەکردنی(راگیرانی) گرێبەستی داناوە، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

**أ.یاسای باری کەسێتی :**

ئەم یاسایە لە مادەی(٦)دا ئاماژەی بە دوو جۆر لە مەرج کردووە: مەرجەکانی دامەزران ئەوەش بریتییە لە یەکگرتنی مەجلیسی ئەرێکردن و قبووڵ کردن و رێکەوتنیان، و گوێگرتنی هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە بۆیان، هەروەها مەرجی دروستی کە بریتییە لە شایەتی دوو شایەتەکە خاوەنی شایستەبوونی یاسایی بن لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیری و پەیوەستنەبوونی ئەم گرێبەستە لەسەر مەرجێك یان رووداوێکی دەستەبەرنەکراو، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە گرێبەست پووچەڵ دەبێتەوە گەر مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزرانی لێ دواکەوت، هەروەها تێکچوو دەبێت گەر مەرجێك لە مەرجەکانی دروستی لێ دواکەوت، ئەوەش ئەنجامدانی کارێکی باشە، چونکە پووچەڵ و تێکدەر سەرەرای یەکگرتنیان لەلای هەموو فەقیهان(لەوانەش حەنەفییەکان) لە واجبوونی جیاکردنەوەی نێوان دوو هاوسەرەکە لەگەڵ ئەوەش جیاوازن لە باری چوونە لای یەکتر، لە هاوسەرگیری پووچەڵدا چوونە لا لەگەڵ زانست بە پووچەڵی بریتییە لە تاوانی زینا و هیچ ئەسەرێك لە ئەسەرە شەرعییەکانی هاوسەرگیری دروستی لێوە پەیدا نابێت، بە پێچەوانەی چوونە لا لە هاوسەرگیری تێکدەردا، چونکە ئەمەیان بەرەهایی پێنج ئاسارەکە کە پێشتر باسمان کرد لەسەری پەیدا دەبن[2]، بەڵام پرۆژەکە سەرکەوتوو نەبووە لە مادەی "نۆ"ی ئەم یاسایەدا،

---

[1] وەك چۆم لە برگەی سێیەمی مادەی(١٣٨)دا هاتووە کە گرێبەستی لێوەشاوە ناتەواوی بە قابیل بە پووچەڵبوونەوە داناوە وەك کاریگەربوون بە فیقهی خۆرئاوایی، لە کاتێکدا لە مادەی(٩٧) بە هۆی راگیرانی هەڵسوکەوتی خولاو لە نێوان قازانج و زیان داناوە.

[2] ئەوەش بریتییە لە شەرعییەتی رەچەڵەك و واجبوونی مارەیی بۆ ئافرەتەکە و واجبوونی عیدە دوای جیابوونەوە و بەریوونەوەی سزای زینا و جێگیربوونی خزمایەتی.

چونکە هاوسەرگیری زۆرلێکراوی بە پووچەڵ داناوە بە چوونە لا دەگۆڕێت بۆ دروست، لەسەر ئەو بنچینەی چوونە لا وەك مۆڵەت ولیە لەدوای لادانی ئەسەری زۆرلێکردنەکە.

دانانی هاوسەرگیری زۆرلێکرلو بە پووچەڵ لە مادەی(٩)دا تەبایە لەگەڵ رای هەندێ لە فەقیهانی شەریعەتی ئیسلامی[1]، گۆڕانی بۆ دروستیش بە مۆڵەت هیچ کەس نەیوتووە، سەرباری ئەوەی تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان زۆرلێکردن(یان راگیراو) لەگەڵ پووچەڵ، بۆیە تێکدەر بۆ زۆرلێکردن لەلای حەنەفییەکان وەك راگیراو ولیە مۆڵەت دەبێتە پاشکۆی بە پێچەوانەی تێکدەر بۆ ئەوانی تر جگە لە زۆرلێکردن، چونکە یەکەمیان بۆ چاودێریکردنی مافی بەندەیە و بە رازیبوونی کۆتایی دەسڕێتەوە، بە پێچەولنەی تێکدەر بۆ شتانی تر جگە لە زۆرلێکردن ئەولنە بۆ چاودێریکردنی مافەکانی خودایە و تێکچوونەکەی بە لادانی هۆیەکەی نامێنێت بە پێچەوانەی ئەوەی گرێبەستی دارایی لەسەریەتی، وەك پێشتر باسمان کرد، وەك هاوسەرگیری تێکچوو بۆ شتانی تر جگە لە زۆرلێکردن، پێویستە دوای لابردنی هۆی تێکچوونەکەی نوێ بکرێتەوە، هەروەك گرێبەستی پووچەڵ ولیە دوای لابردنی هۆی پووچەڵیەکەی وەك هاوسەرگیری بەبێ شایەت، ئەو هاوسەرگیرییە لای جمهوری فەقیهان تێکچووە و ناگۆڕێت بۆ دروست بەهۆی راگەیاندنییەوە لەبەردەم دوو شایەتدا، هەر بەو جۆرە هاوسەرگیری ئافرەتێك کە مافی کەسی تری پێوەیە، وەك ئەوەی هاوسەری پیاوێکی تر بێت یان لە عیدەی تەلاقدلندا بێت لە کاتی سەرهەڵدانی هاوسەرگیرییەکەدا، ناگۆڕێت بۆ دروست دوای لادانی رێگرەکە، بۆیە پێشنیار دەکەین گوزارەی "پووچەڵ" بگۆڕرێت بە زاراوەی "تێکچوو" یان "راگیراو"، چونکە هەریەك لەو دوانە دەگۆڕێت بۆ دروستی جێبەجێکاری پێویست بەهۆی مۆڵەتەوە، هەروەها چوونەلاش بە رازیبوون دابنرێت، چونکە لەو بارەدا

[1] وەك شافیعییەکان و زاهیرییەکان.

مۆڵەتێکی ناڕاستەوخۆیە، دیسان لە مادەی(٢٢)دا ئاماژەی کردووە بە کارکردن بە گرێبەستی تێکدەر و چوونەلا کەمترین مارەیی ناونراو و مارەیی هاونموونە بۆ ئافرەتەکە پێویست دەکات، مارەیی هاونموونەی بۆ هەیە لە باری ناولێنەنانی مارەیی لە هاوسەرگیری تێکچوودا.

**ب-یاسای مەدەنی:**

پرۆژە یاسای عێراقی لەم یاسایەدا رای جمهوری زانایانی لە دابەشکردنی چواریدا وەرگرتووە کە بریتییە لە: پووچەڵ و دروست و بەشی دروستیش بۆ راگیراو و جێبەجێکراوی ناپێویست و جێبەجێکراوی پێویست، بڕگەی یەکەم لە مادەی(١٣٣)ی تایبەتکردووە بە پێناسەی "گرێبەستی دروست" بەوەی بریتییە لە گرێبەستی رەوا لەڕووی خود و وەسفەوە بەوەی لە کەسی خۆیەوە دەرچووە و دراوەتە پاڵ جێگەیەك قابیلی بڕیارەکەیەتی و هۆیەکی رەوای هەیە و وەسفەکانی دروست و سەلامەتن لە ناتەواوی.

مادەکانی (١٣٤–١٣٦)ی تەرخان کردووە بۆ گرێبەستی راگیراو لەڕووی هۆیەکانی راگیرانییەوە و ئەو ئاسارانەی لەدوای مۆڵەت لێیەوە سەرهەڵدەدەن لەدوای بەیانکردنی هەندێ لە مەرجەکانی ئەو مۆڵەتدانە، ئەو پێیوایە لە هۆیەکانی راگیرانی گرێبەست بوونی نەنگی رازیبوون(یان ویست)ە لە زۆرلێکردن یان هەڵە یان رێگری لەگەڵ ستەم[1]، سەرباری ناتەواوی لێوەشاوەیی کە لێوەشاوەیی پێهەستانی کامڵ کەم دەکاتەوە لەدوای دەستگرتن بەسەردا وەك گێلێتی، هەر بەو جۆرە رای حەنەفییەکان و مالکییەکانی وەرگرتووە لە دانانی هەڵسوکەوتی فزولیانە بە راگیراو پێش مۆڵەتی خاوەنەکەی.[2]

---

[1] م(١٢١) و م(١٣٤).

[2] م(١٣٥).

دەستی بۆ گرێبەستی پووچەڵ و هۆی پووچەڵییەکەی بردووە لە مادەی(١٣٧)دا بۆیە پێناسەی کردووە بەوەی"لە بنەڕەتدا دروست نییە بە سەرنجدان لە خودی گرێبەستەکە، یان بە وەسف دروست نییە بە سەرنجدان لە هەندێ لە وەسفە دەرەکییەکانی"، هەروەها لە هەندێ لە حوکمەکانی گرێبەستی پووچەڵی لە مادەی(١٣٨)دا باس کردووە، لەگەڵ ئەوەش جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ گرێبەستی لێوەشاوەیی ناتەولو و بە قابیل بە پووچەڵ کردنەوە دایناوە دوای ئەوەی ناتەولوی لێوەشاوەیی بە هۆیەکانی راگیرانی گرێبەست داناوە لە مادەی(٩٧)دا، لە مادەی(٩٨)دا ئاماژەی کردووە بۆ کەمکردنەوەی گرێبەست و لە مادەی(١٤٠)دا بۆ گۆڕانی گرێبەستی پووچەڵ.

حوکمەکانی گرێبەستی جێبەجێکاری ناپێویست و گرێبەستی جێبەجێکاری پێویستی لەو مادانەدا بەدوای ئەو مادە باسکراوانەدا هاتوون چارەسەر کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەندێ تێبینی بوونی هەیە لەسەر کارەکەی یاسادانەری عێراقی لە مادە باسکراوەکاندا، لەوانە:

١-دانانی زۆرلێکردن بە هۆیەك بۆ راگیرانی گرێبەست کە هەندێ لە فەقیهە ئیمامییەکان و "زفر" لە حەنەفییەکان بۆی دەچن، هەڵە لە سیفەتی جەوهەری و فریودان لەگەڵ ستەم ئەو دوانە لە هۆیەکانی پێویستنەبوونی گرێبەستن بە کۆدەنگی فەقیهانی شەریعەت و فەقیهانی یاسا، یاسادانەری عێراقی نە فیقهی ئیسلامی و نە فیقهی خۆرئاوایی وەرگرتووە و کاریشی بەوە نەکردووە کە لەناو یاسای وڵاتە عەرەبییەکاندا باوە ئەوەندەی من دەیزانم، بۆیە هیچ پاساوێك بۆ ئەم ئاراستە شازە نابینینەوە بە دانانی ئەو نەنگییە باسکراوە لە نەنگییەکانی رازیبوون بە هۆیەك بۆ راگیرانی گرێبەستەکە.

٢-برگەی دووەم لە مادەی(١٣٨) بە دەق دەڵێت: (گەر گرێبەست پووچەڵ بوویەوە دوو گرێبەستکارەکە دەگەڕێنەوە ئەو بارەی کە لەسەری بوون پێش گرێبەستەکە، گەر ئەوە نەشیاو بوو حوکمدان بە قەرەبووکردنەوەی هاوتا

ڕێگەپێدراوە) گوزارەی "حوکمدان ڕێگەپێدراوە" واتە پێدانی دەسەڵاتی خەملاندن بە قازی، بەوەی بڕیار بە قەرەبووکردنەوە بدات یان ڕەدی بکاتەوە، لە کاتێکدا حوکم بە قەرەبووکردنەوە لەم بارەدا لەسەر قازی پێویستە گەر ئەو کەسەی شایستەیەتی داوای کرد.

٣-یاسادانەری عێراقی تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە و گرێبەستی ڕاگیراو[1]، چونکە گرێبەستی لێوەشاوەیی ناتەواوی بە ڕاگیراو لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیار داناوە لە دوو مادەی(٩٧ و ١٣٧)دا و قابیل بە پووچەڵکردنەوە لە مادەی(٣/١٣٨)دا کە دەقەکەی دەڵێت: (کەسی لێوەشاوەیی ناتەواو پابەند نابێت گەر گرێبەستەکە پووچەڵ بوویەوە بەهۆی ناتەواوی لێوەشاوەییەکەیەوە بەوەی شتانێك ڕەد بکاتەوە جگە لەوەی بە قازانج بۆی دەگەڕێتەوە بەهۆی جێبەجێکردنی گرێبەستەکەوە) ئەمەش ئاماژە دەکاتە سەر ئەوەی لێوەشاوەیی ناتەواو بەهۆیەك بۆ ناپێویست بوونی گرێبەست(و قابیلیەتی پووچەڵ کردنەوەی) دادەنرێت، وەك چۆن ڕایەکی باوە لە یاسا کاریگەربووەکان بە فیقهی خۆرئاوایی، ئەم تێکەڵییە لەیاسادانەری عێراقییەوە تایبەت بە گرێبەستی لێوەشاوەیی ناتەواو ئەوە بوو سەریکێشا بۆ ئەوەی هەندێ لە شرۆڤەکەرانی ئەم یاسایە بکەونە هەمان تێکەڵییەوە و دانانی گرێبەستی ڕاگیراو لە فیقهی ئیسلامیدا یەکسان بکەن لەگەڵ ناوەڕۆك و حوکمی گرێبەستی قابیل بە پووچەڵ کردنەوە لە

---

[1] ئەوەی لە بڕگەی دووەمی مادەی (١٣٨)ی ئەم یاسایەدا هاتووە هەمان شتە کە لە "مصادر الحق(١٢٢/٤)"دا هاتووە، گەر گرێبەستەکە قابیلی پووچەڵکردنەوە بوو بەهۆی ناتەواوی لێوەشاوەیی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە و بڕیاری هەڵوەشانەوەی درا ئەوا لێوەشاوەی ناتەواوەکە ئەوەی داویەتی دەیگێڕێتەوە، بەڵام گرێبەستکارەکەی تر لە لێوەشاوەی ناتەواوەکە نایگێڕێتەوە مەگەر ئەو ئەندازەی بە سوود بۆی دەگەڕێتەوە بەهۆی جێبەجێ کردنی گرێبەستەکەوە، بینا لەسەر ئەمە یاسادانەری عێراقی لەم بڕگەیەدا گرێبەستی لێوەشاوە ناتەواوی کردووە بە قابیل بە هەڵوەشانەوە، لەگەڵ ئەوەی لە مادەی(٩٧) و مادەی(١٣٧)دا بە ڕاگیراوی دانا.

فیقهی خۆرئاواییدا، لەگەڵ ئەوەی گرێبەستی راگیرلو هیچ ئەسەرێك لە ئەسەرە شەرعیەکان لە مافەکان و ئەرکەکانی لەسەر پەیدا نابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش قابیلی هەڵوەشانەوە و پووچەڵ کردنەوەن بۆ کەسێك قابیلییەتی پووچەڵکردنەوە لەبەرژەوەندی ئەو بێت[1].

**دووەم: یاسای مەدەنی ئوردنی:**[2]

دەتوانین ئەم یاسایە بەوردترین و رێکخراوترین یاسای وڵاتە عەرەبییەکان دابنێین لە دابەشکردنی گرێبەست لەڕووی سیفەتە یاسایی(یان شەرعی)یەکەیەوە، چونکە بەرۆشنی دابەشکردنی پێنجی دەست بۆ بردووە وەك کاریگەربوون بە فیقهی ئەبی حەنیفە(رەحمەتی خودای لێ بێت)، بۆیە هەر بەشێکی بە پێناسەیەکی کۆکەرەوەی رێگری هاوەڵ لەگەڵ ئاماژە بە گرنگترین توخمەکانی و حوکمەکانی بەم جۆرە:

١–گرێبەستی دروست: ئەو گرێبەستەیە بە بنەڕەت و بە وەسف رەوایە، بەوەی لە کەسی خۆیەوە دەرچووبێت و خرابێتە پاڵ جێگەیەك قابیل بە حوکمەکەی و مەرامێکی رلوەستاوی و دروست و رەوای هەبێت و وەسفەکانی دروست بن و

---

[1] مامۆستا مەرقەس (أصول الإلتزامات ص٢١٠) دەڵێت: (لەسەرەتاوە تێبینی پێویستی جیاکردنەوە لە نێوان گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە و گرێبەستی راگیرلو دەکرێت لەگەڵ تێکەڵ نەکردنیان بەیەکتر، گرێبەستی راگیراو لە شەریعەتی ئیسلامدا گرێبەستێکە مەرجەکانی دامەزران و مەرجەکانی دروستی تێدا فەراهەم بوو، بەڵام لە کەسێکەوە دەرچووە سەرپەرشتیاری نییە بۆ سەرپێهەڵدانی وەك گرێبەستی فزولی و گرێبەستی بریکار لە دەرەوەی سنووری بریکاری، هەروەها گرێبەستی وەسێتدار لە دەرەوەی وەسێتدارییەکەی، حوکمەکەی ئەوەیە لەسەر سەرهەڵدانی هیچ ئاسارێك لە ئاسارەکانی سەرهەڵنادات سەرەڕای ئەوەی گرێبەستێکی دروستە و خاوەن شەرع دان بە بوونیدا دەنێت بەڵکو سەرهەڵدانی ئەسەرەکەی لەسەر مۆڵەتی ئەو رلوەستاوە بۆ ئەوانەی مافی دەستبەکاربوونیان هەیە، لەمەوە رۆشن دەبێتەوە گرێبەستی راگیرلو جیاوازە لە گرێبەستی قابیل بە پووچەڵبوونەوە لەوەدا ئەوەی دواییان لە کاتی بەستنیەوە هەموو ئاسارەکانی بەرهەم دەهێنێت)

[2] رقم (٤٣) لسنة ١٩٧٦ النافذ في ١٩٧٧/١/١.

مەرجی تێکدەر بۆی لێی نزیك نەبێتەوە[1]

٢-گرێبەستی پووچەڵ: ئەوەی بە بنەڕەت و وەسفی ناڕەوا بێت بەوەی پایەیەکی یان جێگەکەی یان مەرام پێی یان شێوەکەی کە یاسا سەپاندوویەتی بۆ دامەزرانی ناتەواو تێدا بێت و هیچ ئەسەرێکی لێوە پەیدا نەبێت و مۆڵەتی بۆ وەرنەگیرابێت، بۆ هەموو خاوەن بەرژەوەندییەك هەیە دەست بە پووچەڵبوونەوەوە بگرێت، بۆ دادگاش هەیە لە خودی خۆیەوە بڕیاری پێ بدات و گوێ بۆ داوای پووچەڵبوونەوە نەگرێت لەدوای تێپەڕبوونی پازدە ساڵ لە کاتی گرێبەستەکەوە[2].

٣-گرێبەستی تێکچوو: ئەوەیە بە بنەڕەتی رەوایە نەك بە وەسفەکەی، گەر هۆی تێکچوونەکەی سڕایەوە(نەما) دروست دەبێت.. تەنها بە دەستبەسەردلگرتن موڵك لە "گرێبەست لەسەرکراو"دا مانای هەیە.. تەنها لە چوارچێوەی ئەوەی حوکمەکانی یاسا بڕیاری لێ دەدەن ئەسەر سەرهەڵدەدات.. هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە یان میراتگرەکە مافی ئەوەی هەیە هەڵیبوەشێنێتەوە لەدوای کەموکورییەکانی گرێبەستکارەکەی تر[3]

٤-گرێبەستی ڕاگیراو: هەڵسوکەوت لەسەر مۆڵەت ڕاگیراو دەبێت لە جێبەجێ کردن: گەر لە کەسێکی فزولییەوە دەرچوو لەو شتانەداماڵی خۆی نین، یان لە خاوەن ماڵێکەوە لە ماڵێکدا مافی کەسانی تری پێوەیە یان لە کەسێکەوە شایستەبوونی ناتەواوە لە ماڵەکەیدا، هەڵسوکەوتەکەی لە نێوان قازانج و زیاندا دەسوڕایەوە یان لە کەسێکی زۆرلێکراوەوە یان گەر یاسا بە دەق لەسەر ئەوە

---

[1] م١٦٧.

[2] م١٦٨، کەیشتۆتە ئەو ڕایەی گەر گرێبەست لە بەرێکیدا پووچەڵ بوو ئەوا هەموو گرێبەستەکە پووچەڵ دەبێتەوە، مەگەر بەشی هەر بەرێکی دیاریکراو بێت، بەوەی لە بەرە پووچەڵەکەدا پووچەڵ بکرێتەوە و بەرە دروستەکە بهێڵرێتەوە: (م١٦٩).

[3] م١٧٠.

هاتبوو[1].

٥-گرێبەستی ناپێویست: گرێبەست ناپێویست دەبێت بۆ یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە یان بۆ هەردووکیان سەرەڕای دروستبوون و جێبەجێبوونی گەر بە سروشتی خۆی ناپێویست بوو بۆی، یان بۆ خودی خۆی هەڵبژاردەی هەڵوەشانەوە مەرج بوو[2].

**لەم خستنەرووە و لەوانی تریشەوە ئەنجامگیری دەکەین:**

١-یاسادانەری ئوردەنی ڕێگەیەکی دروستی گرتۆتە بەر کاتێ مەزهەبی ئەبی حەنیفەی لە دابەشکردنی پێنجی لە گرێبەستدا وەرگرتووە لەڕووی سیفەتە یاساییەکەیەوە، کارێکی باشی ئەنجامداوە و داوا دەکەین لە سەرجەم یاساکانی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا چاوی لێبکرێت.

٢-ئاراستەی ئیسلامی باوی لە فیقهی ئیسلامیدا وەرگرتووە کاتێك پێیوایە هەموو گرێبەستێك ڕاگیراوە گەر مافی کەسانی تر پەیوەست بوو بە گرێبەست لەسەرکراوەوە، بینا لەسەر ئەوە فرۆشتنی بارمتەکراو بەبێ مۆڵەتی قەرزدەری بارمتەگر و فرۆشتنی شتی بەکرێدراو بەبێ مۆڵەتی کرێگرتەکە ڕاگیراو و جێبەجێنەکراوە بۆ هەردووکیان، لەمەدا دەستەبەری مافی لایەکەی تر لە گرێبەستەکەدا هەیە.

٣-نەنگی ڕازیبوون-بە هەڵواردەی زۆرلێکردن- بە هۆیەکانی ناپێویستبوونی گرێبەست دادەنێت، پێچەوانەی ئەوەی یاسادانەری عێراقی شوێنیکەوتووە کە بە هۆیەکانی جێبەجێنەکەری گرێبەستیان دادەنێت.

٤-سەرەڕای چاکەکانی ئەم یاسایە تێبینی ئەوە دەکرێت گرێبەستی ڕاگیراو بووەتە هاوبەشی گرێبەستی دروست، نەك بەشێك بێت لە ئەو، چونکە(م/١٤١) بە دەق هێناویەتی: (هەر کەس بە یەکێك لە دوو جۆرەکەی زۆرلێکردن

---

[1] م١٧١

[2] م١٧٦.

زۆری لێبکرێت بۆ گرێدانی گرێبەستێك ئەوا گرێبەستەکەی جێبەجێ ناکرێت، بەلأم گەر زۆرلێکراو یان میراتگرانی رێگەیان پێدا دوای لادانی زۆرلێکردنەکە بەڕاشکاوی یان بە ئاماژە ئەوا وەردەگەڕێ بۆ دروست) چونکە راگیراو بەشێکە لە دروست[1]

**سێیەم: یاسای مەدەنی یەمەنی:**

ئەم یاسایە سەرەڕای کاریگەربوونی بە فیقهی ئیسلامی لەگەڵ ئەوەش لە دابەشکردنی گرێبەستدا لەڕووی وەسفە یاساییەکەیەوە(یان شەرعییەکەیەوە) ئاراستەیەکی شازی گرتۆتە بەر، چونکە بە دابەشبوونێکی شەشی دابەشی کردووە، بۆ زانینت بە رای جمهوری فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کاریگەر بووە کە دابەشکردنێکی چواری بۆ گرێبەست دەکەن، چونکە ئەو شەش بەشە لە حەقیقەتیاندا بۆ چوار بەش دەگەڕێنەوە، بۆیە لە مادەی (١٣٩)دا دەقەکەی دەڵێت: (گرێبەستەکان لەڕووی سەرهەڵدان و سەرهەڵنەدانی ئاساریانەوە دابەش دەبن بۆ ئەم بەشانە: ١-گرێبەستی دروست ٢-گرێبەستی نادروست ٣-گرێبەستی جێبەجێکار ٤-گرێبەستی راگیراو ٥-گرێبەستی پابەندکار ٦-گرێبەستی ناپابەندکار)

**گرێبەستی دروست:** ئەو گرێبەستەیە پایەکان و مەرجەکانی دروستیی فەراهەم بوون بەپێی ئەوەی لەم یاسایەدا دەقی بۆ داڕێژراوە[2]

**گرێبەستی نادروست:** ئەو گرێبەستەیە پایەیەك یان مەرجێك لە مەرجەکانی دروستیی کە دەقی ئەو یاسایە دەیگرێتەوە تیایدا ناتەولوە[1]

---

[1] مەبەستێك: فرۆشتنی راگیراو بەشێکە لە دروست: فرۆشتنی نەهیلێکراو سیانە: پووچەڵ و تێکچوو و ناپەسەندی حەرام(مکروه تحریما)... ئەوەش کە نەهی تێدا نییە سیانە: جێبەجێکاری پێویست و جێبەجێکاری ناپێویست و راگیراو، یەکەمیان ئەوەیە بە بنەڕەت و وەسفی رەوایە و مافی کەسی پێوە پەیوەست نەبووە و هەڵبژاردەی تیا نییە، دووەم ئەوەیە مافی کەسانی تری پێوە پەیوەست نەبووە و هەڵبژاردەی تێدایە، و راگیراویش ئەوەیە مافی کەسانی تری پێوە پەیوەستە)

[2] م ١٤٠

**گرێبەستی جێبەجێکار:** ئەوەیە سیفەتەکەی ئەنجامدرلوە و نەدرلوەتە پاڵ ماوەیەك یان راگیرلوە لەسەر مەرجێك یان مۆڵەتێك، ئەسەرەکەی لە ئێستادا رادەگیرێت، تەنها لە کاتی هاتنی ماوەکەیدا ئاساری لەسەر سەرهەڵدەدات یان هاتنەدی مەرجەکە یان بەدەستهێنانی مۆڵەت لە کەسێکەوە کە خاوەنیەتی وەك گرێبەستی فزولی کە لەسەر مۆڵەتی خاوەنی بنەڕەتی وەستاوە، هەروەها گرێبەستی منداڵی جیاکەرەوە لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیار یان وەسێتدار وەستاوە لەو شتانەی کە مۆڵەتی پێ نەدرلوە[2].

**گرێبەستی پابەندکار:** ئەو گرێبەستەیە دوای تەواوبوونی هیچ یەکێك لە دوو لایەنەکە مافی ئەوەی نییە هەڵسبوەشێنێتەوە یان لێی بکشێتەوە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی، هەرچەند بە رازیبوون یان بە حوکمی قازی رێگەپێدرلوە و هەڵبژاردەکانی تێدا جێگیر دەبێت[3]

گرێبەستی ناپابەندکار: ئەوەیە کە دروستە بۆ هەریەك لە دوو لایەنەکە یان بۆ یەکێکیان بە ویستی یەکلایەنەی خۆی لێی بکشێتەوە وەك بریکاری[4]

**ئەم تێبینیانە لەسەر کارەکەی یاسادانەری یەمەنی لەم دابەشکردنەدا دەخرێنە روو، بەم شێوەیە:**

١-کەوتۆتە ناو کۆمەڵێك هەڵەی مەنتقییەوە کە جێگەی لێخۆشبوون نییە، "بەش-قسم"ی کردووە بە "هاوبەش-قسیم" بۆ "بەشکرلو-مقسم"ەکە و هەریەك لە راگیراو و جێبەجێکاری پێویست و ناپێویستی کردووە بە هاوبەش بۆ گرێبەستی دروست، لە کاتێکدا ئەوانە بەشن بۆ گرێبەستی دروست، دابەش

---

[1] م ١٤١
[2] م١٤٣
[3] م ١٤٤
[4] م ١٤٥

بوو بەرەهایی گشتگیرترە لە هەریەك لە بەشەكانی و هەر بەشێكیش بەرەهایی تایبەترە لە بەشكراوەكەی، هەر هاوبەشێكیش جیابوەوەیە لە هاوبەشەكەی تری.

٢-پێویست بوو ئەوەی دلواكراوە لە هاتنەدی جێبەجێكاری گرێبەستەكە لە توخمەكانەوە دیاریبكردبایە، پاشان هەر گرێبەستێك یەكێك لەو رەگەزانەی لێ دواكەوتووە بە رلگیراوی دابنابایە، و ئەوەی لە پێویستبوونی گرێبەستدا دلواكراوە بیخستبایەتە روو، گەر یەكێك لە توخمەكانی دوابكەوێت دەبێتە ناپێویست.

٣-دژایەتییەك هەیە لە نێوان دانانی گرێبەست بە جێبەجێكاری پێویست و نێوان جێگیركردنی هەڵبژاردەكان تیایدا، وەك لە (م١٤٦)دا بۆ گرێبەستی پابەندكار هاتووە.

٤-ئەم شەش بەشە، وەك باسمان كرد دەگەڕێنەوە بۆ چوار بەش كە ئەمانەن:

گرێبەستی نادروست(پووچەڵ) لەسەر ئەو بنچینەی پووچەڵ و نادروست یەكسانن، وەك چۆن ئەوە رای جمهوری فەقیهانی موسڵمانە، گرێبەستی دروستیش دروستی راگیراو و جێبەجێكاری ناپێویست و جێبەجێكاری پێویست دەگرێتەوە، بۆیە پێویست بوو ئەم رێكخستنەی وەریگرتبایە وەك كاریگەربوون بە رای جمهوری فەقیهانی موسڵمان.

**ئەو یاسایانەی كاریگەرن بە فیقهی خۆرئاوایی:**

لەو یاسایانەی كاریگەرن بە فیقهی خۆرئاوایی بریتین لە یاسای مەدەنی میسری و سوری و لیبی و لوبنانی و كوێتی، ئەم یاسایانە كەوتوونەتە كۆمەڵێك هەڵەوە كە فیقهی خۆرئاوایی تێیكەوتووە لە تێكەڵكردنی نێوان ئەوەی پێویستە رلگیراو بێت لەگەڵ ئەوەی پێویستە جێبەجێكاری ناپێویست(قابیلی پووچەڵبوونەوە) بێت، پاشان هەڵە لە نێوان مۆڵەتی گرێبەست و تێپەڕاندنی سەرەڕای ئەوەی مۆڵەت بۆ سەرهەڵدانی ئاساری گرێبەستە، لە كاتێكدا تێپەڕاندن بۆ دامەزرانی ئەو ئاسارەیە

دوای سەرهەڵدانی لەسەر گرێبەستەکە، سەرباری دژایەتی نێوان بۆچوونی فرۆشتنی فزولی-بۆ نموونە- مولکداری ناگوێزێتەوە بۆ کڕیارەکە پێش مۆڵەت، لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە فرۆشتنی فزولی قابیلی پووچەڵبوونەوەیە، بۆ زانینت قابیلییەتی پووچەڵبوونەوە لە زاراوەی خۆرئاواییدا بەرانبەر جێبەجێکاری ناپێویستە لە فیقهی ئیسلامیدا[1]، هەموو مافەکان و ئەرکەکانی لەسەر سەرهەڵدەدات تەنها بە دامەزران و رێکارە باسکراوەکان بە دابەشکردنی سیانی باو لە فیقهی خۆرئاواییدا بۆ گرێبەست: گرێبەستی دروست و گرێبەستی پووچەڵ بە پووچەڵبوونەوەیەکی رەها و گرێبەستی پووچەڵ بە پووچەڵبوونەوەیەکی رێژەیی(قابیل بە پووچەڵ کردنەوە)، هەر گرێبەستێك پایەکان و مەرجە یاساییەکانی فەراهەمبوون بریتییە لە گرێبەستێکی دروست، گەر توخمێك لەو توخمانەی لێ دواکەوت دەبێتە پووچەڵ، جگە لەم دوانە قابیلی پووچەڵبوونەوەن، فیقهی خۆرئاوایی و یاسا کاریگەرەکان پێی هەر شتێك هۆیەکە لە هۆیەکانی راگیرانی گرێبەست(جێبەجێنەکردنی) هۆیەکە لە هۆیەکانی ناپێویستبوونی گرێبەست(قابیلییەتی پووچەڵکردنەوە)، بینا لەسەر ئەوە لە دەرخستنی هەڵەکان کە لە یاساکانی کاریگەر بە فیقهی خۆرئاواییدا هاتووە لەم بەشی سێیەمەدا کورتی دەکەینەوە، بەهۆی جیاکاری لە نێوان گرێبەستی راگیراو و گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە.

لە هۆیەکانی قابیلییەتی گرێبەست بۆ پووچەڵکردنەوە لە فیقهی خۆرئاوایی و یاسا عەرەبییەکان کاریگەر بەو فیقهە خۆرئاواییە ئەمانەن: ناتەواوی لێوەشاوەیی، و نەنگییەکانی رازیبوون، و نەبوونی سەرپەرشتیاری لەسەر جێگەی گرێبەست، وەك لە هەڵسوکەوتی فزولیانەدا.

[1] مامۆستا سەنهوری لە (مصادر الحق ٤/١١٥): دەڵێت: "گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە بە پێچەوانەی گرێبەستی پووچەڵەوەیە دەمودەست جێبەجێ دەکرێت و هەموو ئاسارەکانی سەرهەڵدەدە، بوونێکی یاسایی بۆ هەیە لەو سۆنگەیەوە هەڵسوکەوتێکی یاساییە"

**أ.ناتەواوی لێوەشاوەیی:**

ناتەواوی لێوەشاوەیی لە فیقهی خۆرئاوایی و یاسا کاریگەرەکان بەو فیقهە بە هۆیەك لە هۆیەکانی پووچەڵبوونەوەی گرێبەست دادەنرێت، یەکسانە ناتەواوییەکە بەهۆی تەمەنەوە بێت یان بەرهەڵستکارێك لە بەرهەڵستکارەکانی لێوەشاوەیی، وەك بێئاگایی و گێلێتی دوای دەستگرتن بەسەردا، لە یاسای مەدەنی میسری(م١١١) و سوری(م١١٢) و لیبی(م١١١) و لوبنانی(م١١٦) و کوێتی(٦٧): هەڵسوکەوتی داراییانەی منداڵی جیاکەرەوە -کە لە خودی خۆیدا لە نێوان قازانج و زیاندا دەسورێتەوە- قابیلی پووچەڵکردنەوەیە بۆ بەرژەوەندی ناکام، مافی دەستگرتن بە پووچەڵکردنەوە لادەدرێت گەر مۆڵەتی هەڵسوکەوت بە ناکام درا دوای باڵغبوون و تەمەنی کامڵبوون، یان مۆڵەتی لە سەرپەرشتیارەکەیەوە یان لە وەسێتدارەکەیەوە یان لە دادگاوە بەدەستهێنا بەپێی حاڵ و بارەکان و رێنموونی یاسا[1]

لە یاسای میسری(م١١٥) و سوری(م١١٦) و لیبی(م١١٥) و کوێتی(م١٠١)دا بە دەق هاتووە حوکمەکانی منداڵی جیاکەرەوە بەسەر هەڵسوکەوتەکانی بێئاگا و گێلدا تێبپەڕێنرێت دوای تۆمارکردنی بڕیاری دەستگرتن بەسەردا[2]

**ب-نەنگییەکانی رازیبوون:**

هەڵە: لە یاسای مەدەنی میسری(م١٢٠) و سوری(م١٢١) و لیبی(م١٢٠) و لوبنانی(م٢٠٣) و کوێتی(م١٤٧)دا بە دەق هاتووە گەر کەسی گرێبەستکار کەوتە ناو هەڵەی جەوهەرییەوە دروستە بۆی داوای پووچەڵکردنەوەی گرێبەستەکە بکات گەر گرێبەستکارەکەی تر هەروەك ئەو کەوتبووە ناو هەمان هەڵەوە، یان زانستی پێی هەبوو یان ئەوەندە ئاسان بوو دەیتوانی لێی بەئاگا بێت.

---

[1] شایانی باسە مۆڵەتی سەرپەرشتیار یان وەسێتدار ناکرێتە بەڵگە مەگەر هەڵسوکەوتەکە خاڵی بێت لە ستەمی گەورە.

[2] پێش راگەیاندنی بڕیاری دەستگرتن بەسەردا ئەو هەڵسوکەوتانە پووچەڵ نین و قابیلی پووچەڵکردنەوە نین مەگەر بەرهەمی خراپ بەکارهێنان یان رێکەوتنی ژێربەژێری.

فێڵڵێکردن: لە یاسای میسری(م١٢٥) و سوری(م١٣٦) و لیبی م١٢٥) و لوبنانی(م٢٠٨) و کوێتی(م١٥١): دروستە گرێبەستی فێڵڵێکردن هەڵبوەشێنرێتەوە گەر ئەو فێڵەی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە یان ئەو کەسەی لە جێگەی ئەو دادەنیشێت پەنای بۆ بردبوو ئەوەندە گەورە بوو ئەوە نەبوایە لایەنی دووەم گرێبەستەکەی نەدەبەست.

هەروەها لە میسری(م١٢٦) و سوری(م١٢٧) و لیبی(م١٣٦) و لوبنانی(م٢٠٩) و کوێتی(م١٥٢): گەر فێڵڵێکردن لە کەسانی ترەوە بوو جگە لە دوو گرێبەستکارەکە ئەوا بۆ گرێبەستکاری فێڵڵێکرلو نییە دلوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە بکات، گەر نەسەلما گرێبەستکارەکەی تر دەیزانی یان هەر دەبوا بەو فێڵەی بزانیبایە[1].

زۆرلێکردن: لە یاسای میسری(م١٢٧) و سوری(م١٢٨) و لیبی(م١٢٧) و لوبنانی(م١١٦) و کوێتی(م١٥٦)دا بە دەق هاتووە: پووچەڵکردنەوەی گرێبەست بۆ زۆرلێکردن دروستە گەر کەسێك لەژێر دەسەڵاتی ترسدا کە گرێبەستکارەکەی تر خستبوویە سەری بەناحەق گرێبەستی ئەنجامدا و ئەو ترسە پاڵی نابێت بۆ بەستنی گرێبەست بەجۆرێك گەر ترسەکە نەبوایە ئەو گرێبەستە تێنەدەپەڕی بەو جۆرەی رازی بێت لەسەری[2]

لە زۆرلێکردنی دەرچوو لە کەسانێکی ترەوە جگە لە دوو گرێبەستکارەکە لە یاسای میسری(م١٢٨) و سوری(م١٢٩) و لیبی(م١٢٨) و کوێتی(م١٥٧)دا بە دەق هاتووە: گەر زۆرلێکردن لە کەسانی ترەوە جگە لە دوو گرێبەستکارەکە دەرچوو ئەوا

---

[1] یاسای کوێتی(م١٥٤) جیاوازی کردووە لە نێوان بەخشینەکان و بریتیدانەکان لەم مەرجەدا، بۆیە بەدەق هێناویەتی کە: (لە گرێبەستی بەخشینەکاندا پووچەڵکردنەوەی گرێبەست دروستە- وەك هەڵواردەیەك- گەر بەرهەمی فێڵڵێکردن هاتبوو بەبێ سەرنجدان بەوەی فێڵەکەی لێوەشاوەتەوە)

[2] گەر ئەو ترسە لەسەر بنچینەیەك راستبووبوویەوە بەوەی لە رەوشەی ئێستادا ئەو لایەنەی بانگەشەی بۆ دەکات وا وێنا بکات ترسێکی مەزن لە ئێستادا ئابلۆقەی دلوە ئەو ترسە یان شتانی تر جگە لەو ترسە هەڕەشە لە نەفس و جەستە و شەرەف و ماڵی دەکات.

بۆ گرێبەستکاری زۆرلێکرلو نییە دلوای پووچەڵ کردنەوەی گرێبەستەکە بکات گەر نەسەلمابێت گرێبەستکارەکەی تر بەوەی دەزانی یان پێویست بوو بەو زۆرلێکردنەی بزانیبایە[1].

پێشێلکاری: لە یاسای میسری(١٢٩) و سوری(١٣٠) و لوبنانی(١٢٩) و کوێتی(م١٥٩ و ١٦٠)دا بە دەق هاتووە: گەر پابەندبوونەکانی یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە هەرگیز هاوتا نەبوو لەگەڵ ئەوەی ئەو گرێبەستکارە بەدەستی دەهێنێت بەپێی گرێبەستەکە یان لەگەڵ پابەندبوونەکانی گرێبەستکارەکەی تر، ڕۆشنبوویەوە گرێبەستکاری ستەملێکراو بۆیە گرێبەستەکەی ئەنجامداوە، چونکە گرێبەستکارەکەی تر حەز و ئارەزووی ڕۆشن و سەرکەشی تێدا بەکارهێناوە ئەوا بینا لەسەر دلوای گرێبەستکاری ستەمکلێکراو دروستە بۆ قازی گرێبەستەکە پووچەڵ بکاتەوە یان پابەندبوونەکانی ئەو گرێبەستکارە کەم بکاتەوە، پێویستە لە ماوەی یەك ساڵدا لە بەرواری گرێبەستەکەوە دلوا بەرز بکاتەوە ئەگەر نە قبوولکرلو نییە.

### ج-نەبوونی سەرپەرشتیاریی بەسەر جێگەی هەڵسوکەوتەوە:

هەر کەس لە کاروباری کەسانی تردا بەبێ مۆڵەت یان نوێنەرایەتی پێشینە هەڵسوکەوتی کرد ئەوە پێی دەوترێت فزولی و کارەکەشی پێی دەوترێت خۆتێهەڵقورتان، جا کارەکە قسە بێت وەك فرۆشتنی ماڵی کەسانی تر یان کڕینی ماڵێك بۆ کەسێك بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی پێشینە لە کەسەکە، یان هەڵسوکەوتێکی کرداری بێت وەك خەرجکردن بۆ ژن و منداڵی کەسانی تر کاتێك کەسەکە بێسەروشوێن یان نادیار بێت یان وەك دلنەوەی قەرزەکەی و هاوشێوەکانی ئەمانە[2]،

---

[1] یاسای کوێتی(م١٥٨) جیاوازی کردووە لە نێوان بەخشینەکان و بریتیدانەکاندا بۆ بە دەق هێناویەتی لە بەخشینەکاندا گونجاوە دلوای پووچەڵکردنەوەی بکرێت گەر ڕازیبوون پێی بەهۆی زۆرلێکردنەوە بەبێ سەرندان بەو کەسەی زۆرلێکردنەکەی لێوەشاوەتەوە.

[2] مامۆستا سەنهوری لە (مصادر الحق ١٨٣/٤) دەڵێت: فزولی لە فیقهی ئیسلامیدا جیایە لە فزولی لە فیقهی خۆرئاواییدا، لە فیقهی خۆرئاواییدا فزولی ئەو کەسەیە هەستاوە بە کارێکی پێویست ←

فەقیهانی یاسا وا گومان دەبەن کەسی فزول لە فیقهی ئیسلامیدا جیایە لە فزول لە فیقهی خۆرئاواییدا، وەك یاسا عەرەبییەکان کاریگەر بە فیقهی خۆرئاوایی جیاوازیان کردووە لە نێوان هەڵسوکەوت لە موڵکی کەسانی تردا بەبێ مۆڵەتی کەسەکە لەگەڵ خۆتێهەڵقورتان، لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان دوو جۆرن لەژێر رەگەزی هەڵسوکەوت لە کاروباری کەسانی تردا بەبێ مۆڵەت یان بوونی نوێنەرایەتی پێشینە جێگەیان دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەش هەڵسوکەوتی فزولی بە زۆری لە گرێبەستدا بەکاردەهێنرێت، خۆتێهەڵقورتانیش لە کاروکردەوەکاندایە، بینا لەسەر ئەو جیاوازییە بانگەشەبۆکراوە یاساکانی کاریگەر بە فیقهی خۆرئاوایی خۆتێهەڵقورتانیان لەژێر ناونیشانی (دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) چارەسەر کردووە لەسەر ئەو بنچینەی گوایە ئەوە شێوازەکە لە شێوازەکانی پیادەکردنی، وەك یاسای مەدەنی میسری(م١٨٨-١٩٧) و سوری(م١٨٩-١٩٨) و لیبی(م١٩١-٢٠٠) و لوبنانی(م١٤٩-١٥١، ١٥٣) لەناو ئەم یاسەدا دەربارەی هەڵسوکەوتە کردارییە رەواکان باسی لەبارەوە دەکرێت. لە کاتێکدا ئەو یاسایانە هەڵسوکەوتی گوتاری لەژێر ناونیشانی(فرۆشتنی موڵکی کەسانی تر) چارەسەر کردووە و بە دروستی قابیل بە پووچەڵ کردنەوە دایناوە، وەك میسری(م٤٦٦-٤٦٨) و سوری(م٤٣٤-٤٣٦) و لیبی(م٤٥٥-٤٥٧)[1]

---

کە بۆ خاوەن کاری چارەسەر کردووە وەك چاکەیەك لە ئەوەوە، ئەو شتەی لەو کارەدا خەرجی کردووە بۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام فزولی لە فیقهی ئیسلامیدا ئەو کەسەیە دەستتێوەردان دەکات بۆ کاروباری کەسانی تر بەبێ بریکاری و نوێنەرایەتی، پێویست نییە بە کارێکی زۆر پێویست هەڵبستێت، هەر کەسماڵی کەسانی تری بەبێ نوێنەرایەتی فرۆشت ئەو کەسە فزولییە، یەکسانە لەوەدا فرۆشتبێتی وەك ماڵی کەسانی تر یان فرۆشتبێتی وەك ئەوەی ماڵی خۆیەتی، یەکسانە کڕیارەکە زانیبێتی فزولییە یان نەیزانیبێت.

بەڵام هەر کەس لە فیقهی ئیسلامیدا شوێنپێی پیادەکردنەکانی هەڵسوکەوت بەبێ مۆڵەت لە کاروباری خەڵکیدا هەڵبگرێت دەبینێت هەڵسوکەوتی فزولی یان خۆتێهەڵقورتان لە فیقهی خۆرئاواییدا جۆرێکە لە رەگەزی هەڵسوکەوتی فزولی لە فیقهی ئیسلامیدا.

[1] لە(م٣٨٥)دا لە یاساڕێژی پێویستەکان گرێبەستەکانی لوبنان: فرۆشتنی ماڵی کەسانی تر پووچەڵە جگە لەم بارانەدا:

ئەم مادانە ئەم خاڵانە لەئامێز دەگرن:

١-گەر کەسێك شتێکی بە خود دیاریکراوی فرۆشت و ئەو خاوەنی نەبوو ئەوا بۆ کڕیار دروستە داوای پووچەڵکردنەوەی فرۆشتنەکە بکات، کارەکەش بە هەمان شێوەیە گەر فرۆشتنەکە کەوتە سەر خانووبەرە، گرێبەستەکە تۆمار کرابێت یان تۆمار نەکرابێت، لە هەموو بارەکاندا ئەم فرۆشتنە تێپەڕنابێت بەسەر مافی خاوەنی شتە فرۆشراوەکە با کڕیاریش مۆڵەتی گرێبەستەکە بدات.

٢-گەر خاوەنەکەی بڕیاری فرۆشتنی دا ئەوا گرێبەستەکە بەسەر حەقی ئەودا تێدەپەڕێت و لە حەقی کڕیارەکەدا بۆ دروست وەردەگەڕێت، هەر بەو جۆرە گرێبەستەکە لە حەقی کڕیارەکە وەردەگەڕێت بۆ دروست گەر موڵکداری فرۆشراو گەڕایەوە بۆ فرۆشیار دوای دەرچوونی گرێبەستەکە.

٣-گەر بۆ کڕیار حوکمی پووچەڵکردنەوەی فرۆشتنەکە دەرکرا و نەیدەزانی فرۆشراوەکە موڵکی فرۆشیارەکە نییە، ئەوا بۆی هەیە داوای قەرەبوو بکاتەوە با فرۆشیارەکەش نییەتی باش بێت.

---

١-گەر فرۆشراو تەنها بە رەگەزەکەی یان جۆرەکەی دیاریکراو بێت، گونجاو نییە گەر بە خود دیاریکراو بوو.

٢-گەر خاوەن مۆڵەتی دا، گەر رەفزی کرد پووچەڵە، ئەمە مەرجێکە لەسەری رێکەوتوون.

٣-گەر دواتر کەسی فزولی مافی موڵکداری بەسەر فرۆشراودا بەدەستهێنا.

پاشان یاسارێژی لوبنانی مافی کڕیار لە قەرەبوودا بەڕەوا نابینێت مەگەر کڕیار نیێت باش و فرۆشیار نیێت خراپ بێت، بەوەش یاسای لوبنانی لە یاسای میسری جیادەبێتەوە، لە دوو باردا لەگەڵی هاوڕا نییە، یەکەم: بەمەرجگرتنی نیێت خراپی فرۆشیار، سەرباری نیێت باشی کڕیار، دووەم: فرۆشراو شتێکی دیاریکراو نەبێت بە خود، بەڵکو بە رەگەز یان بە جۆر دیاریکرا بێت، بە پێچەوانەی ئەوەی مامۆستا سەنهوری دەڵێت لەوەی لەگەڵ یاسای میسریدا لە هەموو حوکمەکاندا پێکدێتەوە، جگە لە بەمەرجگرتنی نیێت خراپی فرۆشیار (انظر الوسيط ٤/٢٧١).

لە یاسارێژییە کاریگەرەکان بە فیقهی خۆرئاوایی ئەم تێبینیانە سەرنج دەدرێن:

١-بوونی دژایەتی رۆشن لەنێوان وەسفکردنی هەڵسوکەوتی فزولی بەوەی قابیلی پووچەڵکردنەوەیە ولتە دادەمەزرێ و لەسەری ئاساری یاسایی سەرهەڵدەدات، بەڵام قابیلی هەڵوەشانەوەیە لەگەڵ وتنی ئەوەی مولکداری پێش مۆڵەت ناگوێزرێتەوە، مادەی(٤٦٦) لە یاسای مەدەنی میسری بە دەق دەڵێت: (لە هەموو بارەکاندا ئەم فرۆشتنە گوزەر ناکات-فرۆشتنی مولکی کەسانی تر بەبێ مۆڵەت و نوێنەرایەتی- لە حەقی خاوەن شتە فرۆشراوەکە با کڕیاریش مۆڵەتی گرێبەستەکە بدات)

٢-ئەو قسەیەی کە ئاساری یاسایی لەسەر هەڵسوکەوتی لێوەشاوە ناتەواوی سوڕلو لە نێوان قازانج و زیاندا سەرهەڵنادات بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیار یان دادگا لەگەڵ پێدانی مافی پووچەڵکردنەوە پێچەوانەیە لەگەڵ مەنتقی یاسایی کە بانگەکات بۆ وریایی و ئاگاداربوون لە هەڵسوکەوت لەسەر ماڵ و مولکی ناکامان، لەو هۆشداریانە ئەو قسەیە کە ماڵ و مولکی ناکامان راگیراوە لە بازنەی نێوان قازانج و زیاندا.

٣-بەرپرسیارێتی کاریگەربوونی یاساکانی ولاتە عەرەبییەکان بە فیقهی خۆرئاوایی و یاسای فەرەنسی و دوورخستنەوەی فیقهی ئیسلامی دەکەوێتە سەر شانی یاسادانەری میسری و فەقیهانی یاسا لە میسر، ئەوانەی دژیەتییەکی رۆشن لە نێوان گوفتارەکانیان و کردارەکانیاندا دەبینینەوە لەوەی پەیوەستە بە فیقهی ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامەوە، بەڵگە لەسەر ئەو دژایەتییە دەهێنمەوە بە گواستنەوەی ئەوەی دوو فەقیهی مەزنی میسری(مامۆستا سەنهوری و مامۆستا مەرقەس) دەیلێن.

مامۆستا سەنهوری لە کتێبەکەیدا"مصادر الحق"دەڵێت[1]:

"سەرەڕای ئەوەی گرێبەستی تێکدەر لە مەزهەبی حەنەفیدا ئەسەرێك لە بنەڕەتدا بەرهەم ناهێنێت و بوونی لەسەر هەڕەشەی تیاچوونە، چونکە شایستەی هەڵوەشانەوەیە لەگەڵ ئەوەش گرێبەستی تێکدەر هەڵدەستێت بە رۆڵێکی گرنگ لە پارێزگاری کەسانی تر و پارێزگاری خودی گرێبەستکارەکە، ئەو دوورە لەوەی گرێبەستێکی پووچەڵبوەوە بێت و هیچ ئەسەرێکی نەبێت، بۆیە ئەو کڕیارەی قەواڵەی موڵکدارییەکەی فریودان یان سوو یان مەرجی تێکدەری پێ تێکەڵ دەبێت وەك ئەو کڕیارە نییە قەواڵەی موڵکداریەکەی نەنگییەکی لە بنەڕەتی گرێبەستەکەدا پێ تێکەڵ دەبێت، وەك ئەوەی جێگەی گرێبەستەکە ماڵێکی بێبایەخ(بێبەها) بێت، بۆیە کڕیار بە گرێبەستی تێکچوو گەر هەڵسوکەوتی کرد لە شتە کڕاوەکەدا دوای دەستبەسەرداگرتنی وەك ئەو هەڵسوکەوتە نییە کڕیارێکی دڵنیا پێی هەڵدەستێ و ناترسێت لەوەی شتەکە لە دەستی وەربگرنەوە، لەمەدا پارێزگارییەکی گەورە هەیە بۆ کەسانی تر، گرێبەستی تێکچوو خودی گرێبەستکارەکە دەپارێزێت، کڕیار دەپارێزێت گەر فرۆشتنەکە زیادی کرد لە دەستیدا دوای دەستبەسەرداگرتنی زیادەیەك لە فرۆشراوەکەوە لەدایك نەبووە، بەڵام پێیەوە پەیوەستە، بۆیە گرێبەستی تێکچوو دوورە لەوەی وەك گرێبەستی پووچەڵبوو وابێت، بەڵکو ئەوە گرێبەستێکە پارێزگارییەکی زیادە دەبەخشێت نەك تەنها بە کەسانی تر بەڵکو بە خودی گرێبەستکارەکە، ئەمە و گرێبەستی تێکچوو لە گرێبەستی پووچەڵ لە کارێکی جەوهەری تردا جیادەبێتەوە، ئەوەش ئەوەیە گەر تێکچوونەکەی لێ لابرێت دەگۆڕێت بۆ دروست و ئەسەر بەرهەم دەهێنێت نەك وەك ڕوودلوێکی مادی بەڵکو وەك هەڵسوکەوتێکی شەرعی".

[1] ٤/٢٧٣-٢٧٤ الطبعة الثالثة لسنة ١٩٦٧، مع الإختصار في النقل.

ئەمە ئەوە بوو مامۆستا سەنهوری لەباری گرێبەستی تێکچووەوە وتی، سەرباری ئەوەش دەڵێت: "فەقیهانی یاسا مەدحی کارەکەی ئەبی حەنیفەیان کردووە، چونکە زۆرێك لە مامەڵە دارلییەکانی رزگار کردووە لە دارمان".

مامۆستا "مەرقەس"یش رەخنە لە یاسادانەری میسری دەگرێت بەوەی دەستی بۆ گرێبەستی راگیراو نەبردووە و دەڵێت: (ئەو بە پێویستی دەبینێت قەزا کاری پێ بکات سەرەڕای بێدەنگبوونی یاسادانەر[1]: هەر لەسەرەتاوە پێویستی جیاکردنەوەی نێوان گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە و گرێبەستی راگیراو و تێکەڵنەکردنی نێوانیان تێبینی دەکرێت، بۆیە گرێبەستی راگیراو لە شەریعەتی ئیسلامدا گرێبەستێکە مەرجەکانی دامەزران و مەرجەکانی دروستی تێدا فەراهەم هاتووە، بەڵام لە کەسێکەوە دەرچووە ویلایەتی بەسەر سەرهەڵدانیدا نییە، وەك گرێبەستی فزولی و گرێبەستی بریکار لە دەرەوەی سنووری بریکارییەکە و گرێبەستی وەسێتدار لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتەکەی، حوکمەکەی ئەوەیە هیچ ئاسارێك لە ئاسارەکانی لەسەر سەرهەڵدانی دروست نابێت سەرەڕای ئەوەی گرێبەستێکی دروستە و یاسادانەر دان بە بوونیدا دەنێت، بەڵکو سەرهەڵدانی ئەسەرەکەی لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسە وەستاوە مافی هەڵسوکەوتی هەیە لەسەری، گەر بە مۆڵەتێکی دروست مۆڵەتی دا ئەوا لە کاتی دەرچوونییەوە جێبەجێ دەکرێت و گەر رەدی کردەوە پووچەڵ دەبێتەوە، لە کاتێکدا گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە لە کاتی گرێدانی گرێبەستەکەوە هەموو ئاسارەکانی سەرهەڵدەدەن، یاساڕێژی ئێستا شتێك دەربارەی گرێبەستی راگیراو باس ناکەن، بەڵکو خۆی کورتهەڵهێناوە لەسەر خستنەڕووی ئەسەری گرێبەستی دروست و مەبەستیشی بەو گرێبەستە دروستە ئەوەیە ئەسەر بەرهەم دەهێنێت واتە رانەگیراو، پاشان حوکمی گرێبەستی پووچەڵ و گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوەی رۆشن کردۆتەوە، ئەوەش هەندێ جار هۆیەك بووە بۆ

---

[1] الوافي في شرح القانون المدني في الإلتزامات، المجلد الأول، نظرية العقد والإرادة المنفردة، الطبعة الرابعة ١٩٨٦، ص٤٢٤- ٤٢٦ مع تصرف.

تێکەڵی زۆر لە نێوان گرێبەستی قابیل بە پووچەڵکردنەوە و گرێبەستی ڕاگیراو، لێرەوە سەریکێشاوە بۆ وەسف کردنی هەندێ لە گرێبەستەکان بەوەی قابیلی پووچەڵ کردنەوەن تەنها بەهۆی ئامادەیی هاتنی مۆڵەت بەسەریاندا، سەرەڕای ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەو گرێبەستانە پێش مۆڵەتدانیان هیچ ئەسەرێك بەرهەم ناهێنن، لە نموونەکانی ئەوە گرێبەستی وەسێتدار یان سەرپەرشتیار لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتیان، واتە بەبێ دلوای مۆڵەتی دادگا لەو شتانەی پێویستی بە مۆڵەتە، هەروەها گرێبەستی بریکار لە دەرەوەی سنووری بریکارییەکەی و گرێبەستی فزولی، هەروەها کڕینی ئەو شتەی بریکاری پێڕاسپێرراوە بۆ خۆی لەلایەن بریکارەکەوە و هاوشێوەکانی ئەمانە، دروست ئەوەیە ئەم گرێبەستانە لەسەر مۆڵەت ڕاگیراون و چۆناندنیان هەر بەو جۆرە دیاریدەکرێت تەنانەت لەگەڵ نەبوونی دەق لەسەر ئەو چۆناندنە لە یاساڕێژی ئێستادا، چونکە ئەم گرێبەستانە پووچەڵ نین و قابیلی پووچەڵ کردنەوەش نین، بۆیە ئەم گرێبەستانە لە یاسادا بە گرێبەستی لێ بێدەنگ بوو لە سزاکەی دادەنرێت، ئەم بێدەنگبوونەش بەپێی مادەی یەکەم برگەی دووەم لە یاساڕێژی مەدەنی قازی-دەربارەی ئەم سزایە- سەرپشك دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای سەرچاوەکانی تری یاسا، لەوانە شەریعەتی ئیسلام، بۆیە بۆمان دروستە بیرۆکەی گرێبەستی ڕاگیراو لەو شەریعەتەوە وەربگرین بۆ ئەوەی ئەو ناتەواوییە دەرکەوتووە لە یاساڕێژی مەدەنی پێ پڕ بکەینەوە)[1]

مامۆستا سەنهوری پشتیوانی ئەم ڕایەی کردووە لە "الوسيط-كتاب البيع"دا[2]، هەروەها لە "مصادر الحق في الفقه الإسلامي"دا[3]

پاشان مامۆستا مەرقەس[4] دەڵێت: "یاسادانەری عێراقی ڕاشکاوانە دانی بەوەدا ناوە لە یادداشتی ڕۆشنکردنەوەکەدا بۆ یاسای ژمارە(١١٩) ساڵی ١٩٥٢ تایبەت بە

---

[1] ئەمە هەمان ئەو شتەیە لە کتێبی أصول الإلتزامات، ص٢١١ وتویەتی

[2] ٣٥٢/٤ الطبعة الثالثة ١٩٨٦ هامش (٢).

[3] ٢٧٦/٤، ٢٧٧ الطبعة الثالثة ١٩٦٧.

ویلایەت لەسەر ماڵ و سامان، لەوێ ڕاشکاوانە ڕێگەیاندووە گرێبەستی وەسێتدار لە دەرەوەی سنووری وەسێتدارییەکەی ڕاگیراوە لەسەر مۆڵەتی دادگا و هیچ ئەسەرێك بەرهەم ناهێنێت تا مۆڵەتەکەی تەولو نەبێت"

وا دەردەکەوێت ئەم دوو مامۆستایە کە لە زانا گەورەکانی یاسای میسرن ئاگایان لە فیقهی ئیسلامی نەبووە پێش یاسارێژی یاسای مەدەنی میسری نوێ ١٩٤٨، گەر ئەو بیانووە نەبولیە ئەوا دەکەوتنە بەر ئەم ئایەتە ﴿كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[٢]، هیوایەکی گەورەمان هەیە بە پڕکردنەوەی ئەم ناتەواوییە تەشریعییە لە یاسایەکی عەرەبی یەککرتوو لە داهاتوودا.

---

[١] الوافي ، المرجع السابق ص٤٢٦.

[٢] الصف : ٣

# مەبەستى سێیەم:
# لەرووى بریتیدانەوە

گرێبەست دابەش دەبێت بۆ بریتیدانەكان و بەخشینەكان:

١-گرێبەستى بریتیدان: ئەو گرێبەستەیە هەریەك لە دوو گرێبەستكارەكە بەرانبەرێكى بۆ ئەوەى دەیدەن تێدا وەردەگرن، یان ئەوەى بۆ كەسى بەرانبەر پێیەوە پابەند دەبێت، وەك فرۆشتن، بۆیە كڕیار بەرانبەر نرخێك كە دەیدات بە فرۆشیارەكە فرۆشراوەكە وەردەگرێت، وەك چۆن فرۆشیار نرخێك لە بریتى فرۆشراوەكە وەردەگرێت.

٢-گرێبەستى بەخشین: ئەو.گرێبەستەیە لە رێگەیەوە یەكێك لە دوو گرێبەستكارەكە بریتییەك بەرانبەر ئەوەى بەخشیویەتى وەرناگرێت یان بۆ ئەوەى پێیەوە پابەند بووە وەك چۆن ئەویتر بەرانبەرێك نادات بۆ ئەوەى وەریگرتووە وەك خواستن و دانان و بریكارى بێ پارە و پێدان.

## بەرى دابەشكردن:

بەرى دابەشكردن لەم خالآنەدا دەردەكەوێت:

١-لەرووى لێوەشاوەییەوە: لە بیرتیدانەكاندا لێوەشاوەیى پێهەستانى ناتەولو بەسە بۆ دامەزرانى گرێبەستەكە سەرەڕاى سەرهەڵنەدانى ئاسارەكەى مەگەر لەدواى مۆڵەت، لە كاتێكدا لە بەخشینەكاندا-بە هەڵواردەى وەسێت- بوونى لێوەشاوەیى پێهەستانى تەولو بە مەرج دەگیرێت[1].

[1] هەڵواردەكردنى وەسێت بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە: یەكەمیان نەگواستنەوەى موڵكدارى وەسێتپێكراو بۆ وەسێتبۆكراو لە دواى مردنى وەسێتكەر نەبێت، ئەو لەرووى مادیەوە بەو وەسێتە زەرەرمەند نابێت، دووەمیان لێوەشاوەیى ناتەولو وەك لێوەشاوەیى تەولو وایە و ←

٢-لەرووی پلەی پابەندبوونەوە: بەری دابەشبوون لە بریتیدانەکاندا توندترە وەك لە پابەندبوون لە بەخشینەکاندا گەر کەسی پابەندبوو کەمتەرخەمی پێکرد، بۆ نموونە: گەر لادانان(الوديعة) بە کرێ بوو ئەوە بریتییە لە بریتیدان و کەسی لادانراو پابەند دەبێت بەوەی بۆ پارێزگاری دانانەکە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ.

بەڵام گەر بەبێ کرێ بوو ئەوا ئەو کەسە خۆبەخشە و پابەند نابێت بە پابەندبوونی پیاوێك شەو و رۆژ لەپای دانراوەکەدا بوەستێت، بەڵکو پابەند دەبێت بە ئەندازەی ئەو هەوڵەی بۆ پارێزگاری لەماڵی خۆی دەیبەخشێت بەبێ ئەوەی وەك پیاوێکی وابەستە بە شتەکەوە سەرقاڵی چاودێری بێت.

٣-لەرووی پابەندبوونەوە بە دەستەبەری مافداری: لە بەخشینەکاندا لە سنوورێکی بەرتەسکدا دەستی بۆ دەبرێت، بۆ نموونە پێدەر مافداری کەسی پێدراو دەستەبەر ناکات مەگەر بەئەنقەست بیەوێت هۆی مافدارییەکە بشارێتەوە یان پێدراوەکە بە بریتییەك بێت(پێدانی پاداشت)، لەو بارەدا قازی بریتییەك بۆ کەسی پێدرلو دیاریدەکات بەرانبەر ئەو زیانەی بەریکەوتووە لە باری یەکەمدا، بەڵام لە باری دووەمدا پێدەر تەنها بە ئەندازەی ئەوەی کەسی پێدرلو بەوی دلوە دەستەبەر دەکات[1] بە پێچەوانەی بریتیدانەوە -وەك فرۆشتن- لەم بارەدا دەستەبەری تەواو بۆ مافداری راوەستاوە.

٤-لەرووی نەنگییە شارلوەکانەوە: دەستەبەری لە بریتیدانەکاندا راوەستاوە، بەڵام لە بەخشینەکاندا دەستەبەری بوونی نییە مەگەر بە ئەنقەست نەنگییەکەی

---

عیبادەتەکەی دروستە و پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت، وەستێتیش عیبادەتێکی دلرلیانەیە کەسی وەستێکەر پێی ئاتاجە.

[1] وەك لە مادەی ٦١٤ یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکاردا هاتووە: "پێدەر شایستەبوونی پێدرلوەکە دەستەبەر ناکات مەگەر هۆی شایستەبوونەکە بە ئەنقەست بشارێتەوە یان پێدانە بە بریتییەك بێت، لەباری دوایاندا پێدەر بە ئەندازەی ئەو بریتییە پێدرلوەکە بەوی دەدات شایستەبوون دەستەبەر دەکات، هەموو ئەمانە کاتێك راستن لەسەر جگە لەمانە رێکەوتن نەکرابێت"

شاردبێتەوە یان پێدەر خاڵیبوونی پێدراوەکەی لە نەنگی دەستەبەر کردبێت، یان فرۆشراوەکە گیاندارێکی تووشبوو بێت بە نەخۆشییەك سەریكێشابێت بۆ تووشبوونی هەموو گیاندارەکانی تری کەسی پێدرلو، لەو بارەدا لەسەر پێدەر پێویستە قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە، کاتێك پێدرلو بوو بە مافداری کەسی پێدرلو جێگەی کەسی پێدەر دەگرێتەوە لەو شتانەی ماف دلوایان بۆ ئەو تێدایە.

٥-لەرووی هەڵەوە لە کەسی گرێبەستکارەوە: پووچەڵکەرەوەی گرێبەستە بە شێوەیەکی گشتی لە بەخشینەکاندا گەر کەسایەتی پێبەخشرلو جێگەی بایەخی بەخشەرەکە بوو، بە پێچەوانەی بریتیدانەکانەوە لێرەدا پووچەڵکەرەوە نییە گەر نەسەلمێت کەسایەتی گرێبەستکار جێگەی بایەخ بووە لە کاتی گرێدانی گرێبەستەکەدا، وەك ئەوەی یەکێك بێت لە خزمە نزیکەکانی یان پزیشکێکی خاوەن پسپۆڕی تایبەت بێت.

٦-لەرووی دلوای جێبەجێ نەکردنی هەڵسوکەوتی دەرچوو لە قەرزدارەوە وەك زیان گەیاندن بە قەرزدەرەکە(دلوای پۆلسیانە) ئەمەیان لە بەخشینەکاندا بەبێ پێویستبوونی نیێتی خراپی پێبەخشرلو، بەلآم لە بریتیدانەکاندا قبوولّ ناکرێت مەگەر قەرزدەر نیێتی خراپی خاوەن هەڵسوکەوت بسەلمێنێت و ئەو کەسەش هەڵسوکەوتەکەی بۆ ئەنجامدرلوە زانستی بەوە هەبێت[1].

---

[1] الأستاذ الدكتور سليمان مرقس – أصول الالتزامات، ص٤٦-٤٧.

# مەبەستی چوارەم:
# لەڕووی ڕۆڵی کاتەوە لە گرێبەستدا

دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

١-گرێبەستی یەکسەر: ئەو گرێبەستەیە کات بۆ دیاریکردنی جێگەکەی دەستێوەردانی نییە یا دەستێوەردانیشی بۆ دیاریکردنی ماوەی جێبەجێ کردنەکەی هەبێت، بۆ نموونە فرۆشتن بە سروشتی خۆی گرێبەستێکی یەکسەری جێبەجێکردنە و کات بۆ دیاریکردنی دوو بڕبڕەکە(فرۆشراو و نرخ) دەستێوەردانی نییە، بەڵکو فرۆشراو بە وەسفە خودییەکانی یان بە بینینی دیاریدەکرێت، نرخەکەش بە بڕێك لە پارە یان بە نرخی بازاڕ دیاریدەکرێت، بەڵام بەوەی گرێبەستەکە جێبەجێکردنی یەکسەری بێت ڕێگری ناکات لە دیاریکردنی ماوەیەك بۆ جێبەجێ کردنی پابەندبوونەکانی هەردوو لایەنەکەی یان لایەنێکیان.

٢-گرێبەستی بەردەوام(گرێبەستی بەماوە) یان(گرێبەستی کاتئامێز): ئەو گرێبەستەیە بۆ دیاریکردنی جێگەکەی کات دەچێتە ناویەوە و دەبێتە توخمێکی جەوهەری تیایدا نەك توخمێکی لابەلا ماوەی جێبەجێکردنەکەی دیاریدەکات وەك گرێبەستی بەکرێدان.

**بەری دابەشکردن:**

ئەم بەرە لەم خاڵانەدا جیلوە دەکات:

١-لەڕووی هەڵوەشانەوە: هەڵوەشان جێبەجێکردنی یەکسەرییە بەهۆی ئەسەرێکی گەڕاوەوە، دوو گرێبەستکارەکە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو بارەی کە پێش بەستنی گرێبەستەکە لەسەری بوون، بە پێچەوانەی جێبەجێکردنی بەردەوامەوە، ئەوەی لێی لەدەستچووە ناتوانرێت بگێڕرێتەوە، بەڵکو ئەسەری هەڵوەشانەوەکە تیایدا کورتدەبێتەوە تەنها لەسەر داهاتوو.

٢-لەڕووی کاریگەری هێزێکی زاڵ: لە گرێبەستی یەکسەرییدا کاریگەری هێزی زاڵ کە وا دەکات جێبەجێ نەکرێت کورتدەبێتەوە لەسەر دواخستنی وەفاکردن بە پابەندبوون تا کاتی نەمانی هێزە زاڵەکە بەبێ کاریگەری لەسەر بڕی ئەرکی پێبەستان، هەندێ جار کاریگەرییەکە سەردەکێشێت بۆ هەڵوەشانەوەی گرێبەست گەر کاتەکەی درێژەی کێشا، بە پێچەوانەی بەردەوامەکەوە ماوەی راگیرانی جێبەجێ کردن بەهۆی هێزە زاڵەکەوە لە ماوەی گرێبەستەکە کەم دەکاتەوە، گەر درێژەی کێشا تا هەموو ماوەی گرێبەستەکەی داگیرکرد گرێبەستەکە تەواو دەبێت و جێگەیەك بۆ بوونی نەمامێنێتەوە لە کاتی لاچوونی هێزە زاڵەکەدا، بۆ نموونە یەکێك ئوتێلێك لە شاری بەسرە بەکرێ بگرێت و شەڕی عێراق-ئێران وا بکات قازانجی لێ نەبینێت، گەر ئەو شەڕە پێش کۆتایی ماوەکە کۆتایی هات لەوەی ماوە لە کات جێبەجێ دەکرێت و ئەوەی لە سوود لێبینین تیاچووە کەم دەکرێتەوە، بۆیە کەسی بەکرێدەر مافی کرێی ئەو ماوەیەی نییە.

# مەبەستی پێنجەم:
# لەڕووی ناونان و ڕێکخستنی یاساییەوە

گرێبەست دابەش دەبێت بۆ ناونرلو و ناونەنرلو:

١-گرێبەستی ناونرلو: ئەو گرێبەستەیە یاسا بە ناوێکی دیاریکرلو ناوی لێناوە و حوکمەکانی ڕێکخستووە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە دەقە یاساییەکانەوە.

٢-گرێبەستی ناونەنراو: ئەمە بە پێچەوانەی ناونراوەوە یاسا ڕاستەوخۆ حوکمەکانی ڕێکناخات و بە ناوێکی دیاریکرلو تایبەتی ناکاتەوە.

ڕووی ئەم جیاوازییە بۆ زۆری ئاڵوگۆڕی جۆری یەکەم دەگەڕێتەوە هاوڕێ لەگەڵ بەدەستهێنانی گرنگییەکی گەورە لەڕووی کردارییەوە لە کاتی دانانی یاساڕێژیدا، بەلآم لەوانەیە گرێبەستێك لەژێر سێبەری یاسایەکی پێشوودا لە جۆری دووەم بەرهەمی گۆڕانکاری لە ژیانی ئابووریدا لەژێر سێبەری یاسای نوێدا ببێتە یەکێك لەو گرێبەستانەی گرنگی تایبەت بەخۆیان هەیە، بۆیە یاسا ڕێکیان دەخات و تایبەتیان دەکات بە ناوگەلێك بگونجێ لەگەڵ سروشتیاندا.

لەو گرێبەستە ناونەنرلوانە لەژێر سێبەری یاسای مەدەنی عێراقی ڕاوەستاودا: بریتییە لە گرێبەستی هاوەردە و گرێبەستی میوانخانەیی و گرێبەستی بلآوکراوە، پرۆژە یاسای مەدەنی نوێی ساڵی ١٩٨٥ ڕێکیخستوون-یاساکە تا ئێستای ڕۆشنایی نەبینیوە- سەرەڕای ئەوەی ئەم گرێبەستانە گرنگییەکی زۆریان لە ژیانی کرداری ئەمڕۆدا بەدەستهێناوە.

١-گرێبەستی هاوەردە[1]: ئەو گرێبەستەیە بەپێی دلواکارییەکەی هاوەردەکەر

---

[1] ئەو سێ پێناسە باسکرلوانە لە دەرهێنانی خۆمە لەگەڵ کۆمەکی وەرگرتن بە مادەکانی پرۆژەکە(٦٨٤،٧٨١،٨٨٤) لە کەسەوە نەمگواستۆتەوە، چونکە پێناسەی هاتوو لەو مادانەدا ناتەولو و نەنگیدار بوون یان ناواخن و زیادەیان لەئامێز گرتبوو.

پابەند دەبێت بە ئامادەکردنی شمەکی دیاریکراو بۆهاوەردەکرلو لە ماوەیەکی دیاریکراودا بە هاوەردەکردنی یەك لەدوای یەك لە کاتی خۆیدا بەرانبەر پابەندبوونی بە نرخەکانیان.

٢-گرێبەستی میوانخانەیی: ئەو گرێبەستەیە بەپێی داواکارییەکەی خاوەن میوانخانە پابەند دەبێت بە ئامادەکردنی شوێنی نیشتەجێبوون و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری بۆ میوانەکان بەرانبەر کرێیەك لە ماوەیەکی دیاریکراو یان دیارینەکراودا.

٣-گرێبەستی بلاوکراوە: ئەو گرێبەستەیە دانەری بلاوکراوەکە بەپێی داواکارییەکەی مافی خۆی لە قازانجبینینی دارایی دەگوێزێتەوە بۆ کەسی پەخشکەر بەرانبەر پابەندبوونی بە بلاوکردنەوە و پێدانی بڕی پارەکە.

**بەری دابەشکردن بۆ ناونراو و ناونەنراو:**

١-گەر ناکۆییەك لە گرێبەستی ناونراودا بۆ دادگا خرایە روو لەسەر قازی پێویست دەبێت بۆ ئەو حوکمە بگەڕێت لەم ناکۆکییەدا جێبەجێی دەکات بەپێی ئەو یاسایەی حوکمەکانی رێکخستووە، چونکە گرێبەستە ناونراوەکان یەکەمجار دەقە تایبەتەکان پێی حوکمی بەسەردا دەکەن، گەر نەیبینییەوە ئەوا پێویستە بگەڕێتەوە بۆ رێسا گشتییەکان.

گەر ناکۆکی لە گرێبەستی ناونەنراودا هەبوو ئەوا لەسەر قازی پێویستە بۆ حوکمەکەی لە رێسا گشتییەکانی پابەندبوون بگەڕێت، واتە دەقە گشتییەکان کە دەستەبەری ئەو رێسا گشتییانە دەکەن.

٢-گەر قازی نەیتوانی چارەسەرێکی گونجاو لە رێگەی دەقەوە یان لە رێگەی رێسا گشتییەکانەوە دەربهێنێت پێویستە لەسەری پەنا ببات بۆ دەقە تایبەتەکان کە چارەسەری گرێبەستی تری ناونراوی خاوەن پەیوەندی بە ناونەنراوەوە دەکەن یان هەوڵی بەکارهێنانی تێگەیشتن یان پێوانە بدات.

# مەبەستی شەشەم:
# لەرووی دیاریکردنی بەهاوە

دابەش دەبێت بۆ گرێبەستی بەها دیاریکراو و گرێبەستی ئەگەری:

١-گرێبەستی بەها دیاریکراو: ئەو گرێبەستەیە هەریەك لە دوو لایەنەکە دەتوانن کاتی بەستنی گرێبەستەکە و ئەو بڕەی وەریدەگرێت و ئەو بڕەی دەیدات دیاری بکەن، لە گرێبەستی فرۆشتندا-بۆ نموونە- هەریەك لە فرۆشیار و کڕیار دەتوانن بەدیاریکراوی ئەوەی وەریدەگرێت لە کەسەکەی تر و ئەوەی پێی دەبەخشێت بزانێت .

٢-گرێبەستی ئەگەری: ئەو گرێبەستەیە تیایدا بڕی پابەندبوونەکانی یەکێك لە دوو لایەنەکە لەسەر رووداوێك وەستاوە کە روودانەکەی ئەگەر و نەگەرە و بۆی هەیە بڕی پابەندبوونەکان زیاد یان کەم بکات.

لە پیادەکردنەکانی بریتییە لە گرێبەستی بیمە(دڵنیاکاری) لەسەر ژیان، هەردوو لایەنەکە ناتوانن کاتی گرێبەستەکە رۆشنبکەنەوە و ژمارەی ئەو پشکەی دەکەوێتە ئەستۆی بیمەبۆکراو دیاریبکەن، هەر بەو جۆرە ناتوانن مەودای پابەندبوونەکانی بیمەکار دیاریبکەن، چونکە بەپێی درێژی تەمەنی بیمەبۆکراو درێژ دەبێتەوە، لەوانەشە بەزوویی بمرێت و تەنها یەك پشك بە بیمەکار بدات یان چەند پشکێکی کەم، بەلگەنەویستە بیمەکار لەباری یەکەمدا قازانجکەرە و لە باری دووەمدا زیانەکەی گەورەیە.

بینا لەسەر ئەگەری قازانج و زیان گرێبەستەکە پێی دەوترێت ئەگەری.

هەندێ جار گرێبەستی بەها دیاریکراو بەسروشتی خۆی دەگۆڕێت بۆ گرێبەستی ئەگەری بە خستنە ناوەی توخمێکی نادڵنیاکەر وەك فرۆشتنی خانوو بەرانبەر موچەیەك بە درێژایی تەمەنی فرۆشیار.

**بەری دابەشکردن:**

لەسەر ئەم ئەم دابەشکردنە بەرێك سەرهەڵدەدات، ئەوەش ئەوەیە دروست نییە بۆ ئەو کەسەی رووبەڕووی زیان بووەتەوە پەنا ببات بۆ ستەملێکراوی و داوای لادانی ئەو ستەمە بکات لەڕووی یاساوە، چونکە گرێبەستەکە لە خودی خۆیدا نادڵنیاکەرە واتە هەر لە سەرەتاوە پێشبینی نادڵنیایی لێدەکرێت، بۆیە قبووڵ کردنی گرێبەستەکە بە شاندانە ژێری ئەو زیانە پێشبینیکراوە دادەنرێت.

# باسی سێیەم:
# ویستی یەکلایەنە(تاقانە)
# (هەڵسوکەوتی تاکلایەنە)

ویستی یەکلایەنە زاراوەیەکی خۆرئاواییە، هەڵسوکەوتی تاکلایەنە زاراوەی فیقهی ئیسلامییە، بەزۆری هەردووکیان هاوواتان، مەبەست پێیان پابەندبوونی کەسێکی سروشتییە بەرانبەر بە کەسانی تر بۆ هەستان بەوەی بەرژەوەندی هەردووکیانی تێدایە، جا سەرهەڵدانی مافێك بێت وەك بەڵێندان بە خەڵاتێك بۆ کەسەکەی تر، یان بەردانەوەی مافێکی راوەستاو وەك پاکردنەوەی ئەستۆ لە مافێك گەر بە بەردانەوە چۆناندنی بۆ کرا بەبێ موڵککردن.

هەڵسوکەوتی تاکلایەنە(ویستی یەکلایەنە) بریتییە لە هەموو ئەوەی لە مرۆڤەوە دەردەچێت لە گوفتار و کردار بە ویستی یەکلایەنەی خۆی بەجۆرێك شەرع یان یاسا ئەسەرێکی لەسەر دروست بکات و بایەخی پێبدات، بە پێچەوانەی گرێبەستەوە کە لە یەکگرتنی دوو ویست بەجۆرێك ئەسەرەکەی لەسەر گرێبەست لەسەرکراو و گرێبەستکار سەرهەڵبدات لە مافەکان و ئەرکەکان.

پێش چوونە ناو لێکۆڵینەوەی کرۆکی ئەم بابەتە گرنگە هەندێ هەڵە کە زانایانی یاسا و یاساکان تێیکەوتوون و لە پێشینەوە بۆ پاشین گوازراونەتەوە بەبێ پەیبردن پێیان بخەینەروو، لەو هەڵانە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: لە یاساکان و شرۆڤەکانی یاسادا گوزارەی(ویستی یەکلایەنە) لە جێگەی (هەڵسوکەوتی یەکلانە) بەریلاوە، ئەمەش لە چەندین رووەوە هەڵەیە، لەوانە:**

١-هەرکاتێك وشەی "ویست" بەکارهێرا مەبەست پێی "ویستی ناوەکی"ە بینا لەسەر رێسای(گەر شتێك بەکارهێنرا هەڵدەدرێتە سەر تاکی کاملّی) تاکی کاملّیش بریتییە لە ویستی ناوەکی، ویستی دەرەکی وەك قالّب و توێکلّ وایە بۆی، چونکە گوزارشتە لە ویستەکە، هەروەها لەبەر ئەوەی یاسا حوکم بە دەرەوە دەکات.

٢-تێکەڵکردن لە نێوان رووداوەکان و هەڵسوکەوتەکان بە کورتهەڵهێنانی هەڵسوکەوتە یاساییەکان لە گوفتارەکاندا و بەکارهێنانی رووداوەکان بۆ کردارەکان، لە نووسینەکانماندا هەڵەی ئەم بەکارهێنانەمان خستۆتە روو، بەلاّم لێرەدا بابەتەکە دووبارە دەکەینەوە بۆ سوودی زۆرتر، هەروەها لەبەرئەوەی بەرتەسککردنەوە پێچەوانەی عورف و شەرع و ترازووی مەنتقە:

أ. لە عورفی عەرەبدا بەکارهێنانی هەڵسوکەوت بۆ گوفتار و بۆ کردار باوە، بۆ نموونە گەر کەسێك قسەیەکی ناماقووڵی کرد یان بە کارێکی ناشیرین هەستا لەبەردەم خەڵکیدا پێی دەوترێت: ئایا ئەمە هەڵسوکەوتی مرۆڤی ژیرە؟

ب- قورئانی پیرۆز وشەی "عمل-کردار" و داتاشراوەکانی بۆ گوفتار و بۆ کردار بەکارهێناوە، ئەمەش لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا، لەوانە: ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[1].

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە زۆرترین کرداری چاکەی مرۆڤ کردارگەلێکە بۆ پەروەردگاری ئەنجامدابێت یان بۆ خزمەتی خەڵکی.

ج- مەنتقی یاسایی جیاوازی ناکات لە نێوان گوفتار و کرداردا لە سەرهەڵدانی ئاساردا کە یاسا بایەخی پێدەدات.

---

[1] سورة العصر/ ١-٣.

د– لەم سەردەمە پێشکەوتووەدا گوزارەی "ویستی یەکلایەنە" بەزۆری لە ڕێگەی کردارەوەیە بە بەکارهێنانی هۆکارە تەکنەلۆژییەکانی سەردەم بۆ پێکهێنانی گرێبەست لە نێوان دەوڵەتاندا لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە یان ئیمەیل(پۆستی ئەلەکترۆنی) یان نووسینەوە یان ئاماژەوە یان جگە لەمانە شتانی تر، هەموو ئەم هۆکارانە کردارن نەك گوفتار.

شایانی باسە دوای پێداچوونەوە بە زۆرێك لە یاساکان و شرۆڤەکانیاندا بەکارهێنانی گوزارەی(هەڵسوکەوتی تاکلایەنە)م لە جێگەی(ویستی یەکلایەنە) نەبینییەوە، بە هەڵواردەی یاسای مەدەنی ئوردەنی[1] کە بەشی دووەمی تایبەت کردووە بە ناونیشانی(هەڵسوکەوتی تاکلایەنە) بۆ چارەسەری ئەم بابەتە، بۆیە مادەی(٢٥٠) لەو یاسایە بە دەق دەڵێت: (دەگونجێ "هەڵسوکەوتی بە ویست" تەواو ببێت بەبێ ڕاوەستان لەسەر قبووڵ کردن گەر پابەندکردنی کەسانی تری تێدا نەبێت بۆ ئەو شتەی یاسا بڕیاری لێدەدات)

**دووەم: زانایانی یاسا لە دەقە یاساییەکان و شرۆڤەکانیاندا سەرچاوەی پابەندبوونیان بۆ پێنج شت دابەش کردووە** کە ئەمانەن: گرێبەست، و ویستی یەکلایەنە، و کرداری ناڕەوا، و بەدەستهێنانی بێ هۆ(دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ)، و یاسا، بەمەش کرداری ناڕەوا و بەدەستهێنانی بێهۆیان کردووە بە هاوبەشی ویستی یەکلایەنە(هەڵسوکەوتی تاکلایەنە).

لە ترازووی مەنتقدا هاوبەش(قسیم)ی هەرشتێك لەو شتە جیابووەتەوە، ئەوەی یەکێکیان بەڕاستی دەزانێ ئەویتریان بەڕاستی نابینێت لە تاکەکان، هیچ یەکێکیان لەژێر چەمکی ئەویترياندا جێگەی نابێتەوە، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە ئەو کارە هەڵەیەکە پێچەوانەیە بە مەنتقی یاسایی، چونکە هەریەك لە کاری ناڕەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ(یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) لەژێر چەمکی(هەڵسوکەوتی تاکلایەنە) جێگەیان

[1] رقم (٤٢) لسنة ١٩٧٦.

دەبێتـەوە بەتێکەیشـتنێك لـە بەشـەکانی ویسـتی یەکلایەنـە، بەش(قسـم)ی شـتێك تایبـەتترە لـە بەشکراوەکەی(مقسـم)، هـەرکات دەسـتەبەر بـوو دابەشـکرلو لەگـەڵی دەستەبەر دەبێت بەبێ پێچەوانەکەی.

**سێیەم- بەدەستهێنان بێ هۆ(یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) دەکەوێتە ژێر کاری ناڕەواوە یان کاری زیانبەخش بە کەسانی تر**، بۆیـە تەنهاکردنـەوەی بـە بەشـێکی سەربەخۆی هاوبەش بۆ بەشی کاری ناڕەوا پێچەوانەی مـەنتقی یاسـاییە وەك چـۆن پێچەوانەی مەنتقی ڕەوانبێژییە کە دلوای دوورخستنەوەی ناواخن و دووبارەبوونـەوە دەکات لە قسەدا بەتایبەت لە داڕشتەی یاسایی هونەریدا.

**چوارەم: فەقیهانی یاسا تێکەڵییەکیان لا دروست بووە لە نێوان گرێبەسـت و هەڵسوکەوتی تاکلایەنە(ویستی یەکلایەنە)** لەژێر ناونیشانی گرێبەستی پابەندکار بۆ یەك لایـەن کاتێـك گرێبەسـتەکانیان دابەشـکردووە بـۆ چـەندین بـەش لـە سـۆنگەی جۆراوجۆرەوە-وەك پێشتر باسمان کرد- بۆیە دەڵێن: لە دابەشکردنی گریبەستدا بە سەرنجدان لە ماوەی پابەندبوون بۆ گرێبەسـتی پابەنـدکار بـۆ هـەردوو لایەنەکـە(یان ئاڵوگۆڕی) ئەوەش ئەو گرێبەستەیە پابەندبوون(یان ماف)ی ڕووبەڕوو لە ئەستۆی دوو گرێبەستکارەکەدا دروست دەکات، وەك گرێبەستی فرۆشتن فرۆشیار پابەند دەکات بە گواستنەوەی تەواوی موڵکی فرۆشرلو بۆ کڕیارەکە و کڕیاریش پابەنـد دەکـات بـە رادەستکردنی نرخەکە بۆ فرۆشیارەکە، هەروەها بـۆ گرێبەسـتی پابەنـدکار بـۆ یـەك لایەن ئەوەش ئەوەیە کە پابەندبوون لە ئەسـتۆی یـەکێك لـە دوو گرێبەسـتکارەکەدا دروست دەکات بەبێ ئەویتریان، بـەجۆرێك یـەکێك لـە دوو لایەنەکـە تـەنها قـەرزدەر دەبێت بەبێ قەرزدار، ئەویتریان قەرزدار دەبێت بەبێ قەرزدەر وەك لە پێداندا[1].

---

[1] تەماشای أصول الالتزامات للأستاذ الدكتور سليمان مرقس، ص٤١-٤٢ بکە، ئەو لە گەورەکانی فەقیهانی یاسایە لە میسردا کە ئەم دابەشکردنە نامەنتقییەی بە هەڵە وەرگرتووە، هەر بەو جۆرە مامۆستا سەنهوری الوسيط ١٧٠/١، ئەویش لە گەورە فەقیهانی یاسایە لە جیهانی عەرەبیدا.

ئـەم دابەشـكردنە مـەنتقی یاسـایی رەدی دەكاتـەوە، چـونكە لـە دەروازەی دابەشكردنی شتە(كە گرێبەستە) بۆ خودی خۆی و بۆ جگە لەخۆی(كە هەڵسوكەوتی تاكلایەنەیە) كە گرێبەست نییە، چونكە چییەتی گرێبەسـت بریتییـە لـە هەماهـەنگی دوو ویسـتی یـەككگرتوو لـە ئـەرێكردن و نەرێكردنـدا خۆیـان دەبیننـەوە، تیایانـدا مەرجەكانی دامەزران فەراهەم دەبن بەجۆرێك لەسەر ئەو چییەتییە مافەكان و ئەركە روویـەرووەكان سـەرهەڵدەدەن، هۆشمەنـدان و زانایـانی مـەنتق و فەیلەسـوفان كۆدەنگیان هەیە لەسەر پووچەڵی دابەشكردنی شتێك بۆ خۆی و بۆ جگە لە خۆی.

**پێنجەم: پشتگوێ خستنی رۆڵی هەڵسوكەوتی تاكلایەنە لەلایەن زانایانی یاسا و یاساكانەوە لە هۆگەرایی پابەندبوونەكان و كورتهەڵهێنانی** ئەم هۆگەراییە تایبەت بە پرسە مەدەنییەكان لە بازنەی بەرتەسكی سنووردار بە دەقـە یاسـاییەكان بـەجۆرێك لەسەر هەڵسوكەوتی تاكلایەنە هیچ ئەسەرێكی یاسایی سەرهەڵنەدات مەگـەر لـەبارە سنووردارەكاندا بە دەق.

بۆ نموونە برگەی یەكەم لە مادەی (١٤٨) لە یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاو بـە دەق هێناویەتی(ویستی یەكلایەنە هاوەڵەكەی پابەند ناكات مەگەر لەو بارانـەدا یاسـا بەدەق هێناویەتی)، لەسەر ئەم بنچینەیە یاسـا ویسـتی یەكلایەنـە ناینێتـە ژێربـاری رێسایەك هاوشێوەی رێسای(تاوان و سزادان بە دەقە)، چونكە بـەپێی ئـەم ئاراسـتە بەرتـەسكە پێویستە بوترێت: (لە ویسـتی یەكلایەنـەدا نـە "بـەر" بـوونی هەیـە و نـە بەرپرسیارێتی، مەگەر بە دەقێك)

ئەمەش بەرهەڵستی دەكات لەگەڵ كۆدەنگی زانایانی یاسا لەسەر جیاكاری نێوان پرسـە تاوانكـاری و مەدەنییـەكان بـەوەی پابەندبوونـە تاوانكارییـەكان سـنووردار و چواچـێوەدارن بـە پێچـەوانەی پابەندبوونـە مەدەنییەكانـەوە كـە نایەنـە ژێـر سنووردارکردن و چواچێوەداركردنەوە.

**شەشەم: هەندێ لە بیردۆزە یاساییەكان لە چارەسەری ویستی یەكلایەنە تایبەت بە پابەندبوونەكان** دوورتر لەوەی ئێمە باسمان كردووە بۆی دەچن، لەوانە بیردۆزەی

فەرەنسی کە دەڵێت: ویستی یەکلایەنە ناتوانێت پابەندبوون سەرپێهەڵبدات، ئەگەر نە ئەو پابەندبوونەی لە کاری یاساییەوە(ویستی یەکلایەنە) سەرهەڵدەدات سەرچاوەکەی رێکەوتنی دوو ویستەکە(لەڕووی گرێبەستەوە) دەبێت، یاسای مەدەنی فەرەنسی ئەم رێسایەی لە یاسای فەرەنسی کۆنەوە بەمیراتگرتووە کە ریشەکەی(بیردۆزەکە) دەگەڕێتەوە سەر یاسای رۆمانی، ئەم ئاراستە یاساییە واقیعی کرداری بۆ پیادەکردنی پابەندبوونەکانی سەرهەڵدەر لە ویستی یەکلایەنەوە دەباتە دواوە، و مەنتقی یاسایی رەدی دەکاتەوە.

**حەوتەم: زیاتر لە ٥٠٪ی پابەندبوونەکان هۆیەکانیان(یان سەرچاوەکانیان) بریتییە لە هەڵسوکەوتی تاکلایەنە** لە گوفتار و لە کرداری رەوا و ناڕەوا، نزیکەی ٤٠٪ی پابەندبوونەکان هۆیەکانیان(یان سەرچاوەکانیان) بریتییە لە گرێبەست، سەرەڕای ئەوەش زانایانی یاسا پابەندبوونەکانی گرێبەستیان لە زۆرێك لە مادەکاندا چارەسەر کردووە، وەك یاسای مەدەنی میسری لە مادەکانی(٨٩–١٦١) لە کاتێکدا ویستی یەکلایەنە(یان هەڵسوکەوتی تاکلایەنە)ی لە یەك مادەدا(م/١٦٢) چارەسەر کردووە و یاسای مەدەنی عێراقی[1] گرێبەستی لە مادەکانی(٧٣–١٨٣) چارەسەر کردووە، لە کاتێکدا ویستی یەکلایەنی لە دوو مادەدا(م/١٨٤–١٨٥) چارەسەر کردووە، سەرچاوەی ئەم هەڵەیە لەو دوو یاسا باسکراوەدا دانانی کاری ناڕەوا یان دەوڵەمەندبوونی بێ هۆیە بە هاوبەشی ویستی یەکلایەنە، هەر بەو جۆرە بەدەستهێنان بێ هۆ لە یاسای مەدەنی عێراقیدا و دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ لە مەدەنی میسریدا، بە هەمان شێوە یاسادانەری ئوردەنی کەوتۆتە ناو هەمان هەڵەوە لە یاسای مەدەنی ژمارە(٤٣)ی ساڵی ١٩٧٦، چارەسەری گرێبەست و حوکمەکانی کردووە لە مادەکانی(٨٧–٢٤٩)، لە کاتێکدا هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی لە مادەکانی(٢٥٠–٢٥٥)دا واتە تەنها لە شەش مادەدا چارەسەر کردووە.

---

[1] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

بـۆ دوورکەوتنــەوە لــەو هەڵــە باســکراوانە زۆریــەی زانایــانی یاســا و یاســاکان تێیکەوتوون شوێنی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە(هەڵسوکەوتی تاکلایەنە) دەکەوین لەسەر ئەم ڕێچکەیە:

أ.بەکارهێنانی "هەڵسوکەوتی تاکلایەنە" بە مانا گشتگیرەکەی وەك جێگرەوەیەك بۆ "ویستی یەکلایەنە".

ب–دابەشکردنی هەڵسوکەوتی یاسایی بۆ گوفتار و بۆ کردار.

ج–دابەشــکردنی کــردار بــۆ کــرداری بەســوود وەك خۆتێهــەڵقورتان و کــرداری زیانبەخش وەك داگیرکردن.

د–پاشــان لێکۆڵینەوەکــە هەڵســوکەوتی تاکلایەنــە لــەڕووی سروشــتەوە دابــەش دەکات بۆ سێ دلوا، یەکــەمیان تایبــەت دەکرێـت بــە هەڵســوکەوتە گوتارییــە تاکلایەنە بەسوودەکان، و دووەمیـان بـۆ کـردارە تاکلایەنـە بەسوودەکان و سێیەمیان بۆ کردارە تاکلایەنە زیانبەخشەکان.

بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد ئاراستەی فەقیهانی ئیسلام وردتر و گشـتگیرترە ئەوەش ئەوەیە هەڵسوکەوتی تاکلایەنە بریتییە لە هەموو گوفتار و کردارێکی دەرچوو لە مرۆڤێکی باڵغی ژیری خاوەن هەڵبژاردەوە بەجۆرێك یاسا یان شـەرع پابەنـدبوونی لەسەر دروست بکات بەبێ ڕاوەستان لەسەر ویستی کەسەکەی تر.

# مەبەستی یەكەم:
# هەڵسوكەوتە گوفتارییە تاكلایەنە بەسوودەكان

هەڵسوكەوتی تاكلایەنە بریتییە لە هەر گوفتار و كردارێك لە مرۆڤێكی باڵغی ژیری خاوەن هەڵبژاردەوە دەرچوو‌بێت بەجۆرێك یاسا(یان شەرع) پابەندبوونی لەسەر دروست كردبێت بەبێ رلوەستان لەسەر ویستی كەسەكەی تر، بە پێچەوانەی ئەو مافەی لەسەری سەرهەڵدەدات ئەمەیان هەندێ جار ئاتاجە بە قبوولكردنی بۆپێویست(الملتزم له)، یان بەلانی كەمەوە لەسەر رەد نەكردنەوەی رادەوەستێت، وەك پێدان و وەسێت و شتانی تریش جگە لەو دوانە لە بەخشینی بە موڵككردنی بێ بریتی، بەڵام لە هەندێ هەڵسوكەوتی تاكلایەنەدا لە شێوەی بەردانەوە وەك لابردنی قەرز(بەخشین لە قەرز)[1] یان دابەزین لە مافێكی راستەوەبوو[2]، یان تەڵاقدان بەبێ بریتی، و شایەتیدان و دانپیادانان و هاوشێوەكانی ئەمانە لە مەدەنییەكاندا، هەروەها دەستدرێژی بۆ سەر نەفس و ئەوانەی لە خوار نەفسەوەن لە ماڵ و نامووس لە تاوانكارییەكاندا كە دەبنە هۆ بۆ دەستەبەری تاوانكارانە، و سەرچاوەی ئەم هەڵەیە بریتییە لە پێناسەی ویستی یەكلایەنە وەك باسمان كرد و كورتكردنەوەی لە گوفتارەكاندا، بۆیە ئەسەر لەرووی مافەوە یان لەرووی پابەندبوونەوە لەسەر قبوولكردنی ئەویتر یان رەد نەكردنەوەی رانەوەستاوە.

بەسەرنجدان لەوەی هەڵسوكەوتی تاكلایەنە كارێكی بەویستە دەبێتە ئەسەرێك بۆ توانای مرۆڤ، شوێنكەوتەی ویستی، شوێنكەوتەی پەیبردنی، ئەوەی زانراوە لە یاسا و شرۆڤەكانیدا ئەسەری ویست پێچەوانەی مەنتقی یاساییە، چونكە هەر كارێكی

---

[1] گەر بە بەردانەوە چۆناندنی بۆ بكرێت نەك بەموڵككردن.

[2] وەك دابەزین لە خوێنی كوشتنی هەڵە.

بەویست جا کارەکە گوفتار بێت یان کردار، ڕەوا بێت یان ناڕەوا یەکەمجار پەیبردنی بکەرەکەی پێوە پەیوەست دەبێت و پاشان ویستی ناوەکی پێیەوە پەیوەست دەبێت بۆ لێبڕان و نەخشەکێشان و چۆنێتی بەدەستهێنانی پێش هاتنە ناو دونیای بوونی دەرەکییەوە، پاشان توانینی پێوە پەیوەست دەبێت کە خۆی دەبینێتەوە لە گوزارشتی ویستی ناوەکی بەوەی ئاماژە دەکاتە سەری یان کرداری جێبەجێ کردن بۆ دەرهێنانی ئەوەی شاراوەیە لە زەینیدا بۆ جیهانی بوونی دەرەکی(ئاشکرا).

شایانی باسە یاسا حوکمی ڕووالەت و شتی دەرکەوتوو دەکات، بە پێچەوانەی شەرعی خوداوە کە حوکمی دەرەوە(ئاشکرا) و حوکمی ناوەوەی هاتووە ژێرباری ویستی مرۆڤ دەکات، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾[1].

هەر کەس پێیوایە ئەم ئایەتە سڕاوەتەوە بە ئایەتی﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[2] هەڵەی کردووە، چونکە ئەم ئایەتەی دوایی نەسخکەر نییە، بەڵکو تایبەتکراوە بەهۆی مانای گشتی وشەی"ما-الموصولە"وە کە لە خودی خۆیدا "گشت" دەگەیەنێت بۆیە ناوەوە لە غەریزە بێویستەکان هەڵوەردە دەکات، بەلام غەریزە بەویستەکان وەك حەسودی و شاردنەوەی شایەتی و هاوشێوەکانیان مرۆڤ لەسەریان دادگایی دەکرێت و پرسیاری لێ دەکرێت لەڕووی ئایینەوە گەر لەڕووی قەزاشەوە پرسیاری لێ نەکرێت.

ئەوەی ڕۆشنە زۆربەی هەڵسوکەوتە یەکلایەنە بەسوودەکان بریتین لە بەخشین، بۆیە لێوەشاوەیی پێهەستانی تیادا بەمەرج دەگیرێت بە هەڵواردەی وەسێت، چونکە وەسێتکەر لە ژیانی خۆیدا لەڕووی ماددییەوە زیانی پێناگات، ئەمەش بەهۆی نەگواستنەوەی مولکداری وەسێتکەر بۆ وەسێتبۆکراو مەگەر تەنها کاتێك

---

[1] سورة البقرة/ ٢٨٤.

[2] سورة البقرة/ ٢٨٦.

وەسیێتکەرەکە دەمرێتن هەروەها لەبەر ئەوەی وەسێت عیبادەتێکی دارابیە لەرووی قازانجەوە سوودێك بە وەسیێتکەرەکە لە ژیانی دواڕۆژدا دەگەیەنێت.

سەرباری مەرجی لێوەشاوەیی کامڵ بەمەرج دەگیرێت رازیبوونی کەسی هەڵسوکەوتکەر تێکەڵ بە نەنگییەك لە نەنگییەکانی نەبووبێت.

پێشتر بەدرێژی باسی ئاستەکانی لێوەشاوەیی و بەرهەڵستییەکانی و رێگرەکانیمان کرد، ماوەتەوە باسێك لەسەر نەنگییەکانی رازیبوون بکەین کە بە سروشت زانایانی یاسا لێیدەکۆڵنەوە لە کاتی لێکۆڵینەوەیان لە توخمەکانی گرێبەست کە بریتییە لە هەڵسووکەوتێکی لێکدراو لە دوو هەڵسوکەوتی یەکلایەنە، لە کاتی لێکۆڵینەوەی هەڵسوکەوتی تاکلایەنە(ویستی یەکلایەنە) بینیمان باسەکەی ئێمە وردەکاری زۆرتری تێدایە، چونکە گرێبەست لە یەکگرتنی دوو ویستی تاکلایەنە پێك دێت، باسەکەی ئێمە لێرەدا لەپێشترە تاکو پێکەوە گرێبەست و هەڵسوکەوتی تاکلایەنە بگرێتەوە.

لە پیادەکردنەکانی هەڵسوکەوتی تاکلایەنە: هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی دروستکەری پابەندبوون و هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی لابەرە پابەندبوون، و هەڵسوکەوتی تاکلایەنی دورستکەر و لابەر بۆ پابەندبوونن.

باسەکەمان بەسەر سێ لقدا دابەش دەکەین.

# لقی یەکەم:
# هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی
# دروستکەر بۆ پابەندبوون

## أ-مۆڵەتی گرێبەستی راگیراو:

مۆڵەتی گرێبەستێك کە لەسەر ئەو مۆڵەتە راگیرلوە لە هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی گوتارییە.

هەڵسوکەوتی یاسایی یان شەرعی لە یەکێك لەم بارەدا راگیراوە:

١-یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە لێوەشاوەییان ناتەولو بێت: بۆیە لەم بارەدا گرێبەستەکە بە راگیرلوی دادەمەزرێت(ئاسارەکانی لەسەر سەرهەڵنادات لە مافەکان و ئەرکەکان مەگەر دوای مۆڵەت لەو کەسەی مافی مۆڵەتی بەدەستە)، کاتێك مۆڵەتی دا ئاسار بەرهەم دێت لە بەرواری بەستنی گرێبەستەکەوە، واتە بە ئەسەرێکی گەڕاوە، ئەگەر نە وادادەنرێت وەك ئەوەی لە بنەڕەتدا بوونی نەبووبێت.

٢-نەبوونی سەرپەرشتی گرێبەستکار بەسەر جێگەی گرێبەستەکەدا: وەك ئەوەی کەسێك ماڵی کەسانی تر بەبێ نوێنەرایەتی پێشینە بفرۆشێت وەك خۆهەڵقورتاند لە کاری خەڵکی، لەم بارەدا فرۆشتنەکە دادەمەزرێ، بەلاَم بە راگیراوی لەسەر مۆڵەتی خاوەن جێگەکە(شتەکە) گەر لە ماوەی سێ مانگدا مۆڵەتی دا بە جێبەجێکەر و پێویست دادەنرێت لە بەرواری بەستنییەوە، گەر مۆڵەتی نەدا وادادەنرێت وەك ئەوەی لە بنەڕەتدا بوونی نەبووبێت، هەر بەو جۆرە کڕینی کەسی فزولی بۆ کەسێك مۆڵەتی کڕینی پێنەداوە، گرێبەستەکە دروستە لەلای هەندێ لە فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام(وەك حەنەفییەکان و

مالیكییەكان) و یاسا كاریگەرەكان بەوان[1] لەسەرئەو كەسەی مافی مۆڵەتی هەیە.

٣-پەیوەستبوونی مافی كەسانی تر بە جێگەی هەڵسوكەوتە تاكلایەنەكەوە: وەك ئەو كەسەی بە زیاتر لە سێیەكی ماڵە لێجێماوەكەی وەسێت دەكات، بۆیە زیادەكە لەسەر رەزامەندی میراتگران دوای مردنی میراتلێگیراوەكە راگیراوە گەر باڵغ و ژیر و خاوەن هەڵبژاردە بوون.

شایانی باسە لە ژیانی وەسێتكەرەكەدا داوای مۆڵەت لە میراتگران ناكرێت بۆ دووركەوتنەوە لە زۆرلێكردنی ئەدەبی، چونكە مۆڵەت لە ژیانی وەسێتكەردا وا لە میراتگران دەكات حەیا و ئەدەب و رێز بەرانبەر وەسێتكەر نیشان بدەن و ببێتە جێگەی شوبهە بۆ زۆرلێكردنی ئەدەبی.

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە مۆڵەتی گرێبەستی راگیرلو هەڵسوكەوتێكی گوتاری تاكلایەنەیە مافەكان و ئەركەكان دروست دەكات.

## ب-بەڵێن بە خەلات:

ئەمەش بریتییە لە هەڵسوكەوتێكی گوتاری تاكلایەنە ئاراستەی جەماوەر دەكرێت و داخوازییەكەی بریتییە لە پابەندبوون بە پێدانی خەلات بۆ كەسێك بە كارێكی دیاریكراوی داواكرلو هەڵبسێت، ئەوەش لە دیارترین پیادەكردنەكانی هەڵسوكەوتی گوتاری تاكلایەنەیە كە دەبێتە هۆ بۆ پابەندبوونی بەڵێندەر(الواعد) بە پێدانی ئەوەی دیاریكردووە لە كاتی خۆیدا، بە چاوداخستن لە كەسایەتی بەڵێنپێدرلو، یەكسانە زانرلو بێت یان نەزانرلو، پێش بەڵێنەكە دەستی بە كارەكە كردبێت یان نە، هەروەها یەكسانە بەڵێنەكە رەها بێت یان سنووردار بە ماوە، یاخود سنووردارکرابێت بە مەرجێك یان نە.

---

[1] كالمدني العراقي المادة (١٣٥).

**پایەکانی بەڵێندان بە خەڵات**

لە پێناسە باسکراوەکەیەوە دەگەینە ئەوەی پایەکانی خەلات بێنجن: دارشتنی بەڵێنەکە، و بەڵێندەر، و بەڵێنپێدرلو، و بەڵێندراو، و کاری داواکرلو.

١-دارشتنی بەڵێنەکە: تەنها بریتییە لە ئەرێکردن و مەرجەکانی ئەمانەن:

أ- گوزارەیەکی رۆشن بێت و ئاماژە بکات بۆ مانای بەمەرامگیراو.

ب- گوزارشتەکە ئاراستەی جەماوەر کرابێت، گەر ئاراستەی کەسێکی دیاریکراو یان کۆمەڵێك کەسی دیاریکراو کرا ئەوا گوزارەکە بە ئەرێکردن دادەنرێت، وەك ئەرێکردن لە گرێبەستدا، بۆیە هیچ ئەسەرێکی لەسەر سەرهەڵنادات گەر هاوتا نەبێت بە قبووڵ کردن، گەر قبوولکردنەکە تەولو بوو دەگۆڕێت بۆ گرێبەست، ئەو کات هۆی پابەندبوونەکە بریتی دەبێت لە گرێبەستەکە نەك هەڵسوکەوتی تاکلایەنە، بۆیە حوکمەکانی بەڵێن بە خەلاتی بەسەردا پیادە ناکرێت.

ج- رەهاکردن یان ماوەدانان: گەر بەڵێندەر لە دارشتنەکەدا ماوەیەکی دیاری نەکردبوو بۆ هەستان بە کارەکە دروستە بۆی لە بەڵێنەکەی پاشگەز ببێتەوە هەر کات ویستی، بە مەرجێك ئەوە کاریگەری نەبێت لەسەر ماف ئەو کەسەی هەستاوە بە کارەکە پێش پاشگەزبوونەوە.

بەلام گەر ماوەیەك دیاریکرا ئەوا لەسەریەتی پێیەوە پابەند ببێت و بۆی نییە بەر لە تەولوبوونی لێی پاشگەز ببێتەوە، گەر کاتێکی بۆ کارەکە دیاریکرد بەو کاتەوە پابەند دەبێت.

٢-بەڵێندەر: فەراهەمبوونی لێوەشاوەیی گرێبەستکاری تیایدا بەمەرج دەگیرێت، پێشتر باسی لێوەشاوەیی و بەرهەڵستەکان و رێگرەکانی کراوە.

٣-بەڵێندراو(بابەتی پابەندبوون): ئەوەی لە جێگەی گرێبەست بەمەرج دەگیرێت تیایدا بەمەرج دەگیرێ، بەوەی گونجاو و رەوا و دیاریکراو یان قابیلی دیاریکردن بێت و بەهایەکی دارایی هەبێت، ئەوەش هەندێ جار لە بەهایەکی

دارایی پاڵفتەدا خۆی دەبینێتەوە وەك برێك لە پارە، یان ئۆتۆمبێلێك یان خانوویەك، یان زەوییەك، یان شتانی تر لە ماڵی گوازراوە و نەگوازراوە، هاونموونەیی و بەهاداری.

٤-ئەو کارەی ئەنجامدانی داواکراوە، لە شێوازەکانی:

أ.دۆزینەوەی شتێکی ونبوو یان بزربوو.

ب-ئاماژەکردن بە هەندێ زانیاری یارمەتیدەر بێت بۆ دۆزینەوەی تاوانباری هەڵهاتوو، یان سیاسییەکی ونکراو، یان رێکەوتنێکی تاوانکارانە بەر لە جێبەجێ کردنی.

ج-یان هەستان بە داهێنانی شتێك سوودی گشتی تێدا بێت.

د-یان گێڕانەوەی ماڵی دزراو یان داگیرکراو.

هـ-یان دانانی کتێبێك لە پرسێکی گرنگی خاوەن سوودی گشتیدا.

و-یان دروستکردنی پەیکەرێکی ئەندازیاری بۆ کەسایەتییەکی مێژوویی.

ز-یان هەر ئامانجێکی تری داواکراو لە دیدگای بەڵێندەرەوە.

٥-بەڵێنپێدراو بە خەڵات، ئەم مەرجانەی تێدا بەمەرج دەگیرێت:

أ-کارەکە وەك ئەوەی داواکراوە ئەنجام بدات.

ب-پابەند بێت بە بەڵێنەکەوە گەر کات بۆدیاریکراو بوو، هەروەها پابەند بێت بە مەرجەوە گەر بەمەرجگیراو بوو.

**لەباری پاشگەزبوونەوەی بەڵێندەر لە بەڵێنی خەڵاتەکە سێ ئەگەر هەیە:**

**ئەگەری یەکەم:** گەر دەستی نەکرد بە جێبەجێ کردنی کاری داواکراو ئەوا بەڵێندەر بەتەواوی لە سەرئەنجامی بەڵێنەکەی گەردن ئازاد دەبێت.

**ئەگەری دووەم:** ئەوەی خەرجی کردووە بۆی بگێڕرێتەوە بە مەرجێ لە بەهای ئەو خەڵاتە تێنەپەڕێ بەڵێنی پێدابوو، ئەو بەڵێنەی کە لێی لاداوە بە بنچینەی ئەم پابەندبوونە دانانرێت، بەڵکو بۆ حوکمەکانی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی بڕیار لەسەردراو دەگەڕێتەوە لە دەقە یاساییەکاندا.

**شایانی باسە ئەم بەرپرسیارێتییە لە دوو باردا بەردەبێتەوە:**

**یەکەمیان:** باری بەربوونەوەی دلوا بە گێڕانەوەی ئەوەی خەرجی کردووە بە تێپەڕبوونی شەش مانگ لە راگەیاندنی پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنەکە.

**دووەمیان:** بەڵێندەر بەڵگە راستبکاتەوە لەسەر ئەوەی سەرکەوتنی هیوابۆخوازراو ناتوانرێ دەستەبەر بکرێت گەر ئەوەی دەستی بە جێبەجێ کردنی کردووە تەواو بوبێت، چونکە لەو بارەدا پەیوەندی هۆکارایی کۆتایی پێ دێت لە نێوان زیانەکە کە بەهۆی شاندانەژێر خەرجییەوە تووشی بووە لەگەڵ پاشگەزبوونەوەی بەڵێندەر لە بەڵێنەکەی.

هەر بەو جۆرە لە باری دەستکردن بە جێبەجێ کردنی کارە دلواکراوەکە پێش راگەیاندنی خۆلادان(خۆبوارن) لە بەڵێنەکە و تەولوکردنی دوای ئەو خۆبواردنە.

**ئەگەری سێیەم:** ئەوەیە گەر کاری دلواکراو هەمووی تەواو بووبێت پێش راگەیاندنی خۆلادان لە بەڵێنەکە، لەم شێوازەدا هەستان بە خەڵاتەکە پێویست دەبێت[1].

شایانی باسە گەر کارەکە -کە خەڵاتەکەی لەپێناودا بڕیاردراوە- لەلایەن زیاتر لە یەك کەسەوە جێبەجێ کرا، ئەوا خەڵاتەکە بۆ لەپێشترینیانە گەر بەدوای یەکتردا جێبەجێیان کردبوو، گەر پێکەوە و لە یەك کاتدا جێبەجێیان کردبوو ئەوا خەڵاتەکە بە یەکسان بۆیان دابەش دەکرێت، بەڵام ئەم رێسایە بە جیاوازی سروشتی شێوازی گشتی بەکارهێنراو لە بەڵێندان بە خەڵات گۆڕانی بەسەردا دێت، بۆ نموونە:

أ- گەر سەرکردەی جەنگێك بە دە سەرباز لە سەربازەکانی وت: گەر یەکێك لە هەمووتان یەکەمجار فلان شوێنی دوژمنم بۆ بگرێت ئەوا-بۆ نموونە- دە هەزار دۆلاری پێ دەدرێت، گەر بەدوای یەکتردا شوێنەکەیان گرت ئەوا خەڵاتەکە بۆ یەکەمەکەیانە، بەڵام گەر پێکەوە و بەبێ بەدوای یەکترداهاتن

---

[1] يُنظر مجموعة الأعمال التحضيرية للقانون المدني المصري رقم (١٣١) لسنة ١٩٤٨، ٢/٣٤٠.

شوێنەكەیان گرت ئەوا هەر یەكەیان شایستە دەبێت بە دە هەزار دۆلار، چونكە وشەی(هەریەك) مانای گشتی دەگەیەنێت لە رێگەی تاكەوە، بۆیە پێویستە هەمووان هەریەك بە تەنها دەستی بۆ ببرێت وەك ئەوەی كەسێكی تری لەگەڵ نەبێت.

ب- گەر پێی وتن: هەمووتان گەر یەكێك لە ئێوە یەكەمجار فلاَن شوێنی دوژمنی گرت، ئەوا دە هەزار دۆلاری پیَ دەدرێت، گەر بەدوای یەكتردا داگیریان كرد ئەوا برەكە بۆ یەكەمین كەسیانە.

ج- گەر هەموویان پێكەوە دەستیان بەسەردا گرت برە پارەكە بە یەكسانی بەسەریاندا دابەش دەكرێت و بە هەریەكەیان هەزار دۆلار دەدرێت، چونكە وشەی"هەمووتان" مانای گشت دەگەیەنێت لە رێگەی كۆوە نەك تاكەوە، هەموو ئەوانەی دەچنە ناو ئەو گشتەوە بە یەك كەس دادەنرێن لەوەی هەموویان یەكەمن، بۆیە برە پارەكە بە هاوبەشی و یەكسانی پێیان دەدرێت.

د- گەر پێی وتن: هەر كەس لە ئێوە یەكەمجار ئەو شوێنەی دوژمن بگرێت ئەوا دە هەزار دۆلاری پێدەدرێت، گەر بەدوای یەكتردا گرتیان برە پارەكە بۆ یەكەم كەسیانە، گەر هەر هەموویان بەیەكەوە گرتیان ئەوا شایستەی هیچ شتێك نابن، چونكە وشەی(هەركەس) بەبیَ وشەی (هەمووتان) بەرەهایی مانای ئابلۆقەدان ناگەیەنێت نە لە رێگەی تاككردنەوەوە نە لە رێگەی كۆكردنەوەوە[1].

زۆرێك لە پیادەكردنی تر بوونی هەیە بۆ هەڵسوكەوتی گوفتاری كە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی پابەندبوونەكان وەك وەقف، و نەزر و بەمەرجگرتن بۆ بەرژەوەندی كەسانی تر، و مەرجەكانی گەرەنكەچكردن كە لایەنی بەهێز دەیان سەپێنێت بەسەر لایەنی لاوازدا لە گرێبەستەكانی گەرەنكەچكردندا، هەروەها هاوپەیمانییە

[1] لمزيد من التفصيل يُنظر: كشف الأسرار مع أصول البزدوي، ٢/٣٢٨ وما يليها، أصول السرخسي، ١/١٥٨. مؤلفنا: أصول الفقه في نسيجه الجديد، ٢/٣٣٩ وما يليها.

ناهاوسەنگەکان کە دەوڵەتی بەهێز دەیسەپێنێت بەسەر دەوڵەتی لاوازی شکستخواردوودا لە دوای کۆتایی جەنگ، وەك ئەو مەرجانەی دەوڵەتانی هاوپەیمان لەدوای جەنگی جیهانی دووەم سەپاندیان بەسەر ئەڵمانیا و یابان و ئێراندا.

## لقی دووەم:
## هەڵسوکەوتی گوفتاری تاکلایەنەی بەردەوام بۆ پابەندبوونی راوەستاو

هەڵسوکەوتی گوفتاری تاکلایەنە وەك چۆن دروستکەری پابەندبوونە و پێش ئەوە بوونی نەبووە، هەر بەو جۆرە هەندێ جار بەردەرەوەی پابەندبوونی راوەستاوە.

لە گرنگترین پیادەکردنەکانی گەردنئازادی(ئەستۆپاکی) و کۆتاهێنانی بە بریکاری لە بریکارگرەوە بۆ بریکارەکە، و کۆتاهێنانی دەستەبەری لە "بۆدەستەبەرکراو"ەوە، هەروەها کۆتاهێنـانی بارمتە لە قەرزدەری بارمتەگرەوە، هەروەها دابەزین لە تۆڵەسەندنەوە یان خوێنوەرگرتن.

### گەردنئازادکردن:

بریتییە لە وازهێنانی قەرزدەر لە مافەکەی خۆی کە بابەتی پابەندبوونی قەرزدارە بەبێ بەرانبەر.

ئەوەش هەڵسوکەوتێکی یاسـاییە لە یەك لاوە و راوەستانەکەشی بریتییە لە ئاراستەکردنی ویستی قەرزدەر بۆ لێخۆشبوونی قەرزەکەی.

#### چۆناندنی گەردنئازادکردن:

پرسیارێك بوونی هەیە خۆی دەخاتە سەر بەڕەی لێکۆڵینەوەکە ئەوەش بریتییە لە دیاریکردنی سروشتی گەردنئازادکردنەکە و سیفەتە یاساییەکەی ئایا ئەوە بە مولککردنە یان بەردانەوە، لە نێوان فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام و فەقیهانی یاسادا جیاوازی لەسەرە:

أ. هەیانە چۆناندنی بۆ کردووە بەوەی بەرەهایی باردانەوە(إسقاط)ی قەرزەکەیە.
ب. هەیانە چۆناندنی بۆ کردووە بەرەهایی بەموڵککردن(تملیك)ە.
ج- هەشیانە چۆناندنی بۆ کردووە بەوەی بۆ خاوەن قەرز بە موڵککردنە و بۆ قەرزدارەکە بەردانەوەیە[1].

پارسەنگدراو لە بۆچوونی ئێمەدا ئەوەیە گەردنئازادکردن بریتییە لە بەردانەوەی مافی قەرزدەر لە ئەستۆی قەرزداردا، لەوێوە بەردانەوەی پابەندبوون بە وەفاکردن بە قەرزەکە، چونکە ئەو مافەی بابەتی پابەندبوونەکەیە بە گەردنئازادکردن بەردەبێتەوە، بەردانەوەی ئەوەش بەردانەوەی پابەندبوون پێویست دەکات، لە ڕێسا گشتییەکان(بەربووەوە ناگەڕێتەوە وەك چۆن نەبوو(معدوم) ناگەڕێتەوە)[2].

**بەری جیاوازی:**

ئەو بەرە کامەیە لەسەر چۆناندنی گەردنئازادکردن بە بەردانەوە یان بە موڵککردن سەرهەڵدەدات؟

کۆمەڵێك ئەنجامی گرنگ لەسەر ئەم چۆناندنە سەرهەڵدەدەن لەوانە:

أ. گەر بە بەردانەوە چۆناندنی بۆ کرا زانینی قەرزدەر بە بڕی قەرزەکە بە مەرج ناگیرێت، بە پێچەوانەی بە موڵککردنەوە.
ب- گەر بە بەردانەوە چۆناندنی بۆ کرا ئاتاج نییە بە قبوولکردنی قەرزدار بە پێچەوانەی بە موڵککردنەوە.
ج- بەربووەوە ناگەڕێتەوە، واتە بە گێڕانەوەی لەلایەن قەرزدارەوە ناگەڕێتەوە بە پێچەوانەی بە موڵککردنەوە.

---

[1] يُنظر المنثور في القواعد للزركشي، ٨١/١، والأشباه والنظائر لابن نجيم، ص٢٦٣، الاستقصاء في مسائل الإبراء للأستاذ علي حيدر، ص١٨ وما يليها.

[2] يُنظر المنثور في القواعد للزركشي، ٨١/١، والأشباه والنظائر لابن نجيم، ص٢٦٣، الاستقصاء في مسائل الإبراء للأستاذ علي حيدر، ص١٨ وما يليها.

د- زانـینی قــەرزدار لـە بەردانـەوەدا بـە مــەرج ناگیرێـت، بـە پێچـەوانەی بـە مولّککردنەوە لێرەدا زانین بە مەرج دەگیرێت، مادەی(٣٧١) لە یاسای مەدەنی میسری راوەستاو بە دەق هاتووە: (پابەندبوون کۆتایی پێ دێت گەر قەرزدەر گەردنی قەرزدارەکەی بە هەڵبژاردنی خۆی ئازاد کرد، گـەردنئازادکردن تـەواو دەبێـت هــەرکات گەیشـتە زانسـتی قەرزدارەکـە، و بـە رەدکردنـەوەی رەد دەکرێتەوە)

لەم دەقەوە حاڵی دەبین یاسادانەری میسری چۆناندنی بـۆ گـەردنئازادکردن بـە موڵککردن کردووە، سەرەڕای ئەوەی مانای کۆتاهاتن نزیکترە لە مانای بەردانەوە تا مانای بەموڵککردن[1].

دژایەتییەك لـە یاسـای مـەدەنی عێراقیـدا دەبینرێتـەوە لـە نێـوان چۆناندنی بـە بەردانەوە و مەرجی قبولکردن و ماف رەدکردنەوە لە قەرزدارەوە، مـادەی(٤٢٠) بـە دەق هێناویـەتی: (گـەر قــەرزدەر گـەردنی قەرزدارەکـەی ئـازاد کـرد قەرزەکـە بەردەبێتەوە)

لێرەدا یاسادانەری عێراقی چۆناندنی بۆ گەردنئازادکردن کردووە بە بەردانەوە لەم مادەیـەدا، ئەمــەش پێچـەوانەی ئەوەیـە لـە مــادەی (٤٢٢)دا هــاتووە بــەوەی: (گەردنئازادکردن لەسەر قبووڵی قەرزدار رانەوەستاوە، بەڵام گـەر پـێش قبـوولکردن رەدی کردەوە دەگەڕێتەوە) لەنێوان ئەم دوو مادەیـەدا دژایەتییـەکی رۆشـن بـوونی هەیە، چونکە گەردنئازادکردن هەڵسوکەوتێکی تاکلایەنەیـە و بـە ویسـتی یەکلایەنـە پابەندبوون بەردەداتەوە، بۆ ئەم بەردانەوەیە رۆڵێك بۆ ویستی قەرزدار بوونی نییـە، وەك چۆن دژایەتی بوونی هەیە لە نێوان نەبوونی مـەرجی قبـوولکردن و نێـوان مـاف رەدکردنەوە، چونکە رەدنەکردنەوە واتە رازیبوونێکی ناڕاستەوخۆ.

[1] ويُطابق المصري المدني السوري (م/٣٧١)، والكويتي (م/٤٣٥)، والمغربي (الفصل ٣٤٠).

ئــەوەی نامۆیــە ئەوەیــە یاســای پێویســتکراوەکان و گرێبەســتەکانی لوبنــان گەردنئازادکردنی قەرزدار لە قەرزەکەی لەلایەن قەرزدەرەوە بە رێکەوتن و گرێبەست داناوە[1].

**لە مەرجەکانی گەردنئازادکردن:**

١- لە کەسی گەردنئازادکەردا لێوەشاوەیی بەخشین بوونی هەبێت بۆیە لەو کەسانەوەی لێوەشاوەییان ناتەولوە دروست نییە، یاساکان بە دەق هێناویانە و رای فەقیهانیش یەکیانگرتووە کە حوکمە بابەتییەکان بۆ بەخشین بەسەر گەردنئازادکردندا گوزەر دەکات[2].

٢- خاڵیبوونەوەی رازیبوونی گەردنئازادکەر لە نەنگییەکانی ویست.

٣- قەرزەکە لە رووی کردارەوە جێگیر و پەیوەستبوو بێت بە ئەستۆگری قەرزدارەوە، بۆیە گەردنئازادکردن بۆ شتێك دروست نییە هێشتا پێویست نەبووە، با هۆی پێویستبوونەکەشی جاری بووبێت وەك خەرجی ژن(هاوسەر)ی داهاتوو.

٤- گەردنئازادکردنەکە لە نەخۆشی مردندا نەبێت، ئەگینا حوکمەکانی وەسێتی بەسەردا دەسەپێت، بۆیە زیاتر لە سێیەکی لێجێماو پێویستی بە مۆڵەتی میراتگران دەبێت لەدوای مردنی گەردنئازادکەر، وەك پێشتر لە وەسێتدا بەدرێژی باسمان کرد.

٥- ماف کە بابەتی پابەندبوونە لەو مافانە بێت بەردانەوە قبووڵ دەکات، بۆیە دروست نییە بۆ "تاواندەرحەقکرلو" یان سەرپەرشتیاری خوێن مافی کەفارەتی

---

[1] مادەی (٣٣٨) بە دەق هێناویەتی کە: ((گەردنئازادکردن لەو قەرزەی قەرزدەر لە مافەکانی لێی دابەزیوە بۆ بەرژەوەندی قەرزدار تەنها بەپێی داخوازی رێکەوتن دەبێت، چونکە لە گەردنئازاکردندا رێکەوتنی خاوەنانی پرسەکە پێویستە))، هەروەها مادەی(٣٤٠) بە دەق هێناویەتی: ((گرێبەستی گەردنئازاد کردن یان راشکاوانەیە یان ئاماژە))

[2] ومنها المدني العراقي (م/٤٢١)

کوشتن بەریدەنەوە، چونکە لە مافە رووتەکانی خودایە، بەڵام دەتوانرێت لە خوێن گەردنئازادبکرێت.

٦- بابەتی پابەندبوون شتێك نەبێت لە شتان، چونکە پەیوەست نابێت بە ئەستۆگرییەوە، بەردانەوە بۆ ئەو شتانەیە پەیوەستن بە ئەستۆگرییەوە، بەڵام لێدابەزین قبووڵ دەکات، وەك دابەزینی لێداگیرکراو لە ماڵە داگیرکراوەکەی، هەر بەو جۆرە دابەزینی لێدزراو لە ماڵە دزراوەکەی.

**رەهاکردن و سنووردارکردن لە گەردنئازادکردندا:**

أ. گەردنئازادکردنی رەها: ئەوەیە بە مەرجێکەوە کۆتوبەند نابێت و نادرێتە پاڵ ماوەیەك لە کات.

ب- گەردنئازادکردنی سنووردار بە مەرجێك نایەتەدی مەگەر بە فەراهەمبوونی ئەو مەرجە، گەر قەرزدەر گەردنئازادکردنی قەرزدارەکەی لە هەندێ لە قەرزەکەی ئازاد کرد بە مەرجی پێهەستان بە گێڕانەوەی ئەوی تری، گەر قەرزدارەکە پێیهەستا ئەوا گەردنی ئازاد دەکرێت گەر پێیهەڵنەستا گەردنی ئازاد ناکرێت و هەموو قەرزەکەی لەسەر دەمێنێتەوە.

گەر درایە پاڵ ماوەیەك گەردنئازادبوونەکە نایەتە دی تا ماوەکە نەیەتە بەرەوە.

**ئاسارەکانی گەردنئازادکردن:**

١- کۆتاهاتنی پابەندبوون.

٢- ئەستۆپاکی ئەستۆی قەرزدارەکە.

٣- ئازادبوونی ئەستۆی دەستیار(کەفیل) ئازادبوونی ئەستۆی بنچینەیی پێویست ناکات بە پێچەوانەکەوە،گەر قەرزدەر گەردنی قەرزادەرەکەی ئازاد کرد لە هەموو قەرزەکە ئەوا ئەستۆی کەفیلەکە پاکدەبێتەوە، چونکە شوێنکەوتە بە بەریوونەوەی شوێنکەوتووەکەی بەردەبێتەوە، لق بە

بەریوونەوەی بنەڕەتەکەی بەردەبێتەوە[1].

٤- گەر قەرزدەر گەردنی یەکێك لە دوو قەرزدارە دەستەبەرکەرەکانی ئازادکرد ئەوا بەسەر ئەستۆگری دەستەبەرکارەکەی تردا گوزەر ناکات، بەڵکو ئەسەر تەنها لە بەشەکەی ئەودا کورت دەبێتەوە و بە ئەندازەی ئەوە قەرزەکە لادەچێت[2].

## لقی سێیەم:

## هەڵسوکەوتی گوفتاری تاکلایەنەی بەردەوام و سەرپێهەڵدەری پابەندبوون پێکەوە

هەڵسوکەوتی گوفتاری یەکلایەنە وەك چۆن سەرپێهەڵدەرە بەتەنها یان بەردەرەوەیە بەتەنها هەندێ جاریش سەرپێهەڵدەر و بەردەرەوەیە پێکەوە و لەیەك باردا و لە یەك کاتدا، لە دیارترین پیادەکردنەکانی ئەم بارە تەڵاق و تکاکارییە.

### یەکەم، تەڵاق:

بریتییە لە کۆتاپێهێنانی پەیوەندی ژن و مێردی بە هەڵسوکەوتێکی گوفتاری تاکلایەنە لە لای مێردەکەوە یان لە لای ژنە سەرپشککراوەکەوە یان لە لای قازییەوە، هەندێ جاریش بە ڕێکەوتنی ژن و مێردەکە کە پێی دەوترێت"خولع" ئەمەی دواییان لە بابەتەکەی ئێمە بەدەرە.

تەڵاق یان "رجعی"ە یان "بائین"ە، بائینیش یان جیابوونەوەی بچووکە یان جیابوونەوەی گەورەیە.

---

[1] مجلة الأحكام العدلية، المادة (٥٠).

[2] المدني العراقي (المادة ٣١٨)، والمدني المصري (المادة ٢٨٢).

أ. **تەلاقی رجعی(تەلاقی گەڕاوە)**: بریتییە لە هەر تەلاقێك دوای چوونە لا بە مەرجێ بە بریتییەك نەبێت و بۆ جاری سێیەم نەبێت.

**حوكمەكەی**: بۆ مێردەكە هەیە ژنەكەی بگێڕێتەوە بەبێ گرێبەست و مارەیی نوێ پێش كۆتاهاتنی عیدەكەی.

ب- **جیابوونەوە بە جیابوونەوەی بچووك**: بریتییە لە هەر تەلاقێك پێش چوونە لا یان بە بریتییەك یان بۆ یەكەمجار یان بۆ دووەمجار بێت.

**حوكمەكەی**: بۆ ژن و مێردەكە هەیە ژیانی ژن و مێردی تێهەڵكەنەوە بە گرێبەست و مارەییەكی نوێ.

ج-**جیابوونەوە بە جیابوونەوەی گەورە**: بریتییە لە تەلاق بۆ جاری سێیەم.

**حوكمەكەی**: دروستنەبوونی گەڕانەوەی ژیانی هاوسەرداری نە بە گێڕانەوە و نە بە گرێبەستێكی تازە مەگەر ژنەكە بە شوكردنێكی ئاسایی شوویكاتەوە بە پیاوێكی تر و بچێتە لای و دوای ئەو بە تەلاقدانێكی ئاسایی تەلاقی بدات یان پیاوەكەی بمرێت و عیدەكەی كۆتایی هاتبێت، ئەوا بۆی هەیە مێربكاتەوە بە پیاوەكەی یەكەمجاری كە تەلاقی دابوو بە گرێبەست و مارەییەكی نوێوە.

**بۆ هەریەك لە هاوسەرگیری و تەلاق پابەندبوونی دارایی و نادارایی بوونی هەیە:**

أ. پابەندبوونە داراییەكانی هاوسەرداری: بریتییە لە پابەندبوون بە خەرجی ژنەوە لە رۆژی دامەزرانی هاوسەرگیرییەوە و مارەیی پێشینە، و مارەیی دواخراوی تەواو دوای چوونە لا، بۆیە مێرد پابەند دەبێت بە خەرجی بۆ ژنەكەی لە بەرواری هاوسەرگیرییەوە یەكسانە كەسەكە هەژار بێت یان دەوڵەمەند، و پابەند دەبێت بە پێدانی مارەیی ناونراو یان مارەیی هاوشێوە[1] لە دەمی

---

[1] مارەیی هاونموونە بریتییە لە مارەیی نموونەی ئەو لە هەموو سیفەتەكانی و لەم بارانەدا پێویست دەبێت: أ.گەر لە بنەڕەتدا ناوی مارەییەكە نەنرابێت. ب.گەر مارەییەكە برەكەی نادیار بوو. ج.گەر ماڵێكی بێبایەخ بوو. د.گەر موڵكی ئەو كەسە نەبوو پابەندە بە پێدانییەوە.

ئێستادا بێت یان دواخرابێت، هەموو دواخراوێك دەبێت بە ئێستا بە مردن یان بە تەلاق.

ب- پابەندبوونە نادارایییەکانی هاوسەرداری: مێرد پابەند دەبێت بەوەی هاوسەری لەگەڵ ژنەکەی بکات ناو بە ناو لەڕووی چێژوەرگرتنی هاوسەرییەوە، هەروەها لەڕووی تێکەڵی و خۆشەویستی ئاڵوگۆڕ و ڕێزی بەرانبەر و هاوشێوەکانیان.

هەر بەو جۆرە تەلاقپابەندبوونی لەسەر سەرهەڵدەدات کە هەندێکیان دارایین و هەندێکیان نادارایین.

أ.پابەندبوونە دارایییە سەرهەڵدراوەکان لەسەر تەلاق ئەمانەن:

**یەکەم:** خەرجی عیدە(عدة)، مێرد پابەند دەبێت بەوەی خەرجی ژنە تەلاقدرلوەکەی بدات وەك چۆن لە باری هاوسەرداری لەگەڵی خەرجی بۆ دەکرد تا کۆتایی عیدەکەی.

**دووەم:** مارەیی دواخراوی پێبدات کە بە تەلاق بووە بە ئێستا.

**سێیەم:** موتعە: بریتییە لە بڕێك پارە لە ماڵ یان شمەك یان پۆشاك یان هەر پێویستییەکی دارایی تر لە دوای تەلاق ژنەکە سوودیان لێ دەبینێت.

**چوارەم:** کرێی شیردان: لەباری بەردەوامی هاوسەریدا پیاو بەو کرێیە پابەند نییە، بەلام دوای جیابوونەوە لەیەکتر پابەند دەبێت بە پێدانی ئەو کرێیە بە شیردەرەکە، شیردەرەکە دایکی منداڵەکە بێت یان نە تا کۆتایی ماوەی شیردانەکە مەگەر بە هەڵبژاردەی خۆی خۆبەخشانە کارەکە ئەنجام بدات.

**پێنجەم:** خەرجی بەخێوکردن: لەدوای جیابوونەوە لەسەر مێرد خەرجی بەخێوکردن پێویستە تا کۆتایی ماوەی بەخێوکردنەکە، ئەو کارەش بەردەوام دەبێت تا بەخێوکراوەکە بێنیاز دەبێت و لەسەر پێی خۆی دەوەستێت لە دابینکردنی داخوازییەکانی ژیان.

**شەشەم:** قەرەبووکردنەوەی ژنەکە لە تەلاقی بێپاساو واتە ئەو تەلاقەی هیچ پاساوێکی نییە و لە هەمان کاتدا زیان بە ژنەکە دەگەیەنێت.

تەلاق بە ویستی تاکلایەنە لە مێردەکەوە یان لە ژنەکەوە یان لە قازییەوە پابەندبوونە راوەستاوە سەرهەڵدراوە باسکراوەکان لەسەر مێردەکە بەردەدەنەوە، لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك پابەندبوونی نوێ لەسەر مێردەکە سەرپێهەڵدەدات، ئەوەش بریتییە لە شەش پابەندبوونە باسکراوەکە سەرباری پابەندبوونی ژنەکە بە چاوەڕوانی ماوەی عیدەکەی، ئەوەش بریتییە لە تەولوکردنی سێ حەیز(یان سێ پاکی-ثلاثة قروء)[1]یان دانانی سکەکەی گەر سکپڕ بوو یان تەولوکردنی سێ مانگ گەر لە تەمەنی حەیزدا نەبوو یان کەوتبێتە ناو تەمەنی بێهیوابوون لە حەیز، بەزۆری تەمەنی بێهیوابوون لە نێوان(٤٥-٥٥)ساڵدایە[2].

## دووەم-جووتکردن(الشفعة)

لەڕووی زمانەوە بریتییە لە "الضم-ئامێزگرتن"، لە زاراوەی یاسای و فیقهیدا بریتییە لە مافی بەموڵککردنی خانووبەرەی فرۆشراو بەزۆر بە ویستێکی تاکلایەنە بەوەی لەسەر کڕیار راستبووەتەوە لە نرخ و خەرجی ئاسایی[3].

---

[1] زانایانی شەریعەت لەسەر مانای "القرء" جیاوازیان هەیە کە هاوبەشێکی گوزارەییە لە نێوان "حەیز" و "پاکی"دا، هەیانە هەڵیداوەتە سەر "پاکی" و هەشیانە بە "حەیز" لێکدانەوەی بۆ کردووە.

[2] لمزيد من التفصيل يُراجع مؤلفنا أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن، دراسة مقارنة بالقانون.

[3] المدني العراقي (م/١١٢٨).

**توخمەکانی جووتکردن:**

لە گرنگترین توخمەکانی ئەمانەن:

١- ئەو ماڵە جووتکراوە خانووبەرەی بەموڵککراوبێت بۆیە جووتکردن لە ماڵی گوازراوەدا نییە بەهۆی نواکەوتنی هۆی ئامانجگەرابیەوە(فەلسەفە) بۆ موباحکردنی جووتکردن وەك روخسەتێك و هەڵواردە لە رێسای: (زەرورەتی فەراهەمبوونی رازیبوون لە بریتیدانەکاندا) ئەو هۆیە بریتییە لە لادانی زیانی پێشبینیکراو کە هەندێ جار تووشی شەریکی پێشتر دەبێتەوە لە پشتی هاوکارە نوێیەکەوە.

٢- جووتکەر هاوکار بێت، بۆیە جووتکردن بۆ جیرانێك نییە پێوەلکاو بێت یان بەرانبەر بێت.

٣- کەسەکە هاوکاربێت لە خودی شتەکەدا نەك لە سوودی شتەکەدا بەتەنها، بۆیە جووتکردن بۆ کرێگرتەی خاوەن سوودەکە نییە، هەر بەو جۆرە بۆ وەسێتبۆکراو بە سوودبینینی کاتی یان هەتاهەتایی.

٤- بەموڵککردنی هاوکارە نوێیەکە دواکەوتبێت لە بەموڵککردنی هاوکارە پێشینەکە، گەر دوو کەس پێکەوە خانوویەکیان کڕی ئەوا جووتکردن بۆ یەکێکیان نییە لەسەر ئەویتریان.

٥- فرۆشتنی خانووبەرەی جووتپێکراو تەواو بێت و پایەکان و مەرجە یاساییەکانی فەراهەم بووبن.

٦- گرێبەستەکە بریتیدان بێت، بۆیە جووتکردن بوونی نییە گەر هاوکارە نوێیەکە بوو بە خاوەنی خانووبەرەکە لە رێگەی میرات یان وەسێت یان صەدەقە یان هاوشێوەکانی ئەمانەوە لە بەخشینەکان، گەر یەکێك لە دوو هاوکارەکە بەشی خۆی لە خانووبەرەی هاوبەشدا دا بە کەسێکی تر ئەوا بۆ هاوکارەکەی تر نییە بە جووتکردن وەریبگرێت.

٧- وەرگـرتن بـە جـووتكردن دوانەكـەوێت دوای سـەرهەڵدانی گرێبەسـتەكە بـە دواكەوتنێك عورف بە دابەزین لە ماف جووتكردن یان پشتلێهەڵكردنی دابنێت.

یاسای مەدەنی عێراقی ماوەی درێژخایەنی لەم بابەتەدا بە شەش مانگ دانـاوە لە تەواوی ڕۆژی فرۆشتنەوە[1]

گەر ئەم توخمانە فەراهەم بوون و ڕێگرەكان نەڕێكران بۆ جووتكردن كە بریتییـە گوفتارێكی بەویسـتی تاكلایەنـە دەبێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی پابەندبوونـەكان لەسـەر جووتكەر وەك پابەندبوون بە پێدانی ئەوەی لەسەر كڕیـار ڕاسـتبووەتەوە لـە نـرخ و خـەرجی ئاسـایی، هـەروەها پابەنـدبوون بـەوەی بڕێـك زیـاتر لـە نرخـی خانووبـەرە جووتكراوەكە بدات بە كڕیار بەهۆی بینا یان چاندنەوە گەر كڕیار بینای لە خانووبەرە جووتكراوەكـە دروسـت كـرد یـان درەخـتی تێـدا چـاند پـێش ئـەوەی ویسـتی وەرگرتنەوەی خانووبەرەكە بە جووتكردن بەو بكات[2].

بەلأم گەر دوای پێراگەیاندن ئەوە ڕوویدا بوو ئـەوا بـۆ جووتكەرەكـە هەیـە داوای لابردن و هەڵكێشانی درەختەكان بكات گەر زیان بە خانووبەرەكە نەگەیەنێت، ئەگەر نـە بـۆی هەیـە بینـا و درەختـەكان بهێڵێتـەوە بـەو نرخـەی دەچـێتە لابـردن و هەڵكەندنەكە[3].

لە هەمان كاتدا جووتكردن وەك هەڵسوكەوتێكی گوفتاری تاكلایەنە دەبێتە هـۆی بەردانـەوەی پابەندبوونـەكانی كڕیـار بەرانبـەر بـە فرۆشـیار لەسـەر فرۆشـتن سـەرهەڵدەدات، هـەروەها بەردانـەوەی مـاف لـە هەڵسـوكەوتدا لـە خانووبـەرە جووتكراوەكەدا دوای ئەوەی ئاگادار دەكرێتەوە بە حەزی وەرگرتن بە جووتكردن.

---

[1] المدني العراقي (م/١١٣٤).
[2] المدني العراقي (م/١١٤٣).
[3] المصدر السابق.

**لە ریگرەکانی جووتکردن ئەمانەن:**

١- درێژخایەنی: گەر ماوەی شەش مانگ تێپەڕی بەسەر تەواوی فرۆشتنەکەدا ئەوا دلوای جووتکردن بەردەبێتەوە، ئەم ماوەیە تەنانەت بەسەر مافی ناکامان و نادیاراندا گوزەر دەکات.

٢- گەر فرۆشتنەکە بە زیادکردنی ئاشکرا کرابوو لە ڕێگەی قەزاوە یان فەرمانگەوە.

٣- گەر فرۆشتنەکە لە نێوان دوو هاوسەردا بوو یان لە نێوان بنەڕەت و لقدا بوو یان لە نێوان پەراوێزەکان تا پلەی چوارەم[1].

٤- گەر مەرام لە کرینی خانووبەرەکە کردنی بێت بە جێگەی عیبادەت یان بەستنەوەی بە شوێنی عیبادەتەوە و لە فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە بەو شێوەیە تۆمارکرابوو.

٥- گەر ئەو کەسەی مافی جووتکردنی هەیە دابەزی بە راشکاوانە یان ئاماژە با پێش فرۆشتنیش بێت.

٦- گەر خانووبەرەی جووتکرلو وەقف بێت.

٧- گەر شەفیعەکە دلوای هەندێ لە خانووبەرەی مەشفوعەکەی کرد و هەندێکی وازلێهێنا، چونکە جووتکردن بەش کردن قبووڵ ناکات.

٨- گەر دلوای جووتکردن بەرز نەکرابوویەوە لەسەر هەریەك لە فرۆشیار و کڕیار لە ماوەی سی رۆژدا لە بەرواری راگەیاندنی حەز بۆ کارەکە.

٩- گەر لە سندوقی دادگادا دانەنرابێت کە خانووبەرەی جووتکرلو لە فەرمانگەکەیدا بڕێك پارە دەبینێتەوە یەکسانە بە نیوەی نرخی راستەقینە کە فرۆشتنەکەی پێکراوە.

---

[1] وەك مام و پوور(خوشکی باوك) و خاڵ و پوور(خوشکی دایك).

گەر ئەم رێگرانە بوونیان نەما و ئەو تۆخمە ئامـاژەبۆکراوانـە دەسـتەبەر بـوون موڵکی جووتکەرەکە جێگیر دەکرێت بۆ جووتبۆکراوەکە دوای جێبەجێ کردنی حوکمی قەزایی یان رێکەوتنی رەزامەندیانە و تۆمارکردن لە فەرمانگەی تۆمارکردنی خانووبەرە.

کەسی جووتکەر بەرانبەر بە فرۆشیار دەچێتە جێگەی کڕیار لە هەموو مافەکانی و پابەندبوونەکانی، بەڵام مافی ئەوەی نییە سوود ببینێت لەو ماوەی بە کڕیار دراوە لە پێدانی نرخەکە، بەڵکو پابەند دەبێت بە پێدانی نرخەکە و ئەوەی لەسەر کڕیار راست دەبێتەوە بۆ فرۆشیارەکە لە ئێستادا گەر رێنەکەوتبن لەسەر مانـەوەی ماوەکـە یـان لەسەر ماوەیەکی تر[1].

---

[1] یُنظر في القوانين العربية المصادر الآتية: العراقي المواد (١١٢٨–١١٤٤)، الأردني (١١٥٠–١١٧٠)، الكويتي (٨٩١–٩٠٤)، اليمني (١٢٣١)، المصري (٩٣٥–٩٤٨).

هەندێ جیاوازی لە نێوان ئەم یاسایانە دەبینرێتەوە لەرووی تۆخمەکان و حوکمەکانی جووتبوونەوە، لەگەڵ ئەوەش درێژکردنەوە لەم بابەتەدا ئەرکی ئێمە نییە، چونکە ئەوەی لامان گرنگە لە جووتکردندا ئەوەیە کە هەڵسوکەوتێکی گوفتاری بەویستی تاکە هەندێ پابەندبوون سەرپێهەڵدەدات و پابەندبوونە راستبووەکان لە هەمان کاتدا بەردەداتەوە.

## مەبەستی دووەم:
## هەڵسوکەوتی تاکلایەنەی کرداری بەسوود (چاکخوازی)

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە دابەش دەبێت بەسەر سێ لقدا، یەکەمیان تایبەت دەکرێت بە چۆنێتی چارەسەری چاکخوازی لە یاساکاندا، دووەمیان بۆ توخمەکانی و سێیەمیان بۆ حوکمەکانی.

### لقی یەکەم:
### چۆنێتی چارەسەری چاکخوازی لە یاساکاندا

لە دیارترین پیادەکردنەکانی هەڵسوکەوتی یەکلایەنەی کرداری بەسوود بریتییە لە چاکخوازی.

**چاکخوازی**: بریتییە لە هەستانی کەسێك بە کارێکی بەپەلەی ناپابەندبوو پێیەوە بە مەبەستی بەرژەوەندی کەسانی تر[1].

یاسا عەرەبییەکان[2] و فەقیهانی یاسا و شرۆڤەکەرانی چارەسەری چاکەخوازییان کردووە بە چارەسەرێك کە پێچەوانەیە لەگەڵ رێساکانی مەنتقی یاسایی و فەلسەفەی یاسا لە چەند رووەوە، لەوانە ئەمانەن:

---

[1] ئەم پێناسەم هەڵبژارد، چونکە کورتتر و وردترە لە پێناسەکەی مامۆستا سەنهوری لە الوسیط ١٣٨٥/١ المأخوذ من المادة (١٨٨) مەدەنی میسریدا بەوەی خۆهەڵقورتان ئەوەیە کە کەسێك بە مەبەست هەستێت بە کارێکی بەپەلە بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر بەبێ ئەوەی پابەند بێت بەو کارەوە.

[2] منها المصري (م/١٨٨-١٩٧)، العراقي (م/٢٢٣-٢٤٤)، الأردني (م/٣٠١-٣٠٨).

**یەکەم:** چاکەخوازییان بە هاوبەشی ویستی تاکلایەنە داناوە لە سەرچاوەکانی پابەندبووندا لەگەڵ ئەوەی بەشێکە لێی و لە گرنگترین پیادەکردنەکانیەتی، ئەوەی بەلگەنەویستە ئەوەیە "هاوبەش"ی شتێك لە شتەکە جیابووەتەوە و هەریەکەیان ئەوەی بەڕاستی دەزانێت ئەویتریان بەڕاستی نابینێت، لەکاتێکدا"بەش" ی شتێك بەرەهایی لە شتەکە تایبەتترە، لە هەر شوێنێك هاتەدی شتە بەشکراوەکە لەگەڵی دێتە دی، بەبێ پێچەوانەی هەمووەکی، بەم پێیە هەندێ جاریش بەشکراوەکە لەگەڵ بەشێکی تر دێتەدی جیا لەو بەشە.

**دووەم:** چاکخوازی کردووە بە بەشێك لە "دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ" لە هەندێ لە یاساکاندا وەك یاسای مەدەنی میسری راوەستاو[1] کە لە بەشی چوارەمدا بۆ سەرچاوەکانی پابەندبوون دەوڵەمەندبوونی بێهۆی دابەش کردووە بۆ پێدانی نا شایستە[2] و چاکخوازی[3]، هەروەها وەك یاسای مەدەنی ئوردەنی راوەستاو لە بەشی چوارەمدا بۆ سەرچاوەکانی پابەندبوون کاری بەسوودی دابەشکردووە بۆ بەدەستهێنان بەبێ هۆ[4] و دەستبەسەرداگرتنی ناشایستە[5] و چاکخوازی[6] و دانەوەی قەرزی کەسانی تر[7].

ئەم دابەشکردنانە لە ترازووی مەنتق و فەلسەفەدا رەفزکراون، چونکە دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ نارەوایە بەهۆی نەبوونی هۆیەکی رەوالەوە، هەر شتێکیش نارەوا بوو پووچەڵە، هەر بەو جۆرە پێدانی ناشایستە نارەوایە بەهۆی نەبوونی هۆیەکەوە ئەمەش دیسان پووچەڵە، لە کاتێکدا چاکخوازی کارێکی رەوای مرۆییە و لە

---

[1] المواد (١٨١-١٨٧)،

[2] المواد (١٨٨-١٩٧).

[3] المواد (٢٦٣-٢٩٥).

[4] المواد (٢٩٣-٢٩٥).

[5] المواد (٢٩٦-٣٠٠).

[6] المواد (٣٠١-٣٠٨).

[7] المواد (٣٠٩-٣١٠).

دەروازەی هاوکارییە لەسەر چاکە و دروستە و مافەکان و پابەندبوونە یاسایی و شەرعییەکانی لەسەر سەرهەڵدەدەن گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون، ئیتر چۆن دروستە شتێك ناڕەوا و پووچەڵە دابەش بکرێت بۆ پووچەڵی ناڕەوا(پێدانی ناشایستە) و بۆ دروستی رەوا(چاکخوازی)؟

هەمان شت بۆ دابەشکردنەکەی یاسای مەدەنی ئوردەنی بڵێ: بەدەستهێنان بەبێ هۆ کارێکی ناڕەوا و پووچەڵە گەر بۆ پووچەڵی ناڕەوا(دەستگرتنبەسەری ناشایستە) و بۆ دروستی رەوا دابەش بکرێت، بەڵکو پێویست لە هەندێ باردا بریتییە لە چاکخوازی و گێڕانەوەی قەرزی کەسانی تر.

پاشان گێڕانەوەی قەرزی کەسانی تر بەشێکە لە چاکخوازی ئیتر چۆن دروستە بکرێت بە هاوبەشی، لەگەڵ ئەوەی هاوبەشی شتێك لێی جیاوازە و بەشەکەشی تایبەتترە لە ئەو بەڕەهایی.

ئەم گاڵتەجارییە یاساییە چییە بۆ چارەسەری پرسە گرنگەکان لە مامەڵە داراییەکاندا؟

**سێیەم:** یاسا عەرەبییەکان و فەقیهانی یاسا دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ(یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ)یان کردووە بە "هاوبەش"ی کاری ناڕەوا یان (کاری زیانبەخش) بەپێی جیاوازی لە گوزارەی ئەو یاسایانەدا، لەگەڵ ئەوەی بەدەستهێنانی بێ هۆ(یان دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ) وەك باسمان کرد کارێکی ناڕەوا و زیانبەخشە، چۆن دروستە بەشی شتێك بکەی بە هاوبەشی شتەکە لەگەڵ ئەوەی بەش بەڕەهایی تایبەتترە لە بەشکراوەکەی، و هاوبەشی شتێکیش لێی جیاوازە و هیچ کامیان ئەوەی ئەویتریان بەڕاستی دەزانێت بەڕاستی نابینێت.

**چوارەم:** زاراوەی(دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی پابەندبوون لەسەر قسەی زانایانی یاسا، هەروەها لەسەر ئەوەی جێگیر کراوە لە زۆربەی یاساکاندا زاراوەیەکی هەڵەیە لە زمانی عەرەب و عورفی عەرەبدا، چونکە نابێتە سەرچاوە بۆ پابەندبوون گەر چوار توخمی تێدا فەراهەم نەبێت:

١-دەوڵەمەندبوونی کەسێك ماڵی کەسانی تری بەبێ پاساو بەدەستهێناوە.

٢-هەژارکەوتنی ئەو کەسەی ماڵەکەی لەدەستدلوە و گوازرلوەتەوە بۆ کەسانی تر بەبێ هۆیەکی رەوا.

٣-پەیوەندییەکی هۆکەرلیی لەنێوان دەوڵەمەندبوون و هەژارکەوتندا بەوەی دووەم لەسەر یەکەم سەرهەڵبدات.

٤-نەبوونی هۆیەکی دروستی رەوا.

گوزارەی "دەوڵەمەندبوون" و "هەژارکەوتن" رۆشنن لە زمانی عەرەب و عورفی عەرەبدا، ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەوەیە دەوڵەمەندبوون بە ماڵی گرانبەها یان بە برێکی زۆر لە ماڵ دەبێت بەجۆرێك گۆڕانی باری ئابووری بەئاشکرا لێوە سەرهەڵدەدات، هەر بەو جۆرە هەژارکەوتن تەنها بە لەدەستدانی ماڵێکی گرانبەها یان برێکی زۆر لە ماڵ سەرهەڵدەدات.

شرۆڤەکردنی زانایانی یاسا بۆ "دەوڵەمەندبوون" بە زیادەی توخمێکی ئەرێیی لە ئەستۆگری داراییدا بۆ کەسێك لەسەر گیرفانی کەسانی تر دەوڵەمەند بووە، بە نەبوونی ئەم توخمە لە ئەستۆگری هەژارکەوتوودا پێچەوانەی شەرع و مەنقی یاسایە، چونکە ئەو کەسەی ماڵی کەسانی تر بەدەستدەهێنێت بەبێ هۆیەکی شەرعی ناچێتە ناو مولکی ئەوەوە، لەوێشەوە نابێتە توخمێکی ئەرێیی لە ئەستۆگرییە داراییەکەیدا، وەك چۆن ئەو کەسەی ماڵێك لەدەستدەدات لە مولکداری ئەو دەرناچێت، بۆیە وەك مولکی ئەو دەمێنێتەوە لە هەر دەستێکدا بێت، ئیتر چۆن دروستە گوزارەی"دەوڵەمەندبوون و هەژارکەوتن" لەم بابەتەدا بەکاربهێنرێت، یاسادانەری عێراقی کارێکی باشی کردووە کاتێك "بەدەستهێنان بەبێ هۆ"ی هەڵبژاردووە لە جێگەی"دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ" چونکە ئەوەی یەکەمیان هەموو برێکی گەورە و بچووك دەگرێتەوە مرۆڤ بەبێ هۆی شەرعی بەدەستی بهێنێت، بۆیە لەسەریەتی یەکسەر بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە.

سەرچاوەی ئەم هەڵە یاساییانە و هاوشێوەکانیان دەتوانین بۆ ئەم هۆیانەیان بگێڕینەوە:

١–نەبوونی زانستی تەولو بە زانستی مەنتق و فەلسەفە.

٢–تێکەڵکردن لە نێوان هۆیەکانی پابەندبوون و سەرچاوەکانی پابەندبووندا.

٣–تێکەڵی لە نێوان هەڵسوکەوتە یاساییەکان و ڕوودلوە یاساییەکان، دانانی هەر کردارێك بە ڕوودلوێکی یاسایی، یەکسانە کردارەکە بەویست بێت یان نە، هەروەها کورتهەڵهێنانی هەڵسوکەوتی یاسایی لە گرێبەست و ویستی تاکلایەنەدا.

٤–هەڵە لە وەرگێڕانی زارلوە لە زمانی بێگانەوە بۆ زمانی عەرەبی.

٥–گرنگی نەدان بە ویستی یەکلایەنە وەك سەرچاوەیەك بۆ پابەندبوون، وەك دەڵێن، یان هۆی پابەندبوون، وەك مەنتقی یاسایی دەیڵێت، لەگەڵ ئەوەی هۆیەکانی پابەندبوونە مەدەنی و تاوانکاریەکان نزیکەی ٩٠٪ بۆ ویستی یەکلایەنە دەگەڕێتەوە.

## لقی دووەم:
## توخمەکانی چاکخوازی

وەك پێشتر چەندین جار باسمان کرد توخمەکانی هەر شتێك ئەوانەن ئەو شتەی لەسەر وەستاوە، گەر توخمەکە بەشێك بوو لە چییەتی شتەکە پێی دەوترێت پایە، ئەگەر نە، پێی دەوترێت مەرج، سەرەڕای ئەوەش شرۆڤەکارانی یاسا تێکەڵییەکیان لا دروست بووە لە نێوان توخمەکان و پایەکان و مەرجەکاندا، بۆیە هەندێکیان لە جێگەی هەندێکی تریان بەکارهێناوە، وەك ئەوەی کۆمەڵێك وشەی هاوواتا بن.

لەم بابەتەماندا(چاکخوازی) هەیانە هەموو توخمەکانی چاکخوازی کردووە بە پایە بۆی[1] ، بۆیە دەڵێن: پایەکانی چاکخوازی سیانن پاڵپشت بە پێناسە هاتووەکەی لە مادەی(١٨٨)ی مەدەنی میسری راوەستاو کە دەقەکەی: (چاکخوازی: ئەوەیە کەسێك بە مەرامی هەستان بە کارێکی بەپەلە هەستێت بە سەرپەرشتیاری کاری کەسێکی تر بەبێ ئەوەی بەو کارەوە پابەند بێت)

ئەوانەش:

١-پایەی مادی: بریتییە لە هەساتنی خۆهەڵقورتێن بە کارێکی بەپەلە بۆ کەسێکی تر.

٢-پایەی مەعنەوی: ئەوەیە کەسی فزولی لە هەستانەکەیدا بەو کارە بەپەلە مەرامی بەرژەوەندی خاوەن کارەکە بێت.

---

[1] لەسەرو هەموویانەوە مامۆستا سەنهوری، الوسیط ١/١٣٨٧ ئەوەی بەدوایدا دێت، و مامۆستا مەرقەس، أصول الالتزامات، ص٥٥٣ ئەوەی بەدوایدا دێت، و مامۆستا "عبدالحی الحجازی"، النظرية العامة للالتزام ١/٦١٢ ئەوەی بەدوایدا دێت، و مامۆستا صلاح الدين الناهي، محاضرات في القانون المدني العراقي، بەدەستهێنان بەبێ هۆ و خۆهەڵقورتێنی وەك دوو سەرچاوە بۆ پابەندبوونەکان، ص٢٠٩ ئەوەی بەدوایدا دێت.

٣-پایەی یاسایی: ئەوەیە بەرانبەر ئەو کارە بەپەلە کەسەکە پابەند نەبێت پێیەوە و بریکار نەبێت تیایدا و نەهیلێکراویش نەبێت لەو کارەدا.

شایانی باسە گوزارەی "پایەی یاسایی" مامۆستای خوالێخۆش بوو "سەنهوری" بەکاریهێناوە، لەم گوزارەیەدا زۆربەی زانایانی یاسا لە ولاتە عەرەبییەکاندا چاویان لێکردووە بەبێ وردبوونەوە لە ناوردی ئەم گوزارەیە، چونکە وشەی"یاسایی" گەر مەبەستی پێی داننانی یاسا بێت بەو پایەدا ئەوا پێویست بوو هەموو پایەیەك یان توخمێك بە هەمان وەسف وەسف بکرابایە، چونکە لە نێوان هەمواندا کۆبەشە.

گەر مەبەست پێی رێکخستنی یاسایی بێت، ئەوا رێکخستنی هەموو شتێك بە یاسا پێی ناوترێت توخم، چونکە توخمەکانی هەر زاراوەیەکی یاسایی لە بووندا پێش رێکخستنەکەی دەکەون.

لەوانە[1]هەیانە هەموو توخمەکانی چاکخوازیان بە مەرج داناوە، بۆیە دەڵێن: بۆ ئەوەی چاکخوازی بێتە دی پێویستە ئەم سێ مەرجەی تێدا بێت:

١-کەسێك هەستێك بە کارێکی بەپەلە بۆ کەسێکی تر، ئەمە بریتییە لە توخمە ماددییەکەی.

٢-ئەو کەسەی بەو کارە بەپەلە هەڵدەستێت مەبەستی بەرژەوەندی کەسەکەی تر بێت، ئەمەش بریتییە لە پایەی مەعنەوی.

٣-ئەو کەسەی هەڵدەستێت بەو کارە بەپەلە پابەند نەبێت بە هەستان پێی، ئەمەش پایەیەکی یاساییە.

ئەوەی نامۆیە ئەوەیە شوێنکەوتوانی ئەم ئاراستەیە جیاوازی ناکەن لە نێوان پایە و مەرجدا، وا گومان دەبەن ئەو دوانە دوو وشەی هاوواتان، کاتێك بۆ هەر توخمێك گوزارەی پایە و مەرج بەکاردەهێنن لە یەك زاراوەدا.

---

[1] وفي مقدمتهم الأستاذ الدكتور عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٦٢، ألبند (٥٧٨)، تحت عنوان شروط الفضالة، (النصوص القانونية شروط ثلاثة).

هەر بەو جۆرە ئەوەی نامۆیە پاڵپشتی هەردوو ناونانەکە(پایە و مەرج) بریتییە لە یاسای مەدەنی رلوەستاو[1].

## پایەکان و مەرجەکانی چاکخوازی لە ترازووی مەنتقی یاسادا:

ڕێساکانی مەنتقی یاسایی دلوا دەکەن پایەکانی چاکخوازی سیان بن، ئەوانەش: کارکەر، و کارکراو، و کاربۆکراو، بۆ هەر یەکێك لەو پایانە مەرجی تایبەت بەخۆی هەیە، بەم جۆرە:

**پایەی یەکەم /کارکەر: کە پێی دەوترێت فزولی(چاکخواز):**

ئەو کەسەیە هەڵدەستێت بە کارە بەپەلە سوودبەخشە پێویستەکە بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر بەبێ پابەندبوونێکی پێشینە.

**لە مەرجەکانی:**

١-پابەند نەبێت بەو هەستانە بەهۆیەکی پێشینەوە.
٢-نوێنەری ئەو کەسە نەبێت کارەکەی بۆ ئەنجام دەدات نە نوێنەری ڕێکەوتنی وەك بریکاری و نە نوێنەری یاسایی وەك سەرپەرشتیاری، و نە نوێنەری قەزایی وەك وەسێتداری دیاریکراو لەقازییەوە یان لە یاریدەدەری قەزاییەوە کە دادگا دایدەمەزرێنێت بۆ کۆمەکی ناکامان بە هەڵسوکەوتەکان کاتێك وەسێتدار تیایدا پێویستی بە مۆڵەتی دادگا دەبێت.
٣-لێوەشاوەیی جیاکردنەوەی هەبێت، لێوەشاوەیی گرێبەستکاری تێدا بەمەرج ناگیرێت بۆ هەستان بە پابەندبوونە بەرانبەرییەکان، چونکە هەڵسوکەوتی کەسی فزولی لە سەرئەنجامدا بریتیدانە.
٤-مەبەستی بە هەستان بە کارەکە دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کەسانی تر بێت نەك بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکەی خۆی.

---

[1] المواد (١٨٨-١٩٠).

٥-ئەوەی دەستی پێکردووە تەواوی بکات تا خاوەن کارەکە بتوانێت بۆخۆی پێیهەستێت.

شایانی باسە، ئەم برگەیە شرۆڤەکارانی یاسا لە مەرجەکانیان داناوە و منیش وەك ئەوان باسم کردووە، بەڵام بە بۆچوونی ئێمە لە راستەقینەدا ئەوە لە پابەندبوونە فزولییەکانە، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان مەرج و پابەندبووندا، یەکەمیان پێش شتەکە کەوتووە و دووەمیان پاشکۆی شتەکەیە.

٦-نییێتی خۆبەخشی بوونی نەبێت لە بەختکردنی هەوڵەکەیدا و بەخشین لە خەرجییەکەیدا بۆ بەرژەوەندی کەسانی تر، لە رێگەی بەراورد و رەوشی کارکەر و کارکراو ئەم مەرجە دەناسرێتەوە.

٧-وا گومان نەبات بۆ بەرژەوەندی خودی خۆی کارەکە دەکات پاشان بۆی رۆشن ببێتەوە بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر کارەکە ئەنجام دەدات، چونکە پەندوەرگرتن بە نییێتە، بۆیە بە بانگەشەی چاکخوازی ناگەڕێتەوە بۆ لای خاوەن کارەکە، بەڵکو بە بانگەشەی دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ بۆ لای دەگەڕێتەوە[1].

٨-وەك پیاوێکی کارامە لە کارەکەیدا هەوڵبدات.

**پایەی دووەم: کارکراو:**

ئەمەش بریتییە لەوەی کەسێك پێیهەڵدەستێت بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر لە هەڵسوکەوتی یاسایی وەك فرۆشتن و کڕین، یان کارێکی مادی وەك دروستکردنەوەی سیاجێکی روخاو بۆ جیرانەکەی لە باری ئامادەنەبوونی ئەودا.

---

[1] الوسيط ١٣٩٨/١، مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية، ٤٧١/٢.

**لە مەرجەکانی:**

١-کارێکی بەپەلە بێت دواکەوتنی ترسی زیانی لێبکرێت کە خاوەن کارەکە توانای ئەوەی نەبێت بۆخۆی هەستێت بە کارەکە لە کاتی گونجاودا.

٢-کارەکە بۆ ئەو کەسەی بۆی ئەنجام دەدرێت زەرور بێت بۆ رێگری لە زیان یان تیاچوون کە لەسەر دواکەوتنەکە سەرهەڵدەدات، ئەو زەرورەتە دیاریدەکرێت لەو کاتەی دەستێوەردانەکە روویداوە نەك دوای ئەوە، جا کارێکی یاسایی بێت وەك فرۆشتنی ماڵەکەی کە بەخێرایی تیادەچێت یان کارێکی مادی وەك بەرگری شەرعی لە ماڵی کەسانی تر کە رووبەڕووبوونەوەی بە دزی یان داگیرکردن بۆ دروست بووە.

٣-کارەکە بەسوود بێت بۆ ئەو کەسەی بۆی ئەنجام دەدرێت، بەجۆرێك وێنای ئەوە نەکرێت خاوەن کارەکە خۆی دوادەخست لە ئەنجامدانی گەر بیزانیبایە بەو پێویستییە بۆی و لە توانایدا بوایە پێی هەستێت.

٤-کارەکە نەهیلێکرلو نەبێت لە خاوەن شەرعەوە یان لە خاوەن کارەکەوە، بۆیە دروست نییە کۆمەکی کەسێك بکرێت لەسەر تاوانێك، وەك پێشکەش کردنی ئاسانکاری بۆ کەسانێك تاکو بە تاوانێك هەڵبستن، وەك چۆن دروست نییە سەرپەرشتی بەشوودانی کچی کەسێك لەئەستۆ بگرێت بەبێ مۆڵەتی پێشینە لە کچەکەوە یان لە سەرپەرشتیارەکەیەوە.

٥-مەبەست بە کارەکە چاکە بێت وەك هەستان بە خزمەتی کەسانی تر، تەنها بۆ بەرژەوەندی تاکەسی خۆی نەبێت، بەڵام گەر لە یەك کاتدا بۆ بەرژەوەندی خۆی و بەرژەوەندی کەسەکەی تر بوو بەهۆی نەتوانینی جیاکردنەوەی دوو بەرژەوەندییەکە لە یەکتری، وەك نۆژەنکردنەوەی خانوویەکی هاوبەش لە نێوان دوو هاوکاردا یان دروستکردنەوەی سیاجی جیرانەکەی کە سوودی بۆ ئەویش هەیە، ئەوا کارەکە وەك سیفەتی چاکەخوازی دەمێنێتەوە.

**پایەی سێیەم / کاربۆکراو، کە پێی دەوترێت"خاوەن کار" یان"چاکەلەگەڵکراو" یان"سوودمەند"**

ئەو کەسەیە کەسی فزولی هەستاوە بە کارە بەپەلەکە بۆی.

**لە مەرجەکانی:**

١- ئاگادارنەبێت بە کاری کەسە فزولییەکە، بەبێدەنگییەك بێدەنگ بێت لەرووی عورفەوە بەڵگە بێت لەسەر رازیبوون لەو دەستێوەردانە، چونکە لەو بارەدا حوکەماکانی بریکاری یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ(بەدەستهێنان بەبێ هۆ) بەسەر کارەکەدا گوزەر دەکات[1].

بەڵام گەر شتێکی لێنەوەشایەوە بەڵگە بێت لەسەر رازیبوونی یان رەفزکردنی ئەوا دەچێتە ژێر رێساکانی چاکخوازییەوە[2].

٢- کەسەکە خۆی ئامادە نەکردبێت بۆ هەستان بەوەی کەسی فزولی پێیهەستاوە، ئەگینا مافی ئەوەی نییە بە دلوای چاکخوازی بگەڕێتەوە سەری، بەلکو ئەوەی خەرجی کردووە لە ماڵ و کرێی هاوشێوە بۆ ئەوەی بەخشیویەتی لە هەوڵ و کۆشان بە دلوای دەوڵەمەندبوونی بێ هۆ(یان بەدەستهێنانی بێ هۆ) وەردەگرێتەوە.

## چۆناندنی چاکخوازی:

زانایانی یاسا ئەم چۆناندنەیان لەژێر ناونیشانی"بنچینەی چاکخوازی" چارەسەر کردووە کە بریتییە لە فەلسەفە و هاندەر و پاڵنەر و هۆی ئامانجگەرایی، بەو کارەشیان تێکەڵییان لا دروست بووە لە نێوان بنچینە و چۆناندندا، دووەمیان لەژێر ناونیشانی یەکەمدا چارەسەر کردووە.

---

[1] المصدر السابق، المادة (١٩٠)، مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية ٢/٤٧٠.

[2] مجموعة الأعمال التحضيرية، المرجع السابق، ٢/٤٧٠.

لەسەر ئەم چۆناندنە جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە بە چەندین ئاراستە، گرنگترینیان ئەم حەوتەیە:

**ئاراستەی یەکەم:** بە شێوە گرێبەست چۆناندنیان بۆ کردووە یان وەك یاسای مەدەنی فەرەنسی[1] دەڵێت: نیمچە گرێبەست، لەو سۆنگەیەوە کە شێوە گرێبەست کارێکی هەڵبژاردەیی رەوایە و دیارترین پیادەکردنەکانی بریتییە لە چاکخوازی[2].

ئەم ئاراستەیە کاریگەرە بە بیرۆکەی چاولێکەری کۆن کە وا بۆی دەچێت سەرچاوەکانی پابەندبوون بریتین لە: گرێبەست، و شێوە گرێبەست و تاوان و شێوە تاوان و یاسا، ئەم بیرۆکەیە یاساکانی سەردەم رەدی دەکەنەوە، وەك پێشتر بەدرێژی باسمان لەبارەوە کردووە.

**ئاراستەی دووەم:** چۆناندنی بۆ کردووە بە کاری نارەوا، چونکە کەسی فزولی زیانێکی بەرجەستەبووی بە هەژارکەوتن پێدەگات لەو خەرجییانەوە خەرجی کردوون بۆ تەواوکردنی کارەکە یان ئەوەی لەدەستی چووە لە بەدەستهێنراو یان ئەو هەوڵ و کۆشانەی بەختی کردووە.

پاشان سەرچاوەکە لە راستەقینەی خۆیدا کارێکی فزولیانە، نییە بەڵکو بریتییە لە خۆگرتنەوە(ملنەدان)ی خاوەن کار لە گێڕانەوەی ئەو خەرجییەی کەسی فزولی خەرجی کردووە یان ئەو هەوڵ و کۆشانەی بەختی کردووە، ئەو خۆگرتنەوەیە کارێکی نارەوایە و سەرچاوەیە بۆ پابەندبوون لەلای ئەهلی یاسا، فەقیهی فەرەنسی(بلانیۆل)[3] سەرۆکایەتی ئەم ئاراستەیە دەکات و پێیوایە سەرچاوەی پابەندبوون لە چاکخوازیدا بریتی نییە لە کاری رەوا کە کەسی فزولی پێی هەستاوە، بەڵکو بریتییە لە کاری نارەوا کە لە خاوەن کارەکەوە دەردەچێت بە خۆگرتنەوە لە گێڕانەوەی ئەوەی کەسی فزولی شایستەیەتی، واتە خاوەن کار بەو خۆگرتنەوەی

---

[1] المادة (١٣٧٠).

[2] الأستاذ حلمي بهجت بدوي، أصول الالتزامات ٣٦/١ وما يليها.

[3] الأستاذ صلاح الدين الناهي، المرجع السابق، ص٧٩.

کارێکی هەڵە ئەنجام دەدات و وەك بەرپرسیارێتییەکی کەمتەرخەمی پرسیاری لێ دەکرێت.

رەخنە لەم ئاراستەیە دەگیرێت بەوەی کار هۆی پابەندبوونە نەك سەرچاوەی پابەندبوون، جیاوازیش نییە لەم هۆگەرایییەدا لە نێوان جۆناندنی بە کارێکی بەسوودی رەوا یان کارێکی زیانبەخشی نارەوا، پاشان ئەم ئاراستەیە بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ قسەکەی "بلانیۆل" بەوەی سەرچاوەکانی پابەندبوون دوانن: گرێبەست و یاسا، شێوە گرێبەست و تاوان و شێوە تاوان هەر هەموو بۆ یاسا دەگەڕێنەوە، پاشان ئەم دابەشکردنە بۆ سەرچاوەکان یاسا هاوچەرخەکان پشتگوێیان خستووە، چونکە پێچەوانەیە بە مەنتقی یاسایی.

**ئاراستەی سێیەم:** گێڕانەوەی بنچینە یان جۆناندن بۆ دەسەڵاتی ویست یان(ویستی یەکلایەنە)، ئەم ئاراستەیە دروستە لەو ڕێگەیەوە چاکخوازی شێوازێکە لە پیادەکردنەکانی ویستی یەکلایەنە، بەڵام بنچینە نییە وەك چۆن خاوەن ئاراستەکە بۆی دەچێت بەڵکو بریتییە لە هۆی پابەندبوون، پاشان گەر مۆڵەتی خاوەن کاری لەسەر نەبێت کەسی فزولی بەسەریدا دەگەڕێتەوە بە داوای دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنانی بێ هۆ) نەك بە داوای چاکخوازی.

فەقیهی فەرەنسی(جوسران)[1] رابەرایەتی ئەم ئاراستەی سێیەمە دەکات، رەخنە لەم ئاراستەی سێیەمە دەگیرێت بەوەی ویستی یەکلایەنە هۆی پابەندبوونە نەك سەرچاوەی پابەندبوون.

**ئاراستەی چوارەم:** پێیوایە چاکخوازی لەسەر بنچینەی بیرۆکەی گەڕانەوە بیناکراوە لەو سۆنگەیەوە دەرئەنجامی کاری کەسی فزولی پێویستە بۆ خاوەن کار بخرێتە روو تاکو بڕیاری لەسەر بدات، ئەم ئاراستەیە یاسای مەدەنی فەرەنسی[2] لە دەروازەی ئەرکەکانی بریکار ئاماژەی پێکردوە.

---

[1] الأستاذ زهدي يكن، أصول الالتزامات، ص٣٦ وما يليها.

[2] المادة (١٩٩٨).

**ئاراستەی پێنجەم:** وا بۆی دەچێت چاکخوازی شێوازێکە لە بەدەستهێنانی بیٚ هۆ و سەرچاوەی پابەنـدبوونی کەسـی فزولـی بریتییـە لـە کـرداری مـادی کـە پێـی هەستاوە[1].

ئەم ئاراستەیە هەڵەیە، چـونکە چـاکخوازی کـارێکی ڕەوای مرۆییـە لـە دەروازەی هاوکاری لەسەر چاکە، لە کاتێکدا بەدەستهێنان بەبیٚ هۆ کارێکی ناڕەوایـە بـەڵکو لـە زۆربەی حاڵەتەکاندا تاوانە.

**ئاراستەی شەشەم:** دەڵێت یاسا سەرچـاوەیەکی ناڕاسـتەوخۆیە لـە چـاکخوازی، چونکە یاسا وەك چۆن سەرچاوەی پابەندبوونی ڕاستەوخۆیە بـەبیٚ دەسـتێوەردانی ویسـتی مـرۆڤ هـەر بـەو جـۆرە سەرچـاوەیەکی ناڕاسـتەوخۆیە کاتێـك سـەرهەڵدانی پابەنـدبوون لەسـەر هەڵسـوکەوتی یاسـایی یـان ڕووداوی یاسـایی ڕادەوەسـتێت، سەرچاوەی ڕاستەوخۆ بریتییە لە کاری مادی دەرچووی لەلایەن کەسی فزولییەوە[2].

دەستبردن بۆ ئـەم ئاراسـتەیە سەردەکێشـێت بـۆ فرەیـی سەرچـاوە یـان بـەش بەشکردنی تایبەت بە یەك حوکم، ئەمەش لە مەنتقی یاسایی و ڕێساکانی فەلسـەفەدا ڕەفزکراوە، چونکە دوو هۆی تەواو بۆ سەر یەك ئەنجام نایەن.

**ئاراستەی حەوتەم:** وای بۆ دەچـێت یاسـا سەرچـاوەیەکی ڕاسـتەوخۆیە لەسـەر بنچینەی چۆناندنی چاکخوازی بەوەی ڕووداوێکی مادیانەیـە(کارێکی یاسـایی)ە نـەك هەڵسـوکەوتێکی یاسـایی، لەسـەر ئـەم ئاراسـتەیە ڕۆڵـی ویسـت لـە چـاکخوازیدا دەپوکێتەوە، ئەمەش ئەوەیە هەندیٚ لە زانایانی یاسا وەریانگرتووە[3].

لەم ئاراستەیەدا تێکەڵییەك بوونی هەیە لـە نێـوان هەڵسـوکەوتی یاسـایی کـە لـە گرێبەست و ویستی یەکلایەنەدا کورتدەبێتەوە –لەسەر بۆچوون(بانگەشە)ی زانایانی یاسا– لەگەڵ ڕووداوی یاسایی کە هـەموو کـار و کـردەوە بەویسـتەکان دەگرێتـەوە،

---

[1] الأستاذ صلاح الدين الناهي، المرجع السابق، ص١٩٣ وما يليها.

[2] الأستاذ صلاح الدين الناهي، المرجع السابق، ص١٩٤ وما يليها.

[3] منهم الأستاذ عبدالحي حجازي، النظرية العامة للالتزامات، ٦١١/١ وما يليها.

ئەمانەش ئیسان لە هەڵسوکەوتی یاساییبن، هەر بەو جۆرە ئەم ئاراستەیە تێکرڵییەکی تێدایە لە نێوان هۆی پابەندبوون و سەرچاوەی پابەندبوون سەرەڕای ئەوەی چاکخوازی هۆیەکە و یاسا سەرچاوەیە، پێشتر بەدرێژی لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەم تێکەڵییە کراوە.

لەڕاستیدا خستنەڕووی بەڵگەکانی ئەم ئاراستانە و ئاراستەکانی تر و گفتوگۆ لەسەر کردنیان کات و تەمەن بەفیڕۆدانە، چونکە ئاڵۆزی و بەیەکداکێشان تیایاندا بالأدەستە بە تێکەڵکردن لە نێوان بنچینەی چاکخوازی و چۆناندنەکەیدا، ئەم ئاراستە چۆناندنی چاکخوازیان چارەسەر کردووە لەژێر ناونیشانی بنچینەی چاکخوازیدا لەگەڵ جیاوازییەکی ڕۆشن لەنێوان دوو زاراوەکەدا، بنچینەی شتێك بریتییە لە هاندەر و پاڵنەر بۆی یان هۆی ئامانجگەرایی کە هەموو کردارێکی بەویستی دەرچوو لە مرۆڤەوە لەسەری بینا دەکرێت.

لە کاتێکدا چۆناندنی هەموو زاراوەیەکی یاسایی بریتییە لە پێدانی سیفەتە یاساییەکەی و سروشتە یاساییەکەی.

هەر بەو جۆرە بۆ چارەسەری ئەم بابەتە تێکەڵی دەبینرێتەوە لە نێوان هۆگەرایی چاکخوازی بۆ پابەندبوونەکان لەگەڵ سەرچاوەگەریی چاکخوازی بۆ پابەندبوونەکان.

**چۆناندنی چاکخوازی و بنچینەکانی لە ترازووی مەنتق و فەلسەفەدا:**

لە ترازووی مەنتقدا چاکخوازی چۆناندنی بۆ کراوە بە ویستی سەرەتای یەکلایەنە، و بریکاری لەسەرئەنجامدا، چونکە بەر لە مۆڵەت هەڵسوکەوتێکی کرداری بەویستی تاکلایەنەی بەسوود بووە، ئەمە ڕۆشنە و گفتوگۆ قبووڵ ناکات.

بەڵام لەدوای مۆڵەت لەلایەن خاوەن کارەکەوە یان لەلایەن کەسێکەوە نوێنەرایەتی ئەو دەکات چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی بریکارییە، چونکە مۆڵەتی پاشینە وەك بریکاری پێشینە وایە، ئەمەش ئەوەیە زۆربەی یاساکان ڕاشکاوانە یان بە ئاماژە دانیان پێداناوە، لەباری نەبوونی مۆڵەت بەسەریدا دەگەڕێتەوە بەوەی دلوای دەوڵەمەندبوونە بەبێ هۆ(بەدەستهێنان بەبێ هۆ).

## بنچینەی چاکخوازی:

بنچینە بۆ هەریەك لە کارکەر(کەسی فزولی) و کاریۆکرلو(خاوەن کار) جیاوازە، تایبەت بە کەسی فزولی هاوکارییە لەسەر چاکە سەرەڕای نەبوونی مەبەستی بەخشین، وەك قورئان فەرمانی پێ دەکات: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1]

چونکە تاکەکانی خێزانی مرۆڤایەتی هەموو برا و خوشکن وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾[2] ئەخلاقی برایەتیش بریتییە بریتییە لە هاوکاری و دەست لەناودەستی و هاریکاری لە هەموو بوارەکانی ژیان و پێویستییەکانیدا.

بنچینەکەشی تایبەت بە خاوەن کار بریتییە لە پادلشتی چاکە بە چاکە، وەك قورئان رایگەیاندووە: ﴿هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾[3]، چونکە رستە پرسیارییەکە لێرەدا بۆ دانپیادانان و مامەڵەکردنی هاوشێوەیە، رووبەڕووبوونەوە بە خێر وەك لە چاکخوازیدا، هەروەها رووبەڕووبوونەوە بە شەڕ وەك لە دەستدرێژیکارییەکاندا بەپێی ئایەتی: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[4].

بۆیە کەسی فزولی بە کارێکی ئایینی و مرۆیی و ئەخلاقی هەڵدەستێت بۆ سوود و بەرژەوەندی خاوەن کار، با مەبەستیشی بەخشین نەبێ، چونکە کارەکە لە هەردوو بارەکە کارێکی بەسوودی مرۆییە، بۆیە پاداشتی کەسی فزولی چاکەکار نابێت تیابچێت لەلایەن ئەو کەسەوە چاکەی لەگەڵ کراوە و پاداشتەکەی بریتی بێت لە تیاچوونی ماڵەکەی و خەڵات کردنی بە خراپە.

---

[1] سورة المائدة/٢.

[2] سورة الحجرات/١٣.

[3] سورة الرحمن/٦٠.

[4] سورة البقرة/١٩٤.

## گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر:

شایانی باسە وەفاكردن بە گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر بەبێ مۆڵەت یان بەبێ نوێنەرایەتی بە شێوازێك لە شێوازەكانی چاكخوازی دادەنرێت و حوكمەكانی ئەوی بەسەردا پیادە دەكرێت بە مەرجێ ئەو كەسەی قەرزەكە دەگێڕێتەوە كارەكەی بەخشین نەبێت، هەڵەیە گەر بیكەین بە هاوبەش(قسیم) بۆ چاكخوازی، وەك چۆن هەندێ لە یاسا لەوانە یاسای ئوردەنی رلوەستاو ئەو كارەی ئەنجامدلوە و كاری دابەش كردووە بۆ بەسوود و بەدەستهێنانی بێ هۆ و دەستبەسەرداگرتنی ناشایستە و چاكخوازی و گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر[1].

یاسادانەری عێراقی سەركەوتوو نەبووە لە چارەسەری گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر بەبێ مۆڵەت یان بەبێ نوێنەرایەتی لە دوو رووەوە:

یەكەمیان: لە بەشی چوارەمدا چارەسەری گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تری كردووە لەژێر ناونیشانی "بەدەستهێنان بەبێ هۆ" لەگەڵ ئەوەی بەدەستهێنانی بێ هۆ كارێكی نارەوایە بەڵكو لە زۆربەی حاڵەتەكاندا تاوانە، لە كاتێكدا گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر كارێكی رەوای مرۆییە لە دەروازەی كۆمەكی و هاوكاری.

دووەم: بەخشینی كردووە بە بنەڕەت بۆ گێڕانەوەی قەرزی كەسانی تر، بۆیە ئەو كەسەی قەرزەكە دەگێڕێتەوە مافی ئەوەی نییە ئەوەی وەفای پێكردووە بیگێڕێتەوە بۆ سەر قەرزدار یان خۆی بخاتە جێگەی خاوەن قەرز گەر بە بەڵگەیەك یان نیمچە بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە نەسەلمێت.

مادەی(٢٣٩) لە یاسای مەدەنی عێراقی دەقەكەی دەڵێت: (گەر یەكێك قەرزی كەسێكی تر بگێڕێتەوە بەبێ فەرمانی ئەو ئەوا قەرزەكە لەسەر قەرزدار بەردەبێتەوە، یەكسانە قبووڵی بكات یان قبووڵی نەكات، كەسی گێڕەرەوەی قەرزەكە بە بەخشینی دادەنێت و هیچ شتێك لەو قەرزەی گێڕاویەتەوە بەبێ فەرمانی ئەو ناگەڕێتەوە بۆ سەر

---

[1] المواد (٢٩٣-٣١٠).

قـەرزدار، مەگـەر لـە رەوشـەکەوە دەربکـەوێت بـۆ کەسـی گێـڕەرەوەی قەرزەکـە بەرژەوەندییەك بـوونی هـەبووە لـەو قەرزدانـەوەدا یـان کەسـەکە نیـێتی بەخشـینی نەبووە)

ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ ئایـەتی: ﴿هَـلْ جَـزَاء الْإِحْسَـانِ إِلَّـا الْإِحْسَـانُ﴾، رووی هەڵەکە ئەوەیە دان بەوەدا دەنێت بنەڕەتی کارەکە بەخشـینە و روو لـە پێچـەوانەی ئەمـە ناکـات مەگـەر لـەدوای سـەلماندنی نیـێتی گەڕانـەوە بەسـەر قـەرزداردا، ئـەم ئاراستەیەی یاسادانەری عێراقی کاریگەر بە بۆچوونی هەندێ لە فەقیهانی شـەریعەت پێچەوانەی فەرمانە خواییە ئاماژەبۆکراوەکە و مەنتقی یاساییە.

# لقی سێیەم:
# حوکمەکانی چاکخوازی

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە حوکمەکانی چاکخوازی بریتین لە مافەکان و ئەرکەکان سەرهەڵدراو لەسەری وەك هۆیەك لە هۆیەکانی، سەرچاوەی ئەم حوکمانە بریتییە لە یاسا پێچەوانەی ئەوەی یاسا و یاساناسان لەسەرینی بەوەی چاکخوازی بریتییە لە سەرچاوەی ئەو حوکمانە، ئەوەی لەلای ئێمە گرنگە لەم لقەدا خستنەڕووی پابەندبوونە سەرهەڵدراوەکانە لەسەر چاکخوازی لەو ڕووەوە کە سەرچاوەن، وەك یاسا و زانایانی یاسا دەیڵێن.

هەروەها لەو ڕووەوە کە دەبێت بە هۆ بۆیان وەك مەنتقی یاسایی دەیڵێت، ئەم پابەندبوونانە –بە سەرنجدان لە کەسی پابەندبوو– دوو بەشە: پابەندبوونەکانی کەسی فزولی و پابەندبوونەکانی خاوەن کار.

## یەکەم- پابەندبوونەکانی کەسی فزولی:

١– لەسەر فزولی پێویستە بەردەوام بێت لەسەر ئەو کارەی دەستی پێکردووە تا خاوەن کار دەتوانێت بۆخۆی کارەکە ئەنجام بدات[١].

ئەوەی ڕوونە ئەوەیە یاسا کەس پابەند ناکات بەوەی کاروباری کەسانی تر بگرێتە ئەستۆ بەبێ نوێنەرایەتی، بەڵام ئەو کەسەی دەستێوەردان دەکات خۆی خۆی پابەند دەکات بەو کارەوە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەم پابەندبوونە بۆ دوورخستنەوەی سووکایەتی و یاریکردنە بەماڵی کەسانی ترەوە، شایانی باسە هەندێ لە شرۆڤەکارانی یاسا ئەم پابەندبوونەیان کردووە بە مەرج وەك پێشتر باسمان کرد.

---

[١] المدني المصري (المادة ١٩١).

٢- کەسی فزولی پابەند دەبێت بە ئاگادارکردنەوەی خاوەن کار بەو دەستتێوەردانە هەر کات توانای ئەوەی هەبوو[1] تا خاوەن کارەکە بۆخۆی کارەکە ئەنجام بدات لە جێگەی کەسی فزولی.

٣- لەسەر کەسی فزولی پێویستە وەك کەسێکی ئاسایی هەوڵی خۆی بدات لە هەستان بە کارەکە، ئەو دلوای لێنەکراوە ئامانجەکە بەدیبهێنێت بەڵکو جێگەی پابەندبوونەکەی بریتییە لە بەخشینی گرنگیپێدان و چاودێری، بەڵام بەرپرسیارە لە هەڵەکەی گەر لە پشتگوێخستن و کەمتەرخەمییەوە بوو.

گەر فزولییەکان چەندین کەس بوون لە هەستان بە یەك کار ئەوا هەموویان لە بەرپرسیارێتیدا بەشدارن، چونکە پێویستە کەسی فزولی لە هەستان بە کارەکەی لە ئاکاری باشی کەسێکی ئاسایی لانەدات، ئەگەر نە، بە هەڵەکار دادەنرێت، بۆیە وەك بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی رووبەرووی پرسیار دەبێتەوە لە هەر زیانێك تووشی خاوەن کارەکە دەبێت بەرهەمی ئەو دەستتێوەردانەی ئەو، سەرەڕای ئەوەی دلوای لێ ناکرێت هەوڵێکی لەڕادە بەدەر(نائاسایی) بۆ ئەنجامدانی کارەکە بدات، گەر کەسێك نوێنەرایەتی کەسی فزولی کرد بۆ هەستان بە کاری چاکخوازی هەمووی یان بەشێکی ئەوا نوێنەرەکە وەك نوێنەری بریکار وایە لە هەڵسوکەوتی یاساییدا، هەروەها وەك بەڵێندەر وایە لە ناوەوە لە کارە مادییەکاندا، بۆ کەسی خاوەن کار هەیە ئەو هەڵەیەی لە نوێنەرەکەیەوە سەریهەڵداوە بیگێڕێتەوە بەسەر کەسی فزولیدا لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتی شوێنکەوتوو لە کارەکانی شوێنکەوتەکەی[2].

٤- لەسەر فزولی پێویستە ئەوەی بەهۆی چاکخوازییەکەوە دەستی بەسەردا گرتووە بیگێڕێتەوە.

---

[1] المصدر السابق.

[2] المدني المصري (المادة ١٩٢).

٥- پێویستە لەسەری وردەکاری ئەوەی پێی هەستاوە پێشکەش بکات، کارەکەی هەروەك کاری بریکار وایە، گەر کەسی فزولی هەستا بە هەڵسوکەوتێکی یاسایی بەناوی تایبەتی خۆیەوە بۆ بەرژەوەندی خاوەن کار ئەوا ئەو هەڵسوکەوتە لە پای ئەودا جێبەجێ دەکرێت نەك لەپای خاوەن کارەکەدا[١].

**کاریگەری مردنی کەسی فزولی یان خاوەن کار لە پابەندبوونەکانی فزولیدا:**

گەر کەسی فزولی مرد ئەوا میراتگرانی پابەند دەبن بەوەی میراتگرانی بریکار پێیەوە پابەند بوون، گەر خاوەن کار مرد کەسی فزولی بە پابەندبوویی دەمێنێتەوە بەرانبەر بە میراتگری بەوەی پێیەوە پابەند بووە بەرانبەر میراتگرانیان[٢].

سەرچاوەی هەموو ئەم پابەندبوونانە راستەوخۆ بریتییە لە یاسا، چاکخوازیش بەرەهایی هۆیەکە بۆ پابەندبوونەکان سیفەتە یاساییەکەی هەرچییەك بێت.

**دووەم پابەندبوونەکانی خاوەن کار:**

لە گرنگترینیان:

١- جێبەجێکردنی ئەو پەیمانانەی کەسی فزولی لە جێگەی خاوەن کار بەستوویەتی، بۆیە لەسەریەتی ئەو پابەندبوونانەی لەسەر پەیمانەکان سەریان هەڵداوە -لەو رووەوە لایەنێکە تیایاندا- جێبەجێیان بکات.

٢- قەرەبووکردنەوەی کەسی فزولی بەرانبەر ئەو پەیمانانەی بەستوویەتی بەناوی کەسی خاوەن کارەوە.

٣- گێڕانەوەی خەرجییە پێویستە بەسوودەکان کە کەسی فزولی خەرجیکردوون، هەروەها پێدانی کرێی هاوشێوە بۆ ئەو هەوڵ و کۆشانەی لە

---

[١] الأستاذ السنهوري، الوسيط ١٤١٦/١، الأستاذ مرقس، أصول الالتزامات، ص٥٦٨.

[٢] المدني المصري (المادة ١٩٤).

کارەکەیدا بەختی کردووە، بۆ نموونە گەر کەسی فزولی هەستا بە کارێك دەچووە ناو پسپۆڕی پیشەکەی خۆیەوە، وەك پزیشك لە بەهاناچوونی نەخۆشێك یان ئەندازیارێك لە دروستکردنی دیوارێك، ئەوا لەسەر کارەکەی بە کرێی هاوشێوەی شایستە دەبێت سەرباری ئەو خەرجیانەی خەرجی کردوون.

٤- قەرەبووکردنەوەی کەسی فزولی بۆ ئەو زیانەی رووبەڕووی بووەتەوە بەبێ هەڵە لە ئەوەوە و بە هۆی هەستانی بە کارەکە لەپێناو بەرژەوەندی چاکەلەگەڵکراو، وەك ئەوەی کەسی فزولی هەستێك بە کوژاندنەوەی ئاگرێك کە لەماڵی خاوەن کار بەرپووە ماڵەکە گوازراوە بێت یان خانووبەرە، و بەهۆی کوژانەوەی ئاگرەکەوە تووشی زیان بوو، ئەوا خاوەن کار پابەند دەبێت بە پێدانی قەرەبووی ئەو زیانە.

ئەم پابەندبوونانە پەیوەستن بە ئەستۆگری خاوەن کارەوە و بابەتەکەی بریتییە لە مافە تاکەکەسییەکان بۆ کەسی فزولی، گەر خاوەن کار مرد ئەو قەرزانە پەیوەست دەبن بە لێجێماوەکەیەوە، بۆیە میراتگران پابەند دەبن بە پێدانی پێش دابەشکردنی لێجێماو، چونکە قەرزی پەیوەست بە لێجێماو رێگرە لە هەڵسوکەوتەکەیان، ئەمەش مانای ئەو رێسا یاساییەیە(هیچ لێجێماوێك بوونی نییە مەگەر لە دوای گێڕانەوەی قەرزەکان) واتە هەڵسوکەوتی میراتگری جێبەجێ ناکرێت لە لێجێماودا مەگەر دوای گێڕانەوەی قەرزەکان یان مۆڵەتی خاوەنانی قەرز.

**لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەم خاڵانە بکرێت:**

أ. حوکمەکانی چاکخوازی بەسەر هەڵسوکەوتە یاساییەکانی بریکاردا گوزەر دەکات لە یەکێك لەم دوو بارەدا:

١- گەر لە هەڵسوکەوتەکەیدا لە سنووری بریکاری دەرچوو.

٢- گەر هەستا بە هەڵسوکەوتی یاسایی بۆ بریکارگر لەدوای کەنارردانی و ئەویش(بریکارگر) لەوە بێئاگا بوو.

ب- دلوای سەرهەڵدراو لەسەر چاکخوازی بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەردەبێتەوە

لەو ڕۆژەوە تیایدا کەسی فزولی بە مافەکەی خۆی دەزانێت، بە تێپەڕبوونی پازدە ساڵ لەو ڕۆژەوە تیایدا مافی فزولی سەرهەڵدەدات.

ج- گەر کەسی فزولی لە دیاریکردنی خاوەن کاردا هەڵەی کرد ئەوا مافەکان و پابەندبوونەکانی سەرهەڵدرلو لە دەستبردن بۆ کاری چاکخوازییەکە لە نێوان ئەو و خاوەن کاری ڕاستەقینەدا ڕاست دەبنەوە.

د- گەر کەسێك هەڵسوکەوتێکی لە کاروبارێکدا کرد و وا گومانی برد کاری ئەوە و پاشان بۆی ڕوون بوویەوە کاری کەسانی ترە، ئەوا ئەو پەیوەندیانەی ڕاستدەبنەوە لە نێوان ئەو و ئەو کەسەی تردا دەچێتە ژێر ڕێساکانی بەدەستهێنانی بێ هۆ یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ.

هـ- کەسی فزولی کە دەستێوەردان دەکات بۆ کاروباری کەسانی تر پێچەوانە لەگەڵ حەزی ئەو کەسە نەناسراوە گریمانکراوە یان کارەکە پێچەوانە بێت بە حەزی گریمانکراوی ئەوا ڕووبەڕووی پرسیار دەبێتەوە لە هەر زیانێك تووشی کەسەکە دەبێتەوە بەرهەمی کارە فزولییەکەی ئەو با هەڵەیەکیش بوونی نەبێت بکرێتە پاڵپشت.

ز- بۆ کەسی فزولی هەیە شتە بەمولککراوەکان رابگرێت بۆ خاوەن کار وەك دەستەبەرییەك بۆ ئەو برە پارانەی لە ئەستۆی خاوەن کارەکەدایە.

ح- لەباری فرەیی فزولییەکاندا گەر هەڵەیەك لە یەکێکیان وەشایەوە بەسەر ئەوانی تردا تێپەڕناکرێت گەر دەقێك بوونی نەبێت پێچەوانەی ئەوە[1].

---

[1] لە بابەتی چاخوازیدا تەماشای ئەم سەرچاوانە دەکرێت:
المدني المصري (م/١٨٨-١٩٧).
الأردني (م/٣٠١-٣٠٨).
الكويتي (م/٢٦٩-٢٧٨).
اللبناني (م/١٤٨-١٦٤).
المغربي (الفصول ٩٤٣-٩٥٥).

←

# باسی چوارەم:
# رووداوە شەرعی و یاساییەکان

سروشتی ئەم بابەتە لەرووی مەنتقییەوە دلوا دەکات لێکۆڵینەوەکەی دابەش بکەین لەرووی شێوەوە بەسەر پێنج داوادا، لە دلوای یەکەمدا دەست بۆ پێناسەی بابەتەکە دەبەین، لە دووەمدا رووداوە سروشتییەکان و پابەندبوونە خێزانییەکان، لە سێیەمدا رووداوە سروشتییەکان و پابەندبوونە مەدەنییەکان، لە چوارەمدا رووداوە سروشتییەکان و پابەندبوونە تاوانکارییەکان، لە پێنجەمدا رووداوە سروشتییەکان و پابەندبوونە نوێودەوڵەتییەکان

## مەبەستی یەکەم:
## پێناسەی بابەتەکە

رووداو: کارێکە سەرهەڵدەدات و بوون پەیدا دەکات دوای ئەوەی بوونی نەبووە، لە وشەی"شت" بەرەهایی تایبەتترە کە هەبوو و نەبوو دەگرێتەوە، لەرووی

---

العراقي (م/٢٣٦-٢٣٩). ئەم یاسایە راشکاوانە دەستی بۆ چاکخوازی نەبووە، بەڵام هەندێ لە پیادەکردنەکانی باس کردووە وەك وەفاکردن بە قەرزی کەسانی ترەوە.

ويُنظر المراجع الآتية:

الأستاذ السنهوري، الوسيط ١٣٨٤/١ وما يليها.

الأستاذ عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٦١١ وما يليها.

الأستاذ صلاح الدين الناهي، المرجع السابق، ص١٩٠ وما يليها.

مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية، المرجع السابق، ٤٦٥/٢ وما يليها.

فەلسەفیشەوە پێناسە دەکرێت بەوەی: هەر شتێك دەکرێت بناسرێت یان هەواڵی لەبارەوە بدرێت یان بەدوایدا بگەڕێیت.

"شت"رەگەزێکی باڵایە واتە لە سەریەوە رەگەزێکی تر نییە، لەژێریدا دوو رەگەزی ناوەندگر جێگەیان دەبێتەوە ئەو دوانەش بوون(هەبوو) و نەبوون(نەبوو)ە.

هەبوو لەژێریدا کاری رەوا و کاری ناڕەوا جێگەی دەبێتەوە، هەریەك لەو دوانەش لەژێریاندا هەڵسوکەوت و رووداو جێگەیان دەبێتەوە، لەژێر هەڵسوکەوتدا: گوفتارەکان و کردارەکان جێگەیان دەبێتەوە، وەك چۆن لەژێر رووداودا رووداوی یاسایی و رووداوی سروشتی جێگەیان دەبێتەوە.

## ١-رووداوی سروشتی لە بواری یاسادا:

هەر رووداوێك ویستی مرۆڤ دەستی راستەوخۆی لە روودانی نەبێت، بەڵکو لە بەدیهێنانی توانای تەنهای خودا بێت وەك ژیان و مردن بۆ بوونەوەرە زیندووەکان، هەروەها بوومەلەرزە و لافاو و گەردەلولی با و خۆڵ و هاوشێوەکانی ئەمانە لە بێگیانەکان.

ئەم رووداوە پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە هەیە لەو رووەوە هۆی پابەندبوونەکانی مرۆڤە.

## ٢-رووداوە یاساییەکان:

بریتین لە هەر رووداوێك مرۆڤ رۆڵی هەیە لە روودانی بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ جا رۆڵەکە رۆڵێکی بەویستی نائازاد بێت وەك ئەو کارانەی لەژێر فشاری زۆرلێکردن یان پێویستی زۆردا لە مرۆڤێکی باڵغی ژیر دەوەشێتەوە، یان کاری نەویست بێت بەڕەهایی وەك ئەو کارانەی لە شێت و منداڵی جیانەکەرەوە و ئەوەی لە حوکمی ئەواندایە دەوەشێتەوە.

مەبەست بە "نەویست" ئەوەیە بکەر کاتی دەرچوونی کارەکە لە ئەو ناتوانێت سەرئەنجامی کارەکەی بخەملێنێت لە خێر یان لە شەڕ و لە چاکە یان لە خراپە.

پێشتر ئـەوەمان ڕۆشـن کـردەوە زانایـانی یاسـا سـەرکەوتوو نـەبوون لـە دانـانی پێوەرێکی مەنتقی بۆ جیاکردنەوەی نێوان هەڵسوکەوتی یاسایی و ڕووداوی یاسـایی، بۆیـە هەڵسـوکەوتی یاسـاییان پێناسـەکردووە بـەوەی ڕووتێکردنـی ویسـتە بـەرەو سـەرهەڵدانی ئەسـەرێك کـە یاسـا بایـەخی پێـدەدات، واتـە ئاسـاری لـە مافـەکان و ئەرکەکان لەسەر پەیدا دەبێت.

ئەم هەڵسوکەوتە یاساییەیان لە هەڵسوکەوتی گوفتاریدا کورتکردۆتەوە، هەر بـەو جۆرە هەڵسوکەوتی گوفتاریان لە گرێبەسـت و ویسـتی یەکلایەنـەدا کورتکردۆتـەوە، پێیان وایە جگە لەو دوانە هەموو گوفتارەکان و کردارە بەویست و نەویستەکانی مرۆڤ ڕووداوی یاساین(یان ڕووداوی مادین).

پێشتر نەنگی-ئەم پێوەرەمان ڕۆشن کردەوە، بەڵام لەبەر گرنگی پێوەری مەنتقی بۆ جیاکردنەوەی نێوان هەڵسوکەوتی یاسایی و ڕووداو لێرەدا بابەتەکە بە ڕێگەیەکی ڕۆشنتر و گشتگیرتر دووبارە دەکەینەوە:

هەڵسوکەوتی یاسایی: بریتییە لە هەر گوفتار و کردارێك لە مرۆڤێکی بـاڵغی ژیـری خاوەن هەڵبژاردەی هۆشیار دەوەشـێتەوە بـەجۆرێك یاسـا ئەسـەری لـە مافـەکان و ئەرکەکان پێ سەرهەڵبدات.

بینا لەسەر ئەم پێناسەیە بۆ هاتنە دی هەڵسوکەوتی یاسایی بـوونی ئـەم شـەش توخمە بەمەرج دەگیرێت:

١- ڕووداوەکە لە گوفتار و کردار لە مـرۆڤ وەشـابێتەوە، بۆیـە هـەموو ئـەوەی لـە سروشـــت دەوەشـــێتەوە وەك گـــەردەلوول و لافـــاو و بوومەلـــەرزە و هاوشێوەکانیان یان لە گیاندارەوە وەك ئازاردانی جەستەی مرۆڤ یان تیابردنی ماڵ و سامان یان هاوشـێوەکانی ئەمانـە لـە ڕووداو بـە هەڵسـوکەوتی یاسـایی دانانرێن.

٢- لە مرۆڤێکـی بـاڵغ یـان جیاکـەرەوە وەشـابێتەوە، هـەموو ئـەوەی لـە مرۆڤـی ناجیاکەرەوە دەوەشێتەوە لە گوفتار یان کردار ڕووداوە.

٣-لە کەسێکی باڵغی ژێر وەشابێتەوە، هەموو ئەوەی لە شێت و ئەوەی لە حوکمی شێتدایە دەوەشێتەوە روودلوە.

٤-لە مرۆڤێکی باڵغی ژێری خاوەن هەڵبژاردە وەشابێتەوە، بۆیە هەموو ئەوەی لە زۆرلێکراو یان ناچار دەوەشێتەوە روودلوە.

٥-لە مرۆڤێکی باڵغی ژێری خاوەن هەڵبژاردەی هۆشیار وەشابێتەوە، بۆیە هەموو ئەوەی لە خەوتوو یان بێئاگا یان لەبیرکەر یان بووراوە یان سەرخۆش یان ژێری تێکچوو و یان هاوشێوەکانی ئەمانە دەوەشێتەوە روودلوە.

٦-لە باریدا هەبێت یاسا ئەسەرێکی مەدەنی لەسەر دروست بکات وەك مافەکان و ئەرکە مەدەنییەکان یان ئەسەرێکی تاوانکارانەی لەسەر دروست بکات وەك بەرپرسیارێتییە تاوانکارییەکان و سزادان، بینا لەسەر ئەمە هەموو ئەوەی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە لە موجامەلە و بەریەککەوتنە کۆمەڵایەتییەکان و جووڵە و بزوانەکان و شتانی تریش کە یاسا هیچ جۆرە ئەسەرێکی پێ دروست ناکات لە مافەکان و پابەندبوونەکان روودلون، بەڵام ناچنە ژێر رێکخستنی یاساییەوە.

ئەوەی جێگەی گرنگی ئێمەیە لەم باسەدا بریتییە لە لێکۆڵینەوەی روودلوی سروشتی کە پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە بەجۆرێك یاسا ئەسەری لە مافەکان و ئەرکەکان لەسەر دروست بکات.

ئەو ماف و ئەرکانەی لەسەر روودلوە یاساییەکان سەرهەڵدەدەن پێشتر بەدرێژی لە سێ باسەکەی پێشوودا باسمان لەبارەوە کردووە.

# مەبەستی دووەم:
# رووداوی سروشتی و پابەندبوونە خێزانییەکان

مەبەست بە پابەندبوونە خێزانییەکان بریتییە لەو پابەندبوونانەی لەسەر رووداوێکی سروشتی سەرهەڵدەدەن لە کەسێکدا ئەندامە لە خێزانێك ئاستی کۆمەڵایەتییەکەی هەرچییەك بێت.

لەم باسەدا هەوڵدەدەین چەند نموونەیەك لەو پابەندبوونانە دەست بۆ ببەین، لەوانە:

## یەکەم -رووداوی لەدایکبوون:

مرۆڤ سەرەرای رۆڵی ناراستەوخۆی لەم لەدایکبوونەدا وەك هاوسەریکردن کە سەردەکێشێت بۆ بەیەکترگەیشتنی گیانداری مەنەوی لەگەڵ هێلکەی ئافرەتدا و رۆڵی دایك لە پارێزگاری کۆرپەلە تا کاتی لەدایکبوونی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەدایکبوونی کۆرپەلە بەزیندوویی لە کاتێکی دیاریکراودا کارێکە دەچێتە ژێر ویستی تەواوی خوداوە-سبحانە وتعالی- ئەو خودایەی ئەفرێنەری راستەقینەیە بۆ هەموو مرۆڤێك، بۆیە لەدایکبوون بە رووداوێکی سروشتی دادەنرێت تایبەت بە مرۆڤ.

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە لەدایکبوون هۆیەکە بۆ پابەندبوونە رووبەڕووەکان لەنێوان بنەڕەتەکان(ئوسول) و لقەکانیان لە رۆڵی جۆراوجۆردا بەم جۆرە:

أ- پابەندبوونی دایك بە شیردانی منداڵە لەدایکبووەکە بۆ ماوەی دوو ساڵ گەر بیانوویەکی رەوای بەدەستەوە نەبوو.

ب- پابەندبوونی باب بە خەرجکردن لەسەر شیرپێدەر و بەخێوکەر لەدوای جیابوونەوە بە تەڵاق یان بە مردن، بەڵام لەباری راستبوونەوەی هاوسەریدا هۆی خەرجکردنەکە بریتییە لە هاوسەرداری.

ج- پابەندبوونی میراتگری منداڵەکە بەو خەرجکردنەوە لە ماڵەکەی لەباری مردنی باوکیدا یان لەباری دەستەوسانی باوکی بە خەرجکردن.

د- پابەندبوونی دایك و باوك بە زیان نەگەیاندن بەیەکتری لە ڕێگەی منداڵەکەوە.

سەرچاوەی ئەم پابەندبوونانە بریتییە لە قورئان: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ[1] رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[2].

شایانی باسە ئەم ئایەتە سەرچاوەی ئەو پابەندبوونە ئاماژەبۆکراوانەن کە هۆیەکەی بریتییە لە ڕووداوێکی سروشتی(لەدایکبوون) ئاماژە بە شازدە حوکم دەکات، هەشتیان ڕاشکاوانە گوزارشتی لێکراوە و هەشتەکەی تریان بە ئاماژە هێمای پێکراوە.

### أ.ئەو حوکمانەی ڕاشکاوانە گوزارشتیان لێکراوە:

١- دایکان پابەند دەبن بە شیردانی منداڵەکانیان گەر بیانوویەکی ڕەوایان نەبوو.

٢- ماوەی شیردان دوو سوڕ(دوو ساڵ)ی تەواوە.

٣- باوکی منداڵەکە پابەند دەبێت بە خەرجکردنەوە لەسەر شیردەرەکە لە شیردانندا و بەخێوکەرەکە لە بەخێوکردندا، یەکسانە کەسەکە دایك بێت دوای جیابوونەوەی باوك و دایکی منداڵەکە لەیەکتری یان دوای مردن و شتانی تریش.

---

[1] واتە باوك، "اللام" لە "لە"دا ڕاستەقینەیە لە موڵکداریدا، کاتێك ئەو ڕاستەقینەیە نەشیاوبوو بەهۆی نەبوونی قابیلییەتی مرۆڤ بۆ موڵکداری هەڵدراوەتە سەر نزیکترین مانای موڵکداری کە بریتییە لە ڕەچەڵەك.

[2] سورة البقرة/٢٣٣.

٤- پابەندبوونەکە-لە سنووری توانای داراییدا- دەبێت بە چاکە ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾.

٥- هەریەك لە دایك و باوك پابەند دەبن بەوەی زیان بەویتر نەگەیەنێت لە رێگەی منداڵە شیرەخۆرەکەوە، دایکەکە پابەند دەبێت بەوەی رێگری نەکات لە شیردانی منداڵەکە وەك زیانگەیاندن بە باوکەکە، هەر بەو جۆرە باوکەکە پابەند دەبێت بەوەی رێگری لە دایکەکە نەکات لە شیردانی منداڵەکە وەك زیانگەیاندن بە دایکەکە.

٦- گەر باوکەکە مرد یان دەستەوسان بوو لە خەرجکردن لەسەر شیردەر و بەخێوکەر ئەوا میراتگرانی منداڵەکە پابەند دەبن بە هەستان بەو خەرجکردنە لە جێگەی باوکی﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾، واتە لەسەر میراتگری منداڵەکە، چونکە میراتگرە، بۆیە قورئان خەرجکردنی بە میراتەوە بەستۆتەوە.

٧- رێکەوتنی دایك و باوك و رازیبوونیان لەسەر شیربڕانەوەی منداڵەکە پێش تەواوکردنی دوو ساڵەکە دروستە گەر ئەو کارە زیانی بە تەندروستی منداڵەکە نەدەگەیاند.

٨- دروستە شیردەر کەسانی تر بن جگە لە دایك لەباری مردنی دایکدا یان لەباری نەتوانینی شیرداندا، باوکی منداڵەکە بەرانبەر شیردەرەکە پابەند دەبێت بە هەمان پابەندبوون کە بەرانبەر دایکی منداڵەکە هەیەتی.

### ب-ئەو حوکمانەی ئاماژەیان پێ دەکرێت بە ئاماژەیەکی هێمایی:

١- رەچەڵەکی منداڵ بۆ باوکانیانە، چونکە پیتی"ل" لە وشەی "المولود لە"دا راستەقینەیە لە موڵکداریدا، مرۆڤیش قابیل بە موڵککردن نییە، بۆیە مانا راستەقینەکە نەگونجاوە، گەر مانای راستەقینە نەگونجاو بوو روو لە مەجاز دەکەین[1]، نزیکترین مانا لە مانای راستەقینەوە بریتییە لە رەچەڵەك.

---

[1] مجلة الأحكام العدلية، المادة (٦١).

٢- تەنها باوك پابەند دەبێت بە خەرجكردنەوە لەباری ژیانی و دەسەلاتی داراییدا بەرانبەر تەنهاكردنەوەی بە رەچەڵەك لەسەر رێسای(الغرم بالغنم-گەر سوودەكەی بۆ ئەو بێت زیانەكەشی بەردەكەوێت).

٣- شیری دایك باشترینە، چونكە لەڕووی تەندروستییەوە سوودبەخشترە و لەڕووی كۆمەلأیەتیشەوە لەپێشترە، واتە لەڕووی خۆشەویستی و سۆز و بەزەییەوە، ئەو منداڵەی بە سۆز و خۆشەویستی دایك چێژ وەردەگرێت لە كاتی شیرەخۆرەییدا سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی بۆ كەسانی لێدەوەشێتەوە لە كاتی بەریەككەوتن لە ژیانی كرداریدا.

٤- تەنها بۆ باوك هەیە هەڵسوكەوت لە ماڵی منداڵەكەیدا بكات بەرانبەر تەنهاكردنەوەی بە خەرجی لەسەری لەسەر رێسای (الغرم بالغنم-گەر سوودەكەی بۆ ئەو بێت زیانەكەشی بەردەكەوێت).

٥- گەر باوك منداڵەكەی خۆی كوشت بە كوشتنێك تۆڵەسەندنەوە پێویست بوو ئەوا تۆڵەی لێ ناكرێتەوە، بەڵكو بە سزایەكی تەمبێكردن سزا دەدرێت وەك بەندكردن لە جێگەی كوشتنی، چونكە باكەكە هۆی بوونی منداڵەكەیە، بۆیە دروست نییە كوشتنی منداڵەكە ببێتە هۆیەك بۆ كوشتنی.

٦- وەك چۆن لەدایكبوون هۆیەكە بۆ پابەندبوونی باوك بە خەرجكردن لەسەر منداڵەكەی، هەر بەو جۆرە خزمایەتی هۆیەكە بۆ خەرجكردنی میراتگری نزیك لەسەر میراتلێگیراوی ئاتاج گەر لەڕووی داراییەوە دامەزراو بوو، چونكە خودا خەرجكردنی بە میراتەوە گرێداوە بە: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾، ئەوەی روونە ئەوەیە دیسان خزمایەتی رووداوێكی سروشتییە.

٧- دایك لەپێشترە بە بەخێوكردنی منداڵەكەی دوای جیابوونەوە لە هاوسەرەكەی بە تەلأق یان مردن(مردنی پیاوەكە)، چونكە لەپێشترە بە شیردان.

٨- ژنی دەوڵەمەند پابەند دەبێت بە خەرجكردن لەسەر پیاوی هەژار، چونكە میراتگری مێردەكەیەتی گەر لەپێش ئەو مرد، خودا پابەندبوونی بە

خەرجکردنەوە بەستۆتەوە بە میراتەوە وەك دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[1].

سەرباری ئەو پابەندبوونە دارایيانە لەسەر دایك و باوك کۆمەڵێك پابەندبوونی مەعنەوی بوونیان هەیە، ئەوەش بریتییە لە هەستان بە پەروەردەی منداڵەکان لەڕووی تەندروستی و ڕۆشنبیری و ئەخلاقی و ئاکارییەوە، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە قورئانە لە چەندین ئایەتدا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً﴾[2]، مەبەست بە "النار-ئاگر" لەم ئایەتەدا بریتییە لە هەر سزایەك لەسەر کارێکی ناڕەوا، پارێزگاری لێی بە ئاکاری ڕاست و دروست دەبێت لە ژیاندا.

**ب-لە پابەندبوونەکانی لقەکان بەرانبەر بنەڕەتەکان ئەمانەن:**

١-پابەندبوون بەڕێزگرتن لە دایك و باوك و بەرز نرخاندنیان، سەرچاوەکەی بریتییە لە قورئان لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3] هەروەها ئایەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾[4]

٢-لقەکان بەهۆی سەرپەرشتیارییەوە پابەند دەبن بە خۆگرتنەوە لە ئازاردانی دایك و باوك لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە، خودا دەفەرموێت: ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾[5]، خودا-سبحانه وتعالى- مرۆڤی پابەند کردووە بە خۆگرتنەوە لە هەر ئازارێکی مادی یان مەعنەوی دژ بە دایك و باوك یان بنەڕەتەکانی(باپیرە و داپیرە) بە شێوەیەکی گشتی، کەمترین ئاستی

---

[1] لمزيد من التفصيل في هذا الموضوع يُراجع مؤلفنا أصول الفقه في نسيجه الجديد، ٣٩٩/٢ وما يليها.

[2] سورة التحريم/٦.

[3] سورة العنكبوت/٨.

[4] سورة لقمان/١٤.

[5] سورة الإسراء/٢٣.

ئازاردانی حەرامكردووە كە ئۆف كردنە، بەلگەنەویستە ئازاردانی لەوە گەورەتر حەرامە لە دەروازەی لەپێشتر.

**دووەم - ڕوودانی مردن:**

بەلگەنەویستە ژیان و مردن لە دروستكراوەكانی خودان، هیچ دەستتێوەردانێكی مرۆڤ لەو دوانەدا نییە، ئەو دوانە دوو ڕوودلوی سروشتین بەم مانایە، پێشتر ڕۆشنمان كردەوە مەبەست بە"سروشتی" ئەوەیە ویستی مرۆڤ هیچ ڕۆڵێكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ڕوودانیدا نەبینێت، وەك چۆن لەدایكبوون هۆیەكی سروشتییە لە هۆیەكانی پابەندبوونە باسكراوەكان لە برگەی "أ"دا، هەر بەو جۆرە مردنیش هۆیەكە لە پابەندبوونەكانی میراتگر بۆ جێبەجێ كردنی ئەوەی پەیوەستە بە لێجێماوی مردووەوە گەر ببینرێتەوە، ئەگەر نە لە شتانی تر، لەو پابەندبوونانە:

١–پابەندبوونی میراتگران بە گواستنەوەی میراتلێگیراو بۆ شوێنی كۆتایی خۆی(كفنكردن و ناشتنی)، بەلآم جێبەجێ كردنی ئەم پابەندبوونە لە لێجێماوە پێش دابەشكردنی، لە باری نەبوونی لێجێماودا میراتگران هەڵدەستن بە جێبەجێ كردنی ئەو ئەركە لە ماڵی تایبەت بە خۆیان، لە باری نەبوونی میراتگران یان دەستەوسانی داراییان موسڵمانان یان دەوڵەت پابەند دەبن بە جێبەجێ كردنی ئەو پابەندبوونە.

٢–میراتگران لە دوای خەرجكردن پابەند دەبن لەسەر گواستنەوەی مردووەكە بۆ شوێنی كۆتایی خۆی بەجێبەجێ كردنی وەسێتی میراتلێگیراوەكە گەر لە لێجێماوی وەسێتكەر بینرایەوە بەپێی ئەوەی لە ژیانیدا بڕیاری لێدابوو.

٣–میراتگران پابەند دەبن بە گێڕانەوەی قەرزی میراتلێگیراوە مردووەكەوە، لە ماڵی تایبەت بە خۆیان پابەندی ئەو گێڕانەوەیە نابن، گەر ئەو كارەیان كرد ئەوە لە دەروازەی بەخشینە، چونكە ئەستۆگری میراتگران درێژكراوەی ئەستۆگری میراتلێگیراوەكەیان نییە، هەروەها لەبەر ئەوەی پابەندبوونی ئەوان سەربەخۆیە لە پابەندبوونی میراتلێگیراوەكە لە شەریعەتی ئیسلامدا، پێچەوانەی فیقهی خۆرئاوایی و

ئـەو یاسـانەی کاریگـەرن پێـی، بـەجۆرێك ئـەم فیقهـە میراتگـر پابەنـد دەکـات بـە گێڕانەوەی قەرزی سەر میراتلێگیراوەکە گەر لێجێماو بەس نـەبوو بـۆ وەفـاکردن بـە قەرزەکە، بەڵام میراتگر لەبەردەم قـەزادا مـافی ئـەوەی هەیـە لـە مـافی خـۆی لەسـەر لێجێماوەکە دابەزێت، لەو بارەدا پابەند نابێت بە گێڕانەوەی قەرزی سەر میراتلێگیراو، ئەو قەرزانەی پەیوەستن بـە لێجێمـاوەوە ڕێگـر نـین بـۆ گواسـتنەوەی موڵککداری لێجێماو بۆ میراتگران، بـەڵام هەڵسوکەوتیان لـە لێجێمـاودا جێبـەجێ ناکرێـت، واتـە ڕاگیراوە لەسەر مۆڵەتی میراتگران یـان گێڕانـەوەی قـەرزەکان، ئەمـەش مانـای ئـەم ڕێسایە کە دەڵێت: (لێجێماو بوونی نییە مەگەر دوای گێڕانەوەی قەرز)، واتە جێبەجێ کردن نییە بۆ هەڵسوکەوت لـە لێجێمـاودا مەگـەر دوای پڕکردنـەوەی قـەرزەکان یـان مۆڵەتی قەرزدەر بە هەڵسوکەوت.

هەندێك[1] ئەم حوکمەیان لەم چەند دێڕە هۆنراوەدا داڕشتووە:

| | |
|---|---|
| والدين لا يمنع من أن يملكا | ورثة الميت ما قد تركـــــا |
| لكن به علــق كالمرهـــون | لأنه أحوط للمدفـــــــــون |
| فلم يكن تصرف فيه نفـذ | من وارث إذن الغريم ما أخذ |

(قەرز ڕێگری ناکات لەوەی میراتگری مـردوو ببێـت بـە خـاوەنی لێجێمـاو، بـەڵام قەرزەکەی پێوە پەیوەستە هەروەك بارمتەکراو، ئەوەش باشترە بۆ کەسـی مـردوو، هەڵسوکەوت لە میراتگرەوە لە میراتەکـەدا جێبـەجێ ناکرێـت تـا مۆڵـەتی قـەرزدەر وەرنەگیرێت)

٤-پابەندبوونی هەر میراتگرێك بەو سنوورانەوە خاوەن شەرع بۆی دیاریکردووە لە بەشی خۆی و دەستدرێژی نەکردن بۆ سەر بەشی کەسانی تر لە میراتگران، وەك ئەو نەریتە خراپـەی هەنـدێ لـە دەسـەڵاتدران لـەڕووی مادیـەوە کـاری پـێ دەکـەن لـە دەستگرتن بەسەر بەشـی ئافرەتـدا لـە کچـان و خوشـکان و کەسـانی تـر و بێبـەش

[1] شێخ مەعروفی نۆدێ لە کتێبەکەیدا: قطر العارض.

کردنیان لە بەشی خۆیان کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر دیاریان کردووە لەسەر بنچینەی پلەی خزمایەتی و نزیکی لە مردووەکەوە لە هەموو لێجێماوەکە یان لە بەشێکی، ئەوە لەسەردەمی نەفامیدا و پێش ئیسلام کارێکی باو بوو.

## سێیەم-نەخۆشی مردن:

لە رووداوە سروشتییە پابەندکەرەکان لە چوارچێوەی خێزاندا نەخۆشی مردنە، نەخۆش پابەند دەکات بە نەکردنی هەڵسوکەوت لە لێجێماوەکەیدا لەرووی بەخشین لەباری نەخۆشییەکەیدا بە هەڵسوکەوتێك زیان بە میراتگرانی بگەیەنێت، هەر بەو جۆرە مێرد پابەند دەکات بە تەلاقنەدانی ژنەکەی لە نەخۆشی مردندا بە مەبەستی بێبەش کردنی لە لێجێماو، گەر ئەو کارەی کرد(ژنەکەی تەلاقدا لە نەخۆشی مردندا) ئەوا بە پێچەوانەی نییەتی خراپیەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بۆیە ژنی تەلاقدراو بەشی خۆی بە تەواوی لە لێجێماو وەردەگرێت هەروەك پێش تەلاق، هەر بەو جۆرە لەسەر میراتگران پێویستە خۆیان بگرنەوە لە رێگریکردن لە پێدانی میرات بە ژنەکە بەبیانووی ئەوەی تەلاقدراوە بە تەلاقی جیابوونەوە.

## چوارەم-خزمایەتی:

خزمایەتی کراوە بە هۆ بۆ پابەندبوونی کەسی نزیکی دەوڵەمەند بە خەرجکردن لەسەر خزمە نزیکە هەژارەکەی کە توانای کارکردنی نییە لە برا و خوشك و منداڵەکانیان و مام و پوور و خاڵ و منداڵەکانیان لەوانەی میراتگرن بۆ کەسە هەژارە ئاتاجەکە گەر مردنی پێش ئەو بارە تێکەوتووە دیاریکرابایە وماڵێك یان مافێکی بەجێبهێڵابایە قابیلی گواستنەوە بێت بۆ میراتگران.

پابەندبوونە ئاماژەبۆکراوەکان هۆیەکانی بریتین لە رووداوە سروشتییە خێزانییەکان و سەرچاوەکانیان بریتییە لە قورئانی پیرۆز.

# مەبەستی سێیەم:
# رووداوە سروشتییەکان و
# پابەندبوونە مەدەنییەکان

رووداوە سروشتییەکان بە هۆیەکانی پابەندبوونە مەدەنییەکان دادەنرێن لە زۆرێك لە پرسەکاندا، هەندێ نموونەی دەخەینە روو، لەوانە:

## یەکەم-هێزێکی زاڵ:

هێزی زاڵ بریتییە لە هەر رووداوێك ناتوانرێت پێشبینی بکرێت و لابدرێت لە کاتی نزیکبوونەوە لە رووداني.

زانایانی یاسا لە دەروازەی بەرپرسیارێتی مەدەنی و تاوانکاری گوزارەی"هێزی زاڵ" و "زۆرلێکردنی مادی" و "رووداوی کوتوپڕی" و "زەرورەت"یان بەکارهێناوە، پەیوەندی چییە لە نێوان ئەم زاراوانەدا؟

بیروراکان لەمەڕ مەودای پەیوەندی نێوانیان جۆرلوجۆرن، هەندێك وای بۆدەچن[1]"هێزی زاڵ" و "رووداوی کوتوپڕی" یەك مانایان هەیە واتە هاوواتان، ئەمەش قسەیەکی ناڕاستە، چونکە سەرەڕای رێکەوتنیان لەسەر ئەوەی لە رێگرانی بەرپرسیارێتی سزایین لەگەڵ ئەوەش ئەو دوانە لە بەرپرسیارێتی مەدەنیدا لەیەکتر جیاوازن، بۆیە "هێزی زاڵ" گەر مەرجە باسکراوەکانی فەراهەم بوون(روونەدانی، و نەبوونی توانا بۆ لادانی) لە هۆیەکانی موباحکردنە و دوو بەرپرسیارێتی لادەدات(تاوانکاری و مەدەنی) چونکە ویست لە بوون دەسڕێتەوە، بە پێچەوانەی رووداوی کوتوپڕی پێشبینی نەکراوەوە ئەمەیان ویست ناسڕێتەوە، بەڵکو کار دەکاتە سەر ئازادی ویست و کاری تاوانکاری لە سیفەتی تاونکارانە دادەماڵێت، بۆ نموونە

[1] منهم الأستاذ رؤوف عبيد، مبادئ القسم العام من التشريع الجنائي، ط ١٩٧٩، ص٦٠٢.

شۆفێرێك لە کەسێك دەدات، لەناکاو کەسەکە دێتە بەردەمی و خۆلادان لێی لە ویستی مرۆڤ بەدەرە، ئەم شۆفێرە لەڕووی تاوانکارییەوە پرسیاری لێ ناکرێت، بەڵام لەڕووی مەدەنییەوە بەرپرسیارە گەر ئاراستەی ئۆتۆمبێلەکەی بگۆڕیبایە ڕوو بە دیواری حەوشەی ماڵێك و بڕوخابایە ئەوا پابەند بوو بە قەرەبووکردنەوەی زیانە بەرهەمهاتووەکە لەو ڕوخانەوە.

پەیوەندی نێوان "هێزی زاڵ" و "زۆرلێکردنی مادی" هەندێك دەڵێن[1] زۆرلێکردنی مادی و هێزی زاڵ دوو گوزارەی هاوواتان، سەرەڕای ئەو قسەی دەڵێت سەرچاوەکەی(سەرچاوەی ناچارکردنی مادی) هەندێ جار مرۆڤە.

لەراستیدا ڕێژەی نێوانیان بریتییە لە گشتی و تایبەتی رەها، هەموو هێزێکی زاڵ بریتییە لە زۆرلێکردنی مادی بەبێ پێچەوانەی هەمووەکی، زۆرلێکردنی مادی لەگەڵ هێزی زاڵ بە یەکتر دەگەن گەر سەرچاوەکەی بێگیان بێت یان گیاندارێك بێت، بە تەنهاش دێتە دی گەر سەرچاوەکەی مرۆڤ بێت، وەك ئەو کەسەی دەستی کەسێك بەزۆر دەگرێت و پاڵیدەنێت بۆ واژووکردنی قەواڵەیەکی ساختەکراو تیایدا دان بە مافی زۆرلێکەرەکەدا نراوە، یان شتانی تر بەبێ هۆیەکی رەوا، هەر بەو جۆرە ڕێژە لەنێوان "هێزی زاڵ" و "زەرورەت"دا بریتییە لە گشتی و تایبەتی رەها، لە هەر بارێکدا هێزی زاڵ دێتە دی زەرورەت دێتە دی بەبێ پێچەوانە هەمووەکییەکەیەوە، بۆیە زەرەورەت هەندێ جار ناگاتە پلەی هێزی زاڵ، بۆیە بە ڕێگرەکان لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری نەك مەدەنی دادەنرێن گەر نەگاتە پلەی هێزی زاڵ.

لە دیارترین پیادەکردنەکانی هێزی زاڵ ببێتە هۆی پابەندبوون بریتییە لە باری هەڵوەشانەوەی گرێبەست بەهۆی نەگونجانی جێبەجێ کردنیەوە بەهۆی تیاچوونی جێگەی گرێبەستەکە بەر لە جێبەجێ کردنی، بۆ نموونە گەر فرۆشراو بە هێزێکی زاڵ تیاچوو ئەوا ڕاستەوخۆ بە حوکمی یاسا گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە و پابەندبوونی فرۆشیار بە گێڕانەوەی نرخەکە بۆ کڕیار لەسەری پەیدا دەبێت گەر کۆڵی

---

[1] منهم الأستاذ محمود نجيب، الموجز في شرح قانون العقوبات، القسم العام، ص٤٥٥.

تیاچوونەکەمان بەسەریدا دا لەسەر ئەو بنچینەی پابەندبوونەکەی هێشتا تەواو نەبووە و مولکداری کڕیار بۆ فرۆشراوەکە ناجێگیرە پێش رادەستکردن، بۆیە پابەند دەبێت بە گێڕانەوەی ئەوەی رادەستی کراوە بۆ کڕیارەکە لە جێگەی فرۆشراوەکە هەمووی یان بەشێکی، بەڵام گەر کۆڵی تیاچوونەکەمان دا بە کۆڵی کڕیاردا لەسەر بنچینەی مولکداری و رێسای(بەمولککراو لەسەر خاوەنەکەی تیادەچێت) ئەوا پابەند دەبێت بە وەرنەگرتنەوەی نرخەکە لە کەسی فرۆشیار، پێشتر ئەم بابەتە لە جێگەی خۆی باسکراوە، ئێمە پارسەنگی ئەوەمان دا کە ناوەندگیرە و کۆڵی تیاچوونەکە لەنێوان فرۆشیار و کڕیاردا نیوە بە نیوە دابەش دەکرێت، بۆیە فرۆشیار پابەند دەبێت بە گێڕانەوەی نیوەی نرخەکە بۆ کڕیار، چونکە لە گرێبەستەکەوە قازانجێکی پێنەگەیشتووە، و شان دەداتە ژێر کۆڵی نیوەکەی تری، چونکە پابەندبوونەکەی بەهۆی رادەست نەکردنەوە تەواو نەبووە.

## دووەم - ئەو برسێتییەی هەڕەشەی مردن لە کەسی برسی دەکات:

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە برسێتی رووداوێکی سروشتییە، هیچ رۆڵێك بۆ مرۆڤ لە روودانیدا نییە، گەر بوو بە هەڕەشەی مردن دوو پابەندبوونی لەسەر سەرهەڵدەدات:

پابەندبوونی کەسی برسی بە رزگارکردنی ژیانی خۆی و ژیانی ئەوانەی خەرجییان لەسەر ئەوە لە رێگەی بەدەستهێنانی ماڵی کەسێکی تر بەبێ مۆڵەت.

پابەندبوونێکی تر بە پێدانی قەرەبوو بۆ ئەو ماڵە وەرگیراوە یان خوراوە گەر خاوەنەکەی داوای کردەوە، چونکە زەرورەت رێگە بە قەدەغەکراوەکان دەدات، بەڵام موباحیان ناکات، رێسا بەناوبانگەکە (الضرورات تبيح المحظورات)[1]-زەرورەت قەدەغەکراوەکان موباح دەکات، هەڵەیەکی بەربڵاوە، بۆیە زەرورەتی بەرجەستە لەم رووداوەدا لە رێگرەکانی بەرپرسیارێتی تاوانکارییە، نەك لە هۆیەکانی موباح کردن، رێسای شەرعی و یاسایی گشتی بڕیار دەدات کە (ناچاری ماف کەسانی تر پووچەڵ

---

[1] مجلة الأحكام العدلية، المادة (٢١).

ناکاتەوە) [1].

## سێیەم-مردن

هەندێ جار هۆیە بۆ کۆتاهێنان بە گرێبەست و لەوێشەوە بۆ پابەندبوونی سەرهەڵدراو لەسەر کۆتاهاتنی ئەو گرێبەستە، وەك چۆن کەسایەتی کەسی گرێبەستکار جێگەی بایەخ بێت، وەك ئەو کەسەی لەگەڵ پزیشکێکی پسپۆڕ گرێبەست دەکات بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەك بۆی یان لەگەڵ هونەرمەندێکی پسپۆڕ بۆ هەستان بە دروستکردنی پەیکەری شتێکی شوێنەواری یان کەسایەتییەکی مێژوویی یان هاوشێوەکانی ئەمانە، ئەو کەسە گرێبەستکارە پێش جێبەجێ کردنی مرد، ئەوا میراتگرانی پابەند دەبن بە گێڕانەوەی ئەوەی دەستیان بەسەرداگرتووە لە ژیانیدا.

## چوارەم- ڕووداوی جیرانی:

هەر جیرانێك پابەندە بەوەی زیادەڕەوی نەکات لە بەکارهێنانی مافی خۆی لە کاتی هەڵسوکەوت لەماڵەکەیدا بەجۆرێك زیانی جیرانەکەی لێوە سەرهەڵبدات، واتە کەسی هەڵسوکەوتکار لە سنووری پێویستی و زەرورەتی خۆی تێپەڕاند بێت، بەلگەنەویستە جیرانی ڕووداوێکی سروشتییە.

هەر بەو جۆرە هەموو جیرانێك لە خانووەکەی خۆیدا یان لە کێڵگەکەیدا پابەند دەبێت بەوەی ڕێگە بدات بە لایەنە ئاتاجەکەی تر بۆ مافێك لە مافەکانی هاوبەشی بەوەی ڕێگری نەکات لە جیرانەکەی بە بەکارهێنانی ئەو مافە، وەك مافی گوزەرکردن و مافی مەجرا و هاوشێوەکانیان.

سەرچاوەی هەموو ئەم پابەندبوونانە بریتییە لە یاسا و هۆیەکانیان بریتین لە ڕوودلوە باسکراوەکان.

---

[1] المرجع السابق، المادة (٣٣).

# مەبەستی چوارەم:
# رووداوە سروشتییەکان و
# پابەندبوونە تاوانکارییەکان

رووداوی سروشتی هەندێ جار هۆیە بۆ پابەندبوونی تاوانکاریانە بە نەرێ و بە ئەرێ، لە پیادەکردنەکانی:

## یەکەم-بچووکی تەمەن:

بچووکی تەمەن رێگرە لە بەرپرسیارێتی تاوانکارانە، بۆیە دلواکاری خاوەن ماف کە دەستدرێژی کراوەتە سەر لەلایەن کەسێکی تەمەن منداڵەوە پابەند دەکات بە خۆگرتنەوە لە بەرزکردنەوەی داوا لەسەری، هەر بەو جۆرە قازی بابەت پابەند دەکات بە رەد کردنەوەی ئەو داوایانە گەر بەرزکرانەوە، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە تەمەن بچووکی رووداوێکی سروشتییە، یاسا تاوانکارییەکان جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لە دیاریکردنی بەرزترین ئاست بۆ بچووکی تەمەن کە رێگەرە لە بەرپرسیارێتی تاوانکارانە، یاسای سزا عێراقییە راوەستاوەکان بچووکی تەمەنی بە تەواوکردنی حەوت ساڵ لە تەمەن دیاریکردووە، بۆیە مادەی (٦٤) بەدەق لەسەری هاتووە: (دلوای سزایی راست نابێتەوە لەسەر کەسێك لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا حەوت ساڵ لە تەمەنی تەولو نەکردبێت)، یاسای کوێتی لەگەڵی تەبایە لە مادەی(١٨) و یەمەنی راوەستاو لە مادەی(١/٣٠).

بەلاَم وادادەنرێت ئەم مادەیە بە مادەی(٤٧) لە یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی تایبەت بە پرسە سزاییەکان هەموارکرابێتەوە، چونکە تەمەنی بەرپرسیارنەبوونی سزایی بەرزکردۆتەوە بۆ تەولوی نۆ ساڵ لە تەمەن، بۆیە بە دەق هێناویەتی: (دلوای سزایی راست نابێتەوە لەسەر کەسێك کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە نۆ ساڵ لە تەمەنی تەولو نەکردبێت)

شایانی باسە یاساکانی سزای وڵاتە عەرەبییەکان لە دیاریکردنی بەرزترین ئاستدا لەیەکتر جیاوازن، هەندێکیان دەگەنە (١٤) ساڵ لە تەمەن.

## دووەم -هێزی زاڵ:

لە باسی سێیەمدا باسی ئەوەمان کرد هێزی زاڵ لە هۆیەکانی موباحکردنە، بۆیە ئەو کەسەی کارێکی ناڕەوا ئەنجام دەدات لەژێر فشاری هێزێکی زاڵدا رووبەڕووی پرسیار نابێتەوە نە تاوانکاریانە و نە مەدەنیانە، لە جێبەجێ کردنەکانی:

أ.تووشبوونی شۆفێرێك بە بوورانەوەی کوتوپڕی پێشبینی نەکراو بە هێزی زاڵ دادەنرێت، بەڵام گەر بوورانەوەکە بەهۆی نەخۆشییەکی پێشینەوە بوو، یان پێشتر لێی روویدابوو یان بەهۆی مادەی سەرخۆشکەرەوە بوو یان بەهۆی مادەی سڕکەرەوە بوو ئەوا ئەو بوورانەوەیە بە هێزی زاڵ دانانرێت، بەڵکو هەندێ جار ئەو رووداوە هۆیەکە بۆ توندکردنەوەی سزا وەك لە باری سەرخۆشیدا.

ب—بای توند بە هێزی زاڵ دادەنرێت گەر نەتوانرا سەربکەویت بەسەر لادانی زیانەکانیدا، بەجۆرێك شۆفێرێکی ئۆتۆمبێلی پاڵنا بۆ ئەنجامدانی تاوانێك، لەو بارەدا تاوانکار لەڕووی تاوانکاری و مەدەنییەوە پرسیاری لێ ناکرێت.

ج—گەردەلوولی تەپوتۆز گەر بینین تیایدا گەیشتە رادەی سفر بە هێزایێکی زاڵ سەرژمێر دەکرێت، بۆیە کەسی تاوانکار لەڕووی تاوانکاری و مەدەنییەوە پرسیاری لێ ناکرێت گەر لەژێر فشارەکەیدا تاوانێکی ئەنجامدا.

لە هەموو ئەم بارانە و هاوشێوەکانیان کەسی زیانپێگەیو یان "تاوانلەسەرکراو" پابەند دەبێت بە راستنەکردنەوەی داوا دژ بە تۆمەتبار، بە هەمان شێوە قازی لێکۆڵەر پابەند دەبێت بە رەوانەکردنی پرسەکە بۆ لای قازی تایبەتکراو، گەر رەوانەی لای ئەوی کرد ئەوا لەسەر قازی بابەت پێویستە داواکە رەد بکاتەوە، گەر داوایەکەی قبووڵ کرد پابەند دەبێت بە دەرنەکردنی بڕیار بەسەر تۆمەتباردا، چونکە هێزی زاڵ

کاری تاوانکاری لە سیفەتی تاوانکاری دادەڕنێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەسەری بووە پێش تاوانبارکردن لە موباحی.

## سێیەم شێتێتی لەناکاو:

شێتێتی لەناکاو دوای ئەنجامدانی تاوان، گەر تاوانبارێك لە کاتی دادگاییدا شێت بوو قازی بابەت پابەند دەبێت بە ڕاگرتنی هەموو ڕێکارە تاوانکارییەکان دژ بەو کەسە ڕێکارەکان لە هەر قۆناغێکدا بن، گەر شێتێتییەکە دوای دەرچوونی حوکم ڕوویدا ئەوا پێویستە جێبەجێکردنی ڕابگیرێت، هەر بەو جۆرە کارگێڕی بەندیخانە پابەند دەبێت بە ڕەوانەکردنی نەخۆشەکە لەڕووی ئەقڵییەوە بۆ خەستەخانەی تایبەت بە چارەسەری نەخۆشییە ئەقڵییەکان[1].

## چوارەم -تاریکی شەو:

قازی بابەت پابەند دەبێت بە توندکردنەوەی سزا لەسەر دز گەر تاوانی دزیەکەی لە کاتی تاریکی شەودا ئەنجامدا بوو.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزا ڕاوەستاوەکان سەرکەوتوو نەبووە لە چارەسەری ئەم ڕەوشە توندکراوەدا، مادەی(٤٤٠) لەو یاسایە بە دەق هێناویەتی: (سزا دەدرێت بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی هەر کەس دزییەکی ئەنجامدا و ئەو ڕەوشانەی تێدا بوو: ڕوودانی لە نێوان خۆرئاوابوون و خۆرهەڵاتندا) ڕووی هەڵەی ئەم بڕگەیە ئەوەیە ماوەی زەمەنی تۆزێك پێش هەڵهاتنی خۆر و تۆزێك دوای هەڵهاتنی خۆر بە نزیکەی چارەکە کاتژمێرێك بە کاتی ڕۆژ سەرژمێر دەکرێت.

دروست ئەوە بوو بڕگەکەی بەم جۆرە دابڕشتبایە: (ڕوودانی تاوانەکە لە تاریکی شەودا) چونکە فەلسەفەی توندکردنەوەی سزاکە بریتییە لە ترسناکی تاریکی بەهۆی

---

[1] في تفصيل هذا الموضوع يُنظر مؤلفنا: موانع المسؤولية الجنائية في التشريع الجنائي الإسلامي والتشريعات الجزائية العربية، موضوع الجنون.

ئەوەی لە خودی خۆیدا تۆقێنەرە، ئەم فەلسەفەیە بەپێی ئەو دارشتنە ونبووە، بەلگەنەویستە شەو و تاریکی شەو لە رووداوە سروشتییەکانن.

## پێنجەم- خزمایەتی نزیک:

کوشتنی بنەڕەت لەلایەن لقەوە کوشتنێکە تۆڵەسەندنەوە پێویست دەکات لەگەڵ رەوشی توندکراوە بۆ سزاکە، یاسای سزا عێراقییە رلوەستاوەکان مادەی(٤٠٦) لە دووتوێی رەوشی توندکراوەدا دایناوە کە سزاکە دەگەیەنێتە لەسێدارەدان، بۆیە قازی بابەت پابەند دەبێت بە رەچاوکردنی ئەم رەوشە لە حوکمەکەیدا کە بەسەر بکوژەکەدا دەریدەکات.

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە سیفەتی بنەڕەتبوون لە خزمایەتیدا رووداوێکی سروشتییە.

ئەوەی باسمان کرد لە رووداوە سروشتییەکان بە هۆیەکانی پابەندبوونە تاوانکارییەکان دەژمێررێن و سەرچاوەکانیان بریتییە لە یاسا.

# داوای پێنجەم:
# ڕووداوە سروشتییەکان و
# پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان

مەبەست بەڕووداوە سروشتییەکان بوونەوەرە گەردوونییەکانن وەك دروسکردنە بنەڕەتییە خودایيەکەی خۆیان یان شوێنە جوغرافییەکانیان، ئەوانەی بۆ دەستتێوەردانی مرۆڤ هیچ ڕۆڵێك بوونی نییە لە هاتنەدی ئەو ڕوودلولە یان ئەو شوێنە جوغرافییانە، دەستێوەردانی مرۆڤ لەو شوێنانە لەڕووی دیاریکردنی سنوورەکانیانەوە بە ڕێکەوتن یان پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان یان لە گۆڕان و گەشەی شێوەکانیان وەك گۆڕینی هەرێمێکی وشکانی بۆ هەرێمێکی ئاوی یان بە پێچەوانەوە وەك کەناڵە ئاوییە دروستکراوەکان لە هەرێمە وشکانییەکاندا بۆ هەندێ دەوڵەت، وەك تۆکەندی سوێس و تۆکەندی پەنەما و تۆکەندی کیل، ئەم گەشە و گۆڕانە کارناکەتە سەر ئەوەی ڕوودلوی سروشتی بن لە ڕابردوودا و لە داهاتوودا ببن بە هۆ بۆ پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان.

دەوڵەت دامەزراوەیەکی هەرێمی سیاسییە لە کۆمەڵێك تاکی نێر و مێ پێکدێن و گەلی ئەو دەوڵەتە دروست دەکەن و لە هەرێمەکەیدا نیشتەجێ دەبن و دەچنە ژێر دەسەلاتی ئەو دەوڵەتەوە و بە حوکمی دەستوور و یاسای ئەو دەوڵەتە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرێت و پابەند دەبن بەوەی بۆیان بڕیاردراوە لە مافەکان و پابەندبوونەکان[1].

سیستمی نێودەوڵەتی لە شێوە واقیعییەکەیەوە هەڵدەستێت بە دابەش کردنی زەوییە ئاوەدانەکان بۆ یەکەی هەرێمی و زاراوەی نێودەوڵەتیان بۆ بەکاردەهێنێت.

---

[1] أستاذنا حامد سلطان، القانون الدولي العام في وقت السلم، ط٤، ص٣٥١.

دەوڵەت وەك باسمان کرد لە هەرێمێکی سنووردار و گەلێکی دیاریکراو پێکدێت کە لەو هەرێمانەدا نیشتەجێ بوون لەگەڵ سیستمێکی بابەتیانە کە حوکمی گەل دەکات و دانپیادانانێکی نێودەوڵەتی هەیە بۆی.

دوای هاتنەدی ئەم تۆخمانە دەوڵەت کەسایەتییەکی مەعنەوی خاوەن سەروەری لە چوارچێوەی سنووری نێودەوڵەتیدا بەدەست دەهێنێت، و دەوڵـەتانی تـر پابەنـد دەبن بە رێزلێنانی و دەستتێوەرنەدان لـە کاروبـاری نـاوخۆی بـە دەسـتتێوەردانێك سەروەرییەکەی پێشێل بکات و بەرهەڵستی بکات لەگەڵ یاسا و عورفی نێودەوڵەتیـدا، رێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان ئەو حوکمانەیان رێکخستووە، لەوانە هەندێکیان رێکەوتنی تایبەتن بە مـافی دەوڵـەتان و ئەرکـە ئاڵۆزەکانیـان لـە ١٩٣٣/١٢/٢٦دا کـە لـە مـادەی یەکەمیدا بەدەق دەڵێت:

(بۆ ئەوەی دەوڵەت بە کەسێکی مەعنەوی لە کەسەکان لـە یاسـای نێودەوڵەتیـدا دابنرێت پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا فەراهەم بێت:

١-گەلێکی هەمیشەیی.

٢-هەرێمێکی دیاریکراو.

٣-حکومەت(دەسەڵاتێکی سیاسی)

٤-شایستەی چوونە ناو پەیوەندییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی تر).

## هەرێمەکانی دەوڵەت:

بۆ هەر دەوڵەتێك دوو هەرێم هەیە: وشکانی و ئاسمانی، بەڵام بۆ هەندێکیان سـێ هـەرێم هەیـە سـێیەمیان بریتییـە لـە دەریـایی گـەر بـە دەریـاوە لکابێـت، وەك لـەم رۆشنکردنەوەیەدا:

### یەکەم- هەرێمی وشکانی(تۆخمی وشکانی):

بریتییە لەو بەشەی وشکانی لە زەوی کە سنووری دەوڵەتەکە لە ئامێزی دەگرێت و ئەوەی لەژێریدایە لە کانزا و ناکانزا و ئـەوەی دەکەوێتـە سـەریەوە لـە دەریاچـە و

رووبـار و دەشـت و دۆڵ و چـیا و گـرد و تـەپ و شـتانی تـریش لـە بێگیانـەکان و بوونەوەرە زیندووەکان.

سنووری ئـەم هەرێمانـە بریتییـە لـە مەشـخەڵە سروشـتییەکان لـە چـیاکان یـان دەشـتەکان یـان رووبـارە نێودەوڵەتییـەکان یـان دەریاکـان، ئـەم هەرێمانـە بـەپێی رێکەوتنەکان و پەیماننامەکان و عورفـە نێودەوڵەتییـەکان و شـایەتە مێژوویـیـەکان و هاوشێوەکانی ئەمانە دیاریدەکرێن و مەشخەڵی جوغرافیان بۆ بەکاردەهێنرێت، ئەوانە بریتین لە کۆمەڵێك رووداوی سروشتی کە بە هۆیەکانی پابەندبوونە نێودەوڵەتییـەکان دەژمێررێن، بەجۆرێك دەوڵەتانی جیران و دوور و هاوڵاتییەکانیان پابەند دەکات لـەو سنوورە دیاریکراوانە نەپەڕنەوە مەگەر بەپێی رێنموونییە دەوڵـەتی و ناوخۆییـەکان، لەوانە رازیبوونی دەوڵەتە خاوەن سەروەرییەکە لەسەر هەرێمەکان، هـەر بـەو جـۆرە هاوڵاتیانی هەر دەوڵەتێك پابەند دەکات بە قاچاخی نەکردن لـە نـاوەوە بـۆ دەرەوە یان بە پێچەوانەوە، هەروەها هـەموو دەوڵـەتێك پابەنـد دەکـەن بـە خۆگرتنـەوە لـە دەستدرێژیکردنی مادیانە بە خستنەسەری بەشێك لە هەرێمی دەوڵەتێکی جیران بـۆ سەر هەرێمەکانی خۆی یان بەکارهێنانی بەشێك لە هەرێمەکان بۆ دەستدرێژی کردنە سەر بەرژەوەندی دەوڵەتانی تر.

هەموو رووبارەکان و دەریاچەکان و کەناڵە ئاوییەکان کـە لـە نـاوەوەی سـنووری هەرێمی یەك دەوڵەتدا دەبینرێنەوە فیقهی نێودەوڵەتی زاراوەی"ئاوی نیشتمانی یـان ئاوی ناوەکی بۆ بەکاردەهێنێت"، دروست نییە هیچ لایەك دەریاوانییان تێدا ئـەنجام بدات یان سـوود لـە سـامانە ئاوییەکەی(گیانداران و کانزاکـان) وەربگرێـت جگـە لـە هاوڵاتیانی ئەو دەوڵەتە خاوەن سەروەرییە بەسـەر هەرێمەکانـدا گـەر ئـەو کـارە بـە رازیبوونی پێشتری ئەو دەوڵەتە نەبووبێت.

لەگەڵ ئەوەش بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکان و گرنگیدان بـە ئاسـانکاری کـاری دەریـاوانی نێودەوڵـەتی پـاڵی نـاوە بـە هەڵکەنـدنی چـەندین نۆکەنـد لـەناو هەرێمـە وشکانییەکاندا، وەك نۆکەندی سوێس لە هەرێمەکانی میسردا بـۆ گەیانـدنی دەریـای

سپی ناوەڕاست بە دەریای سوور، دەریاوانی لەم تۆکەندەدا بەپێی ڕێکەتننامەی قوستەنتەنیە لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٨ ڕێکخراوە و دواتر گۆڕانکاری بەسەرداهێنراوە و مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان لە بەکارهێنانی ئەو تۆکەندانەدا دیاریکراوە.

هەروەها وەك تۆکەندی پەنەما کە دوو زەریای ئەتڵەسی و هادی پێکەوە دە بەستێتەوە لە ڕێگەی هەرێمی کۆماری پەنەماوە کە یەکێکە لە کۆمارەکانی ئەمریکای ناوەند، لە شاری پەنەماوە بۆ شاری کۆڵۆن، دەریاوانی تێدا ڕێکخراوە و مافەکان و ئەرکە نێودەوڵەتییەکان تایبەت بە بەکارهێنانی ئەم کەناڵە دیاریکراون.

هەر بەو جۆرە تۆکەندی کەیل کە دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی هەستاوە بە هەڵکەندنی ساڵی ١٨٩٦ بۆ ئەوەی دەریای بەڵتیق و دەریای باکوور پێکەوە ببەستێتەوە بۆ مەرامێکی جەنگی، پاشان سوودبینین لێی گشتگیر کرا لەڕووی نێودەوڵەتییەوە بەپێی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان.

بەڵگەنەویستە ئەم تۆکەندانە و هاوشێوەکانیان لە ڕووداوە سروشتییەکانن دوای داهێنانیان لەڕووی شوێنی جوغرافییانەوە، ئەم ڕووداوە سروشتیانەش هۆن بۆ مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان وەك باسمان کرد.

**دووەم -هەرێمی دەریایی(یان دەریای هەرێمی):**

ئەمەش بەشێکە لە هەرێمی وشکانی دەوڵەتەکە، بەڵام ئاو دایپۆشیوە و دەکەوێتە ژێر سەروەری دەوڵەتەکەوە و کاروباری هەروەك کاروباری هەرێمی وشکانی وایە، هەر دەوڵەتێك -لەسەر دەریای هەرێمی خۆی و لە بن ئەو دەریایەدا- مافی خۆیەتی هەموو مافەکان دەستەبەر بکات کە لە سەروەری و دەسەڵاتیەوە سەرچاوە وەردەگرن، بۆی هەیە مافی ڕاوکردن لە سنووری دەریای هەرێمیدا تەنها بۆ هاوڵاتیانی خۆی کورتبکاتەوە، هەر بەو جۆرە هەر بەکارهێنانێکی ئابوورییانە بۆ بنی دەریاکەی و ئەو چینانەی لەژێر دەریاکەدا بوونیان هەیە، لەگەڵ ئەوەش سەروەری دەوڵەت لەسەر هەرێمە دەریایەکانی ڕەها نییە وەك چۆن لەسەر هەرێمە وشکانییەکە هەیەتی،

بەڵکو هەندێ کۆتوبەندی بەسەردا دێت کە لە تێڕوانینە سروشتی و جوغرافی و سیاسییەکانەوە سەریانهەڵداوە، ئەو تێڕوانینانەی عورفی دەوڵەتان بڕیاریان لەسەری داوە و دەوڵەتانی تر بەدوایدا قبووڵیان کردووە و وەك یاسای دەوڵەتانی لێهاتووە، لەو کۆتوبەندانە مافی گوزەرکردنی بێمەرامانەیە، واتە بۆ ئەو کەشتیانەی سەر بە دەوڵەتانی ترن، سەرباری مافی دەوڵەتانی کەنار دەریانشین لە گوزەرکردنی دەریای هەرێمی گەر گوزەرکردنەکەی مەرامی خراپی لە پشتەوە نەبوو و سوکایەتی بە دەوڵەتە کەنار دەریانشینەکان نەدەگەیاند، بەڵکو ئەو کارە بەپێی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بڕیاری لەسەردراوە، لەوانە(١/١٤ ) لە ڕێکەوتننامەی جنێف لە ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٥٨ کە دەقەکەی دەڵێت: (ئەو کەشتیانەی سەر بە دەوڵەتانی کەنار دەریانشین و ناکەنار دەریانشینن بۆیان هەیە بە گوزەرکردنی بێمەرامانە لە دەریای هەرێمیدا تێپەڕن لە سنووری حوکمەکانی ئەم مادانەدا(مادەکانی ڕێکەوتنەکە) هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ناوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتنە ڕێکەوتوون لەو سۆنگەیەوە کە دانپیادانەری مافێکە نەك دروستکەر بۆی)

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە پێوەرێکی بابەتیانەی جێگیر بوونی نییە بۆ دیاریکردنی مەودای هەرێمی دەریایی، و بە چەندین پێوەری لەیەکتر جیاواز دیاریکراوە لەوانە پێوەری سێ میل و شەش میل و دوازدە میلی دەریایی یان دوورترین دووری تۆپی قەراغ دەریا بیگاتێ یان پێوەرگەلێکی تر کە بەپێی گۆڕانی دەوڵەتان و ناوچە جوغرافییەکانی و فاکتەرە سیاسی و ئابووری و مێژووییەکانی گۆڕانی بەسەردا دێت[1].

### سێیەم - هەرێمی ئاسمانی:

بریتییە لە هەوا و ئاسمان، دەکەوێتە سەر دوو بەشە وشکانی و ئاویەکەوە کە دەچێتە ژێر سەروەری ئەو دەوڵەتەوە، ئەم هەرێمە لقێکە لەو سەروەرییەی بۆ

---

[1] المرجع السابق، ص٦٣١ وما يليها.

دەوڵەتەكە جێگیركراوە بەسەر دوو هەرێمەكەی تریدا وشكانی و دەریایی، هەركات هەرێمی وشكانی یان ئاوی بوونی هەبێت هەرێمی ئاسمانی بوونی هەیە، وەك چۆن سەروەری دەوڵەت بەسەر ئەوەی لەژێریدایە تا ناكۆتا قووڵبوونەوە هەر بەو جۆرە ئەوەی پەیوەستە بەوەی لەسەر رووی هەرێمەكە دەبینرێتەوە لە چینەكانی هەوا و ئاسمان تا ناكۆتا بەرزایی.

ئەم رەگەزە جێگەی گرنگیپێدان و بایەخپێدانی دەوڵەتان نەبوو تا سەدەی بیستەم، دوای ئەوەی جیهانی تەكنەلۆژیا پەرەی سەند لە بواری فڕین و گواستنەوەی ئاسمانیدا.

رووداوی سروشتی ئاسمانی بووە بە هۆی پابەندبوونە نێودەوڵەتییەكان بە خۆگرتنەوەیان لە بڕینی هەرێمی ئاسمانی دەوڵەتێك مەگەر بە مۆڵەتی ئەو دەوڵەتە خاوەن سەروەرییە لەسەر ئاسمانەكەی و بەپێی رێكەوتنە نێودەوڵەتییەكان، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونانە بریتین لە یاسای نێودەوڵەتی.

بەڵام سەروەری دەوڵەتان بەسەر هەرێمی ئاسمانیدا وەك هەرێمی دەریایی رەها نییە بەپێی رێكەوتنە نێودەوڵەتییەكان كە سەرپەرشتی دیاریكردنی مافەكان و پابەندبوونەكان لە بواری گواستنەوە و گەیاندنی ئاسماندا دەكات، لەوانە رێكەوتنامەی پاریس لە ١٣ی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩١٩، ئەم بنەمایانە لەخۆ دەگرێت:

١-بۆ هەر دەوڵەتێك سەروەری تەولو و تاكلایەنە هەیە بەسەر چینەكانی هەوا كە دەكەوێتە سەرو دوو هەرێمە وشكانی و دەریاییەكەوە تا ناكۆتا لە بەرزی.

٢-دەوڵەتە گرێبەستكارەكان پابەند دەبن بەو رێكەوتننامەوە و لە كاتی ئاشتیدا مافی گوزەركردنی بێمەرامیان پێدەبەخشێت لە هەرێمە هەواییەكانیاندا بۆ ئەو فڕۆكانەی سەر بە دەوڵەتە گرێبەستكارەكانن.

٣-دەوڵەتان هەموو لایەك پابەند دەكەن بە خۆگرتنەوە لە جیاكاری مامەڵەی تایبەت بۆ ئەو فڕۆكانەی سەر بە هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەستكارەكانە بەهۆی جیاوازیان لە رەگەزنامەدا.

٤-بۆ هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەستكارەكان مافی ئەوە هەیە پارێزگاری لە فڕۆكەوانی ئاسمانی ناوەكی خۆی بكات تەنها بۆ هاوڵاتیانی.

٥-هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەستكارەكان پابەند دەبێت بەوەی مافی فڕۆكەوانی ئاسمانی بێمەرام بە هەر دەوڵەتێكی تر ببەخشێت كە لایەك نییە لە رێكەوتنەكەدا و لە داهاتووشدا ناچێتە ناویانەوە.

دەستەیەكی نێودەوڵەتی هەمیشەیی بۆ سەرپەرشتی كاروباری فڕینی مەدەنی دروست دەكرێت[1].

## رووداوی رووبارە ناوەكییە هاوبەشەكان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەكان:

بە هۆی بەرتەسكی بوارەوە بۆ لێكۆڵینەوەی بابەتی ئەم دلوایەی دوایی بە رێگەیەكی دووروودرێژ تەنها باس لە گرفتی رووباری فورات و ئەو پابەندبوونە نێودەوڵەتییانە دەكەین بە هەرێمەكانیاندا گوزەر دەكات، ئێستا رووباری فورات بووە بە یەكێك لە گرفتە هەنووكەییەكان، دەرئەنجامی نەرێیی هەیە لەسەر سەرئەنجامی كشتوكاڵ و تەندروستی عێراقییەكان لە ئێستا و لە داهاتوودا.

رووباری فورات لە چیاكانی توركیاوە هەڵدەقوڵێت لەویو چیای "تۆرۆز"ەوە و بە زەوییەكانی توركیادا بە درێژایی (٤٢٠كم) تێدەپەڕێ و پاشان لە "تەرابلس"دا دەچێتە ناو هەرێمی سوریاوە، لەوێش (٦٨٠كم) بە خاكی سوریادا تێدەپەڕێت و پاشان لە "البوكمال" دەچێتە ناو هەرێمی عێراقەوە و نزیكەی (١٢٠٠كم) بە خاكی عێراقیدا گوزەر دەكات و پاشان دەڕژێتە ناو "شط العرب"ەوە كە ئەویش دەڕژێتە ناو دەریای كەنداوەوە.

پەیماننامەی دۆستانە و رێكەوتننامە بەستراوەكانی پێشوو لە نێوان عێراق و توركیادا چەندین بەندی دیاریكردووە بۆ رێكخستنی سوودبینین لە ئاوی رووباری

[1] المرجع السابق، ص٤٣ وما يليها.

فورات لە نێوان دوو دەوڵەتی توركیا و عێراقدا، پاشان ڕێكەوتننامە و لێكۆڵینەوەی جۆراو جۆر لە نێوان توركیا و سوریادا ئەنجام دراوە دەربارەی مافی سوودبینین لە ئاوی ڕووباری فورات، پاشان لە نێوان عێراق و سوریادا، شایانی باسە ئەو ڕێكەوتننامانە بە جیاوازییەكان و تەنگەژە سیاسییەكانی نێوان دوو دەوڵەت كاریگەر بوون.

شوێنی جوغرافی ڕووباری فورات ڕووداوێكی سروشتییە و هۆی پابەندبوونی ئەو دەوڵەتانەیە بە هەرێمەكانیدا تێدەپەڕێت، ئەم پابەندبوونانە بە ڕێكەوتننامەكان ڕێكخراون، بەڵام فیقه جیاوازی تێدایە لە دیاریكردنی بنچینەی ئەم پابەندبوونانەی دەوڵەتان كە ڕووبارە هاوبەشەكان بە هەرێمەكانیاندا گوزەر دەكەن، دەتوانین ئەم جیاوازییە بۆ سێ بیردۆزە بگێڕینەوە كە ئەمانەن:

**یەكەم-بیردۆزەی سەروەری هەرێمی ڕەها:**

پوختەكەی ئەوەیە بۆ هەر دەوڵەتێك مافی تەواوی هەیە سوود لەو بەشە ڕووبارە نێودەوڵەتییە ببینێت كە بە هەرێمەكەیدا گوزەر دەكات، هەموو مافەكان دەستەبەر بكات كە لە سەروەری ڕەهاوە بەسەر هەرێمەكەیدا سەرچاوە وەردەگرن بەبێ مەرج و كۆتوبەند، بەپێی ئەم سەروەرییە ڕەهایە بۆ هەر دەوڵەتێك هەیە پرۆژەی بەسوود بۆ وڵاتەكەی دروست بكات لە بەشێك لەو ڕوبارەی دەكەوێتە ناو سنوورەكەیەوە، وەك چۆن مافی گۆڕینی مەجرای ڕووبارەكەی هەیە هەمووی یان بەشێكی لەناو سنوورەكەیدا.

**ڕاستكردنەوەی بیردۆزەكە:**

ئەم بیردۆزەیە ڕەدكراوەیە لەڕووی مەنتقەوە ئەمەش بە چەندین هۆ دەگەڕێتەوە، لەوانە:

١-پێچەوانەیە لەگەڵ دادپەروەری كە ڕۆحی یاساكانە.

٢-پێچەوانەیە لەگەڵ واقیعی جوغرافی ڕووباری هاوبەش، بەجۆرێك بۆ هیچ هاوبەشێك نییە هەڵسوكەوت بكات تیایدا مەگەر بە ڕازیبوونی هاوبەشەكانی تر.

٣-پێچەوانەیە لەگەڵ پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشی شەشەم تایبەت بــە ناکۆکییــەکان بــە چارەســەری ئاشــتیانە بــەپێی ئــەوەی هــاتووە لــە مادەکانی(٣٣-٣٥).

٤-تێکەڵییەکی تێدایە لە نێوان توخمی زەمینی نەگۆڕ لە هەرێمەکان وەك چیاکان و دەشتەکان و گردەکان و هاوشێوەکانیان لەگەڵ توخمی جوڵاوی گوازراوە لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر(ئاو) بۆ خستنەژێر یەك حوکم لەگەڵ جیاوازیـان لە سروشتدا.

٥-ئەم بیردۆزەیە ژێری تەندروست و مەنتقی یاسا رەدی دەکەنەوە، چونکە هیچ بایــەخێك بــە مــافی دەوڵــەتانی تــر نــادات کــە هاوبەشــن لــە ئــاوی رووبــاری نێودەوڵەتیدا.

٦-ئەم بیردۆزەیە رەچاوی ئەو بنەما گشتییە لە یاسـای نێودەوڵـەتی ناکـات کـە زیانگەیانــدن بــە مافــەکانی دەوڵــەتانی تــر قەدەغــە دەکـات، بــەجۆرێك بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی لەسەر ئەو دەوڵەتــەی کەمتەرخــەمی کـردووە بـە پابەندبوونەکانی لە رێگەی کارە نارەواکانیەوە سەرهەڵدەدات.

**دووەم -بیردۆزەی موڵکداری هاوبەش:**

ناوەرۆکەکەی ئەوەیە بنچینەی رووبار بەتەواوی لە سەرچاوەوە بۆ رژانــە دەریـا موڵکێکی هاوبەشە لە نێوان هەموو دەوڵەتاندا کە رووبارەکە بە هەرێمەکانیاندا گوزەر دەکات، بەجۆرێك مافــەکانیان و ئەرکــەکانیان یەکسـان و تــەواوکاری یــەکترن، بۆیــە یەکێکیان بەبێ رازیبوونی دەوڵەتەکانی تـر ناتوانێـت پـرۆژەی سـوودبینین لـە ئـاوی رووبارەکە لەسەر ئەو بەشەی بە هەرێمەکەیدا جاری دەبێت راست بکاتەوە، گەر ئەو سوودبینینە سەریکێشێت بۆ سەرهەڵدانی زیان بە هەرێمەکانی تر.

تێبینی دەکرێت ئەم بیردۆزەیە سەرەڕای خاڵــە باشــەکانی لــە هەنـدێ لایەنــەوە، بەڵام لە فیقهدا سەرخەری زۆری نییــە، وەك چــۆن دەوڵــەتان لەســەر بنچینەی ئــەم بیردۆزەیە ناچن بەرێوە بەتایبــەت لــەم ســەردەمەدا کــە بەرژەوەنـدی دەوڵــەتان بــە

یەکتردا دەکێشن و ئەمەش ولیکردووە سوودبینین لە ئاوی نێودەوڵەتی هاوبەش لەسەر بنچینەی موڵکداری هاوبەش ئەگەرێکی دوور بێت.

**بیردۆزەی یەکەی هەرێمی رەها:**

گوزارەکەی ئەوەیە رووبار لە سەرچاوەکەیەوە تا دەرژێتە دەریا یەك یەکەی هەرێمییە و سنوورە سیاسییەکان کارناکەنە سەر ئەم یەکەیە و گرێکانی هەڵناوەشێننەوە، هیچ دەوڵەتێك لەسەر ئەو بەشە رووبارەی بە هەرێمەکەیدا گوزەر دەکات ناتوانێت خاوەنی سەروەری رەها بێت، بەڵکو سەروەرییەکەی لەسەر ئەو بەشە رەها نییە، بەڵکو سنووردارە بە پێویستبوونی دەستنەبردن بۆ مەجرای سروشتی رووبارەکە بە ویستی یەکلایەنەی خۆی، بۆیە مافی ئەوەی نییە بەنداو و پرۆژەی کشتوکاڵی دروست بکات یان مەجرای رووبارەکە بگۆڕێت هەمووی یان بەشێکی مەگەر بە رازیبوونی لایەنەکانی تر[1]

پێمان وایە بنچینە بریتییە لە بەرژەوەندی هاوبەش بەجۆرێك مەودای ئەو هاوبەشبوونە بە پەیماننامەکان یان رێکەوتننامەکان یاخود پەیماننامەی نێودەوڵەتی تر دیاری بکرێت.

## سەرچاوەی مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان:

سەرچاوەی مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان کە هۆیەکانیان رووداوە سروشتییەکانە بریتییە لە یاسای نێودەوڵەتی، میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەشی شەشەم(مادەی ٣٣-٣٥) تایبەت بە چارەسەری ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان چارەسەری کردووە بە چارەسەرێکی ئاشتیانە، لایەنە ناکۆکەکان کە لە باریاندا هەیە پارێزگاری لە ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی رووبەرووی مەترسی بکەنەوە بانگ

---

[1] المرجع السابق، ص٥٣٦ وما يليها.

دەکات بۆ جێبەجێ کردنی هەڵبژاردەیی پابەندبوونەکانیان کە جێگەی جیاوازی و ناکۆکییە لە ڕێگەی دانوستان و حەکەمدانان و میانەگیری و چارەسەری قەزلییانەوە.

گەر چارەسەری ئاشتیانە مەرامی لە جێبەجێکردنی هەڵبژاردەیی پابەندبوونەکان -کە جێگەی ناکۆکییە- دەستەبەر نەکرد، ئەوا لەباری هەڕەشە لەسەر ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بە ترسی ئەو لایەنانەی کەمتەرخەمی لە پابەندبوونەکانیان دەکەن لە ڕێگەی دەستدرێژکاری و کارە ناڕەواکانەوە میساقەکە -لە بەشی حەوتەم تایبەت بە ڕێکارەکان و کارە پێویستەکان- بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی ڕێوشوێنی پێویست بۆ بەرپەرچدانەوە و گێڕانەوەی کاروبارەکان بۆ جێگەی خۆیان، وەك لە مادەکانی(٣٩-٥١)دا هاتووە بۆ ناچارکردنی ئەو دەوڵەتانەی کەمتەرخەمن بە پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکانیان بۆ جێبەجێ کردنیان بەزۆر و ناچارکردن.

# دەرئەنجامەكان

لەم دانراوەمانەوە(كتێبەكە) ئەم ڕێنیشاندەری و دەرئەنجامانە هەڵدەگۆزین، بەم جۆرە:

١.لە هەڵە باوەكانە پێناسەی "الإلتزام-پابەندبوون" بكرێت بەوەی بریتییە لە پەیوەستبوونێكی یاسایی(رابطة قانونیة) یان پەیوەندییەكی یاسایی(علاقة قانونیة) یان بارێكی یاسایی(حالة قانونیة) یان هاوشێوەكانیان لە نێوان دوو كەسدا(قەرزدەر و قەرزدار) بەپێی ئەوە یەكێكیان(قەرزدەر) لەویتریان(قەرزدار) داوا دەكات هەستێت بە كارێك یان خۆبگرێتەوە لە كارێك، چونكە "الرابطة" یان "العلاقة" لە گوتەی "الإضافة-خستنەسەر"ە یان سیفەتی هاوبەشە لە نێوان دوو كەس و زیاتر لە دوو كەسدا، "الإلتزام"یش لە گوتەی "الإنفعال-كارلێككردن"ە و سیفەتێكی تایبەتە بە كەسی پابەندبوو، بۆیە دروست نییە سیفەتی یەكلایەنە بە سیفەتی هاوبەش لێكدانەوەی بۆ بكرێت، پێناسەكەی بە "حالة قانونیة-بارێكی یاسایی" پێناسەیەكی ناڕوونە و لە پێناسەكەردا بەمەرج دەگیرێت ڕۆشنتر و ڕوونتر بێت لە پێناسەكراوەكە، سەرباری ئەوەی "حالة قانونیة-بارێكی یاسایی" لە گوتەی "چۆن"ە و جیایە لە گوتەی "الإنفعال-كارلێككردن"

٢-ئەو قسەیەی "مافی تاكەكەسی و پابەندبوون بە خود یەككگرتوون و بە پێگە جیاوازن"، مافی تاكەكەسی بریتییە لە خودی پابەندبوون گەر لەڕووی

قــەرزدەرەوە تەماشــای بکــەی نــاوی "مــاف"ی لــێ دەنرێــت، گــەر لــەڕووی قــەرزارەوە تەماشــای بکــەی پێــی دەوترێــت "پابەنــدبوون"، ئــەم قســەیە بەرهەڵســتی دەکــات لەگــەڵ واقیعــی راســتەقینەی ئــەم دوو زاراوە گــۆڕاوە لــە چــییەتی و راســتەقینەیاندا، یــەکێکیان ئەرێیــە و ئــەویتریان ئــەرێیی، بۆیــە پابەندبوون توخمێکی ئەرێیە لە توخمەکانی ئەستۆگری داراییانە، وەك زانایانی یاسا دەڵێن، گەر لەسەر توخمە ئەرێییەکەی تر(مافی تاکەکەسی) زیـادبوو ئـەوا ئەستۆگری قەرزدار دەبێت و بەپێچەوانەوە پێچەوانە دەبێت، گـەر بـە خـود یەکگرتووبن ئەی بۆ ئەم گۆڕانە لە ئەستۆگری داراییانـەدا روودەدات، سـەرباری ئەوە مافی تاکەکەسی بابـەتی پابەندبوونـە، نـەك خـودی پابەنـدبوون، پاشـان پابەنــدبوون ســیفەتی قــەرزدارە و مــافی تاکەکەســی ســیفەتی قــەرزدەرە، لەبەرئــەوەی دوو وەســفکراوی گــۆڕاون، ئــەوا گــۆڕانی سیفەتەکانیشــیان لــە دەروازەی لەپێشترن.

٣-پێناســەی ئەســتۆگری داراییانــە بــەوەی بریتییــە لــە "کــۆی ئــەوەی بــۆ مــرۆڤ بڕیاردراوە لە مافەکان و ئەوەی لەسەریەتی لە ئەرکەکان یان بریتییە لە دەفری ئــەو مــاف و ئەرکانــە"، پێناســەیەکی هەڵەیــە چــونکە دەستبەســەرداگرتنی داواکراوی تێدایە وەك لە جێگەی خۆی باسمـان کـرد، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی بــوونی مافــەکان و پابەندبوونــەکان لەســەر بــوونی ئەســتۆگری داراییانــە رادەوەستێت، هەر بەو جۆرە پێچەوانەکەشی، سەرباری ئەوەی ئەم پێناسـەیە تێکەڵییەکی تێدایە لە نێوان ئەستۆگری داراییانە و لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ گەر مەبەست بە "لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ" کۆی ئەو ماف و پابەندبوونانە بێت بۆ مرۆڤ بڕیاردراوە لە ئێستا یان لە داهاتوودا، ئەمەش هەمان ئەو پێناسەی "لێوەشاوەیی پێویستی کامڵ"ە کە دەڵێـت بریتییـە لـە دەسـەڵاتی مـرۆڤ بـۆ ئەوەی مافی هەبێت و پابەندبوونی لەسەربێت.

٤-تێکەڵی لەناو یاساکان و شرۆڤەکانیاندا، جارێك لەنێوان جێگەی پابەندبوون و بابەتی پابەندبووندا و جارێکی تر لەنێوان جێگەی پابەندبوون و جێگەی گرێبەستدا، بۆ زانیاریت پابەندکردن و پابەندبوون لە حوکمە دلواکراوییەکان، ئەوەی لە شەریعەت و یاسادا کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە حوکمی دلواکراویی پەیوەست نییە بە خودی شتەکانەوە، بەڵکو پەیوەستە بە هەڵسوکەوتی مرۆڤەوە لە ئەنجامدانی کار یان خۆگرتنەوە لە کار.

٥-بوونی تێکەڵی لە یاساکان و شرۆڤەکانیان لەنێوان تایبەتمەندییەکانی پابەندبوون و توخمەکانی پابەندبوون، وەك لەبەرچاوگرتنی قەرزدار و بەرپرسیارێتی لە توخمەکانی پابەندبوون[1] لەگەڵ ئەوەی ئەو دوانە لە تایبەتمەندییەکان و سیفەتە لابەلاکانی خودی پابەندبوونن، چونکە توخمەکانی شتێك لە بووندا پێشی شتەکە دەکەون، بەلاّم تایبەتمەندییەکان و سیفەتە لابەلاکانی شوێنی بوونی شتەکە دەکەون، ئیتر چۆن دەبێت تایبەتمەندییەکان بە توخمەکان ناوببرێن.

بوونی تێکەڵی لەناو یاساکان و شرۆڤەکانیاندا، و لەنێوان هۆیەکانی پابەندبوون و سەرچاوەی پابەندبووندا، بۆ زانستت پابەندکردن و پابەندبوون لە حوکمە دلواکراوییەکانن لە خاوەن شەرعەوە لە پابەندبوونە شەرعییەکاندا، و یاسادانەر لە پابەندبوونە یاساییەکاندا، ئاساری هەڵسوکەوتی شەرعی یان یاسایی لەسەر هەڵسوکەوت یان ڕووداو سەرهەڵدەدات بە ویستی خاوەن شەرع یان یاسادانەر، ویستی مرۆڤ ڕۆڵێکی نییە لەم سەرهەڵدانەدا دوای دەستبردن بۆ هۆیەکە یان ڕوودانی ڕووداوەکە، لە نێوان شەریعەت و یاسادا جیاوازییەك بوونی نییە لە

[1] النظرية العامة للإلتزام وفقاً للقانون الكويتي (دراسة مقارنة) للدكتور عبدالحي حجازي مصادر الإلتزام ٩٨/١ وما بعدها. بۆیە "حجازي" و کەسانی تریش قەرزداری و بەرپرسیارێتیان بە توخمی پابەندبوون دلناوە.

بابەتی سەرهەڵدانی ئاسار، بۆیە ئاماژە دەکەم بەوەی "الشاطبي"[1] لەسەر ئەم بابەتە وتویەتی: (ئەو کەسەی دەست بۆ هۆ دەبات گەر بە کەماڵی مەرجەکانی و نەبوونی ڕێگرەکانییەوە پێی هەستا و پاشان ویستی ئەنجامەکە ڕوونەدات ئەوە مەبەستێکی نەگونجاوی گرتۆتەبەر و ویستوویەتی شتێك هەڵبگرێت(لابدات) کە هەلگرتنی بۆ نییە و ڕێگری لە شتێك بکات ڕێگری بۆ نییە، هەر کەس گرێبەستێکی هاوسەرگیری بەست یان فرۆشتنێکی کرد یان جۆرێك لە گرێبەستی ئەنجامدا پاشان مەبەستی بوو ئەوەی گرێبەستی بۆکراوە موباح نەکرێت بەو گرێبەستە ئەوا مەرامەکەی بێبنەمایە و ئەنجامەکە کە هۆیەکەی ڕوویداوە ڕوودەدات، هەر بەو جۆرە گەر تەلاقێکی خست یان گرێبەستێکی بەست و مەبەستی پێی داواکراوی ئەوانە بێت لە شەرعدا پاشان بە مەرامی گرت داواکراوی ئەوە نەبێت شەرع داوای دەکات ئەوا ئەو کەسە مەرامێکی پووچی هەبووە، لێرەوەیە حەرامکردنی ئەوەی خودا حەلاڵی کردووە کارێکی پووچ و بێبنەمایە، چونکە ئەوەی خودا بڕیاری حەلاڵبوونی داوە بەبێ هۆیەك لە داوالێکراوەوە ڕۆشنە، هەروەك چۆن مرۆڤ تیایدا دەست بۆ هۆیەکەی دەبات، هەروەها خاوەن شەرع مەبەستییەتی ئەنجامەکان لە هۆیەکانەوە سەرهەڵبدەن وەك پێشتر باسمان کرد، بۆیە نەرێکەری مەرامی ئەو خاوەن مەرامە دژ بە مەرامی خاوەن شەرعە، هەموو مەرامێك دژ بە مەرامی خاوەن شەرع پووچەڵە، بۆیە ئەو مەرامە پووچەڵە).

٧. بوونی تێکەڵی لە شرۆڤەکردنی یاساکاندا لەنێوان توخمەکانی پابەندبوون و توخمەکانی گرێبەستدا، توخمەکانی پابەندبوونی بە سیان داناوە کە بریتین لە: جێگەی پابەندبوون و هۆ و ڕازیبوون، ئەمانەش هەمان توخمەکانی گرێبەستن، لە کاتێکدا توخمەکانی پابەندبوون شەشن کە بریتین لە: "پابەنکراو، و

[1] الموافقات للشاطبي (أبي اسحاق بن موسى اللخمي الغرناطي المالكي-ت٧٩٠ ١/٢١٤-٢١٥) المسئلة التاسعة.

پابەندبوو، و بۆپابەندبوو، و تیاپابەندبوو، و پێپابەندبوو، و هۆی پابەندبوون"، هەڵەیە رازیبوون بە توخمێك لە توخمەکانی پابەندبوون دابنرێت، چونکە رازیبوون لە مەرجەکانی پابەندبوونە بەویستەکانە، پابەندبوونە نەویستەکانیش سەرەرای ویستی مرۆڤ دێنەدی، یەکسانە ویست هەبوو یان نەبوو بێت، وەك لە پابەندبوونەکانی کەسی نالێوەشاوە، گەر رازیبوون توخمێك بوایە لە پابەندبوون، ئەوا پابەندبوون بەبێ ئەو نەدەهاتە دی، لە کاتێکدا زۆربەی پابەندبوونەکان شەرع یان یاسا دەیان سەپێنن هاوتا نیین لەگەڵ رازیبوونی دواڵێکراو پێیان ئەگەر مرۆڤەکە بدرایەتە دەست سروشتی خۆی.

٨.زانا موسڵمانەکان بەر لە یاسا هەموو جۆرەکانی هۆیان پێناسە کردووە، بەلام لەژێر یەك بیردۆزەدا کۆیان نەکردۆتەوە، وەك زانایانی یاسا ئەنجامیان داوە، بەڵکو بۆ هەریەکێك لەو هۆیانە بیردۆزەیەکی سەربەخۆیان تایبەت کردووە کە توخم و حوکمی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەوەی لە یاسادا بە هۆی سەرپێهەڵدەر(دروستکەر) ناونراوە زانایانی ئوسوڵ بەدرێژی و بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە حوکمە دانراوەکاندا چارەسەریان کردووە، فەقیهە موسڵمانەکان "هۆی بەمەرام"یان تاوتوێ کردووە لە مامەڵە دارایییەکاندا لەوەی پەیوەستە بە گرێبەست لەسەرکراو، ئەوەش بریتییە لە هەریەك لە دوو بریتیدانەکە لە گرێبەستەکانی بریتیداندا، بە پێچەوانەی ئەوەی یاسا لەسەریەتی بە دیاریکردنی جێگەی گرێبەستەکە بە یەکێك لە دوو بریتییەکە بەزۆری بەبێ ئەویتریان، هەر بەو جۆرە بەدرێژی لێکۆڵینەوەیان لەسەر هاندەری پاڵنەری ناڕەوا کردووە لەژێر ناونیشانی "سد الذرائع"دا و بۆچوونی زانا موسڵمانەکانیان رۆشن کردۆتەوە لە رادەی کاریگەری ئەو هاندەرە پاڵنەرە ناڕەوایە لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ، نەك تەنها لە مامەڵەکاندا، بەڵکو لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤدا.

٩-وەسفکردنی "هۆی سەرپێهەڵدەر" یان هۆی سەرهەڵدەر لە شرۆڤەی یاسادا لەسەر مەجاز بیناکراوە، چونکە دروستکەر(سەرپێهەڵدەر)ی پابەندبوون لە

پابەندبوونە شەرعییەکاندا بریتییە لە خاوەن شەرع، و یاسادانەر لە پابەندبوونە یاساییەکاندا، بۆیە هۆ سەرپێهەڵدەر نییە، بەڵکو سەرپێهەڵدراوە.

١٠.فیقهی ئیسلامی لە یاسای دانراو جیادەبێتەوە لە هەموو ئەوانەی پەیوەستە بە پابەندبوونەوە لە دیاریکردنی چییەتی پابەندبوون و توخمەکانی و سەرچاوەکانی و حوکمەکانی، چونکە لەم بابەتانەدا بە گەشە و گۆڕاندا تێنەپەڕیوە، بە پێچەوانەی ئەوەی یاسا لەسەریەتی لە گەشە و گۆڕانکاری یەك لەدوای یەك کە لە مێژووی یاسادا روویداوە تایبەت بەو کاروبارانە، بەردەوام ئەو گۆڕانکاریانە لە یاسادا بۆ چارەسەری ئەوەی پەیوەستە بە پابەندبوونەوە دواکەوتوون، وەك دیاریکردنی سەرچاوەکانی و توخمەکانی لەڕووی ژمارە و سروشتەوە.

١١.بوونی تێکەڵییەکی رۆشن لە یاسا و فیقهی یاسا و شرۆڤەکانی لە نێوان هۆی پابەندبوون و هۆی گرێبەست(یان هەڵسوکەوتی بەویستی گشتگیر بۆ گرێبەست و ویستی تاکلایەنە) بەجۆرێك ئەوەی هۆی پابەندبوونە لە گرێبەستدا یان ویستی یەکلایەنەدا یان شتانی تر جگە لەو دوانە کراوە بە سەرچاوەی پابەندبوون، ئەوەش کە هۆی گرێبەستە کراوە بە هۆی پابەندبوون، گەورە فەقیهانی یاسا. بەدەق دوورخستنەوەی هۆی راستەقینەی پابەندبوونیان راگەیاندووە وەك پێشتر باسمان کرد، ئەم تێکەڵکردنە کورتنەکراوەتەوە لەسەر فەقیهانی یاسا لە جیهانی عەرەبیدا، بەڵکو گەورە فەقیهانی یاسای گرتۆتەوە لە فەرەنسا کە بە دایکی یاساکان ناسراوە.

١٢–هەڵسوکەوتی تاکلایەنە وەك چۆن سەرپێهەڵدەری پابەندبوونە هەندێ جاریش تەنها بەردەرەوەی پابەندبوونە، وەك کۆتاهێنانی بریکاری بە ویستی یەکلایەنە لە بریکارگرەوە یان لە بریکارەکەوە.

١٣.هەڵسوکەوتی یەکلایەنە هەندێ جار لە یەك کاتدا بەردەرەوە و دروستکەرە(سەرپێهەڵدەرە)، وەك لە تەڵاق و جووتکردندا وەك باسمان کرد.

١٤.هەڵسوکەوتی یەکلایەنە وەك چۆن سەرپێهەڵدەری پابەندبوونی مەدەنییە، هەندێ جاریش سەرپێهەڵدەری تاوانکارانەیە، وەك پێشتر باسمان کرد.

١٥.زۆربەی مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان بریتین لە رووداوی سروشتی هەبوو لە هەرێمەکانیدا لەرووی بنەڕەتی سروسشتیانەوە یان شوێنی جوغرافیانەوە لەدوای سەرهەڵدانی گۆڕان یان گەشە و پێشکەوتن تیایدا.

١٦–رێکەوتننامە و پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتییەکان و پێشینە مێژووییەکان دیاریکردنی ئەو ماف و ئەرکانە دەگرنە دەست تایبەت بە پابەندبوو و بۆپابەندبوو لە دەوڵەتان.

١٧.سەرچاوەی سەرجەم مافەکان و پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان بریتییە لە یاسای نێودەوڵەتی بەتەنها.

١٨.زانایانی یاسا لە وڵاتە عەرەبییەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی سەرچاوەکانی پابەندبوون پێنجن، ئەوانەش بریتین لە: "گرێبەست، و ویستی یەکلایەنە، و کاری ناڕەوا، و بەدەستهێنان بەبێ هۆ(یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ) و یاسا"، بە بەڵگەی گوازراوە و ئەقڵی سەلماندمان سەرچاوەی پابەندبوون یەکە ئەوەش بریتییە لە یاسا، و ئەوانیتر(چوارەکەی تر) بریتین لە هۆیەکانی پابەندبوون، ئەوان تێکەڵییان لا دروست بووە لە نێوان هۆیەکان و سەرچاوەکاندا.

١٩.فەقیهانی یاسا کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی توخمەکانی پابەندبوون سیانن ئەوانەش بریتین لە جێگەی پابەندبوون و هۆ و رازیبوون، ئەمەش لە دوو رووەوەوە جێگەی رەخنەیە، یەکێکیان زۆرێك لە پابەندبوونەکان رازیبوونیان تێدا نییە، وەك رازیبوون بە یاسا و رووداوەکان، دووەم ئەم سێ توخمە هەمان توخمەکانی گرێبەستن کە بریتین لە جێگەی گرێبەست و هۆ و رازیبوون، بە بەڵگەی گوازراوە و ئەقڵی سەلماندمان شەشن ئەوانەش بریتین لە: پابەنکراو، و پابەندبوو، و بۆپابەندبوو، و تیاپابەندبوو، و پێپابەندبوو، و هۆی پابەندبوون.

٢٠.لەسەر لایەنە ناکۆکەکان -کە دەتوانن پارێزگاری ئاشتی و ئاسایشتی نێودەوڵەتی رووبەرووی هەڕەشە بکەنەوە- پێویستە بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانیان پەنابیەن بۆ رێگەکانی ئاشتی لە دانوستان و میانەگیری و حەکەمدانان و هاوشێوەکانیان، بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە بانگ بۆ چارەسەری ئاشتیانە بکات لە جێگەی بەکارهێنانی توندوتیژی و هێز بەپێی ئەوەی هاتووە لە بەشی شەشەمی میساقەکەدا، گەر چارەسەری ئاشتیانە شکستی خوارد لەسەر ئەنجوومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان پێویستە پەنا ببەن بۆ بەکارهێنانی سزا دژ بەو لایەنەی کەمتەرخەمی لە پابەندبوونەکەی دەکات بەپێی ئەوەی هاتووە لە بەشی حەوتەم لە گوزارەی جۆراوجۆر بۆ سنوور بۆدانان و دامکوتکردن و گێڕانەوەی کاروبارەکان بۆ شوێنی خۆیان.

٢١-لەسەر دەوڵەتی عێراقی پێویستە بە بەڵێن و موجامەلەیەك لەسەر زەوی واقیع جێبەجێ کردنی بۆ نییە لەلایەن دەوڵەتانی جیرانەوە فریو نەخوات، بەڵکو پەنا ببات بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ناچارکردنی ئەو دەوڵەتانە بە پابەندبوونەکانیانەوە کە بابەتەکەی بریتییە لە مافە ئاوییە دیاریکراوەکان بە رێکەوتننامە و پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتییەکان و پێشینە مێژووییەکان.

٢٢-ئەوەی باسمان کرد تایبەت بە رووباری فورات لە پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان و تەگبیرە پێویستەکان لە ئەنجوومەنی ئاسایش یان لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاڵنان و هەڵگرتنی ئەم کەمتەرخەمییەی هەیە بۆ پابەندبوونەکانیان بە هەمان شێوە گوزەر دەکات بەسەر رووباری دیجلە و دوو زێیەکە(زێی گەورە و زێی بچووك) و رووباری سیروان(دیالە) و رووباری ئەڵوەند و رووباری کارۆن و "شط العرب"دا.

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە هۆی گرێبەست لە گرێبەستە پابەندکەرەکان بۆ هەردوو لا لە بریتیدانەکان بریتییە لە هەریەك لە دوو بریتیدانەکە تایبەت بە دوو گرێبەستکارەکە، بۆ نموونە گەر پرسیار لە فرۆشیاری ئۆتۆمبێلێك کرا بۆچی فرۆشتت، ئەوا وەڵامەکەی ئەوەیە "پێویستم بە پارەکەی(نرخەکەی) بوو"، گەر پرسیار لە کڕیار بکرێت بۆ ئەو برە پارەیەت پێدا ئەوا وەڵامەکەی ئەوە دەبێت کە "بەرانبەر ئەو ئۆتۆمبێلە پێمداوە کە پێویستم پێیەتی"، کەوابوو هۆی بەیەکترگەیشتنی ویستی دوو گرێبەستکارەکە و سەرهەڵدانی گرێبەستەکە تایبەت بە هەریەکێک لە دوو گرێبەستکارەکە بریتییە لە بەشی بریتیدانەکە کە لایەکەی تر بەرانبەر ئەوەی ئەم دەیدات بە ئەو پێیدەدات، بینا لەسەر ئەوە دەتوانرێت بوترێت گوزارەی بەمەرامگیراو لە گرێبەستدا لەلای زانا موسڵمانەکان وردترە لە گوزارەی هۆ(یان هۆی بەمەرامگیراو) لەلای یاساناسان، چونکە هەریەك لە دوو بریتیدانەکە بەمەبەستگیراوە بۆ ئەوەی دوو گرێبەستکارەکە بەدەستی دەهێنن.

لە گرێبەستەکانی بەخشینیشدا هۆی بەخشینی بەخشەرەکە هۆیەکی مادی نییە، بەڵکو مەرامێکی مەعنەوییە وەك پاداشت لەلای خودا و حورمەت و بەجێگەیاندنی سیلەی بەزەیی و پاداشتدانەوە بە چاکە و هاوشێوەکانی ئەمانە، هۆیەکە بریتی نییە لە نیێتی کەسی بەخشەر وەك هەندێ لە یاساناسان دەڵێن، چونکە نیێت سیفەتێکی ڕاوەستاوە بە بەخشەرەوە، هۆی پاڵنەریش کارێکی دەرەکییە، بۆیە لەپێشترە پێی بوترێت هاندەری پاڵنەر.